# ئەو دیوی کوێستان
# زەوی ئاسن ئاسمان مس

یەشار کەمال
و : ڕەسووڵ سوڵتانی





بەرگی دووەم

# ئەو دیوی کوێستان

## زەوی ئاسن و ئاسمان مس

یاشار کەمال

و: ڕەسووڵ سوڵتانی

بەرگی دووەم





وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەرێوەبەرایەتی گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەرێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

**● ئەو دیوی کوردستان (زەوی ئاسن و ئاسمان مس)**

● نووسینی: یاشار کەمال

● وەرگێڕانی لە تورکییەوە بۆ فارسی: رەزا سەید حوسێنی و جەلال خوسرەوشاهی

● وەرگێڕانی لە فارسییەوە: رەسووڵ سوڵتانی

● نەخشەسازی ناوەوە: (باران)

● بەرگ: جێگر عەبدولجەبار

● چاپی یەکەم: ٢٠١١

● تیراژ: ١٠٠٠

● نرخ: سێ بەرگ ١٥٠٠٠

● چاپخانە: وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

● لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٩٩٤)ی ساڵی (٢٠١١)ی پێدراوە.

**زنجیرەی کتێب (٦٠٦)**

ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی
رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە
www .Kurdchap.com

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

پێشکەشە

بە دەستە ماندووەکانی هەر سێ برا ئازیزەکەم (برایم، عەولا ، رەحیم)

# ١

حەسەن لە پێشەوە و ئۆمەخان بە دوایدا، وردە وردە بەرەو لێڕەوارەکە دەڕۆیشتن. حەسەن دەستەکانی خستبووە باخەڵیەوە و بڕێك خۆی بەرەو پێشەوە کووڕ کردبۆوە. ئۆمەخان سەیری پەنجەی لاقی دەکرد.

قسەیان پێکەوە نەدەکرد. شڵەژابوون. ئەوەندە لەسەر هەست بوون باڵندەیەك فڕیبایە زەندەقیان دەچوو. چاوەکانیان قیچ کردبوو.

هەموو وڵات وەبن بەفر کەوتبوو. بەفر هەموو گرد و خڕ و دۆڵەکانی داپۆشیبوو. دنیا یەکسەر سپی دەچۆوە. چووکترین پەڵە چییە بەسەر ئەو سپیاییەوە نەبوو، تەنانەت ڕەشایی باڵندەیەك و بگرە مێشێکیش. ئاسمانیش هەر سپی دەچۆوە. ئەوەندە نەبێ لە دوور دوورەوە لە باشوورەوە ڕەنگێکی شین باوی دڵگر بە سەر لێڕەوارەکانی کوێستانی تۆرووسەوە شەپۆلی دەدا. ئەو سامالە دەتگوت دەسرۆکەیەکی بچووکە و بەسەر سپیاییەکی بێسنوور دادراوە. کە لە دووریشەوە سەیری حەسەن و ئۆمەخانت دەکرد، دەتگوت دوو زەڕنەقووتەن لە هێلانەوە بەربوونەتەوە و پەلەقاژەیانە و هەوڵی هەڵفڕینێ دەدەن.

تاوێکی تیژی وەك تاوەکەی چوکووراوا بەسەر ئەو سپیاییەدا کەوتبوو و لەسەر بەفرەکە وا دەدرەوشایەوە چاوی لەبەر هەڵنەدەهات.

لەگەڵ هەر هەنگاوێکیان بەفرەکە کرەکرێ دەهات. هەردووکیان پێخاوس بوون. لاقیان سوور سوور هەڵگەڕابوون. دەتگوت پێ لەسەر ئاسنی سوورەوەکراو دادەنێن. هەربۆیەش ڕۆیشتنەکەیان زۆر سەیر بوو.

هێشتا زۆریان مابوو بۆ دارستانەکە.

حەسەن ئاوڕێکی دایەوە و بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ هۆ کچێ.
ئۆمەخان لەسەرەخۆ وەڵامی دایەوە:
ـ ئا، چییە؟
حەسەن گوتی:
ـ کە گەیشتینە دارستانەکە...
بێ دەنگ بوو...
ئۆمەخان پرسیی:
ـ دەی؟ کە گەیشتینێ؟
حەسەن:
ـ پێت نالێم، پەشیمان بوومەوە. ئەگەر گەیشتینێ، هەر ئەوەندە...
ئۆمەخان وەك بەهەندی نەگرتبێ گوتی:
ـ مەیلێ... پێت وایە بیلێی چ دەبێ؟
حەسەن بە تووڕەییەوە گوڕاندی:
ـ ملت بشکێنە..
ئۆمەخان زانی حەسەن شەڕ دەفرۆشێ و بێ دەنگ بوو.
ـ پێم گوتی بڕۆ ملت بشکێنە. تێناگەی؟
ئۆمەخان:
ـ تێگەیشتم، براکەم، تێگەیشتم. چ بکەم، دە مەیلێ.
حەسەن بە تووڕەیەوە هاواری کرد:
ـ نایلێم.

دیسان خۆی بەرەو پێشەوە نوشتاندەوە. هەنگاوەکانی خۆشتر کردن. ئۆمەخان بە زەحمەت دەیگەیشتێ. کە گەیشتێ، چیی نەمابوو پشووی ڕاوەستێ و بکەوێ. دوایی وردە وردە بێ هێز بوو و وەدوا کەوتەوە. حەسەن هیچ شلی نەدەکردەوە و جار بە جار دوورتر دەکەوتەوە. ئۆمەخان نەیدەتوانی پێی بڵێ:"بڕێك سووکتر بڕۆ حەسەن. ناتگەمێ." دەشیزانی بەجێ بمێنێ و حەسەنی لێ بزر بێ، چیی بەسەر دێ. بە شوێنیدا غاری دا. بڕێکی لێ نزیك بۆوە. دیسان ماندوو بۆوە و بەجێ مایەوە.

"ئەوانە لە خەوێدا ددانی چیڕ دەکردنەوە. لە ناکاو ڕادەچڵەکی و دەیقیژاند. دوایش لە بەیانییەوە هەتا ئێواریێ ورتەی نەدەهات و هەر گرژ و مۆن دەبوو. ئەو هەتیوە حاڵەتێکی

سەیری بەسەردا هاتووە. ئەو منداڵانەی ئاوا دەچنە فکرەوە، ئاخری و ئاقیبەتێکی خۆشیان نابێ. ئەوانە بە سووکترین نەخۆشی تێدا دەچن. منداڵێك کە لە بەیانییەوە هەتا شەوێ هەر لە فکردا بێ، ئیدی کاری تەواوە. جاری جاران حەسەن بەردەوام گۆرانیی بۆ دەگوتن. ئێستا هەر جووکە و نووکەی لێ بڕاوە. دەڵێی داری شەختە لێدراوە."

ئۆمەخان لە دواوەی بە ترس و لەرزینەوە بانگی کرد:

ـ حەسەن بەقوربانت بم. بڕێك ڕاوەستە. برا جوانەکەم.

ئەوەندە لەسەرخۆ گوتی حەسەن گوێی لێ نەبوو.

ـ وەی برا داماوەکەم، کوڕە پشووت لێ بڕا.

بڕێك دواتر حەسەن ئاوڕێکی دایەوە و سەیری دواوەی کرد. ئۆمەخانی نەدی. لەوانەیە کەوتبێتە قوڵکێکەوە و بەجێ مابێ. ددانی چیڕ کردنەوە و چاوەڕێ ما. هەتاو وردە وردە گەرمتر دەبوو و گەرمایەکی خۆش لە مل و پشتییەوە دەخزییە گیانییەوە. چەند جارێك چاوی ترووکاندن. دەستی کردە سێبەری چاوی و ڕوانی. لەو بەفرەدا کە ئەو سەری دیار نەبوو، تەنانەت پەڵەیەکی بچووکیش دیار نەبوو. هەرای کرد:

ـ ئۆمەخان، ئۆمەخان.

دەنگی لە ڕەوەزە دوورەکان گەڕای و دەنگی دایەوە:

ـ لە کوێ بەجێ ماوی ئۆمەخان؟

دەنگێکی کز گەیشتە ئۆمەخان و بەسەر بەفرەکە وەربوو:

ـ ئەوە دێم.

حەسەن بۆی گەڕایەوە. کە لە گردێك وەسەر کەوت ڕاوەستا. ئۆمەخان لەو خوارەوە وەك قالۆنچەیەکی ڕەش بە ڕێگەکەوە نووسابوو و بەرەو سەر دەخزی.

ـ وەرە کچێ، خێرا بە، خودا بتباتەوە.

ئۆمەخان شەلاڵی ئارەقە بوو. هەموو تینی دەدایە خۆی. کە گەیشتە لای هانکەهانکی بوو. حەسەن گوتی:

ـ کچێ ئەوە بۆ وای؟

ئۆمەخان گوتی:

ـ پشووم لێ بڕا.

حەسەن دیسان هەر وا بە خێراییەوە کەوتەوە ڕێ. ئۆمەخان لە دواوەی گوتی:

ـ بڕێك ڕاوەستە برا جوانەکەم. بە ڕاستی پشووم نایە.

حەسەن ڕاوەستا و چاوەڕێی بوو. یەکپارچە تووڕەیی بوو کە لەسەر بەفرەکە ڕاوەستا بوو و سێبەرەکەی کەوتبووە سەر پەنجەکانی لاقی.

کە ئۆمەخان گەیشتە لای گوتی:

ئەگەر وامزانیبا نەمدەهێنای. لەگەڵ ماکەر مەچۆ سەفەر، نەهامەتیت بەسەر دێنێ.

کە ئەو قسانەی دەکرد، دەنگی خۆی گڕ کردەوە و وەك پیرەپیاوان دەستی بەرەو چەناگەی برد. لەو حاڵەتەدا لە کورتەبالاکانی نێو حەقایەتەکان دەچوو، کە بە قولانجێك بەژن و باڵا و حەوت قولانج ڕدێنەوە...

ئۆمەخان بەردەوام بەو قەلافەتەی هەڵبەزیبۆوە و پێی شێت دەبوو:" کە ئاوا لاسای گەورەکان دەکاتەوە، پیاو دینی نامێنێ. فێڵەزان، دیارە حەسەن هەموو شتێکی خراپ نییە، بەلام ئیدی ئەوەیان پیاو لەدین دەهری دەکا... " حەزی لێ بوو شەڕ بفرۆشێ. ئەو هەتیوە بێ تامی کردبوو. ئەدی، باشە چۆن بوو شەڕێك هەلایسێنێ. زۆری حەز لە شەڕێ بوو..، بەلام ئەگەر شەڕی کردبا، حەسەن ئەو شتەی پێ نەدەگوت کە قەرار بوو لە لێڕەوارەکە پێی بڵێ... ئەدی چۆنە بگەڕێتەوە؟ ئەو هەتیوە چلکنە چڵمنە... میزکەرە... لە نوێنیشدا میز بەخۆیدا دەکا. جێوبانەکەی بەردەوام بۆن میزی لێ دێ. لەسەر زمانی بوو بڵێ: "هەی میزکەر...". جا وەرە لەو شەڕەی ساز دەبوو..

حەسەن تووڕە و شێواو، قیت ڕاوەستابوو و جاروبارە قامکە گەورەکەی بە دەمی تیژی تەورەکەیدا دێنا کە بە دەستییەوە بوو. دەیزانی ئۆمەخان زۆر بەوکارەی تووڕە دەبێ.

دیسان ئەدا و ئەتواری گەورەکانی دەرهێنا. وەك ئاشقەکەچەڵە، بە ئەدایەکەوە دەستی بۆ چەنەی برد:

ـ لەگەڵ بێ حەیا و بێ ناموسان مەچۆ سەفەر. تووشی نەهامەتیت دەکا.

ئەو قسەیەی وا کرد، کە دڵنیابوو ئۆمەخان شەڕەکەی دەکا. لە هەر شوێنێکی دیکە بوایە، ئاخۆ لەوانەبوو ئەو هەمووە قسە قۆڕە ببیستێتەوە و دەنگێ نەکا؟

ـ ژن هەموو درۆزنن.

"ئیدی ئەو قسەیە هەر دەیکوژێ. دەیتەقێنێ."

چاوەڕێ ما. چاوەکانی بە تەوسەوە بڕییە کچەکە. ئۆمەخان دیسان دەنگی نەکرد. هەر ئاخێکی هەڵکێشا.

ـ قەحپە دین و ئیمانی نییە...

ئاخۆ ئەو قسەیەش کاری تێنەدەکرد؟

دیتی ئۆمەخان چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو. بەزەیی پێیدا هات. پەشیمان بۆوە لەو قسانەی کردبوونی. چوو و دەستی گرت و گوتی:

ـ ئەتۆ خوشكە جوانەكەمی. خوشكە ئازیزەكەم. ئەو قسانەم لەگەڵ تۆ نەبوون. نا، تۆ نەبووی. هەر ویستم بزانم تێدەگەی ئەو قسانەم لەگەڵ تۆ نییە یان نا؟ هەر بۆیەش كردمن.

ئۆمەخان دڵی خۆش بوو. گوتی:

ـ تێگەیشتم و زانیم لەگەڵ منت نییە. كوا پیاو بە خوشكی خۆی دەڵێ "قەحپە"؟ زانیم بە منیان نالێی.

بەزەییەكەی حەسەن دەمودەست بوو بە تووڕەیی. لە دڵی خۆیدا گوتی:"ئەگەر پیاو خوشكێكی قەحپەی وەك تۆی هەبێ، قەحپەشی پێ دەڵێ و چاویشی دەردێنێ..."

لەناكاو گەڕایەوە و گوتی:

ـ دەی، بەس نییە؟ هەرچی پشوو بوو كێشات و هیچت نەهێشتەوە.

خێرا وەڕێ كەوت.

ئۆمەخان پشوویەكی وەبەر هاتبۆوە. بەفرەكەی لاقی دەبرژاندەوە. وەشوێن حەسەن كەوت.

حەسەن دوای ئەوەی بڕێك ڕۆیشت، ئاوڕێكی دایەوە و سەیرێكی دواوەی كرد. زۆر زۆر تووڕە بوو. دەیویست هەمووی بەسەر ئۆمەخاندا هەڵڕێژێ:"راوەستە ئەو كچەتیوە با نزیك بێتەوە. ئەوجارە لە لووتی دەیهێنمەوە دەرێ. ئەوەی دەیبینی."

ئۆمەخان نزیك بۆوە. دەیزانی چیی بەسەر دێ. بە ترس و لەرزەوە هەنگاوی دەنا. حەسەن دەتگۆت هەڵۆیەكە و ئامادەیە لە نێچیرەكەی ڕۆبێ. بە دەنگێكی گڕەوە گوتی:

ـ ئۆمەخان... هۆی كچێ...

لە ناكاو بێ دەنگ بوو. نیگاكانی كەوتبوونە سەر لاقەكانی كچەكە. چڵك و چەپەری سەر لاقەكانی ئۆمەخان كەمرەی بەستبوو و وەك پێستی مارمێلكەی لێ هاتبوو و ورد دەلەرزین و چڵیان دەدا. لاقەكانی وەك چەوەندەر سوور ببوونەوە.

حەسەن نەرم بۆوە و گوتی:

ـ دەی خێرا وەڕێكەوە كچێ... كە گەیشتینە لێرەوارەكە...

ئۆمەخان دەنگەكەی ئەوی وەك دەستێكی گەرم و بلاوێن لە هەموو گیانیدا هەست پێ كرد، بەڵام سەیری ڕوخساری نەكرد، ئەوەش ئەوی تووڕە كرد.

حەسەن بە خۆشییەكەی زۆرەوە لێوەكانی لستنەوە و گوتی:

ـ جا كە گەیشتینە ئەوێ... كە گەیشتینێ... یەكەم كارێكی كە دەیكەین...

ئۆمەخان هەر بە ڕاستی بێ تاقەت ببوو. خەریك بوو بدڕێ لە داخان، بەڵام بەردەوام حاڵە شڕ و شپرێوەکەی ڕۆژانی ڕابردووی حەسەنی دەهاتەوە بەرچاو. بۆیەش زۆر بە هەندی نەگرت و بێدەنگەی لێ کرد.

حەسەن پێداگر بوو:

ـ جا کە گەیشتینە لێرەوارەکە...

ئۆمەخان خەریك بوو تووڕە دەبوو. بەخۆی گوت:" ئەمجارە دەیلێ. نەیلێ دەدڕێ."

حەسەن چاوی لە چاوی ئۆمەخان بڕی و دووپاتەی کردەوە:

ـ کە گەیشتینە دارستانەکە...

ئۆمەخان بە بزەیەکی مەخسەرەوە گوتی:

ـ دەی بە من چی.

حەسەن هەڵچوو، گوتی:

ـ ئەتۆ گەورە بی، دیارە دەبیە قەحپە.

ئیتر شتێك ڕووی دا کە حەسەن هیچ چاوەڕوانیی نەدەکرد. ئۆمەخان لە ڕوویدا ڕاوەستا و گوتی:

ـ کە گەورە بووم دەبمە قەحپە. ئەویش چ قەحپەیەك. زۆر زۆر باش.

حەسەن چرکەیەك پێی وابوو خراپی بیستووە. لە پێشدا سەری لە گێژەوە هات. دوایی تووڕە بوو و ویستی تێی هەڵدا، بەڵام ئەگەر لێی دابایە، کچە دەڕۆیشتەوە و بە بابی دەگوت و بابیشی وەزعی لە هەموو کاتێك شڕتر بوو. بۆوەی نەدەبوو بچیتە لای. یەکپارچە ئاگر بوو و قسەی لەگەڵ کەس نەدەکرد.

گوتی:

ـ کچێ... دەبوایە وەبەر شەقانت بدەم، بەڵام... بڕۆ شوکرانەبژێر بە... کە گەیشتینە دارستانەکە...

لێوەکانی لستنەوە.

ئۆمەخان خۆی پێ نەگیرا و چووە پێشێ و دەستەکانی براکەی گرتن و گوتی:

ـ دەی بیلێ... لە سەرت گەڕێم حەسەن... کە گەیشتینە دارستانەکە چ دەبێ؟

حەسەن جارێکی دیکەش بە چێژەوە لێوەکانی لستنەوە و بەرەو لێرەوارەکە غاری دا.

ئۆمەخان لە دواوەی هەرای کرد:

ـ هەر نایەم. یان لەسەرم ڕادەوەستی، یان هەر لێرەوە دەگەڕێمەوە. ئەگەر بەقا ناکەی، یەك شەقاوی دیکە باوێ.

جا دەسبەجێ گەڕایەوە.

حەسەن دیتی هەر بە ڕاستی خەریکە دەڕوات. دەترسا بە تەنێ بچێتە دارستانەکە و بەتەنێش لەوێ بێ.

بانگی کرد:

ـ دەی وەرە، وەرە بگەڕێوە.

ـ نایەم. دەڕۆم و هەر هەمووی بۆ بابم دەگێڕمەوە.. موو بە مووی...

حەسەن تووڕە بوو و گوتی:

ـ ملت بشکێنە. بابم لە خۆی وەڕەزە... بڕۆی بەو تەورەی دەستم ورد وردت دەکەم. دایك قەحپە بم وات لێ نەکەم. خێرا وەرە دەی.

ـ نایەم.

ـ سەیر بکە، خەریکە تووڕە دەبم. ئەگەر وەدەستم بکەوی...

ـ بە مەرجێك دێمەوە پێم بلێی کە گەیشتینە دارستانەکە چ دەکەی.

ـ دەی وەرە، پێتی دەلێم...

ئۆمەخان گوتی:

ـ باشە، قسە بکە.

جا گەڕایەوە و هاتە پێشەوە.

حەسەن تووڕە بوو. دیسان چۆوە قەپیلکی خۆیەوە و سەری بەردایەوە و وەڕێ کەوتەوە.

پۆلە باڵندەیەك کە هەر دەتگوت لوێچی دانەوێلەی ڕەشن و بەو سپیاییە بێسنوورەوە کراون، بەسەر سەریاندا تێپەڕین.

حەسەن دڵی زۆر توند بوو. دڵتەنگییەکی لە ڕادەبەدەر. نەیدەتوانی چاو لە تەورەکەی هەڵگرێ و سەیری چەند هەنگاوێك پێش خۆی بکات. هەر وەك بنیادەمێك لە ڕۆژێکی هاوینیدا لە بیابانێکا لە خەو هەستێ کە لە ناکاو نوقمی هەتاو بێ و لەو حاڵەتەدا لە بن بارستایی هەتاوێکدا کە هەموو قورساییەکەی خستبێتە سەری، نەتوانێ بجووڵێ، چۆن خۆی بە عەرزەوە دەنووسێنێ و ناتوانێ جووڵە بکا و چاوەکانیشی بۆ هەڵنایەن... لەو کاتەدا حەسەنیش ئەو حاڵەتەی هەبوو. هەر ئەوەندە بوو بە عەرزەکەوە نەنووسابوو و چاوەکانی لێك نەنابوون. چاوەکانی نیوەکراوە بوون و بەبێ ئەوەی سەیری دوو هەنگاو پێش خۆیەوە بکا، ڕێگەی دەبڕی. جاروبارە وەخۆ دەهاتەوە چاوەکانی هەڵدێنان و دەیڕوانی. چاوی عادەتیان دەکرد، بەڵام کە

هەتاوەکە لە نێوەندی چاوی دەدا، دەتگوت تازە لە خەو هەستاوە و لە بن تیشکی تاوەکەدا دەتلایەوە و دەلەرزی و دیسان ڕێی دەبڕی.

لەو باڵندە شینە، لەو باڵندە بریقەدارە... هەر ئەو باڵندەیەی کەندەڵانەکانی وەك هێلانەی ماران کون دەکرد، زۆر قووڵ و دەچێتە ناخی زەوییەوە و لەوێدا هێلانەکەی چێ دەکا، هەمیشە گوڵێکیش لەبەردەم هێلانەکەیدا شین دەبێتەوە. گوڵووکێ یان پنگەی کێوی. ئەو باڵندەیە بەبێ گوڵ هەڵناکا. دەبێ لەوانە یەك بگرم، بەلام ئەو تووك لێکراوە ناگیرێ. هەر مام خەلیل دەیتوانی بیگرێ. مام خەلیلیش تەواو لێ کەوتووە. ئەو ماڵوێرانە ئاگرتێبەربووە... ئەو بەلای سەری ئەو گوندەیە... لە وەرزی پەمۆ ڕنینەوەیدا کە لە چوکووراوا خۆی بزر کرد، هەموو گوندی پێیان وابوو مردووە. کوڕەکەی ڕایسپارد قورئانی بۆ بخوێنن..

مرێمۆك پێی چەقاند و گوتی:

ـ ئەو نامرێ... ئەو لەگەڵ ئیزرائیل ڕێك کەوتووە... چما دەمرێ؟....

کورت و کورمانجی، مام خەلیل هەرچۆنێك بێ دانەیەك لەو کاشەڵەشینکەیە* دەگرێ. باڵندەکە دەنووکێکی تیژ و درێژ و ڕەش و جوانی هەیە و دەبریسکێتەوە. مام خەلیل سەلکی ئەو باڵندەیە وەك نەزری قوربانی بە شانی منداڵانەوە هەڵدەواسێ. منداڵێکی ئەو نەزرەی بەشانییەوە بێ، چاوەزار کاری لێ ناکا. چاوەزار نایبڕێ.

حەسەن وەبیری هاتەوە، لە تەنیشت جگ و کووژەکە و ئیسکی سەری مارەوە، سەلکی باڵندەیەکی دەنووك درێژیش بەسەر شانییەوە هەڵواسرابوو. مام خەلیل بە دیاری دابوویە مرێمۆك.

گوندییەکان دەیانگوت:

ـ ئای مرێمۆکی ماڵوێران. کوڕە ئەو پیرەمێردەش بنیادەمە، چما دەکرێ نەمرێ.

بەلام ئەوە مرێمۆك بوو. چما دەستی هەڵدەگرت:

ـ ئەوە پێی دەڵێن مام خەلیل... چما دەمرێ؟ لە خێڵی جنۆکانە.... بەرازی بێ دین و ئیمان و زاڵمە و خوێنی حەلالە. ئەو نامرێ. نامرێ. دراوسێکانی من...

---

*کاشەڵەشینکە: کەندەسمە. ئەو باڵندەیە باڵندەیەکی شینی جوانە. لە موکریان دوو ناوی هەیە، هەم کاشەڵەشینکەی پێ دەڵێن و هەمیش کەندەسمە. کەندەسمە لە سێ بەش پێك هاتووە: کەند+ە+سمە واتە ئەوەی کەند دەسمێ. ئەوەی کەندەڵان کون دەکا. چونکە ئەو باڵندەیە کەندەڵانان کون دەکا.

هەر منداڵێکی ئەو سەلکەی بەشانییەوە بێ، سەر بە ڕۆژی دەبێ و قەت تووشی نەهامەتی و کوێرەوەری نایە. باو و باپیرەکانمان وایان وتووە.

باو و باپیرەکانی ئێمە... ساڵی ڕابردوو منداڵە وردکە لە ئەشکەوتەکەی سالینجاق سەلکێکیان دۆزیبۆوە. چاو و گوێچکە و تووکی نەبوو. بەس ددانەکانی جوان بوون. زیت و زیندوو. دەتگوت پێ دەکەنێ. یەکێك لە منداڵەکان گوتبووی:"باووباپیرەکانمان... باو و باپیرەکانمان..." حەسەن هەموو گیانی لەرزیبوو و بیری لە مردنێ کردبۆوە و گوتبووی:"ڕۆژێکیش سەلکی من ئاوای لێ دێ." و کەوتبووە نێو هەستێکی ترسناك و داماوانە و نەمانەوە. دوایی بەبیریدا هاتبوو کە هێشتا منداڵە و مەرگ زۆر لێی دوورە. لە داهاتوودا ئەو گەورە دەبوو و بەساڵا دەچوو و دواتریش وەك مام خەلیل پیر دەبوو.... جا دوایە دەمرد. ئەو بیرە بڕێکی ئەهوەن کردبۆوە، بەڵام دیسانیش خەمناك بوو. تا ماوەیەکی زۆر نەیتوانیبوو سەلکە وشکەکە لەبیرخۆی بەرێتەوە.

دواتر تروسکەی هیوایەکی لە دڵی گەڕابوو. مرۆڤ دوای مەرگ چیی لێ دێ؟ کە دەمرێ دەینێژن. هەموو گیانی دادەڕزێ و کرم تێی دەدا. کرم لە گلێنەی چاوەکانیا دەتلێنەوە و ئەوەندەی دەخۆن کە تەنیا ئێسکەکانی دەمێننەوە. دوایی ڕۆژی پەسلانێ دێ. قیامەت چۆن دەبێ؟ بایەك لە ئەستێرەکانەوە هەڵدەکا. بایەکی توند. زیندەوەرێك لەو دنیایەدا ناهێڵێتەوە. هیچ شتێك. ئەو بایە کێوەکان بەپەڕە دەکا و دەیانکاتە تۆز. شیو و دۆڵەکان پڕ دەکاتەوە. وای لێ دەکا لە ڕۆژهەڵاتەوە بڕوانی، لە ڕۆژئاوا هێلکەیەکت بۆ دانێن دەیبینی. دواتر مرۆڤەکان وەك کوارگی سەوز، وردە وردە لە خاك دێنە دەرێ. دوایی تەرازوو و میزانی دادپەروەریی خودا دادەنرێ و گوناحباران دەبەنە دۆزەخ و بێ گوناحەکانیش بۆ بەهەشت.

ئەوجار حەسەن مێشکی خۆی بە بیری شینبوونەوەی دووبارەی مرۆڤەکان لە خاك و بە بیری بەهەشت و دۆزەخەوە ماندوو دەکرد و بێ پسانەوە پرسیاری ئەوەی لە مرێمۆك دەکرد کە بنیادەم چۆن دەچنە نێو بەهەشتێ. مرێمۆکیش بە عیش و کەفوکوڵەوە باسی بەهەشت و دۆزەخی بۆ دەکرد.

❊ ❊ ❊

ـ قورئان خوێندن بۆ ئەو کافرە؟... "مەولوود" بۆ ئەو بێ دینە؟ بۆ ئەو کافرە لە دین وەرگەڕاوە؟

عەلیە درێژ دەست بە زاری دایکییەوە دەگرێ و دەڵێ:

ـ کچێ دایه... نەکەی... دوای مردووان ڕەحمەت باشە. مردوو تازە مردووە دایە، دەستی لەم دنیایە بەرداوە. خۆت لە تیخی خوا و پێغەمبەران مەدە. مردوو زۆریش خراپ بووبێ، دەستی لە هەموو خراپەیەك شوشتووە و ڕۆیوە.

ـ مام خەلیل نامرێ.

لە زەوییە ڕێك و بێ پەمۆکەدا کوڕەکەی مام خەلیل ڕێوڕەسمی "مەولودی"ی بۆ بابی دانا. هەموو گوندییەکان بەشدار بوون. ژنەکان بە دەنگێکی دڵتەزێن بۆی گریان. تەنیا یەك کەس نەهاتبووە ئەو "مەولوودییە" ئەویش مریەمۆك بوو. مریەمۆك لە گوندییەکان جوێ بۆوە و بەرەو ئەو لای مەزراکە ڕۆیشت و چووە سەر جۆگەکە. لەسەر خاکە سوورەوەبووەکەی چوکووڕاوا چوارمەشقی دانیشت. دەیگوت:

ـ با گوێم لەو مەولوودییە پیرۆزە نەبێ، کە بۆ ئەو کافرەی دەخوێننەوە. ئەگەر پێغەمبەرە خۆشەویستەکەمان گوێی لێ بێ کە ئەو مەولوودییە پیرۆزە بۆ مام خەلیل دەخوێننەوە، لە گۆڕەکەی هەڵدەستێتەوە و دێتە ئێرە و مەولوودییەکەی لە زاری وەردەگرێتەوە و دەیبا.

ئەوجار هەڵدەستا و دەڕۆیی. دەنگی ئاشقە کەچەڵیش هەر وەشوێنی دەکەوت. کە گەیشتە مێشەڵانەکەی کارابوچاك، دەستی لە گوێچکەی کردەوە. دیسان دەنگی دەهات. دیارە لاوازتر ببوو. بەخۆی گوت:"ئەگەر لەو دارستانە تێپەڕم و لەو قوولکەیەش بچمە خوارێ... ئیدی دەنگی ناگاتە ئەوێ." تروسکەی هیوایەك پەیدا بوو.. دیسان پەنجەی نایەوە نێو گوێچکەی. سەری لەگێژەوە هات. وەك چۆن دوای هەور و هەڵلا و بارانێکی خەست، ئاسمان ڕوون دەبێتەوە و ڕووناکاییەکی شێدار و گەرم هەموو وڵات دادەگەرێ... دەنگەکە بڕابۆوە.

لە ناکاو دنیای لێ کپ بوو. خۆزگە دەنگەکەی ئاشقەکەچەڵە نەبڕابایەوە. ئەگەر ئەو مەولوودخوێندنە بۆ مام خەلیل نەبوایە و بۆ ئەو لە دین وەرگەڕاوە نەبوایە و بۆ بەندەیەکی دیکەی خودا بوایە، بەگیان و دڵ گوێی دەدایە. بە زیندوویش دەستی لێ هەڵنەگرتبوو و ئێستا بە مردوویش هەر دەستی لێ هەڵناگرێ. مریەمۆك زگی بەخۆی سووتا. لەسەر خۆڵەکە دانیشت. هەڵلایەك لەسەریدا بوو. ئەو مریەمۆکە کەیفی بە چۆڵەوانی و بێدەنگی نەدەهات. هەر بۆیەش لە مەرگ دەترسا.

دەتگوت دەنگێکی سووك و خەمبار لەگەڵ هەڵلا و هەنگەمەی جەماوەرەکە هاتە بەر گوێی. ئەمجارەیان گوێی نەئاخنی. هەستا و دەستەکانی لێك دا. چەقەنەیەکی لێ دا و هەڵپەڕی. سەیرێکی دەوروپشتی خۆی کرد. بەخۆی گوت:"چاویان دەرێ، با ببینن. با جوان ببینن. چما ئەو بێ دینەش بۆوەی دەبێ مەولوودیی بۆ بخوێننەوە؟"

نزیکـەی نیوەڕۆیــە گەڕایــەوە هۆبەکــەیان. مەولوودخوێندنەوەکــە تــەواو ببــوو. تووشــی ئاشقەکەچەڵە بوو. ئاشق ویستی قەشمەرییەکی پێ بکا، بەڵام مرێمـۆك وا لێـی مـۆڕ بـۆوە کـە ئاشقەکەچەڵە هەزار جار پەژیوان بۆوە.

هاتە نێو جەماوەرەکە. لە نێوەڕاستیان ڕاوەستا. یەکپارچە ئاوری لێ دەباری. دەمارەکـانی گەردنی هەستابوون. گوندییەکان چاویان لە چاوییەوە بڕیبوو و چاوەڕێی بوون بـزانن دەیـەوێ چ بکا. دەستی ڕاستەی هەڵێنا. لەوکاتەدا کە دەیویست بیهێنێتە خوارەوە و شتێك بڵێ، ئـەژنۆی لەرزین و دانیشت. هەر وا کە دەستی بە عەرزەکەدا دەکێشا گوتی:

ـ ئەی خاکە ڕەشە باشەکەی من، ئەی خاکی نوورانی، ئەی هەموو شتێکی ئێمە، لێرە کارم بەکاری کەس نییە و قسە لەگەڵ تـۆ دەکـەم. ئـەو گوندیانـە بـۆوەی نـابن سـەیری دەموچـاویان بکەی. تەنانەت بۆوەی نابێ چارەوی و چوارپێشیان بدوێنی و سڵاوی منداڵیشیان بـستێنیتەوە. سڵاوی منداڵیشیان بستێنیتەوە. لەگەڵ تۆمە خاکە بەپیتەکەی خۆم، ئەقڵەکـەی خـۆم، بـاوکی من، ئەو گوندییانە وازیان لە دین و ئیمـان هێنـاوە. کـۆ دەبنـەوە و مـەولوودی بـۆ تۆپیـوێکی لەدین وەرگەڕاو دەخوێننەوە کە بە چوار کتێبان خـوێنی حەڵاڵـە. بـەو مەولوودییـە، حـەزرەتی محەمەدەکەمان، کە هەم خۆش باشە و هەمیش ناوەکە، زویر دەکەن. حەزم دەکرد لـە نێـو ئـەو خەلکەدا نەمێنم...، بەڵام... پیری و هەزر عەیب. ئەگینا چما لە نێو ئەو گوندییـە کافرانـەدا دەمامەوە؟ لەگەڵ تۆمە، ئەی خاك، پادشاکەی من، لەو گوندەدا قسە لەگەڵ کەس ناکەم. ئەوە بەتۆی دەڵێم. ئەتۆ گوێ بدەیـە. مـام خـەلیل نـەمردووە. ئەگـەر بـشمرم ئـەو بـێ دینـە، نـابێ مەولوودیی بۆ بخوێندرێ. خۆ گوێت لێ بوو خاکەکەی من، هەڵۆکەی من؟

"عەلی" بڕێك لێوەی دوور بوو. بە غاردان هات و زاری دایکی گرت. مرێمۆك هاواری کرد:

گوندییەکان گوتیان:

ـ ئەو مرێمۆکە بە ڕاستی چاوی سوور بووە. هار بووە و قسە بە هەموومان دەڵێ.

ـ هاربوونی پیرەکان زۆر خراپە. پێشتریش...

ـ پێشتریش هەر هار بوو، بەڵام ئێستا خراپتر بووە...

لەمەودوا ئیدی مرێمۆك لەبزی لە لەبزی هـیچ کـام لـە گوندییـەکان تەنانـەت مێرووییـەکی ئاواییش نەگەڕا.

❊❊❊

"ئەو باڵندەیە چۆن دەگیرێ؟ ئەگەر بەو دارەوەی هەڵواسی، دوو هێندە بەر دەگرێ. ئەگەر بیخەیتە مەزرایەکەوە، بەرهەم و حاسڵاتەکەی پێنج بەرامبەر دەبێ... ئەگەر ئاغاکانی چوکووراوا بزانن باڵندەیەکی لەو جۆرە هەیە...

- کە گەیشتینە دارستانەکە...

ئۆمەخان بە تەوسە و تەشەرەوە گوتی:

- ئەگەر گەیشتینێ؟

حەسەن ددانی چیڕ کردنەوە و گوتی:

- با بگەینە لێرەوارەکە... هەر ئەوەندە...

لە لاقانیان وەراند*. لە دوورەوە، دووکەڵێکی شین باو، لە کولانکەی ماڵەکانی گوندە بە بەفرداپۆشراوەکە بەرەو ئاسمان دەکشا. دووکەڵەکە بەرەو لای ڕۆژهەڵات خوار دەبۆوە. ڕەوەزەکانی سەرووی دارستانەکەش، زۆر دوورتر دەگەیشتە لووتکەکانی تۆرووس. هەڵدەکشا. ئەشکەوتەکان برێك لە سەرووترەوە بوون و کۆشکی شای پەرییانیش لەو دیوی ئەو ڕەوەزانەوە بوو. دەیانگوت لەو دیوی ئەو ڕەوەزانەوە، ڕەوەزی بەرزی دیکەشی لێیە. هیچ کەس نەیتوانیبوو بچێت و ئەودیوی ئەو ڕەوەزانە ببینێ. تەنانەت ڕێگر و یاغییەکانیش نەیاندەوێرا بچنە ئەودیوی ئەو ڕەوەزانەوە.

شەوێکیان مام خەلیل ڕێگەی لێ هەتڵە ببوو و گەیبووە ئەودیوی ئەو ڕەوەزانەوە... لە ناکاو دوو هەزار سازلێدەری دیتبوو و لە لایەکیشەوە دووهەزار شمشاڵژەن... ئاوازی جۆراوجۆر... و کچی سەماکار... هەموو شتێك نوقمی نوور بوو. ڕەوەزەکان و گژ و گیاکان و دارەکان و تەنانەت زەوی و ئاسمان... بە سەدان هەزار کەس لە نێوان نوور و ڕەنگە جۆراوجۆرەکاندا دەسووڕانەوە. بە دیتنی مام خەلیل هەموان هەژابوون. کچێکی بەژن بەرز هاتبوو لە بەردەم مام خەلیل ڕاوەستابوو. پێکەنینی کچەکە، ددانەکانی، نینۆکەکانی و چاوەکانی، هەر هەمووی وەك چرا دەدرەوشانەوە. کچە گوتبووی:

- ئەوە بۆچی هاتوویەتە ئێرە ئادەمیزاد؟

مام خەلیل بە زمانێکی تێکەڵ گوتبووی:

- ڕێم لێ هەتڵە بووە.

کچە گوتبووی:

---

* لە لاق وەراندن: لەنەکاو غاردان. ڕاکردنی لە نەکاو.

ـ ئەگەر لە دزییەوە نەهاتبایەوە دەکرا لە نێوماندا بمێنێتەوە. ئەگەر دزییەکانت نەبوایەن، پیاوێکی باش بووی... کابرایەکی دڵ ساف. ئەگینا...

مام خەلیل ویستبووی بڵێ. زاری کردبۆوە، بەڵام دەنگی دەرنەهاتبوو. کچە لەسەری ڕۆیبوو:

ـ یەك بریسکەم لێ دەدای کە ئیسك و پرووسکت هەلاهەلا بن..، بەڵام بەزەییم بە گەنجی و جوامێرییەکەتدا هاتەوە. ئێستا چاوت بنووقێنە...

خەلیل چاوەکانی لێك نابوو. هەر ئەوەندەی زانیبوو وەحەوا کەوتبوو و بە ئاسماندا ڕۆیبوو... هیچی دیکەی نەدەزانی...

پەریزاد گوتبووی:

ـ ئێستا چاوەکانت بکەوە، ئادەمیزاد...

خەلیل چاوەکانی خۆی کردبۆوە و دیتبووی ئەوە لە نێوەڕاستی گوندەکەیە. گوندەکە لەحزەیەك دەتگوت بریسکە لێی داوە و هەمووی ڕووناك ببۆوە. ئەو هەموو شتێکی بەچاو دیتبوو، بەڵام کەس نەیزانی ئەو کچەی ئەوی هێنابووە ئەوێ چیی لێ هاتبوو.

***

حەسەن باوەشێکی پووشکە و چرپی هێنابوو. ڕەوەزێك وەکو سەیوانێك داهاتبۆوە و بەفر نەیگرتبوو. ئەوێ وەك ئەشکەوتێك هەتا ناخی ڕەوەزەکە ڕۆچووبوو. بن ڕەوەزەکە خۆڵەمڕە بوو. ئەو پووشکەیەی هێنابووی وردی کردن و لەسەر یەکی هەڵچنین. ئۆمەخان، کە لە سێبەری بەردەکەدا ڕاوەستا، دەستی کرد بە هەڵلەرزین. ئەگەر چووبایەتە سەر بەفرەکە و بەر تاوەکە، لەوانەبوو نەلەرزیبا.

حەسەن دوای ئەوەی دەستەچیلەکەی چنی، شەقارتەکەی دەرێنا. شەقارتەکەی نوێ و پڕ بوو. حەسەن شقارتەی لە کوێ هێنابوو؟ ئۆمەخان نەیدەوێرا بپرسێ، بەڵام سۆسەی کردبوو. فێڵێکی بە مێشکیدا هات. گوتی:

ـ هەر دەتەویست کە گەیشتینە دارستانەکە ئەوەم پێ بڵێی ئەو شقارتەیەت لە کوێ هێناوە؟

حەسەن تووڕە بوو و گوڕاندی:

ـ نا، ئەگەر زۆرت حەز لێیە بزانی، پێتی دەڵێم. لە هیچ کوێم نەدزیوە. بە ئارەقەی نێوچاوان بەدەستم هێناوە. بچۆ بە بابم بڵێ، بە دایکیشم بڵێ با شقارتەکانم لێ بستێنن. با ئەمنیش ئەو سەرە سپێونەی تۆ بەو تەورە بنەنجنم.

ئۆمەخان پێکەنی و گوتی:

ـ ئەمن دەزانم ئەو شقارتەیەت لە کوێ هێناوە.

حەسەن هەستا و گۆڕاندی:

ـ دەی بڵێ با بزانم، بەڵام ئەگەر بیڵێی و وا نەبێ، تێهەڵدانێکی خەست دەخۆی. هەر ئە لێرەش.

بیرێکی تیژ بە مێشکی ئۆمەخاندا هات:

ـ ئەها، ئەتۆ بەو دارە بەلاڵووکانەی بڕیبووتن، ئەو شەمچانەت پێ کڕیون؟

حەسەن هیچ چاوەڕوانی ئەو قسانەی نەبوو:"ئەی لەو ئۆمەخانە سەگبابە چەندە زیرەکە."

بێدەنگییەکی قووڵ زاڵ بوو. حەسەن شقارتەی لێدابوو و دەستەچیلەکەی ئاگر دابوو. چرپییەکان یەکجێ سووتان. گەرمایەکی هێمن بڵاو بۆوە.

حەسەن گوتی:

ـ دەزانی زۆر سەیر هەڵدەلەرزی!

هەستا و دەستی برد و کچەی گرت و بە دەنگێکی بلاوێنانە گوتی:

ـ وەرە دانیشە و خۆت گەرم کەوە، دەی؟

ئۆمەخان دانیشت. حەسەنیش لە تەنیشتییەوە دانیشت. شانیان بە شانی یەکەوە دابوو.

پەڵەی کەسك کەسك بەسەر ڕەوەزەکانەوە بوو. ئەو پەڵە کەسکانە تا بەرەو قووڵایی دەچوون پانتر و گەورەتر دەبوونەوە. جێ پێی جۆراوجۆر لەسەر خۆڵەکە هەبوون. حەسەن لەناکاو ئەو شوێن پێیانەی بینی. جێ پێی کەو... دیارە، لە شوێن پێی پەلەوەری دیکەی وەك خۆی ناچێ. کەو لاقەکانی بە توندی لەسەر عەرز دادەنێ. شوێن پێیەکانی وەك مۆر دەچن. شوێن پێی هەڵۆ هێندەی لەپی دەستێك دەبێ. جێ پێی چەقەڵ... جێ پێی ڕێوی... هەروەها جێ پێی کەروێشك... جێ پێی کەروێشك دەڵێی پەمۆیە کەوتووەتە سەر خۆڵەکە.

سەری بەرز کردەوە:

ـ دەزانی ئۆمەخان؟، بەڵام سوێند بخۆ بەکەس نالێی؟ سوێند بخۆ...

ـ وەڵلا، بیللا، نایلێم...

ـ بڵێ بە گیانی دایکم نایڵێم...
ئۆمەخان ساتێك دڕدۆنگ بوو. بڕێك بیری کردەوە. دواتر گوتی:
حەسەن خۆشحاڵ بوو. ڕوخساری گەش بۆوە:"نۆ دانە شەقارتەی دیکەشم لەو جۆرە هەیە. دارە بەلاڵووکەکانم فرۆشت و ئەوانەم پێ کڕین. تەواو نابن. ئەگەر پازدە ساڵی دیکەش بچمە هەر جێیەك و ئاوری پێ بکەمەوە، دیسانیش هەر تەواو نابێ...
ئۆمەخانیش شاد بوو و گوتی:
ـ هیچ تەواو نابێ. دە ساڵی دیکەش... بیست ساڵی دیکەش...
جۆرێك لامە لامەکردن و ڕیاییکردن لە قسەکانیدا هەبوو.
حەسەن تێی گەیشت و دڵی خۆش بوو. گوتی:
ـ ئەگەر مانگەکانی بەهار و هاوین بێن... سەیر کە.
جا تیر و کەوانەکەی لە باخەڵی دەرێنا:
ـ ئەوەشم کڕی. با بەهار و هاوین بێنتەوە، بەو تیروکەوانە ئەوەندە پەلەوەر دەکوژم کە...
ئۆمەخان لێی زیاد کرد:
ـ زۆر دەنگێوی، زۆر زۆ...
ـ بە شقارتە ئاگر دەکەینەوە.
ـ ئەمن باڵندەکان چاك دەکەم، دەیانشۆمەوە، خوێی دەکەم و دەیبرژێنم...
ـ دادەنیشین و دەیانخۆین...
تاسە و ئارەزووی خواردنی گۆشتی سووروەوەکراو و بۆنخۆش هەموو گیانیانی تەنییەوە. ئۆمەخان ئاخی هەڵکێشا. حەسەن گوتی:
ـ لێگەڕێ با مانگەکانی بەهار و هاوین بێنەوە. لێگەڕێ با بێتەوە خوشکە جوانەکەم.
وردە وردە سۆز و خۆشەویستییەکەیان بۆ یەکتری دەپشکووت. نە ئۆمەخان ترسەکەی مابوو و نە تووڕەییەکەی حەسەنیش. ئۆمەخان ئەو هەلەی بە دەرفەت زانی و گوتی:
ـ هەر بە ڕاست حەسەن. باسی ئەوەت کرد:
"کە گەیشتینە دارستانەکە..." ئەوە چ بوو؟...
حەسەن پەنجەی بۆ لێوی برد و گوتی:
ـ وست، دەزانی ئۆمەخان. ئەمن زۆر دەترسم... زەندەقم لەوەش چووە کە بۆچی هاتووم.
ئۆمەخان چاوە درشت و ڕەش و قووڵەکانی لە چاوەکانی حەسەن بڕی. ویستی شتێك بزانێ. تێگەیشت چاوەکانی حەسەن پڕە لە ترس. و گوتی:

- ئەمن زۆر دەترسم. زۆر، زۆر...

- بابم، داماوە. ئەویش نازانێ چ بکا....

ئۆمەخان:

- دایکیشم...

حەسەن:

- نەنە مریمۆکیشمان لە هیچ ناترسێ.

ئۆمەخان بە لووتبەرزییەوە گوتی:

- ئەو ناترسێ.

حەسەن:

- گوندییەکان نادوێنێ، بەڵام ئەمن دەزانم، بە دزییەوە قسە لەگەڵ تۆ دەکات. وا نییە درۆیان دەکەم؟...

ئۆمەخان گوتی:

- نە بەخودای. یەك قسە لەگەڵ منیش ناکا. هەر خۆشی دەوێم. لە ڕوانینەکانییەوە دەزانم.

حەسەن:

- جا خۆ ئەوە هیچ نییە. کاتێ تووڕەیە، ئاوا سەیری هەمووان دەکا.

ئۆمەخان کە دەترسا نەکا حەسەن تووڕە بکا، گوتی:

- هەر وا بە سۆزەوە سەیری من دەکا.

بەڵام حەسەن نەیدەویست پەلاماری بدا. ئارام بوو. گوتی:

- لەوانەیە....

ئاخی هەڵکێشا:

- لەوانەیە بە سۆزەوە سەیری تۆش بکا، بەڵام ئەو ناترسێ. بۆی گرنگ نییە بێ یان نەیە...

ئۆمەخان:

- هەر دەڵێی بە دوو دەستان دڵم ڕێك دەگوشن.

حەسەن:

- جارێ با جوان گەرم بینەوە. لای عەسرێ هەڵدەستین پووشکە کۆ دەکەینەوە و بەرەو ماڵ دەبینەوە.

لە دەنگەکەیدا گەرمییەك هەبوو کە ئۆمەخان هیچ خووی پێوە نەگرتبوو.

ئۆمەخان لێوەکانی خۆی گەست و گوتی:
- ئەمن لەو گوندە دەترسم. جۆرێکی لێ هاتووە... هەر دەڵێی گورگ دەوریان داوە.
حەسەن دیسانیش تووڕە بوو و گوتی:
- یانی چی... گورگی چی... باشە پێم نەگوتی؟ تۆ...
ئۆمەخان بە پەلە پەل گوتی:
- نا، حەسەن، نا... مەبەستم ئەوە نەبوو.
دەترسا ئەو ڕێککەوتنە خۆشەیان تێك بچێ.
حەسەن پشتی تێ کرد. لاقەکانی زرد ببوون. قەڵێش قەڵێش ببوون. زەردێکی چلکن... ملی درێژ ببۆوە.

دەتگوت ڕوخساری لە پێستێك پتر هیچی پێوە نییە. پێستێك کە بە ئێسقانییەوە نووسابوو. لێوەکانی تەنك بوون. توێژیان لێ هەڵبببوو. بڕێکیش شین و مۆر ببۆوە. ددانەکانی سپی و درەوشاوە بوون و چاوەکانیشی درشت و ڕەش. پەڵەیەکی باریکی جێ سووتاو بە لا ڕوومەتی چەپییەوە بوو کە وەگ دەمارێك هەتا ملی کشابوو. دایکی قژی سەری قەڵت قەڵت بۆ هەڵپاچیبوو. دەتگوت خوریی بزنە و بە برینگێ بڕیویانەتەوە پۆل پۆل قرژ ببۆوە. قامەکەکانی حەسەن زۆر سەیر درێژ و باریك بوون. لاقەکانیشی هەروەتر...

ئەو ئۆمەخان زۆر لێك دەچوون. دەست و چاوەکانیان و ناسکبوونەکەشیان. ئەوەندەیە لێوەکانی ئۆمەخان گۆشتن و سوور بوون. ڕوخساری کچە، ژاکاو و ماندوو و خەفەتبار و ڕەنگێکی زەردی مەیلە و سپی هەبوو. لێوە سوورەکانی بەو ژاکاوی و بزرکاویشییەوە هەر گەش و درەوشاوە بوون. دەتگوت گوڵێکە و لە نێو ئەو گەڵا زەرد و شەختەلێدراوەدا پشکووتووە.

- لەگەڵ زەردەپەڕدا لە ماڵەوە دەبین. چەند خۆشە.
حەسەن کە لێوەکانی دەلستەوە گوتی:
- چەندە خۆشە... چەندە خۆشە... دایکم چاوەڕێیە. نیگەران دەبێ. دەی با هەر بە پەرۆش بێ.
ئۆمەخان:
- خۆزگە ئەو کابرایە زوو بێ و ڕزگارمان بێ...
حەسەن:
- با بێ و چیی لە دەستی دێ بیکا و نەجاتمان بدا...

حەسەن هاتە تەنیشت ئاگرەکە و تەواو لە نزیکییەوە دانیشت. ئەمجارە لە تەنیشت یەکترەوە نەبوون و بەرەورووی یەکتری دانیشتبوون. جار و بارە، چەند بڵێسەیەك هێندەی چڵە باریکەکانی پووشکەکان و وەك شووشەی سوور هەڵدەستان و دەنیشتنەوە. منداڵەکان چاویان بڕیبووە شکڵی سەیر و سەمەرەی بڵێسەکان.

بڵێسە جۆرێکی دیکەیە. دەسبەجێ دەیگرێ و دادەمرکێتەوە. ئەگەر گوێنی ئاگر بدەی، دەبێ زۆرت کۆ کردبێتەوە بۆوەی هەرکات ئاگرەکە دامرکایەوە قولێکی بخەیتە سەری.

بڵێسەکان لە پرچ و بسکی درێژ و فڕی پەریزادەیەك دەچن. زوو زوو دەگۆڕێن، لەناکاو لوول دەبن و ئەوجار لە نێو خۆڵەمێشەکەدا دادەمرکێنەوە و ڕامێنن. گەلە گۆرگێکن... گورگی پێشەنگ گوێچکەکانی لەمووچەوە بردووە* سەری هەڵێناوە و لەسەر پەنجەی پێی ڕاوەستاوە و لە دوور دەڕوانێ. لە دواوەی گورگەکانی دیکە خۆیان کووڕ دەکەنەوە و خۆیان وێك دێنن و غار دەدەن و دەخەون و هەڵدەستنەوە و ئامبازی یەکتری دەبن.... لە مەیدانی شەڕی گورگەکاندا. هۆپ... گورگی پێشەنگ پشتی وەعەرزی کەوت... چووە کوێ؟ ئێستا... ئێستا خۆی کووڕ دەکاتەوەو خۆی وێك دێنێ و هەڵدەستێ و گوێچکەی لە مووچەوە دەبا، لە بن ڕەوەزەکەوە بەرەو لای پەڵە کەسکەکە مل دەکێشێ. بە زمانی، بە زمانە سپیی بووەکە سەوزاییەکەی ڕەوەزەکە دەلێسێتەوە. دواتر کزە بایەك دێ. بایەك کە دەڵێی سرتەیەکە، لە ناوی دەبا... دوایی گورگی بڵێسەیی، سووتر و باریکتر، تاڵ تاڵ هەڵدەستێ. تێکەڵی گورگەکانی دیکە دەبێ. گورگەکان تێك ئالاون. لە بڵێسەکانەوە دارستانێك شین دەبێتەوە. دارستانەکە دەسووتێ. ئاگر بەربۆتە کێو ڕەوەزەکان و هەموو شتێك بە بڵێسەی بەرز دەسووتێ.

دواتر هەموو شتێك ڕەش دادەگەڕێ، دووکەڵ هەموو وڵات دادەپۆشێ. گورگە بڵێسەییەکان بزر دەبن. دارستانی ئاگرین هەر ئاسەواریشی نییە.

حەسەن ماوەیەك چاوی دەبڕێتە ئەو دووکەڵەی لە بەرماوەی ئاوردووەکە هەڵدەستێ. دووکەڵەکەی بۆنێکی خۆشی لێوە دێ. کە پینچکێکی تەڕ و شێدار دەسووتێ، سەرەتا بۆنێکی تاڵی لێ هەڵدەستێ. دوایی وردە وردە ئەو بۆنەی کەم دەبێتەوە. دواتر کە بڵێسەکان

---

* گوێ لە مووچەوە بردن: گوێ تیژکردنی گیانلەبەر لە کاتی هەست ڕاگرتندا. بۆ بیستن.

دادەمرکێنەوە بۆنی دووکەڵێکی بێخەوش دەدەن. بۆنی دووکەڵی پنچك جۆرێکی دیکەیە و داری کاژ و بەڕوو و سەرو و ئیزگیل و کەنگر، هەرکامەیان بۆنی تایبەت بە خۆیانیان هەیە.

حەسەن لەو پنچکانەی لە تەنیشتی بوون، قولێکی دیکەی خستنە سەر ئاگرەکە، کە دووکەڵی دەکرد. دوو درووە کەنگریشی لەسەر دانان. ماوەیەك دووکەڵ بەرز بۆوە و بەرەو حەسەن هات و چاوەکانی پڕ کرد لە ئاو. ئۆمەخان کە ئاوی چاوی حەسەنی دی، فووی لە ئاگرەکە کرد.

حەسەن هاواری کرد:

ـ فووی لێ مەکە کچێ.

دەنگی زۆر کز بوو. ئۆمەخان وەك گوناحێکی کردبێ ئاوڕی دایەوە و گوتی:

ـ کە دیم دووکەڵەکەی چووە چاوتەوە.. بە دوو فوو ئاگر دەگرێ.

بە تووڕەییەوە لەسەری ڕۆیی:

ـ ئەتۆش گۆڕاوی حەسەن... بەردەوام دەگوڕێنی. ئەوە بۆ وات لێ هاتووە...

نێوچاوانی تێك نا. لاقەکانی کۆکردنەوە بن خۆی و ڕووی لە ئاگرەکە کرد. پنچکەکانی سەر ئاگرەکە قرچەقرچیان لێ بەرز بۆوە. بۆنیان لێ هەستا. لە ناکاو گڕی گرت. بڵێسەیەکی باریك، هەتا نووکی ڕەوەزەکان هەڵکشا. حەسەن گوتی:"ئەوە بوو بە سپیدارێك، سپیدارێکی بەرزی بڵێسە."

هەستا بەسەر گوندەکەدا لە دوور دووری ڕوانی. دەشتەکە بە هەموو سپیاییەکەی خۆیەوە، لە بن تیشکی خۆرەکە و لە ژێر بەفرەکەدا پان ببۆوە. تاقە سپیدارێکی زۆر بڵند، لە چۆڵایی دەشتەکەدا دەشنییەوە، بەڵام زۆر دوور بوو. لە شەبەقی بەیانیدا دەبینرا. کە خۆر لێی دەدا، دەتگوت لایەکی نوقمی ڕووناکییە. کە خۆر بەرز دەبۆوە بڕێك دیار دەبوو لە قرچەی هەتاودا هەر نەدەبینرا و لە نێو تەم و مژ و هەتاودا نوقم دەبوو. حەسەن نەیتوانی سپیدارەکە ببینێ. چون هەموو وڵات نوقی سپیایی و درەوشاوەیی خۆرەتاوەکە بوو.

لە پانایی دەشتە درەوشاوەکەدا، پاناوکێك کە هێندەی دنیا بەرین بوو، دەتگوت دووکەڵێکی خەستی شین باو دەبینی.

لەو سەری دنیاوە، لە نێوان ئەو سپیاییەدا کە دەتگوت حەشرە، کێ ئاگرێکی دیکەی کردبۆوە؟ خۆ لەوێوە دارستانی لێ نەبوو. ئاخۆ پەرییەکان ئاگریان کردبۆوە؟

ئەو بڵێسەیەی هەتا نووکی ڕەوەزەکە هەڵکشابوو، وردە وردە داکشایەوە. لە چاوترووکانێکا ڕێك لە نێوەندەوە برایەوەو هەڵفڕی و ڕۆیی. کە نیوەی سپیدارەکە دەرکەوت، بڵێسەکان بڵاو بوونەوە و دەستیان کرد بە جۆش و خرۆش. ئێستا وەك هەزاران مێروو بە زەوی وەربوون.

مێرووەکانی دوای ئەوەی بە عەرزەکە وەربوون، سوورتر بوونەوە و وەك شووشەی بلوور بریسکانەوە. لە هەر درەوشانەوەیەکدا مێرووی بلێسەکان چەندە زۆر بوون. چۆن دەچنە پاڵ یەك و تێك دەئاڵێن.

حەسەن لەخۆڕا ڕقی لە مێرووەکان هەستا. قولێ پووشکە و سێ دڕووە کەنگریشی لەگەڵیان خستە سەر ئاگرەکە. لەناکاو ئەسپێکی بلێسەیی بە خێرایی لە ئاگرەکە دەرپەڕی. ئەسپێکی گەورە... و سوارێك بەسەر پشتییەوە گرمۆڵە ببوو و خۆی بە سەر یاڵی ئەسپەکە کێشابوو.

حەسەن هاواری کرد:

- ئۆمەخان... سەیر کە... خەریکە ڕادەکا.

ئۆمەخان لەرزی:

- وەی چەنێ جوانە.

لەو کاتەدا ئەسپەکە بە خێرایی لە ئاورگەکە دەرپەڕی و دەرچوو.

حەسەن ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

- ڕۆیی. ئاخ، ماڵ کاول. ئەمن شتی وام قەت نەدیبوو. دەرپەڕی و دەرچوو.

لە چاوترووکانێکا دەرپەڕی و دەرچوو. هەی دایك سەگ، چەندە جوان بوو. ئەی لەو ئەسپە دەتگوت هەڵۆیە. کچێ، یاڵەکانیشی دەفڕین. کلکی لە ئاگرەکە بۆوە و دەرچوو.

ئۆمەخان پێکەنی و گوتی:

- دیسان بلێسە؟ ئەسپی بلێسەیی بوو، ئەی بۆ نەمدی؟

حەسەن گوتی:"

- تۆ ناتوانی بیبینی.

ئۆمەخان:

- بەو قەلافەتەوە کە تۆ هەتە، ئاخری شێت دەبی و وەك "ئەحە شێت"ـت لێ دێ.

حەسەن بە لاقەکانی خاك خۆڵەکەی بردە دواوە و گوتی:

- دەی جا چییە... با وام لێ بێ. بۆ ئەحە شێت خراپە؟ چییەتی؟

ئۆمەخان چووە فکرەوە و گوتی:

- ئاخر شێتە. وا نییە؟

حەسەن گوتی:

- کەس نازانێ. لەوانەشە شێت بێ. تۆ مەترسە. ئەگەر لاساری نەکەی و جوان سەیر بکەی و چاو نەترووکێنی ئەسپ و پەلەوەر و مێروو و چیا و ڕەوەز و بنیادەم و جنۆکەکان... زۆربەیان

جنۆکەن. و بەرییەکانیش... زۆریشیان پەرین... هەر هەموویان لە بلێسەکاندا دەبینی. بلێسە هەموو شتێکی لێ ساز دەبێ. ئاویش، تەنانەت ئاویشی لێ ساز دەبێ. جارێکیان بابم کۆتەرە دارێکی خستە ئاگرەوە. پازدە ڕۆژان لەسەر یەك سووتا. ئەو بلێسانەی لێی بەرز دەبۆوە، وەك ئاو لوورزەوی دەبەست و دواییش پێچاوپێچ بە دەشتەکەدا دەڕۆییشت. وەك ئاوەکانی چوکووراوا....

ئۆمەخان گوتی:

ـ دەزانم، دەزانم... هەمووی یەك بە یەك دەزانم.

حەسەن داهاتەوە و دەستی گرت و گوتی:

ـ ئەتۆ خوشکی منی. مەگەر خوشکم نی؟ خۆ بەکەس نالێی ئەمن ئەسپی بلێسەییم دیتووە؟.. ئەسپەکان و مێرووەکان و پەلەوەرەکانم دیتووە؟ بە خودای درۆیانی ناکەم. هەر هەموویان دەبینم. هەر دەڵێی زیندوون، بەڵام لە بلێسەن... ڕاوەستە و بیانبینە....

هەستا و هێندێك پنچك و پووشکە و چوارپێنج دڕووە کەنگری خستە ئاورگەکەوە و گوتی:

ـ ئەوجارە وەرە جوان چاوت بکەرەوەو بیانبینە. یان ئەسپێ ك دەردەپەڕێ یان سپیدارێك شین دەبێتەوە و هەڵدەچێ.

ئۆمەخان بە کەسەرەوە گوتی:

ـ زۆرم سەیر کرد... زۆرم سەیر کرد، بەڵام هیچی لێ شین نەبۆوە. جگە لەو بلێسانەی وەك پەتك تێك دەئاڵێن شتێکی دیکەم نەدی.

حەسەن گۆڕاندی:

ـ چاوەکاننت بکەرەوە و بیبینە... بیبینە... بیبینە... بیبینە... سەیر کە تاژییەك هەستا، ئەها دەرچوو.

ئۆمەخان بە خەفەتەوە گوتی:

ـ نەمتوانی بیبینم.

حەسەن گوتی:

ـ تف، ئەی چ تاژییەکی جوان بوو. ئەگەر دیتبایەت چەندە جوان بوو.

دیسان لە تەنیشت ئۆمەخانەوە دانیشت و دەستەکانی ئەوی گرتە و بە لاواندنەوەوە گوتی:

ـ خەمت نەبێ، ئەتۆش ڕۆژێك دەیانبینی.

* * *

خۆری دەم زەردەپەڕ، بەسەر چوکووراوادا دەخزی و دەڕۆیی. بێ دەنگ بوون. چووبوونەوە قەپیلیکی خۆیانەوە. حەسەن ئیدی ئەسپ و باڵندە بلێسەییەکانی نەدەدی. هەر دووکیان بیریان لە یەك شت دەکردەوە. لەوانەیە هەر بیریشیان نەدەکردەوە. ترس، پنجی کوتابووە مۆخی ئێسکان و ناخیانەوە و هێلانەی کردبوو. تەنانەت لە هەناسەکانیشیاندا.

کێ بوو؟ چ بوو؟ ئاخۆ گۆڕستانێك بوو لە شەوێکی تاریکدا؟ ئاخۆ بریسکەیەکی ئاسمانەدڕ بوو؟ حەزیا بوو؟ ئاخۆ قەرار بوو بوومەلەرزە بێ؟ یاخۆ قەرار بوو لافاوێکی بە تەوژم بێ و هەموو خانووەکان ڕامالێ؟

ئەو بایەی ڕۆژی پەسلانێ هەڵدەکا... نە شوێنەواری مالێك دەهێڵێتەوە و نە گوندەکە و نە چیاکانیش. ئاخۆ کەسێك دێ و وەك بێشکەیەك ئەو عەرزە ڕادەژێنێ؟ مرێمۆکە پیر دەڵێ چی؟ " لە کۆندا، زەوی، شارێکی لە نێوان چیا پڕ لە بەفرەکاندا قووت دا. بە هەموو خەڵکەکەیەوە، بە خانووەکانییەوە بە دووکانەکانییەوە، بە چووکووراواکەیەوە، بە مەزرای لۆکەیەکەیەوە و بە مێرووەکانییەوە بە ئاوەکانی و بە کێوە بەرزەکانییەوە. هاتن و سەیر دەکەن ئاسەوارێك لە شارەکە نەماوەتەوە.

ئەوەی دەیەوێ بێ، کێیە؟ کەس ناوی ناهێنێ. هیچ کەس نایەوێ ئەویتر بە ترسەکەی بزانێ. وردە وردە هەر ڕۆژێکی بەسەر دادێ، ترسەکە خەستتر دەبێتەوە. تەنانەت سەگەلی ئاوایییش ناوەڕن. دێڵە سەگە زەردەکەی مالی "ئیفلیجەکان"یش ناوەڕێ. ملی بردووەتە بن خۆیەوە و بە نیگای پڕ لە ترس و پرسیارەوە سەیری ڕێبوارەکان دەکا.

ئاخۆ هێلێکی سپیی وەك برۆ بەسەر چاوی باڵندەکەوەیە؟ لاقەکانی ئاخۆ ڕەشن یان سوور؟ ئاخۆ ڕەنگێکی مەیلەوکەسکیان هەیە، کەسکێکی تۆخە؟ یان کەسکێکی شین باو؟ ڕەنگە شینەکەی ئاخۆ لە شینایی ئاسمان ڕوونترە؟ ئاخۆ دەنووکەکەی زۆر درێژ و جوانە؟ هەر دەندووکی ئەو باڵندەیەیە کە چەندی سەیری بکەی لێی تێر نابی و ئەو باڵندە جوانە لە بن تیشکی هەتاودا دەبریسکێتەوە، بەڵام لە ڕۆژە باراناوییەکاندا دەبێتە شینێکی نایاب.

لە ڕابردوودا، لە زۆر زۆر کۆندا، شوێن هەڵگرێك هەبوو بەناوی "یەل وەلی". هەزاران ساڵ لەمەوبەر ژیاوە. ئەو، ئەم باڵندەیەی زۆر خۆش دەویست... لە بەرامبەر خۆی دایدەنا و بێ پشانەوە بەبێ چاوترووکاندنێ، سەیری دەکرد. لە کاتی بارینێدا زۆری سەیر دەکرد. جا چونکە باڵندەکە لە هەوای بارانیدا زۆر جوانتر دیار دەبوو، ناویان نابوو مەلەبارانۆکە.

ئاوێك بە خۆڕ دەڕوا. حەسەن هاتۆتە نێوەڕاستەکەی. ئاوەکە زۆر خۆڕە. خەریکە لەگەڵ خۆی بیبا. ماسییەکان دەڵێی بەسەر ئاوەکەوە باڵیان گرتووە. خۆرەتاوەکە داوێتی لە تەرکی

بنی ئاوەکە. وەك چۆن لە بەفرەکەی ئەو چیایەی داوە، تەرکی ئاوەکە نوقمی تیشکەکەیە. پوولەکەی ماسییەکان چاو بەشەوارە دەخەن. حەسەن پێی دەخلیسکێ و لە نێو ئاوەکەدا دەکەوێتە سەر بەردە درشتەکانی تەرکی ئاوەکەوە، بەلاّم دەسبەجێ هەلّدەستێتەوە.

چاوەکانی سەوزن، لووتێکی قەپۆزبەرانیی هەیە. بە غروورێکی شکاوەوە دەڕوانێ. نەوەی خاوەن زەوییەکەیە، پێستێکی سپیی هەیە. حەسەن وای سەیر دەکا دەلّێی بوونەوەرێکە و لە دنیایەکی دیکەوە هاتووە. ئەویش سەیری حەسەن دەکا. حەسەن کێچی لەکەولّی کەوتووە بۆ دواندنی. قژە سەری بەشانەکراو و زەردە و بریقەی دێ. پێلاّوەکانی برێك تۆزاوی بوونە، بەلاّم دیسانیش بریقەیان هەر دێ. پانتۆلّەکەی کورتە و ئوتووی لێ دراوە. کراسەکەی بێ پەلّەیە و وەك هەور بێ تۆز و گەرد و خاوێنە. شتێکی بە ملی داکراوە و گرێیەکیشی لێ دراوە. حەسەن وەختە لە کونجکۆلّییان بدرێ. خۆزگە توانیبای بیدوێنێ. ئەو هەتیوە شتێکی چۆنە؟ کوڕەش حەسەنی پێ سەیرە. وەك گا چاوی تێوە بڕیوە. ئەگەر بیەوێ شوولکە بەلاّلووکێکی دەداتێ. کوڕە پشتی تێدەکا و هەر وا کە بە نووکە شەق لە گلّمتکەکان دەکا، دوور دەکەوێتەوە. تۆخوا حەیف نییە؟ لەگەلّ هەر نووکە شەقێکیدا دە قۆزاخە لە برکەکان هەلّدەورن. هەر بەڕاست ئەوهەتیوە شێتە؟

چاوەکانی عەلییە درێژ لەترسان زەق بوونەتەوە. حەسەن هەموو گیانی وەلەرزین کەوت. ئای خودایە چ نەهامەتییەك بەسەر ئەو کابرایە دێ؟ بەسەر ئەو گوندە؟ مچورکێکی پێ دا هات و قولێك درووی خستە سەر ئاگرەکە.

ئۆمەخان لە خەیالاّتەکەی هێنایە دەرەوە:

- خۆر خەریکە ئاوا دەبێ. ئەگەر بکەینە تاریکییەوە دایکم شتێت دەبێ.

هەر بە ڕاستیش سەرماکە هەر دەهات و زیادی دەکرد.

- وەبەر تاریکی بکەوین، گورگەکان دێن و دەمان...

حەسەن قەسەکەی لەزاری وەرگرتەوە و گوتی:

- بێدەنگ بە. چما نەمگوت لای من باسی گورگان مەکە؟

مووی لێ بوونە نەشتەر. کچە لەسەری ڕۆیی:

- بۆ ناوی بێنم چییە؟

حەسەن تێی ڕخوڕی:

- بێدەنگ بە، دەتکوژم ها.

دیشان قولێك پووشكە و دوو دڕووی خستەوە سەر ئاگرەكە. دوایی لە بەر ڕەوەزەكە، ماوەیەك ئەو سەرەوسەری كرد. لاقەكانی بە خۆڵەكەدا ڕۆ دەچوون و جێیەكانیان قووڵ دەبوو و شوێنی هەر پێنج پەنجەكەی دەمایەوە.

دوای ماوەیەك هاتوچۆ، بیری لە باڵندە شینەكە كردەوە، دیسان گەڕاوەو لەبەر ئاگرەكە دانیشتەوە و گوتی:

- خورپەیەكم لە دڵی دایە. هیچ حەز ناكەم بگەڕێمەوە ئاوایی.

دەنگەكەی گریاناوی و تۆقیو بوو.

خۆزگە توانیبایان هەزار دانە لەو باڵندەیە بگرن... گۆشتی هەر هەزار دانەكەیان دەخوارد و سەلكەكانیان وەك نەزری قوربان بە سەر دارانەوە دەكردن و لە چوار دەوری ئاوایی دەیانچەقاندن. ئاخۆ دیسان نەهامەتی و بەڵا بەرۆكی ئاواییەكەی دەگرت؟

باشە بۆ كاری وا ناكەن؟ خودا دەزانێ گرتنی هەزار باڵندە زۆر دژوار و ئەستەمە...

لەو شوێنەوەی كەوتبووە ئاوەكەوە... كاتێ تەڕ و خووساو بە چۆڕە چۆڕ دەهاتە دەرێ، لە قەڵشتەكەی ڕووبەڕووی خۆیەوە سێ كونی دیتبوو. دیسان دیتبووی كە لەناكاو باڵندەیەكی بریقەداری باران لە كونێكەوە هاتە دەرێ و لە شەقەی باڵی دا و ڕۆیی.

ئۆمەخان ئاخێكی هەڵكێشا و گوتی:

- ئەمنیش هیچ حەز ناكەم... خۆزگە... بریا دایكم نەگریابا... و شەویش بەسەردا نەهاتبا...

حەسەن:

- برسیشمان نەدەبوو.

- ئەدی، ڕاست دەكەی... خۆزگە هیچ برسیمان نەبایە.

حەسەن:

- خۆزگە ئەو زگە هەر نەبایە.

ئۆمەخان:

- سەیری خۆر بكە... خەریكە ئاوا دەبێ. حەسەن با پەلەی بكەین.

حەسەن ڕاچەنی. غاری دایە نێو لێڕەوارەكەوە.

ئۆمەخان وشكەڵەكان خڕ كەوە. هەم زوو گڕ دەگرن و هەمیش باش دەسووتێن.

حەسەن بەرەو دار بەڕوویەكی بڕێك گەورە چوو و تەورەكەی لە لكێكی وشكی ڕاكێشا. دەنگی تەورەكە گەڕایەوە...

هەوا وردە وردە تاریك دەبوو. بەفرەکە وردە وردە لە درەوشانەوە دەکەوت و سەرماکە پتر دەبوو. لەو بەرەوە، بەسەر دەشتەکەوە، هەورێکی ڕەش دەخوشی و دەهات. بە ڕەنگە ڕەشەکەیەوە، تووڕە و کێوی، لە پێش خۆیەوە ڕووناکایی ئاسمان و سپیایی بەفرەکەی ڕادەماڵی و دەهاتە پێشەوە.

حەسەن گوتی:

ـ خێرا ئەو دارانەی بڕیومن کۆیان بکەوە. خێرابە. با زوو بکەوینە ڕێ. خەریکە دێ.

ترسێکی بێوێنە ناخی حەسەنی داگرتبوو. بە ترسەوە تەورەکەی دادێنایەوە. لاقەکانی دەبرژانەوە و سەرماکەی هەر دەهات و پتر دەبوو.

ـ کۆی کەوە، کۆی کەوە و تەنگەوتێلی دە. کۆگای منیش ئامادە بکە و تەنگەوتێلی دە. دایکم شێت دەبێ.

تاریکییەکەی ناخی هەر دەهات و تۆختر دەبوو و چەندی لە کاتی چوونەوە نزیکتر دەبوونەوە، دەتگوت بەرەو چارەڕەشی و نەهامەتییەکی گەورە دەڕوا.

ئەو باڵندەیە بەو دەندووکە جوانەیەوە... باڵندەیەك لەسەر هەموو لکەکانی دار بەڕووەکە... خۆزگە ئێستا فڕیبایەن.. لەگەڵ هەر تەورێکی دەیوەشاند، لەتە سەهۆڵێکی سەر دارکە بەر دەبۆوە. دارستانەکە بە هەموو دارەکانییەوە، بە هەموو لك و پۆ و گەڵا و ڕەگ و خاکەیەوە سپیاییەکی بەستەڵەك بوو.

ئۆمەخان گورج و خێرا هەموو ئەو وشکەڵانەی حەسەن بڕیبوونی، کۆی دەکردنەوە و چۆڵەپێچی دەکردن. ئەو لکە وشکانەش کە کەوتبوونە عەرزی، ئەوانەیشی کۆ دەکردنەوە.

گوتی:ـ تەواو بوو حەسەن.

حەسەن وەك لە خەوێ ڕاپەڕیبێ ڕاوەستا. بەسپایی و بە لارەلار هات. تەورەکەی لەسەر کۆڵەکەی خۆی دانا.

ـ جوان گرێت داوە؟

ـ جوانم بەستووە.

حەسەن بە نیگەرانییەوە گوتی:

ـ برێك ڕاوەستە. سەیرم نەکەی. پشت لەو لایەکە وا من دەچم. ئاوڕ بدەمەوە و بزانم سەیرم دەکەی، دەتکوژم. هەر لێرە بەو تەورە دەتئەنجنم.

هەر جارێکی دەهاتنە دارستانەکە، ڕێك لە کاتی گەڕانەوەیاندا، حەسەن ئەوەی دەکرد. دەچووە کوێ؟ چیی دەکرد؟ ئەوە ڕاز و نهێنیی ئەو بوو. ئۆمەخان سەرەڕای ئەو ترسەی

هەیبوو، بە سیلەی چاو بە دزییەوە سەیری دەکرد، بەڵام حەسەن لە نێو ڕەوەزە بەردەکاندا لە چاوان ون دەبوو. ئۆمەخان هەر وا بوو...

حەسەن هەر بەو تەورەش ورد وردیشی کردبا، یان ئەگەر تا مردنێش نەیدواندبا، دیشانیش سەیری هەر دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا دەچوو و دەهاتەوە نەیدەتوانی لە جێی خۆی ببزوێ. چ دەسەڵاتی نەبوو جگە لەوەی لەسەر جێی خۆی ڕاوەستێ و وەك بەعەرزەکەوەت دووریبێ، نەبزوێ.... هەر لەو کاتەشدا وەخت بوو شێت بێ بۆوەی بزانێ چییە...

حەسەن بە غاردان خۆی بەسەر بەردەکاندا فڕێ دا و ڕۆیی. دڵی سەیر لێی دەدا. هەرجارێکی دەچووە ئەوێ هەر وا دەبوو. هەموو گیانی تژی دەبوو لە ترس و دڵەڕاوکێ و هەستێکی وەك شادی و ترس پێکەوە.

لەو شوێنە تێپەڕی وا ئاگرەکەیان لێ کردبۆوە. چووە نێو دارستان و ڕەوەزە بەرزەکانی دەتگوت دوورگەن و بەودیویاندا بای دایەوە. ماوەیەك پشتی بە ڕەوەزەکەوە دا و جووڵەی لەخۆی بڕی. دوایی بەردێکی زۆر گەورەی وەك بلێی دەست لەشتێکی زۆر پیرۆز بدا، بەسپایی هەڵێنا. ساتێك سەیری جێی بەردەکەی کرد. لەسەر عەرزەکە چەند مێرووەکی دی کە دەجووڵان. دەتگوت لەوە دەترسێ بەردەکە بشکێ و سێحرەکەی بەتاڵ بێتەوە، بە هێمنی داینایەوە.

کە حەسەن نزیك دەبۆوە، ئۆمەخان بانگی کرد:

ـ حەسەن ئاوڕ بدەمەوە؟

حەسەن بە متمانەبەخۆییەکەوە و شاد وەك ئەوانەی کارەکەی خۆیانیان ڕاپەڕاندووە، گوتی:

ـ ئاوڕ دەوە.

لە پێشدا کۆڵە دارەکەی لە ئۆمەخان هەڵێنا و دواییش هی خۆی هەڵگرت.

خۆر خەریك بوو ئاوا دەبوو. دەبوایە بەرلە ئاوابوونی خۆر لەماڵەوە بن.

ئۆمەخان لە نیوەی ڕێگا گوتی: حەسەن!

ـ حەسەن ڕاوەستا. چاویان لە چاوی یەکتری بڕی. حەسەن گوتی:

ـ بێدەنگ بە.

کەوتەوە ڕێ. ئۆمەخان بە بۆڵەبۆڵ گوتی:

ـ بەڵێنت نەدا کە گەیشتینە دارستانەکە، پێمی بلێی؟ فریوت دام؟

حەسەن بە تووڕەییەکی پترەوە گوتی:

ـ بێدەنگ بە.

# ٢

لە دەوری ئاگردانەکە کۆزیلکەیان کردبوو. مریەمۆك پاڵی وەدیوارەکەوە دابوو و سەری بە سینگیدا شۆڕ کردبۆوە و جووڵەی نەدەکرد. عەلی کە ڕووبەڕووی دانیشتبوو، جار و بارە سەری بەرز دەکردەوە و سەیرێکی ئەو مرچ و مۆنییەی دایکیی دەکرد کە وەك بەرد وشك و ڕەق ببوو.

مریەمۆك وردە وردە سەری بەرز دەکردەوە و وەخۆی دەهاتەوە و متەقی نەدەکرد. هەتا ئەسپەکە نەمردبوو، مریەمۆك یەك پشوو قسەی دەکرد و ماڵەکەی وا پڕ دەکرد لە خۆشی و شادی کەس هەستی بە تێپەڕینی کات نەدەکرد. شەوانی زستان ئەوەندەی شتی جۆراوجۆر دەگێڕانەوە کە هەر تەواو نەدەبوون. ئەو هەمووە حەقایەتە جوان و خۆشەی لە کوێ دێنا؟ خۆزگە لەو ڕۆژە پڕ لە ئازار و خەفەتانەشدا وەك جاری جاران بوایە... خۆزگە وا بوایە.. ئێستا وەك بەرد و دیوار کڕ و بێدەنگە...

لە بانگی خەوتنان چەندی لاداوە؟ چەند؟ کەس متەقی لێوە نایە. منداڵەکان چوونەتە قەپیلکی خۆیانەوە. مات مات دەڵێی خۆڵی مردووت بەسەردا کردوون. ئەلیف جار و بارە تینێکی وەبەر دەهاتەوە و گڕ و تینێکی خۆشی لە ماڵەکە دەگێڕا، بەڵام دوایی دیسان هەموو سارد دەبوونەوە. عەلی نازانێ چ بکا و چ بڵێ.

لە دەرەوە و لە دەشتەکەوە دەنگی لوورە لوور دەهات. ئەو لوورە لوورانە "عەلی"یان شێت دەکرد. ئەگەر وەك جار جاران بوایە، مریەمۆك چیها حەقایەتی لەسەر چەق و لووری ئەو گورگانە دەگێڕایەوە.

دنیاکە خرا ببوو. گوندەکەش گوندە خۆشەکەی جاران نییە. دەڵێی خۆڵی مردووانت بەسەردا کردووە. ئەمساڵ بەفرێکی باش باریوە. بەرهەم و دەغڵ و دان باش دەبێ. باش دەبێ، بەڵام...

عەلی هەولێکی دیکەی دا و گوتی:

ـ دایە، لە دەرەوە گەلە گورگ دەلوورێنن...

مرێمۆک هەر نەشیبیست.

عەلی بڕێك نەرمتر گوتی:

ـ دایە، باشە لەو سەرما و زەمهەریرەدا کە هەموو وڵات بەستوویەتی، ئەو گورگانە چ دەخۆن؟

دەیزانی مرێمۆك لە بەرامبەر باسی "گورگ"ـدا کێچی لەکەوڵی دەکەوێ و خۆی بۆ ڕاناگیرێ. زۆر شتی خۆشی لە سەر گورگان پێیە. عەلی دەیویست لەوسەری بێتەوە. هەوڵی دەدا دەماری مرێمۆك ببزوێنێ. خۆزگە مرێمۆك قسان بکا تەنانەت ئەگەر لەگەڵ ئاگری کوانووەکەش بووبێ یان هەر لەگەڵ ئەو بڵێسانەی هەڵدەستن و دەکشێن، یان لەگەڵ ئەو کولانکەیە... هەر قسەیەك بکا... هەر قسە بکا جا چیی پێ خۆشە با بیڵێ...

بەڵام باسی گورگ و مورگیش وەقسەی نەهێنا. عەلی دوایین فێڵ و گزەی خۆی بەکار هێنا. دەیزانی ئەگەر بەو جۆرە قسان نەکا ئیدی هەتا مردنێ زمانی لە زمانی کەس ناگەڕێ. گوتی:

ـ دایە... دەڵێن مام خەلیل نەمردووە... هێشتا گوندی لە چوکووراوا بوون کە ئەو گەڕاوەتەوە ماڵەوە و خۆی شاردۆتەوە... کوڕەکەی کە دەرگای ماڵەوەیان دەکاتەوە بە سەرسووڕماوییەوە دەبینێ مام خەلیل لە ماڵەکەیاندا خەوتووە... "ئەو مەولوودەشی" بۆی کردبوو لە ترێ سەی چووە... وا نییە دایە؟... ئەتۆ بۆ خۆت دەتگوت ئەو مام خەلیلە نامرێ. ئەتۆ ئاگات لە هەموو شتێ هەیە... هەر بە ڕاستی پێت وایە بۆچی مام خەلیل نایەتە دەرەوە؟ وەك دەڵێن خۆی بە شەرمەزار ی گوندییەکان دەزانێ کە درەنگ بردوونی بۆ لۆکە ڕنینەوە و سەرگەردانی کردوون. دەشڵێن لەوەش دەترسێ کە گوندییەکان بیگرن لەتوپەتی بکەن. بە کوڕەکەی گوتووە:"ئەگەر گوندییەکان بزانن هاتوومەوە یان تۆ بچووکترین هەواڵێکیان بدەیەی، ئەمن سەری خۆم هەڵدەگرم و دەڕۆم." وەك دەڵێن گوتوویەتی:"بێت و ئەو گوندییانە بم بینن، بێ سێ و دوو لەتوپەتم دەکەن." کوڕەکەشی سوێندی بۆ خواردووە کە "گڵێش لێم نابیستێ کە تۆ لە ماڵەوەی." ئەگەر زانیت ئەو قسانەم لە کێ بیستووە؟ "نەنە زەڵە". ڕۆژێکیان دەچێتە ماڵێیان و دەبینێ ئەوە مام خەلیل لەوێیە. "خەلیل" خۆی دەخاتە سەر پێڵاوەکانی زەڵە و لەبەری پاڕاوەتەوە کە"بە کەس نەڵێی... ئەمن نیم... ئەمن مردووم...." و دەسبەجێ خۆی خستووەتەوە ئەمبارەکە و خۆی شاردۆتەوە... ئەدی دایە گیان ئاوا بووە دایە....

مرێمۆك هەر جووڵەیەکیشی نەکرد...

دەشتەکە دەنەڕێنێ. ئەو پووشکە و چرپییەی حەسەن و ئۆمەخان هێنابوویان، قرچە قرچ دەسووتێن و ماڵەکە پڕ دەکەن لە بۆنێکی نەرم و نیان.

دیوارەکەی پشتەوەی ماڵەوەیان پشتی بە کەندی گردەکەوە بوو. دیوارەکەی پێشەوەشی بە بەرد و قوڕ هەڵچنرابوو. بە داری بەڕوو دارەڕایان کردبوو. ماڵێکی پتەو بوو، بەڵام لە باپیرەی بابی عەلییەوە بەمیرات بۆیان مابۆوە. لە باهۆز و تۆفانی لەو چەشنەدا عەلی دەترسا ماڵەکەیان بەسەردا کاول بێ، بەڵام دەشیزانی کە بە زستان ناڕووخێ. چون لە قوڕ و بەردەوە بیگرە هەتا دەرك و دیوارەکەی هەمووی بەستوویەتی. ماڵەکان لە بەهاراندا و لە کاتی توانەوەی بەستەڵەکدا دەتلیسانەوە.

ماڵەکە دەلاقەیەکی هەبوو هەر دوو قولانج دەبوو. ئەو دەلاقەیەش قەت نەدەکراوە. لە گۆشەیەکی دیکەی ماڵەکەوە لە تاریکاییەکەدا مانگایەك و سێ بزنیان بەستبۆوە. لە گۆشەیەکیشەوە تفاق و کایان هەڵدابۆوە. ماڵەکە سارد بوو. ئەو ماڵانەی مانگا و مەڕ و ئەسپ و بزنیان زۆر بوو، گەرمتر بوون. ماڵەکان بە هاڵاوی هەناسەی ئاژەڵەکان گەرم دادەهاتن. چارەوی زیاتر بۆ گەرمکردنەوە باشن. ئەگەر ئەمساڵ بتوانن مەزرایەکی بەپیت بۆ لۆکە چینینەوە پەیدا بکەن، عەلی نیازی وایە مانگایەك و پێنج بزنی دیکەش بکڕێ و منداڵەکانی لەو سەرما و سەخڵەت و لێوەلەرزەیە ڕزگار بکا. گوتی:

ـ دایە، ئەمساڵ لۆکە زۆر دەڕنینەوە. بەفرێکی باش کەوتووە و دەغڵ و دان باش دەبێ. پێنج بزن و چوار مانگای دیکەش دەکڕم. بۆ گەرم داهێنانی ئەو ماڵە لێشمان سەروزیادە. وا نییە؟...

مرێمۆك وەك دار و بەرد متەقی لەخۆی بڕیبوو. بیر لە چی دەکاتەوە؟ ئەو مرێمۆکەی بەر لە مردن خۆی وەك مردووان لێ کردووە. مرۆڤ ئەگەر قسان نەکا مردووە. ئەو مرێمۆکە ئێستا فەرقی لەگەڵ مردووان چییە؟

کوێخا چووە و قسەی لەگەڵ کردووە. ئەو بە کوێخای گوتووە:"بەم زووانە دێمە ئاوایی و بەرە و ڕاخەری بن قوونیان دەردێنم و مانگاو بزنی ماڵیان و ڕۆنی نێو کوپە و تەنانەت نێوفەکی ژنەکانیشیان دەبرم و دەیبەم. خەڵکی گوندەکانی دیکە بە هەر شێوەی بوو قەرزی خۆیانیان دایەوە. ئەوان گوندین و ئێوە نین؟ ئێوەش وەك ئەوان چوونە چوکووراوا. ئەوان لۆکەیان ڕنییەوە و پارەیان وەرگرت. ئەی ئێوە بۆچی وەرتان نەگرت؟ ئێوە درۆیان دەکەن. لەمەودوا-

قوزەڵقۆرتیشتان بە قەرز نادەمێز چاوەڕێ بن. بەو زووانە دێم. ئەوە بۆ سەت ساڵ دەچێ ئەو خەڵکە ساتوسەودایان لەگەڵ ئێمەیە. لە زەمانی باو باپیرە گەورەمەوە. ئەوە یەکەم جارە خەڵکی گوندێك دوای گەڕانەوەی لە چوکووراوا قەرزی خۆیان نەدەنەوە. ئەوە یەکەم جارە نایەنەوە بەر دەرکەم. با بزانم ئەو گوندییانە چۆن لە ڕوویان هەڵدەیێ چاو لە چاوم بکەن. ئەگەر ئەو دنیا کاول نەبێ ئەمن پشتی دەستەکانی خۆم داغ دەکەم. ئێوە خەڵکی گوندی "یالاك" بۆ یەکەم جار ئاد و پەیمانێکی کۆنتان شکاند. سبەی ڕۆژێ کە دەچنە چوکوور و گوندەکەتان چۆل دەکەن، ئەگەرْ دە کەس هاتن و تالانیان کرد و ماڵەکانیشیان لێ سووتاندن پێتان سەیر نەبێ، ئەوە ئێوەن کە بۆ یەکەم جار ئاد و بەڵێنتان شکاندووە. ئەوە ئێوە بوون لەو چیایانەدا تۆوی خراپەتان چاند."

عەلی سەری هەڵێنا و گوتی:

ـ ئەدی دایە... ئاوا...

مرێمۆك خەیاڵ هەڵیگرتبوو. گوێی لە لوورەی گورگەکان هەڵدەخست. لە ناکاو هەموو گیانی لەرزی. سەری هەڵێنا و سەیرێکی عەلیی کرد. دوایی دیسان سەری بە سینگیدا شۆڕ کردەوە. لە بەنجەرەوە دەنگێك هات:

ـ عەلی، عەلی، دەرگا بکەوە.

ـ ئەوە تۆی تاشباش ئۆغلو؟

دەنگەکەی دەرەوە گوتی:

ـ ئا، منم.

عەلی هەستا و دەرگاکەی کردەوە. هەر لەو کاتەدا دڵی لە شتێك ترسا. تاشباش بەو شەوە بۆ کارێکی سادە نەدەهاتەی لای ئەو. دیارە شتێك قەومابوو. خودا وەخێری بگێڕێ.

ـ دەنگ و باس چییە براله؟

تاشباش ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ خەبەری ناخۆش. عادیل ئەفەنی ئەوە دێ.

لەسەر جێیەکەی ئەلیف کە هەستابوو دانیشت و پرسی:

ـ ئەتۆ چۆنی نەنە مرێم؟...

مرێمۆك هیچ گوێی نەدایێ. هەر متەقیشی نەکرد.

تاشباش بە سەرسووڕماوییەوە پرسی:

ـ عەلی، ئەوە نەنە مرێم هەر قسان ناکا؟

عەلی بەسەر گوتی: نا.

بە دەنگێکی شەکەت و مردوو پرسی:

ـ کەنگێ دێ؟...

ـ کەس نازانێ. دیار نییە. لەوانەیە هەر ئێستا پەیدا بێ.

عەلی:

ـ ئەی چ بکەین؟

تاشباش:

ـ ئابڕوو و حەیامان چوو. خۆ ئەگەر کاتی چوونمان بۆ لۆکەچنینێ، بێت و خاکی ئەو گوندەی بە توورەکە بکێشێ بۆمان نییە یەك قسەش بکەین. خۆمان بە خۆمانمان کرد. ئێمە ئاد و بەلێنەکەمان شکاند.

عەلی:

ـ ئەدی، ئێمە شکاندمان. هیچ هەقمان نییە.

ـ ئەی چۆنە بچینە لای و پێی بلێین:"کوڕە عادیل ئەفەنی، کارە و لە پیاوان قەوماوە. مەزرایەکی خراپمان بە نەسیب بوو. جگە لەوەی درەنگ گەیشتینە چوکوور. سالی دادێ دوو بەرانبەری بستێنە."

عەلی:

ـ تۆ پێت وایە قبوولی بکا؟

ـ خۆزگە قبوولی بکا و لە کن خەلك و خودا ڕوو زەردمان نەکا و ئەوەندەشمان بە ڕوودا نەداتەوە کە:"ئێوە بوون نەریتەکەتان شکاند..."، بەلام چاوی سوور بووە. گوتوویەتی:"بوومەلەرزە لەو گوندەی دەدا. لافاو دەیبا. ئەو گوندییە بێ دین و ئیمانانە بەردیان لێ دەبارێ." گوتوویەتی:"مار بەو گوندەی وەردەبن و داگیری دەکەن... هەر هەمووان وەك ئەحە شێتۆکە، شێت و فێدار دەبن."

عەلی بە دلەڕاوکێوە پرسی:

ـ دەی باشە چ بکەین. ئەتۆ فکرت بۆ چی دەچێ؟

تاشباش:

ـ فکری چی. ئەمسال نەمانتوانی بچین گەزە جاوێك بکڕین. ژنەکەی من ڕووت و قووتە. ناتوانێ لە مالێش بێتە دەرێ.

عەلی:

- هەمووان ئاوان. هەموو گوندەکە.

تاشباش ئۆغلۆ:

- دوو کەس ئەو گوندەیان بەو دەردە برد: "یەکێکیان کوێخا سەفەر" و ئەوی دیکەش مام خەلیل...

کە ناوی مام خەلیلی هێنا، مرێمۆك سەری هەڵێنا. لێوەکانی لەرینەوە. دەتگوت دەیەوێ شتێ بڵێ، بەڵام لەوێی کردەوە.

تاشباش ئۆغلۆ لەسەر قسەی خۆی ڕۆیی:

- هەر بەراست ئاگاتان لێیە مام خەلیل نەمردووە؟... بەر لە ئێمە گەڕاوەتەوە ئاوایی و لە کادێنەکەی...

عەلی قسەکەی لە زاری وەرگرتەوە و گوتی:

- ئاگادارم...

## ٣

مام خەلیل جێویانەکەی خۆی لە عـەمباریٚ ڕاخـستبوو. بەشـەو نەبایـە وەدەر نەدەکـەوت. ئەویش کە تەنگاو بایە و ناچار بایە دەستیٚ بەئاویٚ بگەیـەنیٚ. ئـاوا نەبایـە، شـەو و ڕۆژی لـەو عەمبارەدا دەژیـا. دەکـریٚ بلێـی ڕووناکـایی نـەدەدی. هـەر جـارێکی دەرگـای دەکرایـەوە ئـەو نیوەعومر دەبوو و لە ترسان دەخزییە قوژبنێکەوە و مات دەبوو. دەتگـوت بـڕوای کـردووە کـە گوندییەکان بە ڕاستی گەرەکیانە بیکوژن بۆیە گوێی بە قسەکانی کوڕەکەی نەدەبزووتن.

کوڕەکەی دەیگوت:

ـ بـابە، ئەتۆ هیچت لەو خەڵکە نەکردووە... هەرچی کرا، کوێخـا کـردی... ئـەو گوندییـەکانی ماتڵ کرد و وەدرەنگێی خستن... ئەوە ئەو بوو ئـەوانی بـردە مـەزرای بـیٚ حاسـڵ... خـەڵك کاریـان بەسەر تۆوە نییە. کوڕە هەر تاقە یەك جار وەرە دەریٚ بزانە. ئەگـەر خەڵکەکـە پێیـان گـوتی پـشتی چاوت برۆیە، ئەو کات وەرەوە و خۆت حەشار بدە و ئیدی قەت مەیەوە دەریٚ.

مام خەلیل وەڵامی دەدایەوە:

ـ ئەتۆ نازانی. ئەتۆ هێشتا منداڵی. ئەتۆ ئاگات لە فرت و فێڵـی گونـدییان نییـە. ناچـارم دەکەن بێمە دەریٚ و جا ئەوکات دەڵێن ئەها ئەوەتا دوژمـنی خۆمـان دۆزییـەوە و جـا لـەتوکوتم دەکەن. ئەتۆ ئەو شتانە نازانی... ئەتۆش یەکێکی وەك ئەوان. مەرگم بە ئاوات دەخوازی. چما پێت وایە ئەمن بە مەکر و فێڵیٚ ئەنگۆ نازانم؟...

ـ بابە، وەڵڵا تێك چووی. ئاخرییەکەی لەو عەمبارەدا دەڕزێی و دەتولێیەوە. کەیفی خۆتە. حەز دەکەی هەر مەیە دەرەوە.

مام خەلیل دەیگوت:

ـ لێرە دەمرم و نایەمە دەریٚ. و لێفەکەی بەسـەرخۆی دەکێشا.

لەو دواییانەدا هێندێ شتی بیستبۆوە. لە گوندەکەدا ترس و جموجۆڵێك هەست پـێ دەکـرا. کوڕەکەشی ترسێکی بە نێوچاوانەوە بوو.

لەحزەیەك سەری لە عەمبارەکە هێنایە دەرەوە و بانگی کوڕەکەی کرد:

ـــ وەرە کـوڕم، وەرە. ئـەتۆش پـەرۆش و نیگـەران دیـاری. بـۆ دەیانـەوێ تـۆش بکـوژن؟ گوندییەکانیش نیگەران دیارنم. قەرار وایە ئەوانیش بکوژن؟ کێ دەتانکوژێ؟ پێت وایە بەردیان لێ بباریێ؟ یان گوندەکە کاول بێ؟ گوێبیستی هێندێ شت بوومە.... ئـەی ئـەمن چـیم بەسـەر دێ؟ ئەوانە هەر لەبەر من وا دەکەن. بۆ کوشتنی من. چ بەڵایەکمان بەسەر دێ؟

کوڕەکەی پاڵی وەدیوارەکە دا و دانیشت و یەك بە یەك ڕووداوەکانی بۆ گێڕایەوە. قسەکەی خۆی ئاوا تەواو کرد:

ـ کێشەکە لێرە دایە. عادیل ئەفەنی ئەمڕۆ یان سبەی دەگاتە ئێرە.

مام خەلیل بڕوای نەکرد، بەڵام دیسانیش تروسکەی هیوایەکی لەدڵ گـەڕا و ئـاوڕژێنێکی دڵـی کرا. کەوابوو هیوایەك هەیە بۆ ڕزگاربوون. لەوانەبوو خەڵك لێی خۆش بن. ئەگینا ئەستەم بـوو. ئـەو خەڵکە دەیانکوشت. تەنانەت نەشیان دەگوت پیر و کەنفتە. دەیانخنکاند. بە کوڕەکەی گوت:

ـ ڕۆڵە گیان ئەمن دەمزانی ئەو خەڵکە نیگەرانی شتێکن... بەڵایەکی گەورە بەسـەر سـەریانەوە دەسوورێتەوە. ئەوانە نەریتیان شـکاندووە. ئیـدی ڕێگەیـەك نییـە بـۆ ڕزگاربوونیـان. تـەنیا یـەك ڕێ هەیە. لەوانەیە مام خەلیل بتوانێ ڕێیەك بدۆزێتەوە کە هەر هەمووان پێیان سەیر بێ. ئەگەر بـەڵێنم پێ بدەن نامکوژن، ئەمنیش ئەو نیگەرانییەیان لەکۆڵ دەکەمەوە، بەڵام بەو خەڵکە مەڵێ ئـەمن لـە گوندێم. چونکە بەر لەوەی بتوانم کارێکیان بۆ بکەم لەتوکوتم دەکەن.

ـ ئەرێ بابە ئەوە شێت بووی؟ کێ دەیەوێ تۆ لەتوپەت بکا؟

ـ ئەتۆ جوان گوێ بدە قسەی من. تۆ نازانی. هێشتا منداڵی. عەقڵت پێی ناشکێ.

ـ بابە، ئەوە شێت بووی؟ چەندە منداڵی. ئەمن ئەوە تەمەنم شێست ساڵە.

کە کوڕەکەی وای گوت، مام خەلیل ساتێك ڕاوەستا و چووە فکرەوە و گوتی:

ـ نا، نا، ڕۆڵە تۆ هێشتا بـۆنی شـیری خـاوت لـە دەمـی دێ. بەتایبـەتی ئاقڵـت بـە کـاری گوندییەکان ناشکێ. ئەگەر پێیان بڵێی ئەمن لێرەم...

کوڕە لە زاری دەرپەڕی:

ـ دەزانن.

ـ مام خەلیل لە ناکاو گوڕاندی:

ـ تێداچووم. ئێستا دێن. دەرگاکە داخە. خێرا گاڵەی دە. دەی زوو، هەستە خێرا...

دەسبەجێ لە قوژبنی عەمبارەکەدا لێی درێژ بوو و لێفەکەی بەسەرخۆی کێشا. وەك بیی نێو ئاو دەلەرزی.

ـ ئەتۆ بوویە قاتڵی من... قاتڵی من. دەرگاکە داخە... خێرا دەی زوو...

کوڕەکەی وەیزانی بە ڕاستی بابی شێت بووە. دەستی ڕاستی بە نیشانەی وەڕەزی ڕاوەشاند و چووە دەرێ. لە بەر دەرگاکە بە لەبزێکی تەوساوییەوە هەرای کرد:

ـ ئەوە دایدەخەم... دایدەخەم. بۆخۆم لێرە ئێشك دەگرن و ناهێڵم کەس بێتە ژوورەوە.

مام خەلیل دەینالآند و دەیگوت:

ـ ئاخ خ خ خ، ئاخ خ خ ... ئەو کوڕەی منی بە کوشت دا.... ئەو کوڕەی وەك گلێنەی چاوی خۆم خۆشم دەویست و گەورەم کرد. ئەو کوڕەی کە لە زاری خۆمم گێڕاوە و بە دەمی ئەوەوەم کرد و کۆك و پۆشتەم کرد، کوڕەکەی خۆم کە سەری بە فەتەرات دام. کوڕەکەم کە ماڵ کاولی کردم...

مام خەلیل چاوەڕێ بوو. هەر دەنگ و خرتەیەکی گوێی لێ دەبوو، دڵی دادەخۆرپا و دەلەرزی و دیسان هەر چاوەڕێ بوو: ئێستا نا ئێستا دەگەنێ. هەر هەموو گوناحەکان بەستۆی ئەودا دێنن. هەر لە کوێخاوە بگرە تا دەگاتە دوایین گوندی، هەر هەموویان سووچ و تاوانەکان دەخەنە ئەستۆی ئەو و دوای ئەوەی کوشتیان بە عادیل ئەفەنیش دەڵێن:"بمانبوورە عادیل ئەفەنی، ئەوە تاوانباری سەرەکیمان کوشت." ئەگەر ئەو مام خەلیلە نەبوایە چما ئێمە تووشی ئەو نەهامەتییە دەبووین؟

دوو هەستی جیاواز و لێك دژ لە ناخی مام خەلیلدا شەڕیان بوو:"یەکەم مەرگ.. و جا زۆریش لە مەرگ دەترسا. جەستەی لە خوێن شەلاڵی خۆی دێنایە پێش چاوی. هەر لەتێکی جەستەی بە دەستی یەکێك لەو کەسانەوە بوو کە هاتبوونە بەر دەرگای و ئەو دیمەنە لە پێش چاوانی لا نەدەچوو. وەبیری دەهاتەوە کە لە ڕابردوویەکی زۆر دووردا، ڕۆژێکیان ژنان لە چوکووراوا کۆ ببوونەوە و ئاغایەکیان بەردباران کردبوو و کوشتبوویان. ژنەکان دەتگوت هار بوون. دەتگوت دێڵە سەگی زامارن. گوندییەکان بە ڕۆژی ڕووناك ئاغایەکیان کوشتبوو، چۆن مام خەلیل ناکوژن؟."

لە لایەکەوە لە ناخی خۆیدا هەستی بە مەزنی و گەورەیی دەکرد. گوندییەکان تەنانەت بۆ کوشتنی کوێخا سەفەریش ئاوا گەلەکۆمەکییان نەدەکرد. جا سەفەر کێیە؟ منداڵی دوێنێیە..،

بەڵام مام خەلیل هەزار دەرگای بە قوون کردبۆوە. کابرایەکی دنیادیدە بوو. ئەو جار، سەردەستەی چەتە و ڕێگرەکانی ئەسلان ئاغاش بوو. هەم دەترسا و هەمیش سات بە سات چاوەڕێ بوو دەرگاکە بکەنەوە. لە پێش هەمووانەوە مریەمۆك وەك سەی هار و بە سەر و قژی قرژبۆوەیەوە بێ و هەرا بکا:"لێی دەن ژنەکان. ڕۆژ ڕۆژی تۆڵەیە. لێی دەن برادەرینە. لێی دەن کوڕینە. ئەو کافرە لەتوکوت بکەن. ئەو سەگبابە هیچ و پووچەی گوندەکەمانی تووشی نەهامەتی کردووە و بە چوار کتێبان خوێنی حەڵاڵە. لێی دەن، لێی دەن..."

مام خەلیل ئاخێکی توندی کێشا و گوتی:"

ـ ئاخ مریەمۆك، ئەو ڕۆژانە ڕابردن. ئەگەر لەبەر دڵی ئەو برایە نازدارە نەبایە، بۆخۆم دەزانم چم لێ دەکردی، ئاخ مریەمۆك.

لە ئێوارەیەکی پاییزیدا لە چیغشارەوە دەهاتە خوارێ. گەڵای دارەچنار سوور داگەڕابوون. هەتاو لە پشتەوە لەو سوورایییەی دابوو... جار و بارە لە نێو ترس و خۆف دا، ئەو دیمەنەی دەهاتەوە پێش چاو. نەیدەزانی بۆ. ئاوێك بە خوڕ دەڕۆیی. گەڵای سوور ئاوەکەیان داپۆشیبوو. ئاو نەبوو، سوورە گەڵای دارەچنار بوو کە بەرەو خوار دەکشان. لە گوندەکەی گوگسۆنی سەروو، ئەسپێکی شێی ئاڵی دزیبوو. ئەنگی ئەسپەکە و گەڵای دارەکان لێك دەکاڵانەوە. ئەسپەکە لە بن ڕکێفانیدا باڵی گرتبوو و دەفڕی. لە ناکاو ئەسپەکە سڵەمییەوە. ئەگەر خووی بەو کارانەوە نەگرتبایە، لە بن سمی ئەسپەکەیدا هەپروون بە هەپروون دەبوو. لە نێو نزارەکەدا کابرایەکی سەروچاو خوێناویی دی. بە ناڵە ناڵ بەرەو لای جادەکە دەکشا. لە ئەسپەکەی دەبەزی. کراسەکەی خۆ دڕاند و برینی کابرای پێچا. سواری تەرکی خۆی کرد و وەڕێ کەوت. کابرا گوتی:"مەمبە شاران و لای حەکیمان. ئەمن "مەمۆ"م. سەرکردەی یاغییەکان. ئەویش کابرای بردە ماڵەکەی ئەسلان ئاغا و لەوێی دانا و گوتی: ئەوەش برامە. هەتا برینەکەی چاك دەبێتەوە چاوتان بەسەرییەوە بێ. بە ئەنگۆم ئەسپارد."

ئێستا داوێنی چیای تەکەچ بەفر گرتوویە. ئەوێ ئەشکەوتێکی لێیە. دەبێ هەستێ و بچێتە ئەوێ. ئاگرێك بکاتەوە و کاوڕێك سەر بڕێ. ئێستا بێچووە ئاسکەکانیش گەورە بوون.

مەمۆ، گورگی دڕندەی کوێستانان بوو. ئەگەر مام خەلیل ڕایسپاردبا، تەنانەت دوژمنی قەستەسەری خۆشی بایە دەیبەخشی. ئەگەر نەمردبا و مابایە... ئەگەر مابایە، بەو گوندییانەی دەگوت پووتێك چەند کیلۆیە...

دیارە خەڵك لە گوندێ کۆبوونەتەوە و هاوار دەکەن:"وەرە دەرێ مام خەلیل، وەرە دەرێ بێ کافری بێ دین... وەرە دەرێ بێ ئیمان، دوژمنی خەڵك...

چما مام خەلیل لەوانەیە دەرگا بکاتەوە؟ با بیشکێنن. برێك دواتر گەورە و بچووك، کچ و کوڕ و لە پێش هەمووانیشەوە ئەو مریەمۆکە نارەسەنە، هوروژم دکەنە سەر دەرگاکە. دەرگاکە بە قرچوهۆڕ دەشکێ و دەکرێتەوە. لەتوکوتەکەی دەکەوێتە سەر عەرزەکە. حەشیمەتەکە خۆی بە عەمبارێدا دەکەن و بە هاوار و دەنگەدەنگ. لە ناکاو دەکشێنەوە. دەیانەوێ ڕا بکەن. لە ترسا بەسەر یەکدا دەکەون. لە بەردەرگا ڕۆژی حەشرە. چ بووە؟ لەگەڵ کرانەوەی دەرگاکە سێ نوولەی تفەنگ بەرەو سینگیان دەبینن. ڕێك سێرەیان لە سینگیان گرتووە. سێ یاغیی بە فیشەك لغەوە لەگەڵ مەمۆی سەرکردەیان.

مام خەلیل هاوار دەکا:"تەقە بکە مەمۆ. تەقەیان لێ بکە لەو گوندییە بێ شەرەفانە. چما تۆ برای من نی؟ تەقە بکە مەمۆ، مەمۆ پێدەکەنێ و دەڵێ:

- بەبێ تەقەش گوویان بەخۆدا کرد. نیوەیان لە ترسان دڵیان دەتۆقێ. تۆخوا فیشەك حەیف نییە مام خەلیل؟

دوایی دەچێتە نێو گوندەکە. سینگی ڕەپ دەکا، ئەو سەر ئەوسەری دێیەکە دەگەڕێ. گوندی دەیانەوێ قسەیەکی بکەن:"مام خەلیل لێمان خۆش بە... مەماندە یاغی بمانکوژن...

دەرگاکە کرایەوە. مام خەلیل ڕاچڵەکی و گوێی هەڵخست. کوڕەکەی گوتی:

- بابە مەترسێ ئەمنم.

مام خەلیل کە دڵی وەك باڵی چۆلەکە فڕەی دەهات گوتی:

- خودا بتباتەوە. باب کوژ، ئەتۆش وەك ئەو گوندییانە بێ دین و بێ ئیمانی.

جا پرسی:

- عادیل ئەفەنی قەرارە ئەمڕۆ بێ؟

- نا بابە، دیار نییە کەنگێ دێ.

- هیچ جموجۆڵێك لە نێو گوندییەکاندا هەیە؟... ئاخۆ دەتوانی بەبێ ئەوەی کەس بمبینێ هەڵمگری و بمبەیتە داوێنی چیای تەکەچ و لە زارکی ئەشکەوتەکە دامنێی؟

- بەفر و بۆرانە بابە. بارنە. زستانە. چیای تەکەچ سەهلە، پیاو شەقاوێك دوور کەوێتەوە ڕەقەڵدێ و دەمرێ.

- ئەتۆ بمبە ئەوێ، بمبە ئەو ئەشکەوتە... هاوڕێی گیانی بە گیانیم مەمۆ...

بەهێنانی ناوی مەمۆ بریسکەیەك لە دڵی گەڕا و لەسەری ڕۆیی:

- ئاخ، ئەگەر ئێستا ئەو دەبوو... ڕامدەسپارد هەموو ئەو گوندیانە بداتە بەر فیشەك...

- ئەریٚ ئەوە شێت بووی بابە؟ کوڕە گوندی هەر وەنازانن تۆ هەی یان نی. ئەوان دەرد و کوێرەوەری و قوڕبەسەریی خۆیان هەیە. چکاریان بە تۆیە. بچۆ دەریٚ و بە ئاسوودەیی پیاسە بکە. هەر کەس بتبینیٚ دەستت لە ئەستۆی دەکا. ئەو دەمەی تۆ لە چوکووراوا بزر بووی و مەولوودەکەم بۆ کردی، هەر هەموویان بۆت دەگریان. چما بۆم نەگێڕایەوە؟

مام خەلیل قیت بۆوە. هەر لەگەڵ ئەوەی ترووسکاییەك لە عەمبارەکە گەڕا چاوەکانی قیچ کردن. ماوەیەك گێژ و وێژ سەری ڕاوەشاند و دەستی کرد بە هات و هاوار:

- هەتیوە، هەتیوە چڵمنە. یانی گوندییەکان ئەمنیان پیٚ بەشەر نییە؟ چما ئەمن نەبووم ئەوانم درەنگ بردە لۆکە ڕنینەوە؟ چما ئەمن نەبووم ئەوانم قەرزبار و ماڵ وێران کرد؟ چما لە سۆنگەی منەوە نەبوو، کە ئەوان برسی و ڕووت قووت و لێقەوماو بوون؟ برسی و ڕووت و قووت کەوتنەوە؟ ئێستاش ئەگەر بچمە دەرەوە چما نامکوژن؟ لەتوکوتم ناکەن؟ چما تۆ شێت بووی حاجییە چڵمن؟ یانی دەڵێی گوندییەکان ئەمنیان پیٚ هیچ نییە؟ بەبنیادەمم دانانێن؟ کورم، ڕۆڵە، کە هەر لە زاری خۆمم گێڕایەوە و بە دەمی تۆمەوە کرد. بۆخۆم ڕووت و قووت گەڕام و تۆم کۆك و پۆشتە کرد، هەتیوە کەرە چڵمنەکەی خۆم. ئاخ، ئاخ لە دەست تۆ. یانی ئەتۆ کوڕی ئەو مام خەلیلەی کە دەتگوت هەڵۆیە؟

ساتێك بیٚ دەنگ بوو. حاجی بزەی دەهاتیٚ.

- سەرمامە. سەرمامە. بڕۆ لێفەیەکم بۆ بێنە. بەو ژنە قەحپەیەت بڵیٚ ترخێنەیەکی خۆش وەسەر بنیٚ. بەر لەوەی بمرم با ترخێنەیەکی خۆش بخۆم.

- ئاخری گوتت کوێت دێشیٚ.

حاجی باش دەیزانی هەموو ئەو هات و هاوارە بۆ چییە. دەیزانی هەمووی بۆ ترخێنەیەکی گەرم و خۆش و بەهاڵاوە. ئاش لە خەیاڵێك و ئاشەوان لە خەیاڵێك..

- هەر ئێستا پێیان دەڵێم. دەسبەجیٚ سازی دەکا. ئەتۆ خەمت نەبیٚ بابە.

- لێفەم بدەیە حاجی لێفە.

مام خەلیل دیسان بڕوای بە قسەی کوڕەکەی نەکرد. چۆن خەڵك دەشزانن لە ماڵێیە و نایەن نایکوژن؟ حاجییە درۆزن. دیارە پێی نەگوتوون ئەگینا شتی وا هەر نابیٚ نا.

لە بن لێفەکەوە هەڵدەلەرزی و گوێی لە دەنگی دەرگا هەڵخستبوو کە ئاخۆ کەی دێن. هەتا شەویٚ چاوەڕیٚ ما. نەهاتن:"ئاخ، دێهاتیی بیٚ نامووس." بۆنی خۆشی چێشتەکەی سەر ئاگرەکەی بۆ دەهات و ئیشتیای دەبزووت. بووکیٚ بانگی کرد:

- بابە، ئاشەکەم هێنا. وەرە بیخۆ. چاوەڕێی تۆین.
- وڵات تەواو تاریك داهاتووە؟ شەوە؟...
حاجی گوتی:
- نا بابە شەوە، تاریکە...
- بچۆ سەرێکی دەرێ بدە، نەکا هەڵەت کردبێ...
حاجی لەسەر سفرەکەی هەستا و سەرێکی کێشایە دەرێ و گەڕایەوە.
- بابە تاریکەسەلاتێکە چلو چاو نابینێ.

مام خەلیل وەك منداڵێك گورج، لە جێیەکەی دەرپەڕی و هاتە سەر سفرەکە دانیشت و پڕی دایە کەوچەکەکە و وەك لافاو هێنابێی، سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و داگژایە چێشتەکە. وەك شێتان کەچکی لێ دەدا. خێرا خواردی. تێر تێری خوارد و بەبێ ئەوەی قسەیەك بکا، یان سەیری کەسێك بکا، یەکەو ڕێ چۆوە عەمبارەکە و لە جێویانەکەی خزییەوە و لێفەکەی کێشایە سەر خۆی. دوای ئەوەی سەری لەسەر سەرینەکەی هێندێ بارەوبار کرد، دەستەکانی لە بن ڕدێنییەوە لێك ئاڵقە کرد و ئەژنۆکانی هەتا بن چەناگەی خڕ کردنەوە و خۆی گرمۆڵە کرد. جاروبارە گیانی دەلەرزی، بەڵام گرمۆڵەبوونەکەی گەرمای جێویانەکەی پتر کردبوو. مام خەلیل کەیفی بە گەرمای لەشی خۆی دەهات.

"کاتێ مرۆڤ ترسێ ئاوا گەورەی لە دڵی دایە، تەنانەت بە هێزی چل ئێسترانیش ئەو ترسەی لە دڵی ناچێتە دەرێ. گوتت گوندییەکان نایەن؟ ئای حاجییە داماوە چلمنەکەی من، ئاخ، بەخوا دێهاتییەکان بگرن وەك سەگ دەخۆن، هەر بە زیندوویی کەوڵم دەکەن و دەمبرژێنن. کەس کوڕی وەك حاجیی نییە، کوڕێکی باشە، ئەدی کوڕی چاکە، بنیادەم کە بزانێ دێهاتییەکانی بابی دەکوژن، ئیدی ناچێ بڵێ، هۆی خەڵکینەوە ئەوەتا بابم لە ماڵەوەیە. چما بنیادەم بابی خۆی بەکوشت دەدا؟، بەڵام ئەوە هەر حاجییە چلمنەکەی خۆمە، دەبێتە قاتڵی بابی خۆی، دایکیشی دەکوژێ، دەبێتە قاتڵی حەوت پشتی خۆی، بەڵام دەترسێ. وەك سەگ لە مەمۆ یاغی دەترسێ... خۆ مەمۆ بزانێ حاجییە چلمن پیاوێکی ئەوەندە هیچ و پووچ و بوودەڵەیە، دێ و دەیخنکێنێ. حاجییە چلمن باوەڕ ناکا ئەو نەمردووە. باشە، با بڕوا نەکا. کێ دەوێرێ بڕوایە نەکا؟ هەر کێ مەرگی مەمۆی دیتووە؟ مەمۆ لە نێو کێوانە. ئەو نەمردووە. دوو جەندەرمەی لات و پووتی هێلکەدز چۆن دەتوانن لێی بچنە پێشێ؟ حەی حەی، کوڕە ئەوە مەمۆی پێ دەڵێن. برای کێیە؟ مام خەلیل..

حاجییە چڵمن هێشتا بۆنی شیری خاوی لە دەمی دێ. هەوراز و نشێوی هیچ کارێك نازانێ. بیری ئەوەڵ و ئاخرییەکەی ناکاتەوە. هەر بیر لە مەمۆ ناکاتەوە کە لە چیایە. دیارە بە گوندییەکانی گوتووە بابم لە ماڵێیە.

"دیارە گوتوویەتی. وەك پیرەژنان قسەی تێدا ڕاناوەستێ. قسەی لە زاریدا ڕاناوەستێ. دڵی وەك کانییەکەی ئاقچاگۆز وایە. ئەگەر ئەویش نەیگوتبێ، دیارە نەنە زەڵە گوتوویەتی و گوتووشیە، هاتۆتە خەونم. ڕێك چووە بە کوێخا سەفەریشی گوتووە. ئەگەر ئەویش نەیگوتبێ، عەلیەیە درێژەکە گوتوویە. دیارە گوێی لە دەنگی کۆخەیەك بووە و ئاوڕی داوەتەوە. باشە لە خۆی ناپرسێ ئەوە کێیە دەکۆخێ و لە کوێوە دێ؟ دیارە، هەر گوێی لە دەنگی کۆخەکە بووە و ناسیوێتەوە و تێی قووچاندووە و بەو دایکەی گوتووە کە بەخوێنی سەرم تینووە. ئەی عەبە درۆزن کە لەو ڕووبەڕۆوە دادەنیشێ، ئەگەر گوێی لێ بێ چما هاوار ناکا کە "هۆی خەڵکینە، وەرن، مام خەلیل ئەوەتا لێرەیە، بیگرن." وای دادەنێین هیچیان نەیانگوتووە، ئەی ئەو بووکە شپرێوە چلکنە، دەك خودایە بکەوێتە نێو مەنجەڵی تیژاوەوە و داپلۆخێ، چما زمانی ڕادەوەستێ؟

"گوندی بەفرت و فێڵن. مەسەلێك هەیە دەڵێ: گوندی ئەگەر دایکیشی کەمتیار بێ، بێ ئەملا و ئەولا باوکی ڕێوییە، بەڵام مەحاڵە ئەو خەڵکە لە دەعبایەکی دیکە بەوەلەد بووبێتن. کاراتۆپاکلی ئەفەنی، مەلای ئاوایی فتوای ئاوای دەدا. گوندییەکان بۆ کوشتنێ چاوەڕێی شەو دەبن بۆوەی چێژی باش وەرگرن. شەو قەڵای مێردانە. زۆر باشە."

بانگی کوڕەکەی کرد:

- دەزانم ڕۆڵە. سۆمای چاوەکانم، سۆمای چاوی ئەو گوندە، نووری چاوی ئەو دنیایە، کوڕە باشەکەم، دەزانم شەوێ دێن بۆ کوشتنم.

- سێ کۆلکە داری گەورەم بۆ بخە پشت دەرگاکەوە. با لە داربەڕوو بن. پێنج کلۆنیش لە دەرگاکە دە. با هەمووان لە پۆڵا بن. پۆڵای ئەڵمانی. تەنیا بەو شێوەیە دەتوانی بابت لە دەستی ئەو خەڵکە وەحشییە نەجات بدەی، بەڵام دیسانیش ناتوانی. ئەوان چاوەڕێی شەون. لێگەڕێ با شەوی تاریکی مەرگ گەمارۆمان بدا. تاریکاییەکی وەك بەرد قورس و گران بکەوێتە سەر دنیاکەمان، ئەو کات جا ئەوان، بە دەستەکوتە و بە پێ دزە لە ماڵەکانیان دێنە دەرێ و یەك یەك لە بەر دەرگای ماڵەکەمان کۆ دەبنەوە. دوایی وردە وردە هەر کۆ دەبنەوە. ئەوجار پاڵ دەنێن بە دەرگاکەوە. دەرگاکە ناکرێتەوە. کە نەشکرایەوە زیاتری پاڵ پێوە دەنێن.

ئەگەر دیسان هەر نەکرایەوە، دیوارەکە دەقەڵشنەوە. ئەمن دەزانم، کون کردنی دیوارەکە زۆر ئاسانترە لەوەی مل بنێنە بەر دەرگایەکی قایم. وەختایەکی ئەمن ئەوە دەزانم، کوڕەکەی خۆم، سۆمای چاوەکانم، ئاخۆ ئەوان بەوە نازانن؟ کە هاتنە ژووریٚ، وەك بێچووە کەروێشکێك پشتەملم دەگرن و دەمبەنە دەریٚ. دوایی یەکێکیان ئەو پیلەم و ئەویتر پیلەکەی دیکەم دەگریٚ و فڕێم دەدەنە سەر بەفرەکە. گوندییەکان و ژن و منداڵەکانیان، هەرکامەیان فانۆسێکیان بە دەستەوە، تف لەسەر و چاوم دەکەن. دواییش وەك گورگی برسی ئامبازم دەبن. هەر لەتەی جەستەم بە دەستی یەکێکیانەوە دەبیٚ."

ئاخێکی هەڵکێشا و لەسەری ڕۆیی:

ـ ئەدی ڕۆڵە گیان. مەرگی مام خەلیل، هەڵۆی کوێستانان بەو جۆرە دەبیٚ. چ دەکریٚ. مام خەلیل دەڵیٚ چارەنووس وا بووە. یەکێکی ئەو هەمووە زیانەی بە خەڵکەکە گەیاندووە، چما گوندییەکان بە شێوەیەکی دیکەی دەکوژن؟ ڕێك بەوجۆرەی دەکوژن کە ژنەگەل ئاغاکەی چوکووراوایان کوشت و لەتوپەتیان کرد. کاتیٚ پیاوێکی وەك مام خەلیل دەکوژن دەبیٚ ئاوای بکوژن. وا نییە ڕۆڵە؟، بەڵام چ دەکرا ئەگەر لەو تەمەنەدا و بەو سەری پیرییەم لە کوشتنەکەم خۆش بوایەن. وانییە ڕۆڵە گیان؟

حاجی مات ببوو و نەیدەزانی بڵیٚ چی. ئەگەر گوتبای دەتکوژن، خۆ مام خەلیل لە ترسان زراوی دەچوو و هەتا بەیانی هەر لە جێوبانەکەیدا جینگڵی دەدا و هەڵدەلەرزی و دەیناڵاند و جنێوانی دەدا. ئەگەر گوتباشی کە هەر ئاگاشیان لە تۆ نییە و کاریشیان بەسەرتەوە نییە و ئەوان بە دەردی خۆیانەوە گرفتارن، ئەوە دەیکردە هەڵلایەکی وەك حەشر و دەیگوت:"ئای، کوڕە خۆ ئەمن بە پیاو دانانێن." حاجی دیسانیش بە لەسەرەخۆییەوە و بە ساردوسڕییەوە دەیگوت:

ـ بابە، گوندییەکان هەزار دەردی بیٚ دەرمانیان هەیە. ئەتۆ خەم مەخۆ. لە عەمبارەکەی خۆتا بنوو. گوندی چ کاریان بەتۆیە.

مام خەلیل:

ـ ئەمشەو. هەر ئەمشەو دێن و دەمکوژن. ورد وردم دەکەن. شاگەشکە بە، حاجیە چڵمن، دڵت خۆش بیٚ. ئەو پارەوە نانەشت بۆ دەگەڕێتەوە کە من دەیخۆم. هەی چڵمن...

حاجی بە بیٚ تاقەتییەوە گوتی:

ـ نازانم بابە. لەوانەشە بێن. بێن و دیوارەکەیماڵەکەمان کون بکەن. هەرچی ئەوانە دەیچێژن لە دەستی تۆیە. ئەوە تۆی ئەمساڵ ئەوانت برسی و ڕووت و قووت هێشتەوە. پێت وایە ئەو خەڵکە نازانن؟ و ئەگەر زانیشیان چما ناتکوژن؟

مام خەلیل گەش بۆوە:

- دەمکوژن، ڕۆڵە دەمکوژن. ڕووناکایی چاوەکانم دەمکوژن. وەرە لام و گەردنم ئازا بکە. وەرە کنم ڕۆڵە. دەستم بگرە. دەستم بگرە نێو دەستەکانتەوە. بووکەکەم و نەوەکانیشم با بێن. هەر کەس لەو گوندەدا لە نەوە و نەتیژەی منە با بێ. با بێن و گەردن ئازاییان لێ بخوازم. ئەمن ئیدی بەجێتان دێڵم. ئەو گوندییانە ناهێڵن نانی زیندووان بخۆم. ئاخری ئەتۆش بڕوات کرد ڕۆڵە. وانییە کوڕم؟

- بڕوام کرد بابە، ناهێڵن زیندوو بمێنی.

- کەوابوو وەرە ڕۆڵە. ئەو گوندییانە ناهێڵن ڕۆژ بکەمەوە. هەر لە ئێستاوە خەریکن لەبەردەرگایە کۆ دەبنەوە. هەر ئێستا نا ئێستا، دەرگاکە لە ڕێسمە دەبەن. ئانا دیوارەکە کون دەکەن. کوڕم، گلێنەی چاوەکانم.

بە ئاماژەیەکی بووکەکەی کە بزەیەکیشی لەسەر لێوان بوو لەگەڵ منداڵان خۆیان خستە عەمبارەکەوە. حاجی چوو و دەستی باوکی گرت، بووکەکەشی دەستەکەی دیکە. مام خەلیل:

- ڕۆڵەکانم گەردن ئازا کەن.

سۆز و مێهرەبانییەك لە دەنگەکەیدا هەبوو کە مرۆڤی دەهەژاند. حاجی، لەو کاتەوە بابی خۆی دەناسی، قەت ئاوا بە نەرم و نیانی نەیدیبوو. لەسەری ڕۆیی:

- چارەنووسی مام خەلیل ئاوا بوو. کوژرانی بە دەستی گوندییەکانی خۆمان.

دەستەکانی لە دەستی حاجی و بووکەکەی دەرکێشا و دەستی منداڵەکانی گرت:

- ئەنگۆش گەردنم ئازا کەن، چاو ڕەشەکانی خۆم.

دەستێکی بە قژی یەکێکیان و دەستەکەی دیکەی بە سەر و قژی ئەویتریاندا دێنا. ئەوجار وازی لەو دوانە دێنا و دەستی بەسەر ئەوانی دیکەدا دێنا. مام خەلیل لە ژیانیدا دەستی بەسەری کەسدا نەهێنابوو. هەر ئەوە خۆی جێی سەرسووڕمان بوو. ئاخۆ بە ڕاستی پێی لەسەر لێواری گۆڕ بوو؟ گوتی:

- گەردنم ئازا بکەن. لەوانەیە هەر ئێستا بگەنێ. خەریکن دێن. لە پێشدا حاجی و دوای ئەو بووکەکە و دواتریش منداڵەکان:

- گەردنت خۆش و ئازا بێ.

جا لە عەمبارەکە چوونە دەرەوە. هاتن و لە تەنیشت ئاگردانەکە دانیشتن. ماوەیەك بێ دەنگ مان. لە عەمبارەکەوە دەنگی ناڵین و جنێوەکانی مام خەلیل دەهات. گوێیان هەڵخست و بیریان لە مەرگ کردەوە.

کەڵەشێری بەیانی خوێندبوویان کە مام خەلیل هێور بۆوە. بەسپایی وەك منداڵان پشووی دەکێشا. بووکەکەی ناوی فاتێ بوو. فاتێ بە مێردەکەی گوت:

- دەبێ ئەو کابرایە لەو ئازارە نەجات بدەین. بەزەییم زۆر پێیدا هات. قسەکان ئەوەندەیان کار تێکردم ویستم دەست بکەمە گریان. وەخت بوو دەستەکانی ماچ بکەم. لێقەوماوە ئارا و قەراری نییە. سبەینێ ئەمن لەو ئازارەی ڕزگار دەکەم.

حاجی گوتی:

- چۆن؟

فاتێ گوتی:

- بەیانی دەزانی چۆن. ئەمن هەتا ئێستاش هیچ خۆشم نەدەویست و دەمگوت:"دەی با بیکوژن، چش". سەیر کە حاجی، ئەو کابرایە ئەو هەمووە ساڵە خوێناوی بەمن هەڵێناوە، بەڵام بە دوو قسان وەریگێڕامەوە. ئیدی هیچ ڕقێکی لە دڵمدا نەهێشتەوە، جگە لەوە خۆشەویستی و سۆزیشم هاتە دڵەوە. هەر درەنگ نا، بەیانی لەو ترس و ئازارەی ڕزگار دەکەم. زگم پێی سووتا.

چوونە جێوبانەکەیانەوە و هەر سەریان لەسەر سەرینێ دانا، خەو بردنییەوە.

❊❊❊

مام خەلیل لە ژیانیدا نوێژی نەکردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ڕۆژێ مەلا بانگدانی بەیانی لەخەوێ هەڵدەستا. هەڵدەستاو هەر ئەویش بوو کە بەیانیان پووشکە و چرپیەکانی دەخستەوە سەر ئاگرە دامرکاوەکەوە. هەرچی لەخەوێ هەڵدەستا، دەیدی ئاگرەکە نێڵەی دێ و ماڵەکەش گەرمە، بەڵام مام خەلیل دوای گەڕانەوەی لە چوکووراوا و خۆ خزاندنە نێو عەمبارەکەوە، تەنانەت بۆ جارێکیش چییە ئاگردانەکەی دانەگیرساندبۆوە. کەچی ئەمڕۆ زۆری حەز چووبۆوە هەڵکردنی کوانووەکە. هەستێك ناخی تەنیبۆوە. وەك پشیلەیەکی گورج لە عەمبارەکە دەرپەڕی. هات و خێرا ئاگردانەکەی داگیرساندەوە، بەڵام دەسبەجێ گەڕایەوە عەمبارەکە و خەوت. "ئەمڕۆ زۆر ساردە... ئەو حاجییە چڵمنە ماڵ کاولەش ئەوەندە دەستکورت و هەژارە، جووتە ئاژەڵێکی بۆ ماڵەکەی خۆی پێ ناکڕدرێ. هەر دەڵێی کوڕی مام خەلیل، خەلیل هەڵۆ نییە... ئەوە لە تۆرەمەی خەلیل نییە و تۆرەمەی عەبە درۆزنە."

برێك دوای بەخەبەرهاتنەکەی مام خەلیل، فاتێی بووکیشی لەخەو هەستا. "ئەو کچەتیوە چلکنەی وەلییە گڕوێ. ئەوجار منداڵەکان، دواییش حاجییە چڵمن. حاجییە چڵمن شەڕێکی

باشی لەگەڵ ژنەکەی دەکرد. هەموو بەیانیان. ئەوە بە کەیفی مام خەلیل بوو. عادەت و خوو، لە پەتای هارییش خراترن.

مام خەلیل چاوەڕێ ما. ئەمڕۆ شەڕ لە گۆڕێ نەبوو. کەڵەبابی بەیانی خوێندی. تاو کەوت، نەخێر شەڕ نەبوو. "خودایە ئەوە چییان بەسەر هاتووە؟ نەخێر، شەڕێ ناکەن. چاوەڕێ ما و دانی بە جەرگیدا گرت. هیچ سریوە و وستیەکیش نەدەهات.

گازی کرد:

ـ بووك فاتم، ڕۆڵە...

چاوەڕێ ما. هیچ سریوەیەك نەدەهات. گوتی:

ـ حاجی ڕۆڵە، ئەوە بووکێ چی بەسەر هاتووە؟ بۆ کوێ چووە؟

ـ کاری هەبوو. بەیانی زوو ڕۆیشت. کارێکی گرنگی هەبوو. کارت هەبوو بابە؟

مام خەلیل گوتی: دەمەویست بڵێم ئاخۆ...

بێدەنگ بوو.

ـ دەتەویست بڵێی چی بابە؟

ـ دەمگوت....

حاجی گوتی:

ـ هەیهوور ، ئەرێ دە بیڵێ دەی، دەتەویست بڵێی چی؟

مام خەلیل لە جێوبانەکەیدا ئاخێزێکی کرد. ڕدێنی لە قولی گرت:

ـ حاجییە چڵمن... حاجییە چڵمن. یانی تۆش بنیادەمی دەنگت بەسەر مندا هەڵدێنی؟ ئەتۆ هێشتا منداڵی... بۆنی شیرت لە زاری دێ... دەمویست بڵێم چتان بەسەر هاتووە؟

ــ نا، بابە شتێکی وا نییە. دەتەویست چ ببێ. دەرد و داخی ئێمەش هەر ئەوەی خەڵکەکەیە....

ـ دەمگوت....

ـ وەڵڵاهی بابە، ئەمن نازانم مەبەستت چییە...

مام خەلیل بە بن لێوانەوە پێکەنی و گوتی:

ـ ڕۆڵە حاجی، کوڕم...

ماوەیەك بێ دەنگ بوو و لەسەری ڕۆیشت:

ـ ئەرێ دەمگوت چی....

دیسان بێ دەنگەی لێ کرد. دوایی لەناکاو گوتی:

ـ ئەمڕۆ لەگەڵ بووکێ لێکتان نەدا... گوتم نەکا بەڵایەکتان بەسەر هاتبێ. نیگەران بووم.

حاجی پێکەنی و گوتی:

ـ نا، بابە. دەرفەتمان نەبوو. هێشتا خۆر نەکەوتووە هەستاوە و چووە...

مام خەلیل لە ناکاو گوڕاندی:

ـ دەرگاکە.... دەرگاکە... دەرگاکە داخە...

حاجی بە ئانقەست گوتی: داخراوە بابە...

ـ نا، نا... ڕووناکایی دەبینم. ئەو ڕووناکاییە لە کوێوە دێ؟

ـ لە پەنجەرەوە.

ـ بڕۆ پێوەی دە.

ـ دەرگاکە کرابۆوە. حاجی چوو و دایخست و دیسانەوە کردییەوە.

مام خەلیل گوتی:

ـ خودا بتپارێزێ حاجییە چلمن، بەڵام مام مام خەلیل مەخەڵەتێنە. بچۆ ئەو دەرگایە جوان پێوە دە، کە داتخست و دواتر کردتەوە.

دوایی وەك شێتان، ئەوەندەی دەنگی دەردەهات هاواری کرد:

ـ خەریکن دێ یێ ێن... فریام کەوە حەزرەتەکەی غەوس. خودایە گیانی شیرینم بەتۆ ئەسپارد. ئەی گوڵە بیابانییەکە شەفاعەتی خۆتم لێ مەگرەوە...

لە گوناحانم خۆش بە... چما بەتۆم نەگوت... "کە ئەوەی دەگوت، دەنگی تژیی بوو لە خۆشی." چما پێم نەگوتی ئەو گوندییانە لەتوپەتم دەکەن؟ دەرگاکە داخە. کلۆمەکەی بخە. بەردی لە پشت هەڵبچنە. چما دەنگی پێیانت گوێ لێ نابێ. لەوانەیە هەزاران کەس بن. چما نابیستی؟ ژن و منداڵ، پیر و لاو، بە چوارپێ و ئەسپەکانیانەوە بۆ لەتوکوتکردنی من دێن. خەریکن دێن. فریام کەوە پێغەمبەرەکەی ئاخر زەمان. یان هیچ نەبێ ئەتۆ ئەی حەزرەتی خدر بەو ئەسپە خۆڵەمێشییە گورجەتەوە فریام کەوە....

لە ناکاو دەنگی کپ بوو. لێفەکەی بەسەرخۆیدا هەڵکێشا. یەك پشوو دەلەرزی و دەنگی ووو ئووووو... لە زارییەوە دەهاتە دەرێ. هەر لەو کاتەدا حاجی گوێی لە کۆمەڵە دەنگێك بوو. هات و هاوار و پێکەنین... دیار بوو خەڵکێك بەرەو ماڵەکەی ئەوان دێن. برێك دواتر دەستیان کرد بە لەدەرکە دان. فاتێ گوتی:

- دەرگاکە بکەوە حاجی.
مام خەلیل لە عەمبارەکەوە بانگی کرد:
- نەیکەیەوە، نەیکەیەوە، بە قوربانت بم حاجی. چما ئەتۆ کوڕی من نی؟ وەرە سەیر بکە، ئێستا بابت دەکوژن. مەیکەوە. ئەو ژنەتیوە سۆزانییەت ئەو بەڵایەی تووش کردم. باب بە قوربانت بێ، کوڕە بە نۆکەرت بم مەیکەوە. ئەمساڵ ئەگەر چووینەوە چوکووراوا، هێندەی پێنج کەسانت لۆکە بۆ دەچنمەوە. جگەرەش ناکێشم... مەیکەوە حاجی.
حاجی بەرەو لای دەرگایە چوو و پرسیی:
- چیت دەوێ فاتی. بۆچی دەرگاکە بکەمەوە؟ ئەو دەنگەدەنگە چییە؟ فاتمە بە ئەسپایییەوە گوتی:
- جارێ تۆ بیکەرەوە.
مام خەلیل لە عەمبارەکە دەرپەڕییە دەرەوە و گوتی:
- مەیکەرەوە هەتیو.
بەڵام لەو کاتەدا حاجی دەرگاکەی کردبۆوە. مام خەلیل لە بەرامبەر ئەو هەمووە خەڵکە و تەوژمی تیشکەکەدا پێی بە عەرزییەوە ڕەق بوو. چەند جارێك چاوەکانی تررووکاندن و ئەوجار خۆی کۆ کردەوە و گورج لە خۆی خستەوە نێو عەمبارەکەوە و چۆوە نێو جێ و بانەکەی. لێفەکەی بەسەر خۆی کێشا و خۆی گرمۆڵە کرد.
لە پشت سەرییەوە دەنگی قاقای خەڵکەکە بەرز بۆوە و هەموو وڵاتی تەنییەوە. مام خەلیل زۆری توند ڕاچڵەکی.
بەردەوام دەیگوت:
- کاری کردنێ نییە. ئەمن کردم ئەنگۆ مەیکەن و بەزەییتان پێمدا بێتەوە. برادەرینە، ئەمساڵ درەنگ ناتانبەمە لۆکەچنینێ. ئەمجارەیان لێم خۆش بن.
لە ناکاو وەخۆ هاتەوە. چ شتێك خەریك بوو دەقەوما؟... دەنگی گاڵتە و سوعبەتی تێکەڵ بە قاقا لە نێو خەڵکەکەوە دەهات و هەر کامە لەو سوعبەتانە وەك خەنجەرێك لەسەر دڵی مام خەلیل دەنیشت:
- هەر بەزیندوویی...
- بەزیندوویی دەتخۆین...
- مام خەلیل... مام خەلیل...

ـ مرێمۆکیش هات... مرێمۆکیش...
ـ جا وەرە و ڕدێنت لە چنگی ئەو دەربێنە مام خەلیل.
ـ وەرە دەرێ مام خەلیل...
منداڵەکان ئیدی بێ تامیان کرد و گاڵتە و جەفەنگەکەیان کردە گۆرانی.
ـ مام خەلیل، مام خەلیل، کەنگێ دەچییەوە چوکوور؟
جا یەك دەنگ دەیانگوتەوە:
ـ مام خەلیل... مام خەلیل... زەنگوڵەیەك بە کلکەوە...
برێك دواتر، دەنگەکەیان بوو بە غەڵبەغەڵب. وا بە هەڕاوییەوە پێ دەکەنین خۆیان پێ ڕانەدەگیرا.
گوملکسیز بە تووڕەییەوە گوڕاندی:
ـ ئێمە هاتووین چاکە لەگەڵ ئەو کابرایە بکەین یان قەشمەریی پێ بکەین؟ بێ دەنگ بن...
گوملکسیز ئۆغڵو ئەوەندە بە تووڕەییەوە وای گوت، هەموو بێ دەنگ بوون. ئەو بە هێمنی هاتە ژوورەوە و دەستی بە لاشیپانەی دەرگای عەمبارێ گرت و بانگی کرد:
ـ مام خەلیل... هیچ مەترسە. لەخۆڕا دەترسێی. خەڵك تۆ ناکوژن، خۆشیان دەوێی. ئەتۆ خراپ لەو خەڵکە تێگەیوی. ئەوانە نەوەی جوامێرەکانن. وەرە دەرێ. ئەگەر حەز دەکەی وەرە دەرێ، ئەگینا خۆم دێم و دەتهێنمە نێو ئەو خەڵکە. وەرە دەرێ خەلیل خان...
هەرچی کردی، مام خەلیل نەهاتە دەرێ. ئاخرییەکەی گوملکسیز ئۆغڵو خۆی خستە نێو عەمبارەکەوە و لێفەکەی لەسەر مام خەلیل لادا. مام خەلیل خۆی وا گرمۆڵە کردبۆوە بووە چنگێکی لێ هاتبۆوە.
گوملکسیز ئۆغڵو ئەو کابرا گرمۆڵە بووەی بە باوەش هەڵگرت. مام خەلیل لە ئامێزیدا هەر پەلەقاژەی بوو. هێنایە دەرێ و لەسەر بەفرەکەی دانا. مام خەلیل بۆ ساتێك لەوێ لەسەر بەفرەکە بێ جووڵە مایەوە. دوایی بە گومانەوە و هێدی و لەسەرەخۆ دەستی کرد بە جووڵەجووڵ. لە پێشدا دەستی ڕاستەی لەسەر بەفرەکە دادا و برێك هەستا، دواتر دەستی چەپەی دادا و چەند جارێك سەیری لای ڕاست و چەپی خۆی کرد و هەستا. کە تەواو هەستایە سەر پێیان، ساتێك لە حاڵێك دا خێرا خێرا چاوی دەترووکاندن، سەیرێکی خەڵکەکەی کرد. چاوەڕێ بوو حەشیمەتەکە پەلاماری بدەن و لێی دەن. ئیدی دڵنیا بوو لەوەی کاریان بەسەرییەوە نییە، بەڵام هەر چاوەڕوانیش بوو. هیوایەك...

کاتێ مام خەلیل لە نێو ئاپۆرای جەماوەرەکەدا ئاوا چاوەڕوان بوو، گوملکسیز ئۆغلو هاتە پێشەوە و بن پیلی گرت:

- سەیر بکە مام خەلیل... خۆ دیتت. هەموو خەلکی گوند ئەوەتا لێرەن. تەنانەت ژن و منداڵەکانیش. ئەوە بەچاوی خۆت بینیت هیچ کاریان بەسەرتەوە نییە. تازە، هەتا ئەمن زیندووم، کەس ناوێرێ پەنجەیەکیشت لێ بدا. تەنانەت لە گوڵیشت کاڵتر پێ بڵێن و بڵێن پشتی چاوت برۆیە.

بانگی کوڕەکەی کرد:

- ڕۆڵە ئەحمەد. وەرە و دەستەکانی مام خەلیل ماچ بکە.

کوڕەکەی بەغاردان هات و دەستی مام خەلیلی گرت و ماچی کرد.

- وەرە حاجی ئەتۆش دەستی بابت ماچ بکە.

حاجیش ماچی کرد. ئاخری، کچان و کوڕە گەنجەکانیش بە بزەبز دەهاتن و دەستی مام خەلیلیان ماچ دەکرد. گوملکسیز ئۆغلو گوتی:

- کاك خەلیل گەورەی ئێمەیە. بابی ئێمەیە، بەڵام جارێ بەسیەتی. لە سەرمان هەڵدەلەرزێ. ئەوانی دیکە سبەی دێن و دەستی ماچ دەکەن.

هەر بە ڕاستیش مام خەلیل وەك مێژۆکە دەلەرزی. گوملکسیز ئۆغلو، هەڵیگرت و لەو جێوبانەدا کە فاتێ بۆی ڕاخستبوو، درێژی کردەوە و گوتی:

- خودا بتپارێزێ مام خەلیل. ئەتۆ باپیرەی ئەو گوندەی. خودا سایەت لەسەرمان کەم نەکا.

خەلکەکە بە گاڵتە و پێکەنینەوە بلاوەیان کرد.

***

مام خەلیل لە ناخی خۆیدا هەستی بە بۆشاییەك دەکرد. کەوابوو خەڵك نەیاندەویست بیکوژن؟ ئەوە چۆن بوو؟ ئەی کێ تووشی ئەو بەلایەی عادیل ئەفەنیی کردبوون؟ ئەوە کێ بوو ئەوانی کاتێك بردبووە لۆکە ڕنینەوە، کە لۆکە نەمابوو و گوندییەکانی دیکەش نیوەی کاری خۆیانیان کردبوو؟ ئەی کێ بوو سەبارەت بە پەیامەکەی ئیزگیل درۆی لەگەڵ کردبوون؟

ئەوانە ئەمڕۆ کلاویان لەسەر نام. سبەی دێن و لەتوکوتم دەکەن. بە چێژ و لەززەتەوە دەمئەنجنن. ئەو گوملکسیزەش زۆر خراپی سەیر دەکردم. نا، نا، ئەگەر ویستبایان بمکوژن، سێ و دوویان لێ نەدەکرد. بەخوای تا قیامەتیش ناتوانن کاری وا بکەن. خۆ ئەو گوندییانە دەمار و

غیرەتیان نییە. ئەو بەرازانە خوێنی پیاوەتییان بە دەماردا ناگەڕێ. دڵیشیان لەبری خوێن ئاوی تێدایە. ئەگەر هەموو ژنەکانیان لێ بستێنی و لەبەر چاویان دەرپێیان لەپێ داکەنی و هەتا شەوێ لەو گۆڕەپانە هەڵیانپەڕێنی، دیسان متەقیان لێوە نایە. چیت حەز لێیە پێیان بکە. هەر بەلایەکی دەخوازی بەسەریان بێنە دیسان وستەیان نایە.

"بیری لێ بکەنەوە... ئەوانە درەنگ دەبەیتە چوکووراوا. قۆزاخە لۆکەیەکیش چییە دەستیان ناکەوێ و لەو سۆنگەیەوە قەرزەکانی عادیل ئەفەنیشیان پێ نادرێتەوە. ئەوەندەش بە ترسەوە چاوەڕێی هاتنی عادیل ئەفەنی دەکەن هەر دەڵێی چاوەڕێی ئیزرائیلن. هەر دەڵێی هەموو ئەو گەواد و سۆزانییانە لە چاوەڕوانییا خەریکن شێت دەبن...

دواییش هەڵدەستن و دێن و دەستی مام خەلیل کە ئەو هەمووە خراپەیەی لەگەڵ کردوون، ملچە ملچ ماچی دەکەن. هەی بێ ویژدانینە، هەی بێ ناموسینە، هەی کافری بێ دین و ئیمان. کەلاکیشتان بۆوەی نابێ نوێژی لەسەر بکرێ."

زۆر تەریق ببۆوە. کوڕەکەی دوو جاران بۆ ترخێنە خواردنێ بانگی کرد. مام خەلیل نەیتوانی سەری لە بن لێفەکەی بێنێتە دەرێ. قسەی خۆمان بێ چێشتەکەش بۆنێکی خۆشی لێوە دەهات. ئای لەو چێشتە خۆشەی...

ئەوان شۆرباوەکەیان خوارد و تەواویان کرد. مام خەلیل لە بن لێفەکەیەوە ملی دەکێشا و چاوەڕێ بوو ئەوان بن ئاگردانەکە چۆل بکەن. ئاخرییەکەی دیتی کە تەنیا منداڵێکی بچووک لە تەیشت ئاگردانەکەوە ماوەتەوە. دەسبەجێ هاتە دەرێ و ڕایکردەوە عەمبارەکە و خزییەوە قوژبنێکەوە. بە ناڵینەوە گوتی:

- ڕۆڵە حاجی. جێوبانەکەی من لە تەنیشت ئاگردانەکە هەڵگرەو بۆمی بێنە ئێرە.

حاجی هات و نوێنەکانی بۆ هێنایە عەمبارەکە و لە جێی جارانی ڕایخستەوە و گوتی:

- ها وەرە بنوو بابە.

مام خەلیل پرسی:

- لەو شۆرباوە خۆش و بەتامە هیچت بۆ هێشتوومەوە ڕۆڵە؟

- بۆم ڕاگرتووی بابە. چۆن بۆت ڕاناگرم. چما نازانم ئەتۆ ئەندەشت شۆرباوی گەرم پێ خۆشە؟

مام خەلیل بە پەلە گوتی:

- دەی بیهێنە... بیهێنە...

هەروا کە بە پەلەپەل دەیخوارد گوتی:

ـ یانی ئاوا... ئاوا... کەوابوو ئاوا.. ڕۆڵەم حاجی، ئەتۆ کوڕێکی بێ غیرەتی. ئەگەر لە جێی تۆ بوایەم، ئەو شۆرباوە گەرم و خۆشەم نەدەدا بە مام خەلیل. چونکە مام خەلیل دوژمنی قەستە سەری من بوو. ئێمەی درەنگ بردبووە لۆکەچنینێ. هەر بۆیەش ئاوا بە ترسەوە چاوەڕێی عادیل ئەفەنین هەر دەڵێی چاوەڕێی ئیزرائیلین. دەزانی چییان بە من گوت؟ گوتیان مام خەلیل، ئەتۆ خراپەت لەگەڵ ئێمەدا کرد، برسیت کردین، نانت بڕین و ئابڕووشت بردین، بەلام ئێمە دیسان دەستت ماچ دەکەین.

حاجی هەوڵی دا هێوری بکاتەوە و وەلامی دایەوە:

ـ خەڵك تۆ بە خەتابار نازانن. کوێخا بە خەتابار دەزانن. بۆیەش دەستی تۆ ماچ دەکەن.

ئیدی ئەوجار دەیزانی مام خەلیل بۆچی تووڕەیە. گوندییەکان بە شیاوی ئەوەیان نەزانیبوو تێی هەڵدەن.

بێدەنگییەکی قووڵ بەسەریاندا زاڵ بوون. مام خەلیل گوتی:

ـ ها وەرە ئەو قاپە شۆرباوە وەرگرە و لەبەر چاوم ون بە حاجییە چڵمن. ئاخر ئەتۆش بێ ناموسێك نی وەك ئەو خەڵکە؟

حاجی گوتی:

ـ بابە، ئەگەر ئەو خەڵکە تۆیان بە خەتابار زانیبایە، ورد وردیان دەکردی. ئەو خەڵکە زۆر ڕێز لە تۆ دەگرن.

مام خەلیل بە دەنگێکی پڕ لە پاڕانەوە گوتی:

ـ ڕاست دەکەی ڕۆڵە.

حاجی گوتی:

ـ بە خودای ڕاست دەکەی بابە.

مام خەلیل لە دڵییەوە دوعای بۆ حاجی کرد:

ـ دەی خودا لە هەردوو دنیا ڕزگارت بکا ڕۆڵەم...

حاجی ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا:

ـ ئامین...

مام خەلیل لێفەکەی بەسەر سەری خۆیدا کێشا و دیسانیش ترسی دیکەی هێنایەوە دڵی خۆی. وەبیر خۆی هێنایەوە کە گوندییەکان دەیکوژن. بیری لەوە کردەوە کە، پێشتر هەر

دەوێنێ، چەندە دەترسا. ئێستا یەك دوو سەعاتان هەوڵی دا هەتا دیمەنی جەستە خوێناوییەکەی خۆی هێنایە پێش چاوی. کەچی جاران ئەو دیمەنە هەموو گیانیی دێنایە لەرزین و زراوی دەبرد. لە بۆشاییەکی گەورەدا مابۆوە و ئازاری دەچێشت. خۆزگە توانیبای بگریێ... زۆ لە مێژ بوو نەیتوانیبوو بگری. لەوانەیە پازدە ساڵێك دەبوو. بیری کردەوە لەوانەیە مەرگ هەر شتێکی ئاوا بێ. جینگڵی دەدا. بیری لە هەر شتێك دەکردەوە دەستی بۆ هەر کوێیەك دەبرد، بۆشاییەکی بێ سنوور بوو. دەیەویشست بڕواتە دەرێ و هاوار بکا.

لە دەرەوە، لە دەشتێوە، دەنگی لوورە لوور دەهات. تۆفان و باهۆز سەری بە دەشت و دەردا دەکوتا. پێدەشتەکە پڕ بوو لە وێرەوێڕ و گڤە و هاشوهووشی با. دەشتە پڕ لە بەفر و بەستەڵەکە وەك زەریایەکی گەورەی هەوسار پچڕاو وا بوو. ساتێك هەستی ڕاگرت و گوێی لە دەنگەکانی دەشت هەڵخست. بیری لەو بوونەوەرانە کردەوە کە لەوێدا بوون. لەوەها شەوێکدا بنیادەم نەیدەتوانی لە دەرەوە بمێنێتەوە. ئەگەر مابایەوە، لە چاوترووکانێکا دەیبەست دەبووە بەرد. کەوابوو گورگ و ڕێو و ورچ و دەعبای کێوی چییان دەکرد؟ باڵندەکان؟ یان ئەو هەڵۆیانەی لە قەڵشتی ڕەوەزەکانی ئەو چیا سەربەتەمانەدا بوون؟ ئاخۆ ئەو کۆترە سپییانە؟ یان باڵندەی بارانۆکە؟...

بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ لە بەرامبەر ئەو بەفر و بۆرانەدا و لە زستانەدا هیچ بوونەوەرێك خۆی ڕاناگرێ. خودایە گیان خۆت ئەو هەموو مەخلووقەت بپارێزە. ئەوانە منداڵی تۆن. بەرهەمی زەحمەت و نووری چاوی تۆن. هەر بۆخۆت بیانپارێزە.

باڵندە و مێروو و سمۆرە چاو کووژەکەییەکان و دەڵەك و بزنەکێوی و مامزەکان، شێوەی ژیانیان و زاو و زێیان و شیر دانەکەیان و لەو ساتەدا بازرەبوونیانی لەو بەفرەدا هێنایە بەرچاوی. دواییش هەستی بە بۆشاییەك کرد و بێ هێز کەوت. خەریك بوو پشووی ڕادەوەستا. ماوەیەکی زۆر، بە حاڵەتێکی وەك ئاویلکەدان خۆی لەبەردەم دیواری تاریکیدا بینییەوە. هەوڵی دا لەو بۆشاییە دەرباز بێ. هەرچیی پتر هەوڵی دەدا، زیاتر بە بۆشایی و تەنیایی و بێکەسیدا ڕۆدەچوو. لە ناکاو پاڵپشت و دەسگرەیەکی دۆزییەوە. ڕێگەی ڕزگاربوون و ڕۆچنەی هیوایەکی وەك گلۆڵەیەکی تیشك لە پێش چاوەکانی تەقییەوە... خەڵك بۆ تێیان هەڵنەدای؟.... بۆچی نەیانکوشتی؟ هەی بێ ناموسینە، هەی هیچ و پووچینە. هەی دوژمنە بۆق لە زگەکان، هەی گورگەکانی زەوی و ئاسمان. شەیاتینی زەوی و ئاسمانیش ئەوەیان بە

زەیندا نەدەهات. ئەو گوندانە دەڵێن چی؟ عەرزم بە خزمەتتان: دەڵێن ئەتۆ ئەوەندە هیچ و پووچی، تەنانەت ئێمە حەزناکەین دەستمان پێت گلاو بێ. ئەوان ئەمن بە هیچ دانانێن. تەنانەت بە پەڕە کایەکیشم دانانێن و دەڵێن مام خەلیل، ئەگەر ئەو سووکایەتییانە نەتکوژێ، دەی بە ئازار و داخەوە بمرە. چیی دیکەش دەڵێن؟ دەڵێن مام خەلیل، دوای ئەوەی لەمەودوا هەموو خەڵکی ئاوایی بەتۆ ڕادەبوێرن. هەتا تۆمان هەی خەڵکی ئاوایی ئیدی پێویستیان بە شایی و گۆڤەند و ڕابواردن و کایە و گەمە نییە. هەر جنێو بە تۆ دەدەن و پێدەکەنن. ئەو گوندییانە ناتکوژن، بەڵام تۆڵەیەکت لێ دەکەنەوە هەزار جاران خۆزگە بە مردن. ئەگەر ئەوەیان نەکردبایە و هەزار جاریان کوشتبام و زیندوویان کردبامەوە، هێشتا پێم خۆشتر بوو. ئێستا لەو بەفر و بۆرانەدا خودا دەزانێ ئەوان نەنووستوون. چما دەخەون؟ دانیشتوون و باسی مام خەلیلێ دەکەن. فکر و زیکریان لای مام خەلیلە. ناوی مام خەلیلیان لە زار ناکەوێ. ئاخری یەکێکیان پەیدا کرد دانیشن باسی بکەن و تۆڵەی لێ بکەنەوە...

گوێم دەزرینگێنەوە: کە پاشەملێ باسی بنیادەم نەکەن، چما لە خۆڕا گوێچکەت دەزرینگێتەوە؟ بۆ تۆڵەکردنەوە مەخسەرەی دەکەن. بۆ نەیانکوشت؟ لەبەر ئەوەی هەتا دوایین هەناسەی ژیانی، هەتا ڕۆژی قیامەتێ مەخسەرەی پێ بکەن. ئەی لەو بەرازانە؟ دوژمنی قەستە سەرن. وەك وشتر بە کین و بوغزن. هەی کافرینە."

بڕێك سوکنایی هاتبوو. بۆشاییەکەی ناخی لەناو چووبوو. خەوی لێ کەوت.

کەڕەی بەیانی لە خەوێ هەستا. بە دزییەوە لە عەمبارەکەوە ملێکی کێشا. بووکەکەی لە تەنیشت ئاگردانەکەوە دانیشتبوو و خەریك بوو چێشتی لێ دەنا. بۆنی کرد. ترخێنە بوو. "ئەو دەزانێ مام خەلیل کەیفی بە ترخێنە دێ. چما لێی دەنێ؟ تۆڵە دەکاتەوە. دوای ئەوە ئیدی لەو ماڵەدا ترخێنە لێ نانێتەوە. حاڵەتێکی گەپجاڕانە لە ڕوخساری بووکەکەیدا دیار بوو. لە دڵی خۆیدا خەریکە گاڵتەی پێ دەکا. سەیری ئەو منداڵانەی... توتکە سەگینە. ئەوانیش لە بنەوە خەریکن پێدەکەنن. بە مام خەلیل پێ دەکەنن." بڕێك دواتر حاجی وەژوور کەوت. نوقمی شادی بوو. زاری تا بن گوێی داپچڕیبوو:"ئاخ حاجییە چڵمن، ئەویش بەبابی خۆی پێ دەکەنێ. ئەو کوڕەی بە شیری پەلەوەر گەورەم کرد. لە زاری خۆمم گێڕایەوە. حاجی، ئەتۆش خەریکە بە بابت پێ دەکەنی؟"

چاوی لە ژێڵڵا هاتن و بە تووڕەییەوە گوڕاندی:

ـ حاجی ئەوە بەچی پێ دەکەنی؟ خەریکی گاڵتەم...

لە ناکاو بێدەنگ بوو و دەنگی نەرمتر کردەوە و گوتی:
- کوڕی خۆم حاجی گیان.
دەترسا پرسیارێ بکا، بەڵام نەشیتوانی دان بەخۆیا بگرێ و لەسەری ڕۆیی:
- کوڕم حاجی گیان. وەرە لای خۆم. بابت دەیەوێ شتێکت لێ بپرسێ. وەرە کوڕە باشـەکەی خۆم.
حاجی پێی سەیر بوو بابی بۆ وا لە ناکاو گـۆڕا. لـە عەمبارەکـە چـووە پـێش. لـە دەرگـای ماڵەکەوە بەفر دەهاتە ژوورەوە و تۆزێکیش ڕووناکایی.
- ڕۆڵە لە کوێوە دێی؟ سەر و ڕدێن و برۆکانت بەستوویەتی. لـەو بـەفر و بۆرانـەدا لـە چـی دەگەڕێی ڕۆڵە؟ سەرمات دەبێ. لـەو سـەرما و سـەخڵەتەدا وەردە مەکـەوە، نـەخۆش دەکـەوی کوڕی خۆم. لە کوێ دێیەوە؟ دەنگ و باسی عادیل؟
حاجی گوتی:
- گوندییەکان چاوەڕێن. عادیل هێشتا نەهاتووە.
- ئەی خولێکی نێو ئاواییت لێ دا؟ کێت دی؟ دەڵێن چی؟
- جا بڵێن چی بابە گیان. دانیشتوون و چاوەڕێن. لە چاوەڕوانیدا خەریکن شێت دەبن.
- تاشباش دەڵێ چی؟ مەمەد تاشباش ئۆغلو؟
- جـا بڵـێ چـی بابـە. یـەك پـشوو جنێـو بـە گوندییـەکان دەدا و قـسەیان پـێ دەڵـێ. گوندییەکانیش بۆ ئەوەی گوێیان لێی نەبێ، هەر گوێیان داخنن. خۆزگە گوللەیـەکم وێکـەوێ و گوێم لە یەك قسەی تاشباش ئۆغلو نەبێ.
مام خەلیل قسەی بە کوڕەکەی بڕی و گوتی:
- جارێ وەرە. بڕێك وەرە لام ڕۆڵە. دەمەوێ شتێکت لێ بپرسم.
حاجی لە دەلاقەکەی عەمبارەکەوە بەرەو لای بابی داهاتەوە:
- فەرموو بابە.
مام خەلیل بە ئحم ئحم گوتی:
- ڕۆڵە حاجی، ئـەو گوندییانـە دوێ شـەوێ هـەتا بـەیانی، باسـی منیـان کـردووە. وام بیستووە. کەرەی بەیانی دورسون لێچ شۆڕ، هاتبوو دەستم ماچ بکا. گـوتی: گوندییـەکان هەتا بەیانی نەنووستوون. هەر باسی منیان کردووە و پێکەنیون. بەو جۆرە تۆڵـەی خۆیـان لە من دەکەنەوە. وا نییە؟

حاجی گوتی:

- بابە، چما شێت بووی؟

حاجی بیری بۆ هێندێ شت دەچوو، بەڵام نەیدەزانی چییە؟ لەسەری ڕۆیی:

- گوندییەکان بۆ دەبێ باسی تۆ بکەن؟ بۆ دەبێ بەتۆ پێ بکەنن؟ ئەوان بە دەردی خۆیانەوە دەناڵێنن. لە خەم و خەفەتی هاتنی عادیل ئەفەنیدا خەریکە شێت دەبن. ئەوان چما تاقەتی پێکەنینان هەیە تابەتۆ پێ بکەنن؟ هێندە پێش مەبەوە بەرخۆت. گوندییەکان چ کاریان بەتۆیە. هەر لەبیریشیان نەماوی. ئەمن لە هیچ کوێیەك تەنانەت یەك قسەشم لەسەر تۆ نەبیستووە. "دورسوون لیچ شۆڕ" کەڕەی بەیانی بۆ هاتۆتە ئێرە؟ ئەو هەر قەت نایەتە ماڵی ئێمە... بابە بڕوات بێ گوندییەکان قەت بەتۆ پێنەکەنیون. هەر کەسیش وای گوت بڕوا مەکە.

مام خەلیل ئەوەندەی تینی هەبوو گوڕاندی:

- بێ دەنگ بە هەی چڵمن. حاجییە درۆزن. ئیدی نەمدوێنی...

لەبەرچاوم ون بە.

حاجی گوتی:

- بابە، ئەوە شێت بووی.

و وەدەر کەوت.

مام خەلیل هێزی لەبەردا نەمابوو. لە جێوبانەکەیدا کەوت. نیوە گیان ببوو. بەدەستی ڕاستەی خۆی، دەستی چەپەی گرت و گوشیی. دوایی باسکی خۆی گرت. بە هانکەهانکەوە لەبەرەخۆیەوە دەیبۆڵاند.

بووکەکەی شۆرباوی بۆ هێنا. مام خەلیل نەیخوارد. بووکەکەی دایە بەر جنێوان. بووکە هیچی نەگوت و بەوەش ئەوەندەی دیکە شێت بوو.

مام خەلیل هەتا ئێوارێ هەروا جینگڵی دەدا. دەتگوت گیانی دەردەچێ. بیری لە ڕۆژانی ڕابردوو کردەوە. لە ڕێگری و چەتەییەکانی و لەو ئەسپانەی دزیبوونی. لە کێڵگەی لۆکە و لە تف کردنی گوندییەکان لە دەموچاوی. بیری لە هەموو شتێك کردەوە. نەیتوانی لە هیچ کوێ پاڵپشتێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە. هەموو گوندەکە و لە هەموو دنیا. بەفر و بۆران و سەرمای بە دوژمنی خۆ دانا، بەڵام دیسانیش نەبوو. پەنای بردە بەر خودا. دوعای کرد. برێك وەخۆی هاتەوە. خراپەکارییەکانی هێنایەوە پێش چاوی. بیری لە جەحەندەم کردەوە. لە سووتانی لە جەحەندەم دا. لە بەربوونەوەی لەسەر پردەکەی سیراتەوە بۆ نێو دەریای ئاگر... لەگەڵ هەمووی

ئەوانەشدا بیری ئەوەی گوندییەکان نەیانکوشتبوو و گاڵتەشیان پێ کردبوو، لە مێشکی نەدەچووە دەرەوە.

لە ناکاو بیرێك بە چێژێکی سامناکەوە هەموو گیانی داگرت. لە ناکاو لە جێیەکەی دەرپەڕی و لە عەمبارێ وەدەر کەوت. پێدەکەنی. یەك بە یەك نەوەکانی لە ئامێز گرت و ماچی کردن. تەنانەت بووکەکەشی ماچ کرد. خەریك بوو لە برسان دەمرد. گوتی:

ـ بووکە جوانەکەم. بووکە ڕەسەنەکەم. شتێکم لێت دەوێ. ترخێنەیەکم بۆ لێ بنێ و ڕۆنیشی زۆر تێ بکە. تەعناشی لێ دە. با بۆن و بەرامەیەکی هەبێ، هەموو ئاوایی داگرێ. ئەگەر بیبەری سوورت دەستکەوت تۆزێکیشی لەو تێ کە. بۆمی دەکەی بووکەکەم؟

فاتێ گوتی:

ـ چۆن نایکەم بابە. زۆر زۆر بەتامتر لەوەی دەڵێی، لێی دەنێم.

مام خەلیل دڵی خۆش بوو و دەستی بەسەریدا هێنا. گوتی:

ـ با ئەمن بچم خولێك بە نێو ئاواییدا لێ بدەم. با بزانم بەو بەفرە گوندەکە چۆنە. لەبیرم چۆتەوە. با بچم بیبینم.

چاوەکانی ترووسکەیەکی فێڵبازانەی پێوەبوو. گیانێکی بەبەردا هاتبۆوە.

فاتێ بەخۆی گوت:

ـ بیست ساڵ لەمەوبەر ئاوا بوو. ئێستا دیسانیش وای لێ هاتۆتەوە.

مام خەلیل گورج خۆی خستە دەرێ. باهۆز و ڕەشەبایەکە وردە وردە زیاتر دەبوو. دیار بوو دیار بوو شەوێ باڕنێکی توندی پێوە دەبێ. لە دەرەوە زیندەوەرێك دیار نەبوو. وردە وردە بەسەر بەفرە بەستووەکەدا دەڕۆیی. لە مەودای نێوان ماڵەکاندا هیچ بوونەوەرێك دیار نەبوو. هەوا بوولێڵ بوو. هەموو گوندەکە گەڕا. تەنیا یەك شتی دەویست. هەر ئەوەندەی بەس بوو یەك نەفەری گوندەکە ببینێ. لەبەر دەمی دەرگای ماڵەکان ڕاوەستا، بەڵام کەس ئەوی نەدی. تەنانەت منداڵێکیش سەری بەدەرێدا نەدەکرد. ئاخری چوو و لە ماڵەکەی تاشباش ئۆغڵوی دا. تاشباش دەرگای کردەوە. ڕوخسارە مرچ و مۆنەکەی تاشباش بە دیتنی مام خەلیل گەشایەوە.

گوتی:

ـ فەرموو مام خەلیل. بەخێر بێی. خێر و بەرەکەتت هێنا. دەنگ و باست؟

مام خەلیل گوتی:

- نامەوێ دانیشم ڕۆڵە. دەمەویچ شتێکت لێ بپرسم. گوتم با دەورێکی نێودێ لێ بدەم. ماڵ بە ماڵی ئەو گوندە بکەم... دڵم بۆ گەندەکە توند ببوو... گوتم با بچم شتێك لە تاشباشەکەی خۆم بپرسم. گوتم، "تاشباش خۆشی دەوێم."
- ئەی دیارە مام خەلیل، خۆشم دەوێی.
- عادیل لەوانەیە بێ؟ بێ و گوندەکە تالآن بکا؟
تاشباش نێوچاوانی تێك نا. ئەو ئاگرەی لە ئاگردانەکەدا بوو، لایەکی ئەو دەموچاوەی ڕووناك دەکردەوە. گوتی:
- مالم خەلیل... دێ و دار و نەدارمان دەبا. چاریش نییە. فەرموو وەرە ژوورەوە.
- جارێ خەریکم پیاسەی دەکەم. دوایی دێم... دوایی دێم تاشباشی خۆم. گەردنم ئازاد بکە.
کاتێ گەردن ئازایی دەخواست، دڵی خۆش بوو. چاوەڕێی دژکردەوەی تاشباش بوو. تاشباش بەبێ ئەوەی گوێی بداتێ گوتی:
- چما دەتەوێ بچیتە شوێنێك مام خەلیل؟
مام خەلیل بە خەفەتەوە گوتی:
- نا، ڕۆڵە، بەو تەمەنەوە بۆ کوێ، بەو بەفر و بۆرانە دەتوانم بچمە کوێ؟ هەر وا گوتم...
دەنگەکەی لەبزێکی تەوساویی پێوە دیار بوو. گوتی:
خودا سەلامەتت بکا تاشباش. وەرسووڕایەوەو ڕۆیی.
ئەمجارەیان نەیگوتبوو تاشباشی من. لەبزێکی ڕقاویی هەبوو. دەتگوت دەیەوێ بلێ:"پێتان.... پێتان دەڵێم." تاشباشیش هەستی بەوە کرد.
کە دەهاتەوە ماڵێ، لە دوورەوە بۆنی ترخێنەکەی بەسەردا هات. دەست و پێ و گوێچکەی لەسەرما سڕ ببوون. سمێڵەکانیشی بەفر دایپۆشیبوون. لەبەر دەرگاکە بەفری سەر و ڕدێنی لێ کردەوە و وەژوور کەوت. فاتمە بە دڵێکی خۆشەوە گوتی:
- بابە، ترخێنەیەکم بۆ لێناوی لە ژیانمدا شتی وام لێنەناوە.
مام خەلیل دیسانیش دەستی بەسەریدا هێنایەوە و ماچی کرد. نەوەکانیشی یەك بە یەك لە باوەش گرت و ماچی کردن. کوڕەکەشی لەباوەش گرت و ماچی کرد و بۆنی پێوە کرد. دوایی دەمودەست لەسەر سفرەکە دانیشت. هەر کەوچکێکی بۆ زاری دەبرد، لە چێژ و لەززەتێکەوە دەیگوت:"ئۆخەیش". " ئۆخەیش ئاخوا دەستت خۆش بێ کچم. ئەمنیش لە ژیانمدا چێشتی وا

به تامم نەخواردبوو، کچم." لەگەڵ تەواوکردنی چێشتەکە، دەسبەجێ خۆی خستەوە نێو عەمبارەکە و چۆوە نێو نوێنەکانییەوە و لێفەکەی بەسەرخۆیدا کێشا.

شەوگار شەق ببوو. لە ماوەیەك لەوە پێشەوە مام خەلیل گوێی هەڵخستبوو. "لێیان گەڕێ با بنوون. جوان بخەون. بخەون با بزانن مام خەلیل چییە و کێیە. مام خەلیل بۆیان دەسەلمێنێ."

مام خەلیل تەنانەت گوێی لە ترپەی پێی مێروولەش دەبوو. شانازیی بەو گوێچکەیەشەوە دەکرد. ئەوە هەر ئەو گوێچکەیە بوو کە ئەوی کردبووە سەردەستەی چەتەکانی ئەسلان ئاغا. ئێستاش هەناسەی خەوتووەکانی هەڵدەسەنگاند. هەناسەی ئەوەی ئەنووستووە جیاوازە لەگەڵ هەناسەکێشانی ئەوەی لە خەوێکی قورس دایە. چاوەڕێی بیستنی هەناسەیەك بوو کە نیشانەی خەوێکی قووڵ بێ. سات بە سات شادییەکەی ناخی زیادی دەکرد. هەم چاوەڕوان بوو و هەمیش بە زەحمەت خۆ لە گۆرانیگوتن و سەماکردن دەبوارد. کاتێ یەکەمین کەڵەشێرەکان، واتە کەڵەشێرەکانی نیوەشەوێ خوێندیان، دیتی چووکترین جووڵە نییە. هەمووان لە شیرن خەوێدا بوون. دەتگوت خۆڵی مردووانت بەسەردا کردوون.

"یاڵڵا دەی مام خەلیل. باشترین دەرفەتە. دەبێ مام خەلیل بناسن. بزانن مام خەلیل کێیە."

کە ناوی خۆی دێنا، کەیفی ساز دەبوو. لەرزینێکی خۆشی لە ناخی خۆیدا هەست پێ دەکرد. بەبێ ئەوەی بەئاستەم خشپە و ترپەی بێ، لە عەمبارەکە دەرپەڕییە دەرەوە. لەمێژبوو، لە سەردەمی ئەسلان ئاغاوە، پەستەکێکی دەستچنی هەبوو، دەستکاری کوردەکانی ئۆزوون یایلا بوو کە نەیدەهێشت هیچ کەس دەستی بۆ بەرێ. لە یەخدانەکەدا و لە بن هەموو شتەکانەوە و لە نێوان پریاسکەکانی جیازەکاندا بوو. چوو و بەخێرایی دەریهێنا. چەکمە لبادییەکانیشی لە پشت دەرگاکەوە دانرابوون. ئەوانیشی لەپێ کردن. هەر هەموو ئەو کارانە لە چاوترووکانێکا بوون. دەچووە دەرێ. لەگەڵ وەدەکەوتنەکەی، کرێوە و ڕەشەبایەك کە وەخت بوو بەعەرزی دا بدا، بەپیرییەوە هات. چەند جاران بە هێزی کرێوە و بۆرانەکە، بەلادا هات. خۆی گرتەوە:"بە لەعنەت بی، مام خەلیل زۆری لەو بەفر و بۆرانانە دیتووە. وا نییە؟" تفت هەڵاویشتبایە دەیبەست. هەر دەتگوت ئێرە گوندی یالاك نییە و قەراغ دەشتایی نییە و دەتگوت ئەو کاولبووە لەسەر لووتکەی چیای تەکەچەوەیە.

دارەکەی لە ماڵەوە لەبیر چوبوو. هیچ خواردن و پێخۆریشی هەڵنەگرتبوو. ڕێبواری بێ پێخۆر و نان و شەقارتە، چ بەڵا و نەهامەتییەك خراپە ئەوەی بەسەر دێ.

بەبێ ئەوەی دەنگەی دەرگاکە بێ، دیسان چۆوە نێو ماڵەکەوە. نان لە سفرە و پەنیریش لە کووپەکەدا بوو، هەڵێگرت و لە دەسرۆکەیەکی پێچا و لە پشتی توند کرد. دارەکەشی کە لە پشت دەرگاکەوە بوو، هەڵگرت و بەبێ دەنگی وەدەر کەوت.

بۆرانەکە وردە وردە وەحشیتر دەبوو. دیسانیش وەك بەردێك بەدەموچاوی کەوت. گوێی نەدایە. بە هەنگاوی خێرا و پشت لە با و بۆرانە تووڕەکە، وەڕێ کەوت. مام خەلیل دەیویست ڕێ و ڕاست بەرەو باشوور بڕوا.

ئەو دەمەی لە عەمبارەکەدا گوێی لە دەنگی هەناسەی نوستووەکان هەڵدەخست، هەستی کردبوو تۆفانێکی پڕ لە بەڵا و نەهامەتی لە دەرەوە و لە دەشتەکەدا شێتانە دەلوورێنێ، بەڵام نەیتوانیبوو مەزەنەی ئەوە بکا ئاخۆ با و بۆرانەکە ئاوا بە تووڕەییەوە هورووژم دێنێ. تاریکەسەلاتێك بوو هەر مەپرسە. ماڵەکان بە زەحمەت دەبینران.

"دەی باشە. لە پشتەوە لە کەپەنکەکەی دەدا. ئەو کەپەنکە دەتگوت بەردە. دەست و نەخشی کوردەکانە. تۆزقاڵێك سەرما چییە کاری لێ ناکا."

کە لە گوندەکە وەدەر کەوت، لە نێو با و بۆرانێکدا کە شێتانە لە هەر چوار لاوە هورووژمی دێنا، گرفتار بوو. ساتێك تەنانەت نەیتوانی هەنگاوێکیش هەڵێنێ. بیرێکی هیوابڕاوانە وەك برووسکەیەك بە مێشکیدا تێپەڕی:" چۆنە بگەڕێتەوە؟" کەچی دیسانیش خۆشحاڵییەکەی زاڵ بۆوە. "بەیانی گوندییەکان لە خەوێ هەڵدەستن و دەبینن مام خەلیل نەماوە... بەڵێ، سەیر دەکەن مام خەلیل دیار نییە. لە خۆیان دەپرسن لەو بەفر و بۆرانەدا چۆن ڕۆیوە؟ ئەگەر ڕۆیشتووە بەرەو مەرگ ڕۆیشتووە و ئەگەر نەشرۆیوە، ئاخۆ بۆتە دووکەڵ و بە ئاسمانێدا ڕۆیشتووە یان بۆتە ئاو و عەرز قووتی داوە." سەرسووڕماوییەکەی گوندییەکانی هێنایە پێش چاوی. ئەو هێزەی لە ناخیدا بوو هەڵچوو و مچوڕکەی گەرم هەموو جەستەی تەنییەوە."

بە دەنگێکی بەرز گوتی:"کوڕە هەرچی دەبێ با ببێ چش. ئێستا کە گیانی شیرنتت تووڕ داوەتە دەرەوە، لێگەڕێ با لەوەش خراپتر بێ. تەنانەت ئەو ئاسمانەش یەکسەرە ببێتە بەفر و بەسەر زەوییەکەدا بباریێ، یان ببێتە باڕن و بۆران و بەسەر عەرزەکەدا داڕمێ."

بە دڵێکی خۆشەوە کەوتە ڕێ. کە لە شیوەکە ئاودیو دەبوو، باڕنەکە بڕێك کەمتر بۆوە. ئەوە دڵی خۆشتر کرد. هەنگاوی خۆشتر کردن:"لە هەوایەکی ئاوادا دەبێ خێراتر بڕۆی. ئەگینا بە داهێزراوییەوە دەتبەستێ و تێدا دەچی."

چیی وای نەمابوو تەواو لە شیوەکە بچێتە تەختایی، بارنەکە ئەوەندە بەتەوژم بوو و لە هەرچوار لاوە هورووژمی کرد، بۆ ماوەیەك ڕێگەی لێ ون کرد. لە ناکاو دیتی گەڕاوەتەوە و بەرەو ئاوایی هەڵدەکشێتەوە. دەسبەجێ ڕێگەی خۆی دۆزییەوە و بەرەو خوارەوە کەوتەوە ڕێ. تێگەیشت ڕێی لێ هەتلە بووە. دیسان بەهەڵە چووبوو. ئاخۆ مام خەلیلیش هەڵەی دەکرد؟... بەڵێ هەڵەی کردبوو... ئەگەر ئەو بەردەی دۆزیبایەوە کە بە بەرد قوتە بەناوبانگ بوو، دەیتوانی ڕێگەکەی خۆی بدۆزێتەوە و ئەگەر بۆرانەکەش برێك خۆشی کردبایەوە..، بەڵام لەبری ئەوەی کەمتر بێتەوە هەر دەهات و بە تەوژمتر دەبوو:"لێی گەڕێ با توندتر بێ." بەرەو ڕاست چوو و بەرەو لای چەپ گەڕایەوە، بەڵام دەیزانی یەك هەنگاویشی بۆ پێشەوە نەناوە.

دڕدۆنگ بوو. ترسێك دڵی داگرت. چۆنە بگەڕێتەوە؟ وا لەو فکرەی ترسا کە هەموو هێزی بیرکردنەوەی خۆ کۆ کردەوە، بەخێرایی ڕووە و بەردە قوتە[1] وەڕێ کەوت. لەتوپەتی سەهۆڵەکە لە لاملییەوە دەخزانە خۆارەوە. ملی کێشایەوە ناوەوە. لە ناکاو گەیشتە شوێنێك کە تەواو هێمن بوو. بۆران و کرێوە و بارن نەیدەگرتەوە. بیری کردەوە:"ئێرانە شوێنی ئاوای زۆرە. واباشە لێرە پشوویەك بدەم..."

لەسەر بەفرەکە دانیشت.

"ئەو خوارە شیوەدرێژەیە. بەهارێ بوو کە تەرمەکەی کوڕەکەی وەلی سونبولیان لێرە لە بن ڕەوەزێك دۆزییەوە. تازە خەتی لێ دابوو. هەر دەتگوت کڕنۆشی بردووە. گرمۆڵە ببوو و هەر بەو جۆرەش بەستبووی. بەفرەکەی سەر دەموچاویان سڕییەوە. دەتگوت پێدەکەنێ. ئەوەندە جوان مابۆوە هەردەتگوت ڕایوەشێنی وەخەبەر دێ. لە ئەژمار نایەن ئەوانەی لە شیوەدرێژدا ڕەقەڵاتوون. هەر ئەستێرەیەك بەئاسمانەوە بوو. شەوێکیان کاروان ڕێگەی کەوتبووە شیوەدرێژەوە. کاروانێکی ڕێ لێ ون بوو. جگە لە ئەستێرە ڕێنوێنی نەبوو. ئەوان ڕووە و ئەستێرەکان ڕۆیشتن و ڕۆیشتن. ئێستاش نەگەینە کازیوە. کە بەهار داهات، هەر هەموو کاروانەکەیان لە شیوەکەدا دۆزییەوە. ئەسپ و ئێستر و گوێدرێژ و بنیادەمەکان بە پێوە، هەر دەتگوت ئامادەی ڕۆیشتنن.

---

[1] ناوی ئەو بەردەم گۆڕیوە. لە دەقە فارسییەکەدا باسی بەردێك دەکا کە وەك "دەسکاونگ"وایە. بەوپێیە دەبووە بەرداونگ. "سنگ هاون". ئەمن وام پێ جوان بوو ناوی بنێم بەردە قوتە.

مام خەلیل دەیزانی ئەگەر لەو پەناگە و پەسیوە بە ئارامی بێتە دەرێ، لەو خوارەوە تووشی با و بۆران و کرێوە و بارنێك دەبێ، کە زەویی لەبەری دەلەرزێ. دەیتوانی هەتا بەیانی لەوێ بمێنێتەوە و بەیانی وەرێ کەوێ، بەلام نا، نەدەکرا. رێبوار دەبێ رێی خۆی ببڕێ.

بە زەحمەت لە جێی خۆی هەستا. تێگەیشت وردە وردە خەریکە دەیبەستێ. بەخۆی گوت:"باش بوو هەستام."

بەردە قوتە برێك لە خوارترەوە بوو. لەو بەریشەوە شیوەدرێژە. خۆ ئەگەر هەتا بەیانی ئەو هەوایە رۆیبایە، لەوانەبوو بتوانێ لە شیوەکە بپەڕێتەوە.

باشە گوندییەکان دەڵێن چی؟ دەڵێن بە دەستی خۆی، خۆی خستووەتە شیوەدرێژەی پڕ لە بەفر و ڕەشەباوە و بووەتە سەهۆڵ و مردووە. ئەگەر بتوانن تەرمەکەی لە بەهاریدا دەدۆزنەوە. بەستوویەتی و چۆکی داداوە، وەك ئەوەی کڕنۆشی بردبێ. ئەی ئەودەم دەڵێن چی؟ دەڵێن: مام خەلیل، کابرایەکی موسوڵمان بوو. پیاوچاك بوو. ئەوەتا لە سەر نوێژێ مردووە. سەیرە کە زیندووش بوو سەری بە فەرزێ خوادا نەدەدا...."

هەرچی کردی و کراندی نەیتوانی شوێنی بەردە قوتە بدۆزێتەوە. ماوەیەك بە دەوری خۆیدا خولایەوە، بەلام گەیشتبووە ڕاستایی شیوەکە. ئەگەر ویستبای بگەڕێتەوە، هەتا بەیانیش نەیدەتوانی ئەو هەورازە ببڕێ کە پێیدا هاتبووە خوارێ... بە هەموو تینی خۆیەوە دەیویست بێتە سەر ئەوەی کەسیرە دەبێ و دەیبەستێ و دەمرێ و هەتا بەهارێش لەو تەختایی شیوەدرێژدا و لە بن بەفرێدا دەمێنێتەوە. لە ناکاو برواشی هێنا. لە لای چەپی شیوە درێژەوە، دارستانێکی کاژ هەبوو و خۆیشی شقارتەیەکی لە گیرفانیدا بوو. پڕ بوو. هەڵنەپچڕابوو. لە ماڵێ دزیبووی. لەو شوێنەی فاتمە شاردبوویەوە. مام خەلیلی سەردەستەی چەتە و ڕێگران، ئەگەر نەتوانێ قوتووە شقارتەیەك کە ژنێك، ئەویش ژنێکی کە لە ماڵەکەی ئەو دایە، تاقەتی کردووە، بدۆزێتەوە، دەبێ ناوی خۆی بگۆڕێ. ئەگەر بەفر و وەیشوومە بیکاتە قیامەتیش، هەر ئەوەندە بەسە مام خەلیل باوەشێك پووش و پەلاش بدۆزێتەوە. خۆی دەزانێ چۆن ئاگر دەکاتەوە."

ئەو باوبۆرانەی لە دەشتەوە هەڵی کردبوو، لە تەختایی شیوەکەدا زۆر هارتر و دڕتر ببوو. وەك گەلایەك ئەوی بەولاولادا دەدا. کە گەیشتبووە تەختایی شیوەکە، باش تێگەیبوو کە ئەو تۆفان و وەیشوومەیە گاڵتەی پێ ناکرێ و لەو جۆرانەیە وا بێ ئەولاولا کەسیرەت دەکا و دەتکوژێ. کە ئەوەی زانیبوو، بۆ ساتێك خۆشی و شادییەکەی کلپەی سەند، بەلام دەست و قاچی خەریك بوو کەسیرە دەبوو و ئەوەیش تۆقاندی.

لە ناکاو لە جێی خۆی چەقی. چەناگە بێ ددانەکەی وێـك کـەوتن. بـەخۆی گـوت:"ئـەوەی بنیادەم دەکوژێ، ترسە، نەك بـۆران." هـەموو هێـزی خـۆی کـۆ کـردەوە و لـە شـیوەکە چـووە خوارێ. خۆ تاقە یەك ئەستێرە بە ئاسمانێوە بایە، بەس بـوو. ئـەویش نـەبوو. تـازە چـاو چـاوی نەدەدی. باشە بۆ ئەو جێوبانە گەرم و نەرمەی بەجێ هێشتبوو و خۆی خستبووە باوەشی ئەو با و بۆران و وەیشوومە دڕەوە؟

لێرە ڕاست لە چەقی شیوەکەدا و لە سەرخاڵی مەرگ ڕاوەستابوو. ئەوانـەی هاتبوونـە ئـەو شیوەوە، دوای ئەوەی گەیبوونە خاڵی مەرگ، هەرگیز نەیانتوانیبوو بچنە دەرەوە.

بەردەوام بیری لەوە دەکردەوە بگەڕێتەوە. بگەڕێتەوە ئاوایی و لەو مەرگە خۆی ڕزگار بکا کە لەسەر ڕێگەی بـوو. گەیـشتبووە بـەر دەرگـای مـەرگ. مـەرگ ئەسـتەم و دژوار بـوو. مـەرگ گەورەترین بۆشایی بوو. ئەوەی لە ڕەگ و پێستیدا هەست پێ دەکرد. دەسـتی کـرد بـە هـات و هاوار. ماوەیەك هەر هاواری کرد، بەڵام نەیدەتوانی بگەڕێتەوە و بە هـاوار هـاوار هـەتا نـاخی شیوەکە دەڕۆیشت و هێزێك لە پشتەوە پاڵی پێوە دەنا.

هەر بەڕاست لێرەوارەکە لە کوێوە بوو. هەموو هۆشی خۆی کۆ کردەوە و هەوڵی دا شـوێنی دارستانەکە بدۆزێتەوە. لە ناکاو دیسان ڕاوەستا و هەموو گیانی کەوتە لەرزین.

سەردەمانێك لە چوکووراوا لە ڕۆژێکی گەرمدا، لـە بـن دارە توویـەکی تـۆزاوی... شـەو و ڕۆژێك نوستبوو... ئێستا حەزی لێ بوو بنوێ. دەشیزانی ئەگەر بنوێ دەمرێ، بـەڵام خـەوێکی قورس و زاڵ وا دایگرتبوو کە دەیویـست هـەر لـەوێ لـە نـاخی ئـەو سـەرمایەدا بنـوێ، بـەڵام مەرگ... دەی باشە.

ساوایەکی مردووی هاتە پێش چاوی. هەر وەك زگی بە سـاوا مردووەکـە دەسـووتا، ئـاواش زگی بەخۆ سووتا. "لەو پێشەوە بەردێکی قووڵی لێیە. سەر بەردە قووڵەکە سێ داری لـێ بـوو. لك و پۆی وشك ببوون. لە قووڵایی بەردەکەدا ئاگرێك دەکەمەوە و لە تەنیـشتی لێـی دەنـووم. بەردەقووڵەکە ئە لێرەیە. لە پێشەوە برێك لە پێشمەوە."

باهۆزەکە دەلوورێنێ. خەویش وەك ئاوێکی شلەتێن هـەموو گیـانی دادەگـرێ. تاقـەتبڕە... ئەو چێژەی خەوتنە، لە هەموو چێژەکان خۆشترە. مام خەلیل. مام خەلیل، زۆر لە مێـژ سـاڵە، مام خەلیل کە ئەو هەمووە باو و بۆران و وەیشوومەیەی دەیتبـوو، چـما نەیـدەزانی ئـەو خـەوە ڕێگەیەکە بەرەو مـەرگ؟..، بـەڵام دەخـەوت. لەوانەشـە مـام خـەلیل خۆشـترین چـێژی ژیـانی دەچێژێ. خەو وردە وردە و بەهـەموو هێـزەوە دەیباتـەوە. لـەو چـێژە لـە جەسـتەیدا، دەخزێتـە

مووده‌ماره‌کانیشییه‌وه. چیی به‌فر و بارِنه‌که به ته‌وژمتر ده‌بیّ، مام خه‌لیل به‌ره‌و به‌هه‌شتی خه‌وه‌که‌ی ده‌روا و هه‌لّده‌فریّ... جه‌سته‌ی سووکتر ده‌بیّ، به‌لاّم دیسانیش به‌رِیّدا ده‌روا.

خه‌و قورسایی ده‌خاته‌سه‌ری و ئه‌و بۆ ئه‌وه‌ی دانه‌نیشیّ و هه‌ر له‌ویّ رانه‌کشیّ و نه‌خه‌ویّ به زۆر خۆی راده‌گریّ. ئه‌و که‌په‌نه‌کی پێیه. ده‌بیّ خۆی به جوانی له که‌په‌نه‌که‌که‌ی بپێچیّ. لاقه‌کانی کۆ بکاته‌وه و خۆی گرمۆلّه بکا. وا گرمۆلّه بیّ ئه‌ژنۆکانی بگه‌نه چه‌ناگه‌ی. ئاوا هیچ سه‌رمایه‌ك نایگاتیّ. به‌یانیش مام خه‌لیل دۆستی سه‌رما و به‌فره‌کان که خه‌وی خۆی کردووه، ساغ و سلاّمه‌ت و گه‌ش له خه‌ویّ هه‌لّده‌ستیّ.

به‌لاّم ئه‌گه‌ر به‌فرێکی زۆر بباریّ و ئه‌و نه‌توانیّ له بنی بێته ده‌ریّ چی؟...

به‌فر بنیاده‌م گه‌رم ده‌کاته‌وه. ده‌ست و پێی بێهێز بوون... ئیدی ده‌بیّ دانیشیّ و بنویّ. بۆ جارێکی دیکه‌ش هه‌موو تینی ده‌داته خۆی. هێنده‌ی نه‌ماوه بۆ به‌رده قوولّه‌که:"خودا غه‌ززه‌بت لیّ بگریّ. له‌و تاریکی و به‌فر و بۆرانه‌دا چما ده‌کریّ ئاوا سووك و ئاسان به‌رده‌قوولّکه بدۆزیته‌وه؟ وا باشتره هه‌ر لێره راکشێم و لێی بنووم."

وه‌ك ئه‌وانه‌ی به‌ده‌م خه‌وه‌وه ده‌رِۆن، به‌لادا ده‌که‌وت. با و بۆرانه‌که بۆ هه‌موو لایه‌کی ده‌با."ئاگرکردنه‌وه له قوولاّییه‌که‌ی به‌رده‌قوولّکه‌دا... ئاگرێکی گه‌وره... سووتاندنی داره‌کانی به‌رده‌قوولّکه..." ده‌ستی راسته‌ی له گیرفانیدا به شقارته‌که‌وه‌یه:"نان گه‌رم کردنه‌وه له‌سه‌ر ئاگره‌که و خواردنی و دواتریش راکشان و خه‌وتن..." خه‌ریکه شێت ده‌بیّ.

بیری ئالۆزی و خۆرِایی... ئیدی نازانیّ به‌ره‌و کامه لا ده‌چیّ... به پێوه وه‌نه‌وز ده‌دا. ها ئێستا بکه‌ویّ ها تاوێکی دی. مام خه‌لیل له ناکاو هه‌ست ده‌کا که‌وتووه‌ته بۆشاییه‌که‌وه. سه‌یر ده‌کا له‌سه‌ر سه‌هۆلێکی ئه‌ستوور و ره‌قه. ئازاری باسکی ده‌خزێته ناخییه‌وه. ئازاره‌که ده‌سبه‌جیّ جێی خه‌وه‌که ده‌گرێته‌وه. به ده‌ستی چه‌په‌ی باسکی راسته‌ی ده‌گریّ. هه‌ست ده‌کا خوێنێکی شله‌تێن له باسکییه‌وه به‌سه‌ر ده‌ستیدا دێته خواریّ. ژانه‌که تاقه‌تبره. گورج ده‌رده‌په‌ریّ.

شادییه‌ك به‌سه‌ریدا زالّ ده‌بیّ و ده‌لّیّ:"وه‌یش ش باسکم شکا."، به‌لاّم وه‌خۆ دێته‌وه.

با و بۆرانه‌که زۆر درِه. بۆ یه‌که‌م جار گه‌وره‌یی و سامناکییه‌که‌ی ده‌بینیّ و توند خۆی له که‌په‌نه‌که‌که ده‌پێچیّ.

## ٤

"زەڵە" دەیگوت:

ـ کوڕە لە دەوری سەرت گەڕێم سەفەراغا... سەفەراغاکەی من. نازانم چیم لێ قەوماوە. خەون دیتن بێزاری کردووم. لە خەون تۆقیوم. تۆقیوم لەوەی بچمە سەر جێ. ئەوە دە ڕۆژە ئاوام.

"لە دەشتەکەی چوکووراوام. لە ژوور سەرمەوە هەورێکی ڕەش دەخزێ. هەورێکی ڕەش... ڕەش وەك قەیتەران. وەك غەزەبی خودای هەرووژمم بۆ دێنێ. ئەمنیش دەشتەکەی چوکووراوام گرتووەتە بەر و ڕا دەکەم. وەکو بای شەماڵێ دەفڕم. دوایی پشووم سوار دەبێ.

ئەوجار لە زەوییەوە ئەسپی بۆر بۆر بە ڕەوە دێنە دەرێ و دواییش ئەسپی ڕەش. زەوی دەقەڵشێتەوە و زار لێك دەکاتەوە و لە هەناوی زەوییەوە ئەسپ دەردەپەڕن. هەر ئەسپێکی کە دەردەپەڕێ، سەری قیت ڕادەگرێ و کلکی دەکاتە بەیداخ و بە چوار ناڵە و بە لینگدانێ بەرەو دەشتێ تێی دەتەقێنێ. دواییش لە لە زۆنگاوەکەی ئاقچاسازدا ون دەبن. ئەمن بە شوێن ئەسپەکانەوەم و هەورەکەش بە شوێن منەوەیە. ئەمن بە دوای ئەسپەکاندا هەرادەکەم:"کوڕە ڕاوەستن، لانیکەم یەکێکتان ڕاوەستن. ئێوە ویژدانتان نییە؟ دین و ئیمانتان نییە؟" لە قەڵشەکەی زەوییەوە پەیتاپەیتا ئەسپ بە ناڵی بریقەدارەوە دێنە دەرێ. ڕێك لەو کاتەدا یەکێکیان سەری لە قەڵشەکە دێنێتە دەرێ، چنگ لە یاڵی توند دەکەم. ئەسپەکە ماوەیەك بەدوای خۆیدا دەمکێشێ و ئیدی هەڵمدەگرێ. هەورە تووڕەکە بەجێ دەمێنێ. نازانم چۆن بوو لە ناکاو ئەسپەکە لە چاوان ون بوو. زۆر گەورە بوو. وەك ئاوێنە دەردرەوشایەوە.

گوتم: "ئەی ئەسپە چاو جوانەکە، لەبەرت دەپاڕێمەوە، بیکە سندووقی سەرت*، لەگەڵ خۆتم بەرە." هیچ کامیان تەنانەت سەیرێکیشیان نەکردم. لە نێو ئەو هەمووە ئەسپەدا کە لە دەوروپشتم دەخولانەوە، مابوومەوە. هەورەکەش نزیك بۆوە و شتێکی وای نەمابوو بگاتە سەرم. پەنام بردە بەر قوولکەیەك، چیی هەورەکە پتر دادەگەڕا ئەمن زیاتر خۆم بە عەرزەکەوە دەنووساند. لە ناکاو تاژییەك لە عەرزەکەوە دەرپەڕی. ئەمن خۆم خستە سەر پشتی تاژییەکە. نەمزانی چۆن بوو ئەسپەکان و هەورەکەش بەجێ مان. سەیرم کرد تاژییەکەش بزر بووە و ئەمن لە دەشتەکەی چوکووراوادا تاك و تەنیا ماومەتەوە. نە گیایەك و نە دارێك... هیچ شتێك نەبوو. سریوەی هیچ شتێك نەدەهات. هەر من مابوومەوە و دەشتێکی کاکی بە کاکی. دیسان خۆم بە عەرزەکەوە مەڵاس دا. هەورەکە هەر هات هەتا بەسەرم کشا. هەموو گیانم لە تاریکاییەکەدا نوقم بوو. لە ناکاو بینیم پەنجەرەیەکی نوور لە نێوەندی هەورەکەوە دەرکەوت. تیرێژی خۆرەکە وەك باران لەو پەنجەرەیەوە هەڵدەڕژا. لافاوێکی تیشك، هەورە ڕەشەکەی کوت کردبوو و دەخزی. چاوەکانم بە شەوارە کەوتن. ڕووناکاییەکە چاومی کزاندەوە. لە ناکاو هەورەکە تێك شکا و بوو بە دووبەشەوە. ڕەشاییەك لە نێوەڕاستییەوە هاتە دەرێ کە لێوی خوارەوەی عەرزی دەماڵی و لێوی سەرەوەی ئاسمان. خەریك بوو لە ترسانا زەندەقم دەچوو. ئەدی سەفەراغا. لەو کاتەدا بوو ڕووبارێك بەسەرمدا تێپەڕی، ئەمن لە تەختایی ئاوەکەدا مامەوە. کە بەخەبەر هاتم، شەلاڵی ئارەقە بووم. ئەوە ڕۆنیشم بۆ هێناوی. ڕۆنێك کە دە ڕۆژە کۆم کردووەتەوە. بیست هێلکەشم بۆ هێناوی... هەر ئەوەندەم لە دەست هاتووە بەخودای...

کوێخا گوێی بۆ شل کردبوو و ورد ورد، گوێی لە قسەکانی گرتبوو. گوتی:

- دەی چی دیکەش؟...

زەڵە:

- زۆرە...، بەڵام تۆ جارێ هەر ئەوەندە بڵێ..

سەفەر:

---

* سندووقی سەرت: واتە سەدەقەی سەرت. گۆڕینێکی کوردانەیە. من نەمگۆڕیوە ئاوام لە پیرەژنان و نەخوێندەواران بیستووە و دواتریش لە شیعرێکی مامۆستا هەژاردا (سواری مار) خوێندوومەتەوە. ئەو کاتەی بۆقەکە لەبەر مارەکە دەپاڕێتەوە و دەڵێ:"بیکە سندووقی سەرت.... بمکە بە بارەبەرت....

- هەوری ڕەش نیشانەی چارەڕەشییە. ئەو ئەسپانەی لە زەوی دێنە دەرەوە، ئەو گوندییە هەژار و بێکەس و بێدەرەتانانەن کە نازانن ڕوو لە کوێ بکەن و بەو هەورەڕا دیارە ئەهامەتییەکیش بەرۆکی گوندەکە دەگرێ. تاژییەکەش یانی ئەوەی، هیچ هیوایەك نییە گوندییەکان ئەجاتیان بێ و کەڵ بە موو بەندە. ئەتۆ نیشانەی هیوای... هیوایەك کە خەریکە لە دەست دەچێ. هیوای گوندییەکان... ئەو هەورە ڕەشەش کە خەریکە نزیك دەبێتەوە، ئاماژەیە بۆ عادیل ئەفەنی و نیشانەی ئەوەیە کە دێ و گوندەکە کاول دەکا. ئەو تیشکەش کە لە کەلێنی هەورەکەوە دەپژێ، هێمایە بۆ دڵە باشەکەی عادیل ئەفەنی و هەروەها بۆ ئەوەی کوێخاکەتان وای لێ دەکا دڵی نەرم بێ. ئەوناوەش کە بەسەرتا تێدەپەڕێ، یانی ئەوەی شەوێکی تاریك دەورمانی گرتووە و هێمایەکیشە بۆوەی ئەگەر گوندییەکان لەو ڕێیە نەگەڕێنەوە و وەدوای تاشباش تۆغلو بکەون، ئەوا ڕاماندەماڵێ و دەماخنکێنێ و بەردمان لێ دەبارێ. ئێستاش ئەو هەورە ڕەشە سات بە سات نزیك دەبێتەوە. بە سواری ئەسپێکی ڕەش دێ و ئێمەش وەك ئەو ڕەوە ئەسپە لە ماڵەکانمان دێینە دەرێ و ڕێی چیا و چۆڵان دەگرینە بەر. عادیل ئەفەنی واتە هەورە ڕەشەکە دێ و جگە لە من کەس لەو گوندەدا نادۆزێتەوە. ئەتۆش کە لەسەر زەوییەکە ڕاکشابووی، هێمای بۆ من. ئەمن لەبەری دەپاڕێمەوە. ئەویش وەك ئاسمان دەنەڕڕێنێ و دەڵێ ئەو گوندە پەیمان و بەڵێنی شکاندووە. ئیدی هیچ کەس متمانەی بە خەڵکی ئەو گوندە ناکا و ساتوسەوداشیان لەگەڵ ناکرێ. هەموو ئەو شتانەی دیتووتن، نیشانەن. چ بکەین خوشکێ، قەزا و قەدەر خۆی لێ ناشاردرێتەوە... جارێ ئەتۆ خەونەکانی دیکەشت بگێڕەوە...

بەیان ئەنگوتبوو. زەڵەجا هەتا نیوەڕۆیە، هەتا ئەو کاتەی کوێخا ماڵەکەی کوێخا پڕبوو لە گوندییەکان، هەر وا خەونەکانی خۆی گێڕانەوە. کوێخا سەفەریش هەموو جارێ خەونەکانی ئەوی بە خێر و خۆشی لێك دەدایەوە. زەڵەجا دڵی خۆش بوو، بەڵام ترسی هەورە ڕەشەکە دڵی دەگوشی.

کە هاتە دەرێ، یەکەم کەسێکی تووشی هات گوتی:

- خەریکە دێ. هەورە ڕەشەکە ئەوە دێ. دێ و ئەو گوندە خاپوور دەکا.

- ئەوە شێت بووی زەڵەجا؟

- بچن لە کوێخای بپرسن. خەریکە دێ...

دوایی چووە نێو دەستەیەکی ژنان:

ـ خەریکە دێ، کچێ سەربەقوڕینە... وەك تۆفان ئەوە بەسەرماندا دەبارێ... بچن لە سەفەر بپرسن... عادیل ئەفەنی خەریکە دێ.

ژنەکان دایانە پێکەنین. یەکێکیان گوتی:

ـ دا وەرە بزانم...

زەڵەجا گوتی:

ـ پێ بکەنن، پێ بکەنن قەحپەینە. نازانن چ نەهامەتییەك بەرۆکتان دەگرێ و چیتان بەسەر دێ. ئەوە دەیبینن دێ و ئەو لوێچە دانەوێڵە و رزق و رۆزییەشتان بە لێفەکەی سەر پشتتانەوە و بە ڕاخەرەکەی بن قوونتانەوە هەڵدەگرێ و دەیبا.

ژنەکان دیسان دایانەوە قاقا و پێکەنین، بەڵام ئەو ترسەش کە لە دڵیاندا هێلانەی کردبوو، زیاتر بوو.

یەکێکیان بە گاڵتەوە پرسی:

ـ دیسان خەونت دیوە زەڵەجا؟... دیسان نێرییە بزنە کێوی و کەڵە کێوی هاتنە باوەشتەوە؟ دیسانەکەش نێرییەکە توێژی خست و بوو بە گەنجێکی ژیکەڵە؟ دیسانیش عادیل ئەفەنی هاتەوە و ئەو نێرییەی کوشت، ها؟

زەڵەجا بە تووڕەییەوە:

ـ پێ بکەنن، باشە پێ بکەنن هەی کافرینە. قەحپەی حەوت هۆز و عەشیرەتان، ئەوە دێ و دەشیبینن. هەر وەك ئەوێ ساڵێ...

بە نیگای مات و خەفەتبارانەوە، زەڵەجایان ـ کە ئەو هەواڵە شووم و شەڕەی هێنابوو ـ بەڕێ کرد. جا ئەو جارە ئەو ترس و چاوەڕوانییەی ئەو هەمووە رۆژە لەسەر یەك لە ناخیاندا لانەی کردبوو، دەردەکەوت و ئاشکرا دەبوو. ئیدی مەحاڵ بوو. بە دڵنیاییەوە دەهات.... دەهات و ... جا ئەمساڵ کە لە لۆکە چنینەوە هیچیان دەست نەکەوتبوو، ئەو دەهات و پەز و گوێدرێژەکانیان و گەنم و ساوار و قاپ و قاچاغ و لێفە و ڕاخەر و حەسیر و جلەکانیشانی دەستاند و دەیبرد.

هەواڵەکە زار بەزار بڵاو بۆوە. هەموو ژنەکان، گەورە و بچووك و پیر و گەنج لە گۆڕەپانەکەی گوندی کۆ ببوونەوە و بێ دەنگ ڕاوەستابوون. ئەو بەڵایەی ئەو هەموو رۆژە لەسەر یەك تۆقاندبوونی، بەڵام هیچ کەس سەبارەت بەوە هیچ شتێکی بەویتر نەدەگوت خەریك بوو دەهات و وەك تۆفان بەسەریان وەردەبوو.

ئیدی کەس بۆی گرنگ نەبوو کە ئەو هەواڵە لە زاری زەڵەجاوە و لە خەونەکانی ئەوەوە سەرچاوەی گرتبووە. زەڵەجا ئاگری خستبووە عەمباری لۆکەوە. هیچ کەس نەیدەپرسی کێ ئەو خەبەرەی هێناوە. عادیل ئەفەنی خەریك بوو دەهات. ها ئێستا بگاتێ و ها تاوێکی دیکە. هێندەی نەمابوو لە پشت ڕەوەزەکانەوە وەدەر بکەوێ. باشە هەقی خۆی نەبوو؟ شت و مەکی پێ فرۆشتبوون، پارەی بە دەستیش پێیان دابوو و لە جوابی ئەو هەمووە چاکەیەدا جا تۆ وەرە و لە لۆکە ڕەنینێ بگەڕێوە و هیچی مەدەرەوە...

پاڕانەوە و لالانەوە هیچ کاری لە عادیل ئەفەنی نەدەکرد.

ئەی چ دەقەومێ؟

جموجۆڵێك لە نێو ژناندا پەیدا بوو. ڕوویان بەرەو دەشتەکە وەرگێڕا. لە دوورەوە، لەو سەری گوندەوە مریەمۆك خۆی دەدایە سەر گۆچانەکەی و دەهات. تروسکایی هیوایەك کەوتە دڵیانەوە. باشە دیتنی مریەمۆك بۆچی دڵیانی خۆش کردبوو؟ هەمووان دەیانزانی مریەمۆك دەسەڵاتی هیچی نییە و قەوەی بە عادیل ئەفەنی ناشکێ. دەیانزانی، بەڵام دیسانیش مریەمۆك وەکولی هێنابوون و هەموو هیوایان بەوە بوو.

ڕاوەستان هەتا مریەمۆك گەیشتێ. نە جووڵەیەکیان کرد و نە قسەیەکیشیان کرد. چاویشیان لەسەر هەڵنەگرت.

مریەمۆك هات و لەبەر دەمیان ڕاوەستا. ڕوخسارێکی وشك و بێ هەست و چاو قیچ.

کە مریەمۆك گەیشتێ، لە سەر ڕێی لاچوون و ڕێگەیان کرد. مریەمۆك لە نێوەڕاستیاندا ڕاوەستا و چاوی لە عەرزەکە بڕی. هەمووان دەیانزانی مریەمۆك قسان ناکا. دەیانزانی ورد وردیشی بکەن، زاری هەڵناپچڕێ و وەك مردووان بێ دەنگ دەبێ. ئەی ئەو هەمووە خۆشی و شادییەی بە هاتنی ئەو لە دڵیان گەڕابوو، چ بوو؟

سەیری کەسی نەکرد. هەوا سارد بوو. لاقەکانی لەسەر بەفرەکە ببوونە سەهۆڵ. بەفرەکە کرتە کرتی دەهات. بێدەنگییەکی وا باڵی بەسەردا کێشابوون کە جگە لە دەنگی کرتەی بەفرەکە، هیچ دەنگێکی دیکە نەدەبیسترا.

هەمووان لە دەوری مریەمۆك کۆ بوونەوە. هەر دەتگوت چاوەڕوانیی ڕێگە چارەیەکیان لێی هەیە. دەیانەویست ئەو جارێکی دیکەش بڵێ:"ئاخری هاتین، ئاخرییەکەی گەیشتینەوە." مریەمۆك بەلای ئەوانەوە هێزێك بوو. زیاتری لێ نزیك بوونەوە. دەتگوت پەیوەندییان لەگەڵ ئەو و پشووی ئەو دەرمانی هەموو دەردانە.

مرێمۆك یەك دوو هەنگاوی بەرەو ماڵەكەی كوێخا نا. ژنەكانیش بە دوایدا. مرێمۆك چەناگەی لەسەر دارەدەستەكەی دانا و چاوی لەو پیاوانە بڕی كە دەچوونە ماڵی كوێخا. كە دوایین پیاو لە ماڵەكەی كوێخا وەژوور كەوت، ئەو لەسەر عەرزەكە دانیشت و دارەكەی لە تەنیشت خۆی دانا. ژنەكانیش وایان كرد. چاوەڕوانیی شتێك، تروسكەی هیوایەكیان لە ماڵی كوێخا هەبوو.

ماوەیەك لە بێدەنگیدا مانەوە. ئاخرییەكەی مرێمۆك هەستا و ئەوانی دیكەش وێكڕا هەستان. مرێمۆك بەرەو ماڵەكەی كوێخا وەڕێ كەوت. ژنەكانیش بە دوایدا وەڕێ كەوتن.

ماڵەكەی كوێخا جێی كەسی دیكەی نەدەبۆوە.

ژنەكان لە بەر هەیوانەكە كۆ بوونەوە. لە نێو ماڵەكەشەوە دەنگی هیچ پیاوێك نەدەهات. تەنانەت كوێخاش بێ دەنگ و كپ بوو. ژنێك بێدەنگییەكەی شكاند و گوتی:

- دوێ شەوێ مام خەلیل ڕای كردووە. كەپەنەكەكەی هەڵگرتووە و چووەتە ئەشكەوتەكەی تەكەچ.

ژنێكی دیكە گوتی:

- چووە لەوێ بمرێ. سوێند دەخۆم نەیویستووە لە گوندێ و لە نێو ئێمەدا بمرێ.

یەكێكی دیكە گوتی:

- كابرایەكی لووتبەرزە. تەنانەت نەیویستووە كەس تەرمەكەشی ببینێ. ئەمن باشی دەناسم.

حەشیمەتە بێدەنگەكە گیانێكی وەبەر هاتبۆوە. گاڵەگاڵ و دەنگەدەنگ بەرز بۆوە. هەر زارە و دەنگێكی لێوە دەهات.

- لە ترسان نایەتە دەرێ. لە ترسی مردنێ، لە گوندییەكان نەدەترسا، لە مەرگ تۆقیبوو.

- پیرەمێردە. ئەگەر شەوێ كەوتبێتە ڕێ، دەتوانین بكەوینە شوێنی و بیدۆزینەوە.

ژنێكی هەڵیدایە:

- دەیدۆزینەوە. با بكەوینە ڕێ و بچین. یان پیاوەكان بكەونە شوێنی، یان ئێمە خۆمان دەچین.

ژنێكی دیكە گوتی:

- زانیی عادیل ئەفەنی دێ. دیسان گوندەكە ڕووت دەكاتەوە و دەڕوات.

- زانی و بۆ ئەوەی بەچاوی خۆی نەیبینێ، سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیی.

ژنەکان وێکڕا گوتیان:

- تاقەتی نەهێنا.

پیرەژنێك بە هات و هاوارەوە گوتی:

- یارەبی خودایە، خودایە گیان ئێمەش بکوژی و ئەو ڕۆژە ڕەشەی نەبینین.

هەمووان:

- ئامین...

ئەوجار کوێخا هاتە دەرێ. تێکسمڕابوو. سەری پێ هەڵنەدەهات و نەیدەتوانی سەیری کەس بکا.

- خودا بکا لەو بەڵایەمان ڕزگار بێ، هاوینی داهاتوو دەگەڕێینەوە و مەزرایەکی باش دەدۆزینەوە. ئێستاش کە وای لێ هاتووە، ئەمن بەڵێنتان دەدەمێ، چۆنی ئەنگۆ بڵێن وا دەکەم. ئێمە بە دەستی خۆمان وامان لە خۆ کرد. خەتای خۆمان بوو. یەکمان نەگرت. هەر کەسە و بە ڕێیەکدا ڕۆیی. ملمان لەبەر ملی یەکتری نا.

دەنگەدەنگ بەرز بۆوە:

- لەگژ یەك ڕۆچووین.

- دەبێ بچین و مام خەلیل بدۆزینەوەز نابێ بێڵین قەل و داڵ و گورگ و ڕێوی بیخۆن.

- کوێخا ئەمری کرد"

- نابێ بێڵین. "یوسفە ڕەش کوڕە ئەتۆ بەتین و گوڕی. یاڵڵا دەی وەڕێ کەوە. ئەتۆش عوسمان سەوزە. دوو کەس بەسە. بچن و مام خەلیل بدۆزنەوە و بیهێننەوە.

ژنەکان گوتیان:

- تۆ خودا بیدۆزنەوە و بیهێننەوە.

- نابێ بێڵین عادیل ئەفەنی بێتە گوندەکەی ئێمە. ئەگەر بێ، ئەدی چۆن سەیری چاوی بکەین؟ جا ئەگەر هات، تازە فەرقی چییە. دار و نەدارمان دەبا و هەمووان لە برسان پێڕا دێین. بە هاتنی ئەو حەیامان دەچێ.

هەمووان گوتیان: ئابڕوومان دەچێ.

ئەوجار کوێخا چۆوە دیوەخانێ. دیسان سەریان بەردایەوە. یوسف و عوسمان درپان بە ژنەکان دا و وەدەر کەوتن. کە تێدەپەڕین، مرێمۆك مۆڕەیەکی لێ کردن. ئەوانەی مۆڕەی مرێمۆکیان بینی، لێی تێگەیشتن.

یوسف و عوسمان هەتا لە گوندی چوونە دەر و نێو ماڵی ڕووبارەکەیان بڕی، ژنەکان هەر وا سەیریان کردن. وردە وردە ئەو دووانە لەسەر سپیایی بەفرەکە وەك دوو خاڵی ڕەشیان لێ هات و لە سپیایی بەفرەکەدا لەچاوان ون بوون.

دوای ئەوەی لە چاوان ون بوون، مرێمۆك دڕی بە حەشیمەتەکە دا و لەوێ دوور کەوتەوە. بە دوای ئەودا هیوا و ئاواتی ژنەکان ڕەوییەوە. چەمەرییەکی دڵتەزێن جێی ئەوی پڕ کردبۆوە. دەتگوت شتێك لە ناخیاندا مردبوو. دەتگوت بوومەلەرزەیەك هاتبوو و هەموو گوندەکەی خاپوور کردبوو و ئەوان بێ ماڵ و حاڵ و بێ پەنا مابوونەوە:

"ئەمساڵ بەهارێ گوڵەکان بە ماتەم و خەمەوە دەپشکوێن. ئەو هەورانەی لەودیو تەکەچەوە دێن، هەموو ڕەشپۆش دەبن. بەفر بریقە بریقەکەی نامێنێ. ئەو بەهارە سەوز و شین نابێ. بەرغەل ناکاڕێنن و چیاکان لایی لایی ناچڕن. "عەلی"یە درێژیش لە شمشاڵی ناتووڕێنێ. ئەمساڵ ئیزگیلیش نایە، ئەمساڵ پێدەشتەکە شین نابێتەوە و مەزراکان دەسووتێن.

"بەهاری ئەمساڵ لە گوندێدا زەماوەندە. کوڕەکەی ساکارجا و کچەکەی سونبولە شێت زەماوەندیانە و کوڕەکەی "وەلی"یە ڕەش و کچەکەی ڕەشیدە کوێریش، بەڵام بەو حاڵەوە زەماوەند و هەڵپەڕکێی چی؟ چ تامێکی دەبێ؟

لە ناکاو هەموو ژنەکان ڕوویان بەرەو ڕێگاکەی خوارەوە وەرسووڕاند. لە پێشدا ورتە ورت و جموجۆڵێك بەرز بۆوە. دوایی هەمووان لەسەر جێی خۆیان وشك بوون. کوێخا و گوندییەکان هەر هەمووان پێکەوە لە ماڵێ دەرپەڕین.

لە لای خوارووەوە، سوارێك بە کەوای شۆڕەوە وردە وردە دەهات. کوێخا بە دەنگێکی کزی وەك مردووان گوتی:

ـ ئەوە دێ. عادیل ئەفەنییە. ئەوەی نەدەبوو ببێ بوو. جەندەرمەشی لەگەڵ نییە، بەڵام لەگەڵی بایە باشتر بوو.

بە پەلەپەل خۆی خزاندەوە ماڵەوە و دەرگای لەسەر خۆی پێوە دا.

ژنان و پیاوانیش بەبێ ئەوەی قسەیەك بکەن، بڵاوەیان کرد و هەمووان چوونەوە ماڵەکانیان، دەرگاکانیان داخست و پشتەکانیان خستن.

گوندەکە چۆڵ و کپ بوو. ترس و خۆف تەنانەت خزیبووە ناخی دار و بەردەکانیشەوە. هیچ گیانلەبەرێك لە دەرەوە نەمابوو. نە پشیلە و نە چوارپێ و نە پەلەوەر. دەتگوت هەزار ساڵە ئەو گوندە چۆڵ کراوە. تەنانەت لە کولانکەی ماڵەکانیشەوە دووکەڵێك نەدەهاتە دەرەوە.

تاقە گیانلەبەرێکی کە لە دەرەوە مابۆوە، سەگە زەر و فسۆسەکەی هۆمەرۆك بوو. لە بەر دەرگاکەی تاشباشەوە وەرکەوتبوو، سەری وەدەستەکانی کردبوو و وەنەوزی دەدا.

رێبوارە کەپەنەك لەبەرەکە کە لە لای سەرووەوە دەهات، کە گەیشتە گوندەکە، هەستی کرد شتێکی نائاسایی لەو گوندەدا هەیە. لە پێشدا سەری ئەسپەکەی خۆی بەرەو مالّی کوێخا وەرسووڕاندەوە. سەیری کرد هیچ دەنگێك نایە، بەلاّم بەفری بەر مالّەکان پێخوست کرابوو و قوڕاوی ببوو. سەر بەفرەکە شوێن پێی تازەی پێوە دیار بوو. ئەگەر گوتبای ئەمساڵ لە چوکووراوای نەگەڕاونەتەوە، ئەدی ئەو شوێن پێیانە چ بوون؟ چۆلەکوژ بەدیارەوە نەبوو. چما دەکرا گوندێکیان چۆل کردبێ و دەرگایان گالّەدابێ و ڕۆیشتبێن؟ باشە کوێ هەیە بچن؟

سوارەکە بەسەر ملی ئەسپەکەدا خۆی شۆڕ کردەوە و ڕووە و مالّەکەی کوێخا بانگی هێشت:

ـ سەفەرەفەنی؟ سەفەرەفەنی؟

هیچ دەنگێك لە مالّەکەوە نەهاتە دەرێ.

ـ سەفەرەفەنی، سەفەرەفەنی.

"وەڵڵاهی سەیرە، جا شتی وا چۆن دەبێ، بەبێ ئەوەی تاقە یەك کەسیان لە گوندیدا بمێنێتەوە، ڕۆیشتبێن؟

کوێخا کە پشووی لەخۆی بڕیبوو، لە کەلێنی دەرکەوە سەیری سوارەکەی دەکرد. دەسبەجێ ناسییەوە. یازدە ساڵ لەوە پێشیش جارێکی دیکە هاتبووە ئەو گوندە. باشە ئەوجار چیی دەویست؟ ئاخۆ کارەکەی پەیوەندیی بە حیزبەوە هەبوو؟ ئەو کابرایە کوڕە گەورەی کۆپلۆزادەکان بوو. دەبێ پەیوەندییەك هەبێ لەگەلّ هاتنی ئەو و عادیل ئەفەنیدا. دەرگا بکاتەوە یان نا؟ بڕێك دڕدۆنگ و دوو دلّ بوو. دوایی بڕیاری دا نەیکاتەوە. بەو جۆرە ڕێبوارەکە، دوای گەڕانەوە، دەیگوت، گوندەکە چۆل بووە و عادیل ئەفەنیش پێی وا دەبوو، خەلّکی گوندەکە، ئاواییەکەیان چۆل کردووە و بۆ ئیشکردنێ چوونەتەوە چوکووراوا و ئەو زستانە ئیدی بەلای گوندەکەدا نەدەهاتەوە. بەخوای فکری چاك بوو.

ـ سەفەرەفەنی، سەفەرەفەنی.

پشیلەیەك دەستی کرد بە میاواندن. سەفەر بە تووڕەییەوە و لە بن ددانەکانییەوە گوتی:

ـ ئەو پشیلەیەك بێ دەنگ بکەن.

ژنەکان دەسبەجێ دەنگیان لە پشیلەکە بڕی.

سوارەکە دوای ئەوەی چەند جارێکی دیکە بانگی کرد، بێهیوا بوو و ئەسپەکەی بەرەو نێو گوندێ تاو دا بەشکم تووشی زیندەوەرێك بێ.

کوڕەکەی کۆپلوزادەکان، دەیزانی گوندەکە چیی بەسەر هاتووە. ئەمساڵ دوای گەڕانەوەیان لە چوکووراوا نەیانتوانیبوو قەرز و قۆڵەی عادیل ئەفەنی بدەنەوە. نەدانەوەی قەرزیش بۆ گوندی ئەوپەڕی حەیاچوون و سەرشۆڕی بوو. نەریت شکاندن بوو، بەڵام لەوەش خراپتری بەدواوە بوو. چون ئەوان ساڵێك قەرزی عادیل ئەفەنییان پێ نەدرابۆوە، لەمەودوا هیچ دووکانداریکی گەورەدێ شتیان بە قەرز ناداتێ. هیچ سووچ و تاوانێك بۆ خەلکی گوند لەوە گەورەتر نەبوو.

باشە عادیل ئەفەنی چۆنی توانیبوو تاوانی نەدانەوەی قەرزی ساڵێك ئەوەندە گەورە بکاتەوە؟ نهێنیی بەسەریەکەوەنانی سەرمایەیەکی ئەوەندە گەورە لە شارۆچکەیەکی ئاوا بچووکدا لەوەدا بوو.

ئەوە چ نەریتێك بوو؟ ئەقلّی بنیادەم نەیدەبڕی. کە گوندییەکان دەچوونە لۆکە ڕنینەوە، تەنانەت گیانلەبەرێکیشیان لە گوندیدا بەجێ نەدەهێشت. ئەوان هەموو شتەکانی خۆیان، نوێن و قاپ و قاچاغ و پێخۆر و خواردن و جیازی دەخستە نێو سندووقەکانەوە و بەنرخترین شتەکانیشیان لە ماڵەوە بەجێ دەهێشت و لە نەبوونی ئەواندا هیچ کەسێك پێی نەدەنایە ئاواییەکەوە و تەنانەت دەستیان لە چڵە شقارتەیەکیش نەدەدا. ئەو نەریتە نەك هەر لە گوندێك بەڵکو لە هەموو گوندەکانیشدا هەر وا بوو. دەیانگوت:"ئەگەر لەو مانگانەدا وا گوندەکان چۆلن گوندەکە پڕ لە زێر و گەوهەریش بکەن و هەموو خەلکی ئاوەدانییەکەش بەوە بزانن، و هەموو چیاو چۆلیش پڕ بن لە چەتە و ڕێگر، دیسانیش مەحاڵە یەکێك بچێ و تەنانەت دەست بۆ بچووکترین شتی ئەوان و زێرەکانیان بەرێ." ئەوە نەریتێکی زۆر سەیرە خودایە گیان. ئەو بنیادەمانە شتێکی سەیر و سەمەرەن.

هەروەها هیچ کام لەو گوندانەش لە گەڕانەوەیاندا لە چوکووراواوە، مەحاڵە قەرزی خۆیان نەدەنەوە، بەڵام ئەگەر نەیدەنەوە چ دەقەومێ؟

کوڕەکەی کۆپلوزادەکان لە ناخەوە هەڵچوو و تووڕەییەکی سەیر دایگرت. ئەگەر ئەمساڵ قەرزەکانیان بۆ نەدرابۆوە، خۆ ساڵی داهاتوو هەر دەیاندایەوە... چۆن دەبێ ئەو خەلکە ئاوا لێ بکەی و بەو شێوەیە سزایان بدەی و سەرشۆڕ و هەناسەساردیان بکەی.

بەخۆی گوت:" ئەو عادیلە کابرایەکی زۆر خراپە، دیارە خەلکی ئەو گوندە بۆوەی قەرزەکەی بدەنەوە، بەو زستانە زەمهەریر و وەیشوومەیە چوونەتە چوکووراوا و هەتا بایی قەرزەکانیان پارە کۆ

نەکەنەوە، ناگەڕێنەوە، بەڵام باشە بەو زستانە چییان دەستکەوێ؟ کوا کار؟ چ پەیدا دەکەن؟ دەبێ بە عادیل ئەفەنی بگوترێ ئەو ناهەقی و زوڵمەیان لێ نەکا. بڕێك پیاوەتیی هەبێ و نەرم و نیان بێ. هەر نەوەندە بۆ ئەو بەسە گەزە جاوێکی یەك لیرەیی بە پێنج لیرە بەوان دەفرۆشێ..."

بە هیوای ئەوەی بتوانێ کەسێك بدۆزێتەوە ماڵ بە ماڵی گوندەکەی کرد. گوندەکە چۆل بوو و ترس و سام و خۆفی دەخستە دڵی بنیادەمەوە. لەو ڕووناکایەی بەر ترووسکایی ئەو بەفرەدا کە خۆرەکە لێی دەدا، وردە وردە خۆی نوقمی تاریکی و بێهیوایی دەدی.

هەر دەتگوت گوندەکە تازە چەند ساتێك لەوەپێش چۆل کراوە. بۆنی ژیان لە هەموو لایەکەوە دەهات. لە ناکاو بە دیتنی چوارپێیەك زۆر دڵی خۆش بوو. ئاخۆ ئەو سەیە تۆپیبوو؟ ئەسپەکەی بەرەو لای سەیەکە لێخوڕی. سەگەکە بە بیستنی دەنگی سمی ئەسپەکە سەری هەڵێنا و سوارەکە دڵی بەوە خۆشتر بوو.

دیسان خولێکی دیکەی بە گوندەکەدا لێ دایەوە. کزە بایەکی سارد و سڕکەر لە دەشتەکەوە هەڵی کردبوو. ئاسمان ڕەنگێکی شینی ڕوون و ساماڵی هەبوو. دەتگوت خۆ لەبەر ئەو کزە بایە ڕاناگرێ و وەك لەتە سەهۆڵێك پەرش و پڵاو دەبێ و لەتوکوتە شینەکانی لە سەرەوە دەرژێنە خوارەوە و لە ساتێکدا سەر بەفرە سپییەکە بە وردە سەهۆڵی کەوی و شین دادەپۆشرێ.

وردە وردە نیگەرانی و خەم و ترسێك دڵی دەتەنی. خوایە گیان ئەوە چ ترسێك بوو. ئاخۆ لە سۆنگەی چۆلیی گوندەکەوە بوو؟

خۆی پێ نەگیرا. هەر دوو خولەکی دیکە مابایەوە، پشووی سوار دەبوو. قوڕگی پڕ بوو گریان. سەری ئەسپی خۆی وەرسووڕاند و بە چوارناڵە و وەك بای شەماڵ لە گوندەکە وەدەر کەوت. یەك پشوو بە قەمچی لە ئەسپەکەی ڕادەکێشا. دەتگوت سەریان لەدووی ناوە بیکوژن.

تا گەیشتە ڕێگەی شار و لە چاوان ون بوو، شلی نەکردەوە.

گوندییەکان لە کەلێنی دەرگاوە سەیری هەموو هەڵسوکەوتەکانی سوارەکەیان کردبوو. سەرسووڕماوییەکی سەیری پێوە دیار بوو. سەرسووڕمان و خەفەت و نیگەرانی و ترسەکەی ئەو، شادبوونەکەی بە دیتنی چوارپێیەکە و ڕەنگ بزرکانەکەی کە دەتگوت خەریکە بخنکێ و دواتر گەڕانەوە و ئەسپ لینگدانەکەی وەك ئەوەی لەبەر دوژمنێکی نەبەدی* یان هەژدیهایەك

---

*نەبەدی: شتێك کە بەچاو نابینرێ. نادیار. پیرەژنان کە دووعا دەکەن دەڵێن: یاخوا تیری نەبەدیت وێکەوێ/پێکەوێ. واتە تیرێك کە بەچاو نابینرێ.

ڕا بکا، هەر هەموویان دیتبوو. هەموو حاڵەت و هەڵسوکەوتەکانی و تەنانەت لە ڕوخساریدا ئەوەشیان خوێندبۆوە کە لە ناخیدا چ دەگوزەرێ.

سوار کە لە گوندەکە چووە دەرێ، هەر هەموان بە ڕوویەکی گەش و شادەوە هاتنەوە دەرێ. گوندەکە دەتگوت جێژنەیەتی و نوقمی خۆشی و دەنگەدەنگێکی بێوێنە بوو. وەڕینی سەگەل و کاڕەکاڕی مێگەل و زەڕینی گوێدرێژ و گریانی زارۆکان و خوێندنی کەڵەشێر هەر هەمووی تێکەڵاو ببوون. هەر وەك چۆن پێش هاتنی بوومەلەرزە هەرچی ئاژەڵە دەهەژێن و دەنگێکی سامناك گوندەکە پڕ دەکا، ئەو گوندەش وەك کاتی پێش بوومەلەرزەی لێ هاتبوو.

ئەوانەی چەند مانگێك بوو بزەیان لە لێوان نەگەڕابوو و قسەیەکیشیان لەگەڵ کەس نەکردبوو، نوقمی شادی و خۆشی بوون. کوێخا گوتی:

ـ شوکری خودای جارێ نەجاتمان بوو. ئەمڕۆ لەو مەترسییە ڕزگاریمان بوو. دوایش خودا گەورەیە.

عەلی"یە درێژ شمشاڵەکەی لەبەر پشتوێنی دەرهێنابوو و تێی دەتووڕاند و دە پازدە گەنج قۆڵیان لە قۆڵی یەکتری کردبوو و هەڵدەپەڕین.

## ٥

کەڵەبابی نیوەشەوێ دەیانخوێند. "حوسنی" هێشتا نەنوستبوو. ئەمشەو قەرار بوو ڕەجەب بێتە ژوانی. لە مێژ بوو نە ئەو دەهات و نە حوسنیش چاوەڕێی بوو. زۆر سەیر بوو. کەچی پێشتر هەر دوو ڕۆژان یەکتریان نەدیبایە، شێت و شەیدا دەبوون.

بەڵام ئەمشەو دەبوو بێ. گوێی هەڵخستبوو و چاوەڕێ بوو. ئێستا نا ئێستا لەوانەبوو دەنگی فیکەی ڕەجەب بێ. دایك و بابیشی خۆ نەدەنووستن...

لەو جەنگەیەدا دەنگی فیکەیەکی کز وەك دەنگی باڵندەیەك هات. بەحاڵ دەبیسرا. دایك و بابی بەخەبەریش بوایەن، نەیاندەزانی چ باسە. دڵی داخورپا. گوێی هەڵخست. بابی لە جێوبانەکەیدا دەجووڵایەوە:"شەیتان بە لەعنەت بی. شەوانی پێشوو وەك مردووان دەنووست. کەچی ئەمشەوە هەر جینگڵ دەدا."

باوێشکی دا. یەکپارچە ئاگر بوو. خەریك بوو گری تێبەردەبوو"خۆزگە بنوێ... ئەوە مانگێکە، مانگ و نیوێکە هەر سەردەنێتە سەر بالیفەکە خەوی لێ دەکەوێ..، بەڵام ئەمشەو بەختەکەی من، خودا غەززەبی لێ گرتووە. دەك خودا بتباتەوە. ئای لەو ناهەقییەی."

بێ ئۆقرە بوو. دەنگی فیکەکە دیسان هات. حوسنی هەستا لەسەر جێیەکەی دانیشت. گوێی لە هەناسەکانی بابی هەڵخست. دەنگی کاوێژی مانگا فندق دەهات. بزنەکان بێدەنگ بوون. مانگا بۆریش دەنگی نەدەهات. دەی چ باشتر. مچورکێك بە لەشیدا هات. ئەگەر بابی بەخەبەر هاتبا و دیتبایەی چی دەکرد؟ دیمەنەکەی هێنایە پێش چاوی:"بابی بە ڕووتی بەسەریاندا چووەو تەورێکی بە دەستییەوەیە و بە دەستەکەی دیکەی قژی سەری گرتووە و تەورەکەی بە ملیدا دێنێ. هەموو گیانی وەسەر خوێن کەوتووە."

دەست و پێیەکانی لەبەریەك دەکشانەوە و چاوەڕێ بوو. دەنگی پشووەکانی بابی گۆڕدران. لەخۆشیان وەخت بوو بفڕێ. بابی خەوی لێ کەوت. بە لەرزەلەرز و بەسپایی لە جێویانەکەی هاتە دەرێ. دەرگاکەی کردەوە و وەدەر کەوت.

لە دالآنی ماڵەکەی تەنیشت ڕەوەزەکە، تارماییەکی دی. ڕەجەب هەمیشە لەوێ چاوەڕێی دەبوو. بە غاردان خۆی گەیاندێ. ڕەجەبیش هەستا و بۆی لێی چووە پێش. لەبەر دالآنەکە گەیشتنە یەك.

بەفرەکە شەوەکەی ڕووناك کردبۆوە. بایەکی سارد لە دەشتەکەوە هەڵیکردبوو وەك شیر لەشی دەبڕی. هەموو وڵات بەستبووی. جگە لە خشپەی سەر بەفرەکە و هەناسەی ئەوان سریوەی هیچ شتێك نەدەهات.

حوسنی ڕەجەبی لە ئامێز گرتبوو. دەسووتا و دەشلەرزی. هەناسەی ڕەجەب وەك ئاگر دەموچاوی دەسووتاند. وا پێکەوە نووسابوون دەتگوت بوونەتە یەك جەستە. لەرزینەکەی جەستەی ئەو ڕەجەبیشی گرتەوە. خۆ لە سەرما نەبوو، تەنانەت بەفرەکە لاقە ڕووتەکانیشی نەدەتەزاندن. لێوەکانیان تامی سوێری خوێنی دا. شەو و خوێن و لێوەکانیان لەبیر چووبۆوە.

دوای ماوەیەك وەخۆیان هاتنەوە و لێك جوێ بوونەوە. هەستیان بە سەرماکە کرد. ڕەجەب دەستی حوسنیی گرت و بردییە ماڵە چۆلەکەی حەسەنە کوێر. هەر دەرگایان کردەوە، شەپۆلێکی گەرما لەسەروچاویانی دا. ڕەجەب لە پێشدا ئاگردانی ماڵە چۆلەکەی نێلێ دابوو. هاتن و لە تەنیشت ئاگردانەکە دانیشتن. هەتا پتر گەرم دا دەهاتن زیاتر پێکەوە دەنووسان. ڕەجەب لاقی چەپەی خستە سەر لاقەکانی حوسنی و لەباوەشی گرت. ئەوجار ڕەجەب دەلەرزی و حوسنی هێور بوو و لە باوەشیدا خۆی مەڵاس دابوو. گوتی:

ـ ناکرێ، ناکرێ، سەیر کە. ئەودەمەی دەهاتم، بابم هێشتا نەنووستبوو.

ڕەجەب بە پەلە و بە هەناسەبڕکێ گوتی:

ـ دەی با نەخەوتبێ. با بمانبینێ.

کتوپڕ هەر دوو کیان ڕووت ڕووت بوونەوە. دوو جەستەی ڕووت تێك ئالآن. ئەگەر یەکێك لە دەرەوە بەوێدا تێپەڕیبایە، گوێی لە ئاخ و ناڵینیان دەبوو. لە خۆشییان هۆشیان نەمابوو. نوقمی چێژ و خۆشی بوون. خۆڵەکەی بنیان تەڕ ببوو.

نەیاندەزانی چەندی تێپەڕیوە. هەر کامەیان بەلایەکدا کەوتن. هەناسەبڕکێیان بوو.

لە پێشدا ڕەجەب وەخۆی هاتەوە و دواییش حوسنی. چوونە لای ئاگردانەکە. ئەوجار شێتانە دەمیان بە دەمی یەکترییەوە نابوو. ئاگرەکە دەست و لاقیانی دەسووتاندەوە و ئەوان هەستیان پێ نەدەکرد. ڕەجەب سەرتاپێ جەستەی لە ئارەقە شەڵاڵی حوسنیی ماچ دەکرد و دەیلستەوە... کچەتیوە مەست و سەرخۆش بوو و هەناسەبڕکێی بوو و لە ناخییەوە گیانی دەلەرزی. لە بەر تیشکی ئاگرەکە جەستەیان دەتگوت مسێکی سوورەوە کراوە.

حوسنی خۆی کۆ کردەوە. خۆی لە ماچەکانی ڕەجەب کردەوە و خزییە گۆشەیەکی دیکەی ئاگردانەکەوە. ڕەجەب ساتێك چییە نەدەحەجمی. لێی چۆوە پێشێ و دیسان دەستی کردەوە بە ماچ کردنی. تێر نەدەبوو. حوسنی خۆی پێ نەگیرا و خۆی دایە دەست ماچ و ڕاموسانەوە.

هەتا ڕۆژ بۆوە هەر عیشقبازییان کرد. هەتا ئەو دەمەی وا ماندوو بوون، نەیاندەتوانی ببزوون، تەنانەت قسەشیان پێ نەدەکرا.

ڕووبەڕووی یەکتری لەبەر ئاگردانەکە دانیشتبوون. حوسنی سەری هەڵنەدەهێنا سەیری چاوی ڕەجەب بکا. هەمیشە هەر وا بوو. دوای ڕابواردن و عیشقبازییەکەیان، حوسنی ماوەیەك بەبێ ئەوەی سەیری ڕەجەب بکا لەبەر ئاگردانەکە دادەنیشت و دوایی دەردەپەڕی و جلەکانی لەبەر دەکردەوە و ڕایدەکرد.

جەستە ماندووەکەی حوسنی هەمووی داڕووشابوو و کوترابوو. ژانێکی خۆشیشی تێدا بوو. برێك دواتر شمەکەکانی لەبەر کردەوە. ڕەجەب چاوەڕێ بوو دەرپەڕێ و بڕوا، بەڵام حوسنی ئەمجارەیان نەڕۆیشت. دیسان لەبەر ئاگردانەکە دانیشتەوە و دیسانیش سەیری ڕەجەبی نەکردەوە. ڕەجەب زانیی شتێك لە گۆڕێیە. بەرەوڕووی یەکتری دانیشتبوون. حوسنی چاوی لەبەردەمی بڕیبوو و ڕەجەبیش چاوی لە چاوی بڕیبوو. ڕەجەب بەسپایی پرسیی:

ـ چییە؟ ... چ قەماوە؟

بە زاری داپچڕاوەوە چاوەڕێ ما:

ـ ئەوە مانگێکە.. لەوانەشە سێ مانگە.. لە چوکوور گەڕاوینەوە...

ڕەجەب گوتی:

ـ نەمتوانی بێم... ترسام. گوندەکە حاڵەتێکی سەیری هەیە. بەڵا و نەهامەتییەك بەسەرمانەوە دەخولێتەوە...

حوسنی وەڵامی دایەوە:

ـ دەمەویست شتێکت پێ بڵێم...

لە دەنگەکەی خۆی ترسا و بێ دەنگ بوو.
رەجەب گوتی:
- دا بیڵێ بزانم.
بیری کردەوە: "باشە ئەو کچەتیوە چییەتی؟"
حوسنی گوتی:
- وەرە برۆین...
دەنگەکەی ئەوەندە کز و مردووانە و خەفەتبار بوو دەتگوت لە گەرووی کەسێکی دەمەومەرگەوە دێتە دەرێ. لەناکاو دەنگی گۆڕا و لەسەری ڕۆیشت:
- ئیدی ئەو گوندە بۆ ژیان نابێ... خەڵکەکەی هەر دەڵێی یەکتری نابینن. دەترسم. وەرە هەر ئێستا هەڵمگرە با برۆین.... برۆین... باشە؟...
رەجەب:
- برۆین؟... جا بۆ کوێ؟...
- دەچینە چوکووراوا.... با برۆین.
رەجەب:
- بەو بەفر و وەیشوومەیە... کوڕە گورگ دەمانخوا.
حوسنی بەتووڕەییەوە گوتی:
- با بمانخۆن. هەستە با هەر ئێستا برۆین.
رەجەب: باشە..، بەڵام...
حوسنی:
- دەترسم، بەڵایەکمان بەسەر دێ. هەر بەڵایەك بەسەر ئەو گوندە بێ خەتای ئێمەیە. تەنانەت لەش پیسیش لە خۆیان دەرناکەین... هەستە با برۆین.
رەجەب:
- ئەمنیش دەترسم. ئەو کابرایە هەر دێ...
- دێ... با بەر لەوەی بێ ئێمە برۆین. بەر لەوەی گوندەکە لافاو بیبا...
رەجەب گوتی:
- ئەوە شێت بووی؟... گوندەکە بۆ لافاو دەیبا؟...
حوسنی:

ـ بەر لەوەی بوومەلەرزە لێی بدا...

ڕەجەب:

ـ ئاخر لە ڕێیە ڕەقهەڵدێین.

حوسنی:

ـ با ڕەق هەڵێین و بمرین..، بەڵام بڕۆین.

ڕەجەب:

ـ بەفر و بۆران و قیامەتێکە هەر مەپرسە. چوکووراوا ڕێی دە ڕۆژە. خۆ هاوین نییە.

بێ دەنگ بوون. هیوایان بڕابوو. هەر بە ڕاستیش لەو زستانە سەختەدا پیاوی ژیر لە گوندی وەدەر نەدەکەوت.

ئاگرەکە خەریك بوو دادەمرکایەوە. خوسنی خۆی قیت کردەوە و دەستی ڕەجەبی گرت. دەستی ڕەجەب وەك سەهۆڵ وابوو. گوتی:

ئەو بەڵایەی بەسەر ئەو گوندە دێ، خەتای ئێمەیە... خودا لە داخی ئێمە ئەو بەڵایانە بەسەر ئەو گوندەدا دەبارێنێ.

ڕەجەب:

ـ کچێ ئەوە تۆ شێت بووی؟ بۆ پێت وایە لەو گوندەدا هەر من و تۆ ئەوە دەکەین؟

ـ ڕاستە، هەمووان دەیکەن..، بەڵام... لە داخی ئێمەیە. ئەگەر ڕانەکەین، ئیدی نایەمەوە لات... هەتا هاوینێ کە زەماوەندەکەمان دەکەین، ئیدی نایەمەوە.

دەنگی زۆر سەیر توند و پێداگرانە بوو.

ڕەجەب گوڕاندی:

ـ ئەوە شێت بووی؟... لە کەللەی داوی؟...

ـ نایەم... نایەم... بشمکوژی نایەمەوە... ئەها...

بە بیستنی دەنگی کەڵەبابی بەیانی، هەر دووکیان دەرپەڕین. بە ترسەوە سەیرێکی یەکتریان کرد. ڕەجەب دەستی حوسنیی گرت. حوسنی دەستی ڕاپسکاند و لە دەرگاکە وەدەرکەوت. بە غاردان بەرەو ماڵەوەیان ڕۆیشت و خۆی خزاندەوە نێو جێیەکەیەوە. خۆی گرمۆڵە کرد. هێشتا گیانی لەرزی مابوو. لێفەکەی بەسەر خۆی کێشا. چاوەڕێی بەڵایەك بوو. دەترسا. شەرمەزار بوو. سەری بردە بن بالیفەکەیەوە.

## ٦

کەڕەی بەیانی مریێمۆك هات و لەبەر دەرگاکەی کوێخا سەفەر ڕاوەستا و چاوی لە دەرگاکە بڕی. هەموو قورساییەکەی خۆی دابووە سەر دارەکەی و بێ جووڵە ڕاوەستابوو.

کوێخا لە کەلێنی دەرگاوە دەیبینی و هەموو گیانی وەلەرزین کەوت:"ئەو خودا غەززەب لێگرتووە چی دەوێ؟ چاوی لە دەرگاکە بڕیوە و دەڕوانێ. بە ڕاوەستانەکەیڕا شتێکی بە دەمەوەیە. دەڵێی غەززەبی خودایە. سەیری ئەو ڕاوەستانەی بکە. ئەو گوندە وێرانیش بێ، لە سۆنگەی ئەو کافرەوە کاول دەبێ. ئەگەر تاشباش ئۆغڵو نەدەبوو، قەت ئەو نەهامەتییە بەسەر ئەو خەڵکە نەدەهات و ئەو مەزرا بێ بەرهەمەیان بەنەسیب نەدەبوو."

ئەگەر کوێخا چووبایە و قەرزی خۆی دابایەوە بە عادیل ئەفەنی، عادیل ئەفەنی چیی پێ دەگوت؟ دەیگوت:"هاوڕێ، ئەتۆ پارەت هەبوو و داتەوە، ئەی گوندییەکانت؟ ئێوە ئەمساڵ بوونە نموونەیەکی خراپ بۆ گوندییەکانی دیکە. لەمەودوا گوندییەکانی دیکەش فێری ئەو بەزمەی دەبن و دوای گەڕانەوەیان لە چوکووراوا، قەرزەکانیان نادەنەوە." خۆ مەرگ خۆشتر و ئاسانتر بوو لە بیستنی ئەو قسانە...

"ئەوجار دوای ڕۆیشتن بۆ چوکووراوا دەبێ دە نەفەر بکەنە پاسەوانی گوندەکەیان، ئەگینا تالآنی دەکەن و دەیبەن. ئەمساڵ کە گوندییەکان لە چوکووراوا دەبن، عادیل ئەفەنی گوندەکە دەسووتێنێ. چون دێهاتییەکان نەریتەکەیان شکاندووە و قەرزەکەیان نەداوەتەوە. دز و چەتە و پیاوکوژ و یاغییەکانیش نەریتەکەی خۆیان دەشکێنن و بەسەر گوندی دا دەدەن و دار و بەردی بەسەر یەکەوە ناهێڵن و وەباڵیان بەئەستۆم هەقی خۆشیانە. جا دەشڵێن خەتای کوێخا سەفەرە... و دەشیخەنە گەردنی ئەو تاشباشە بێ دین و ئیمانە. ئەگەر ئەو جووتە لەگژ یەکتری ڕانەچووبایەن..."

"نا، نا، شتی وا نابیّ. عادیل ئەفەنی بۆ ئەوەی گوندەکانی دیکەش بە ئێمەوە تەمبێ بن، دەسپێریّ ئەو گوندە تالاّن بکەن و ئەمر دەکا ماڵەکانیش بسووتێنن."

"جا ئەوە دامانا واش نەکەن، ئەمڕۆ و سبەی دیّ و گوندەکە ڕووت دەکا و دەڕوا. گوێی بە فرمێسکی چاوی کەسیش نابزوێ. دەکریّ پێش بە هەموو شتیّ بگرین، پێشی لافا و تۆفان و بوومەلەرزە، بەلاّم پێشی ئەومان پیّ ناگیرێ. هەروەها دەسەلاّتیش نییە هاوڕێ."

"دەبیّ تەگبیرێکی لیّ بکەین... دەبیّ بە هەمووومان تەگبیر و ڕایەك لەو بەلاّیە بکەین و پێشی بگرین."

کوێخا سەفەر لەو ڕۆژەوە تا ئێستا لە شەرمەزارییان خەریك بوو ببێتە تنۆکێك ئاو. بیری لیّ بکەنەوە. چۆن دەکریّ؟ لەو سەت و شێست گوندەدا تەنیا گوندییەکانی ئەو کوێخا چالاك و هەڵسووڕە قەرزیان پیّ نەدرێتەوە و نەریتی هەزاران ساڵەیان بشکێنن؟ شتی وا چۆن دەبیّ؟ جا کوێخا سەفەر لە شەرمەزارییا نەمریّ کیّ بمریّ؟...

دوای ئەوە ئیدی ناتوانیّ ڕوو لە شاری بکا. هەتا دەمریّ ڕووخساری شار نابینێتەوە. کوێخای گوندێکی قەرزەکەی نەدابێتەوە. ئەویش چ کوێخایەك. کوڕەکەی خدرە مەزن و بەڕێزەکە، کە ڕدێن سپی و دەمڕاستی حەوت گوندان بوو. ئێستا وای دانێین و ناچار بیّ و هەڵە بکا یان فەرمانێك بیّ و قایمقەمام بانگی بکا و ناچار بیّ بچێتە شاری، ئاخۆ لەویّ لە ئاست ئەو خەڵکە سەری هەڵدیّ؟ ئاخۆ دەتوانیّ سەیری چاوی خەڵك بکا؟

بەلاّم ئیدی کار لە کاریّ ترازاوە. ئەمڕۆ سبەی، عادیل ئەفەنی دیّ و چ هاتنێکیش... وەك هەڵۆیەکی پەلاماری پۆلە کۆترێك بدا و کۆترەکان لە ترسی گیانیان، هەر وا کە پەڕ و باڵیان بە ئاسمانیّ وەردەبیّ، پەنا بەرنە بەر ئێرە و ئەویّ. دیّ و تەنانەت دوایین دەرزیی هەموو ماڵەکانیش دەستێنیّ و دەیبا. ڕووداوی دیکەش دەقەومیّ. کاری ئەو خەڵکە پێش بینی ناکریّ. ئەگەر برسی بن، دەبنە سەی هار. نەدەبوو ئەو گوندییانە برسی بن. هیچ دوور نییە لەو ساتەدا عادیل ئەفەنی تیتۆڵ تیتۆڵ بکەن و تەنانەت چەکدارەکانیشی...

بیرێك وەك برووسکە بە مێشکیدا هات. بانگی گزیرەکەی کرد:

- گزیر، گزیر، ئەوە لە کوێی هەتیو، زوو وەرە ئێرە.

گزیر دەسبەجیّ وەلاّمی دایەوە:

- فەرموو گەورەم. لێرەم.

سەفەر گوتی:

ـ بچۆ جارِ بدە، با هەموو خڕ بنەوە. دوو قسەم پێیانە. دەمەوێ شتێکیان پێ بڵێم.
گزیر دەسبەجێ چووە نێوەڕاستی گوندی و دەستی کرد بە جارکێشان:
ـ دوایی نەڵێن نەمانبیستووە... هەتا پێنج دەقیقەی دیکە، هەموو دەبێ لە بەر دەرگای کوێخا بن. خێرا بن. پەلەی بکەن. کوێخای ئێمە، نوێنەری یەکەمی حوکمەتەکەمان، دەیەوێ ڕێنوێنیتان بکا.
مرێمۆك هەر لەوێ ڕاوەستابوو و بەبێ ئەوەی چاوی بتروووکێنێ، چاوی لە دەرگای ماڵەکەی بڕیبوو. سێبەرەکەی کە خۆی دابووە سەر دارەدەستەکە، لە بن تیشکی هەتاوەکەی بەیانیدا کەوتبووە سەر بەفرەکە و هەتا گۆڕەپانەکەی گوندی کشابوو.
سەفەر دەترسا: "ئەو پیرەژنە غەززەبە لە خۆڕا ئاوا لە بەر دەرگای ڕاناوەستێ. بەخوای موویەك لەو ماستەدا هەیە کە ئەقڵی مرۆڤ نایبڕێ. با بزانین ئاقیبەتی چ دەبێ."
چووە لای مرێمۆك و بە نەرم و نیانی گوتی:
ـ نەنە مرێمۆك، ئەوەندە ڕاوەستای ئاوی لاقت چوو، ورە ژووری دانیشە.
مرێمۆك وەڵامی نەدایەوە و هیچ نەشجووڵا. سەفەر ئەوەندەی دیکە لەوەی ترسا:
ـ ئەوە نەهامەتییەکە و بەرۆکی ئەو گوندەی گرتووە. هەر مەزراکەی* ئێمە وا نەبوو. هەموو مەزراکانی چوکووراوا بێ بەرهەم بوون. خەڵکی هەموو گوندەکان ئەمساڵ قەرزباری عادیل ئەفەنین. وا نییە نەنە مرێم؟ دایکی دایکان؟ ئەستۆندەکی تاوڵی گوندەکەی ئێمە، نەنە مرێمۆك. مام خەلیل و ئەو هەتیوە خوێڕییەت ئەو عەلی"یە درێژە بە نۆکەر و بە قوربانی تۆ بن و لە دەوری تاڵەموویەکت گەڕێن. دەتەویست چی بە من بڵێی؟ بڵێ دەی، سەفەری کوڕت، چیی بفەرمووی لەسەر چاوی خۆی دادەنێ؟... ئەتۆ دایکی خۆمی. چما وا نییە؟...
گوندییەکان بە دەنگی جارِی گزیر لە ماڵێیان هاتنە دەرێ و بەرەو ماڵە کوێخای دەچوون. کوێخا کە دیتنی بە پەلەپەل گوتی:
ـ سەیر کە دایە گیان، گوندییەکان ئەوە دێن. ئەگەر قسەیەکت هەیە فەرموو لەسەر چاومی دادەنێم. ئەگەر بفەرمووی مام خەلیل لەو گوندە وەدەر دەنێم و دێ بەدەری دەکەم. ئەگەرچی خۆیشی ڕای کردووە... و چاوی بەو دێیە ناکەوێتەوە.... وەرە ژووری دایە، وەرە ئەو کاتەی قسە بۆ گوندییەکان دەکەم لە تەنیشتمەوە ڕاوەستە.

---

* مەزرا: هەر مەزرەعە عەرەبییەکەیە و کوردێنراوە و لە موکریان بە کێڵگەی کشتوکاڵی دەڵێن مەزرا.

پیلی مریمۆکی گرت. مریمۆك دەستی ڕاپسکاند. کوێخا بە تووڕەییەوە گوڕاندی:

ـ چیتان لە گیانی من دەوێ؟ ئەمن واز لەو کوێخایەتییە دێنم. چش با گوندی بێ گەورە بن. چیتان دەوێ؟ ئەمن نەبم، ئەو گوندییانە تێدا دەچن. ئێستاش لەبری ئەوەی لای من ڕاوەستی و وەك یەکەمی ئەنجوومەن سەیرت بکەن، وەرە لێرە ڕاوەستە و لە نێو گوندییەکاندا بمێنەوە.

گوندی لەبەر دەرگای ماڵەکەی کۆ دەبوونەوە. کوێخا چووە پێشتر و دەستی کرد بە سەیر کردنیان. هەموو سەرلێشێواو و بێ هیوا دەهاتنە بەرەوە. بێدەنگ بوون... تەنانەت منداڵە ساواکانیش نەدەگریان. ڕواڵەتێکی ئەوەندە تۆقیویان هەبوو لەوانەبوو بە چووکترین دەنگ بگەڕێنەوە و ڕا بکەن.

کوێخا گوتی:

ـ ئەندامەکانی ئەنجوومەنی گوندی بێن و لە تەنیشتم ڕاوەستن. دانوستانێکی زۆر گرنگمان هەیە. دەمەوێ پێتان بڵێم چا چییە.

ئەنجوومەنی گوند دەسبەجێ هاتن و لە لای ڕاستییەوە بە ڕیز وێستان. هەموو گوندەکە، ورد و درشت بە پیر و گەندەوە هاتبوون و لە دەرکی کوێخای خڕ ببوونەوە. تاقە یەك کەس نەهاتبوو. ئەویش تاشباش ئۆغلۆ بوو.

کوێخا لە دڵە خۆیدا گوتی:"هەی کافر، خۆ لە هیچ کارێکی ئەو گوندە نادا و قسەیەکیش ناکا. گوندییەکان بە قسەی ئەو لەبنەوەبڕە دەکەن. تەماحی لەو پلە و پایەی منە. بەو جۆرەی دەستی پێ کردووە سالی دادێ کوێخایەتییەکەشمان لە چنگ دەردێنێ. زۆر چاکە. ئێمەش تەگبیر و ڕای خۆمان هەیە. ئێمە زۆر دەرکەمان بە قوون کردووەتەوە. تاشباشی داماو.

گوندی بەبێ ئۆقرەیی چاوەڕێ بوون. کەس سریوەی لەبەر نەدەهات.

سەفەر بیری کردەوە:"گوندەی بۆوەی نابن وەڕەزیان بکەی. ئەگەر وەڕەز بن، ئیدی قسەیان ناچێتە کەللەی..." و دەستی پێ کرد:

ـ بەڵایەکی گەورە بەرۆکی گوندەکەمانی گرتووە. ئەوە دووەم جارە تووشی نەهامەتی دەبین. خودا بەسەر کەسی نەهێنێ، بە تایبەتی هیچ هاووڵاتییەك تووشی نەبێ. زۆر کەس لە بیریانە ڕێك بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر لە چوکووراوا لۆکە لە وشکەساڵی و بێبارانیدا هەمووی سووتا... دەتگوت چڵە گیایەکیش لەو چوکووراوایە نەڕواوە. ئەو ساڵە چووینە چوکووراوا، کە گەیشتینێ دیتمان مەزرا چییان بەسەر هاتووە. چارمان نەبوو. بە دەستی بەتاڵ گەڕاینەوە و

چاوەڕێ بووین. وابوو عادیل ئەفەنی بەخۆی و بیست جەندەرمەی چەکدارەوە هات. نوێنەرێکی حوکمەتیشی لەگەڵ بوو. لە ئێمەیان پرسی ئاخۆ قەرزی عادیل ئەفەنیمان لەسەرە یان نا؟ هەموو گوتمان بەڵێ، حاشاکردن لە قەرز، حاشاکردنە لە خودا. گوتیان عادیل ئەفەنی دار و نەدارتان دەبا. گوتمان، نۆشی گیانی بێ، هەقی خۆیەتی. لەوانەیە زۆرتان لەبیرتان مابێ، عادیل ئەفەنی دەستێکی بە دێیەکەدا هێنا و چیی گەنم و ساوار و ئارد و مریشك و کەڵەشێر و بزن و مانگا و گوێدرێژ و ئەسپ هەبوو، هەمووی ڕادا و بردی و شتێکی دیکەشی کرد: "نیوەکی ژنەکەی مچەکەچەڵیشی بڕی و بردی و گوتی: "جا، هەموو شتێکتان لەبیر بچێتەوە ئەوەتان لەبیر دەمێنێ کە نیوەکی ژنەکەتانم بڕی و بردم. ئیدی لەمەودوا پارەی من ناخۆن." ئەو ساڵە هەتا بەهارێ عادیل ئەفەنی بە عارەبانە و ئەسپ و گوێدرێژان دار و نەداری گوندییەکانی هەموو برد. ئەو گوندەش ئەوەندەی تێدا بوو تەواو نەدەبوو. ئەو ساڵە لەو سۆنگەیەوە گوندی برسی مانەوە. توێکڵە دارمان خوارد. گەنمی شین بەر لەوەی گوڵ بکا، خواردمان. ئەو ساڵە ئەو هەمووە منداڵە لەو گوندەدا لە برسان مردن... دەلییە سەرخۆش، سێ منداڵی لە برسان پێڕاهاتن* و لە تاوان هەستا بچێ عادیل ئەفەنی بکوژێ، گوتمان" ئەمانە، دەغیلە مەستان، نەکەی، کاری کردنێ نییە." خۆمان بەسەر پێڵاوەکانیدا کێشا. ئەی کێ شت و مەك بە گوندییان بفرۆشێ؟ ئەگەر عادیل ئەفەنی نەبێ، هەر هەمومان ڕووت و قووت دەمێنینەوە." و دەلی سەرخۆش عادیلی نەکوشت. و خوداش سێ منداڵی دیکەی دایەوە.

"جا ئێستا پێتان دەڵێم، بیستوومە عادیل ئەفەنی بەخۆی و بیست چەکدارەوە ئەوە دێ. دیسان دەیەوێ دار و نەداری گوندەکە بەرێ. خۆ ئەمساڵ بەرووبوویەکی وا نەبوو. ئەگەر هەموو شتەکانمان بەرێ، ئەوە نەهامەتییەکی گەورەیە بۆ گوندەکە و هەروەها زۆر کەس لە برسانا دەمرن.

بۆیە دەمەوێ تەگبیرێکتان پێ بکەم. کەس عادیل ئەفەنیی پێ ناگێڕدرێتەوە. چار نییە. دێ و گوندەکە ڕووت دەکا و هەروەها منداڵ و پیریش هەموو لە برسانا دەمرن. لەوانەشە هەر هەموومان لە برسان بمرین و لە شەرمەزارییان ببینە دڵۆپە ئاوێك و بچین بە عەرزدا. جا چ بکەین؟ بۆیە ویستم بێن، گوتم بەشکم ڕێیە بدۆزینەوە. دەی باشە ئێستا چ بکەین.

---

*پێڕاهاتن: ئەوەی لە تینووان دەمرێ دەڵێن لە تینووان خنکا. بۆ برسیش دەڵێن: لە برسان پێڕاهات. پێڕاهاتن بە گشتی بۆ مردن و دیق کردنیش بەکاری دێنن.

لە دوا دواوە پیرەمێردێك هەرای كرد:

ـ با گوندەكە چۆل كەین و بڕۆین، تا عادیل ئەفەنی دێ و دەبینێ گوندەكە چۆلە و پێی وا دەبێ هێشتا لە چوكوور نەگەڕاوینەتەوە.

كوێخا ڕەگی ملی وەك گوریسی لێ هات:

ـ ناكرێ. بەو بەفر و بۆرانە ناكرێ گوندەكە چۆل بكەین. بۆ كوێ بچین؟ پێتان وایە عادیل ئەفەنی نازانێ ئێمە لە چوكوور گەڕاوینەوە؟ ئەوجار ئەگەر بێ و گوندەكە چۆل ببینێ، ئاخۆ ئاگری نادا؟... ئەو قسەیەت پووشێك ناژێ.

چەند دەنگێك پێكەوە گوتیان:

ـ هیچ چاری دیكەمان نییە جگە لەوەی گوندەكە جێ بێڵین و بڕۆین.

ـ كوڕە چا ئەمن هیوام بە ئەنگۆ بوو. ئەوجار پێم وابوو گوندییەكانی من ئەقڵێكیان لە مێشكیدا هەیە. هەروەها پێشم وابوو ڕێگە چارەیەكم دەخەنە بەردەم. جا ئێستا كە ئەنگۆ هیچتان لە دەست نایە، جوان و زەریف گوێتان بكەنەوە و بزانن دەڵێم چی. هەرچی گوتیشم بیكەن. بێت و بەقسەم نەكەن، هەرچی قەوما لە ئەستۆی خۆتان. ئیدی لە ئەستۆی من نییە. برسی مانەوەتان لە بەهارێدا و مردنی منداڵ و نەخۆشەكانتان پەیوەندیی بە منەوە نییە و ناشتوانن هیچ بەرۆكی من بگرن. ئەو ڕێگە چارەیە بەیانی زوو نەنە مرێمۆك كە هاتە ئێرە خستییە بەر دەمی من.

هەموو ئاوڕیان دایەوە و سەیری مرێمۆكیان كرد. مرێمۆك كە دەتگوت لەسەر دارەدەستەكەی وەنەوز دەدا، بە بیستنی ناوی خۆی سەری هەڵێنا و دوایی بە تووڕەییەوە چەند جارێك دارەكەی لە عەرزەكە ڕاكێشا.

ـ ئەوجار نەنە مرێمۆك ژیرترین و ئازاترین و بەغیرەتترین دایكی ئەو گوندەیە. پێی گوتم:"كوڕم، كوێخا، خودا ئەتۆی وەك ئەولیای خۆی بۆ ئەو گوندە ناردووە. پێی گوتم:"ئەو قسە و ڕاسپاردەیەی من بەو گوندییانە بڵێ." ئەوە منیش دەمەوێ قسەكانی ئەوتان پێ ڕابگەیەنم.

مرێمۆك پەیتا پەیتا دارەكەی لە عەرزی دەوەژاند و بێ ئۆقرە بوو. نەیدەزانی چ بكا و هەر بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە، بەڵام چون ئاد و بەڵێنی بەخۆی دابوو، ئەو گوندییانە نەدوێنێ، نەیدەتوانی هیچ بڵێ. كوێخاش دەیزانی ئەگەر ئەو بشمرێ یەك قسەش ناكا و لەسەری ڕۆیشت:

ـ جا ئێستا بچنەوە ماڵەكانتان و چیی هەتانە و نیتانە، هەر لە گەنم و جۆ و ئەسپ و گوێدرێژ و مانگا و گامێشەوە بگرە هەتا دەگاتە ڕۆن و ساوار و قاپ و قاچاغەكانتان، هەر

هەمووی بشارنەوە. دیارە دەپرسن لە کوێیان بشارینەوە؟ ئەمن چووزانم. هەر کەسە و بۆ خۆی جێگەیەك بدۆزێتەوە. ئەمنیش جێیەك بۆ خۆم دەدۆزمەوە. کە عادیل ئەفەنی و جەندەرمەکان هاتن، پووشێکیش چییە لەو گوندەدا دەستیان ناکەوێ. سەیر دەکەن و دەبینن وەزعی گوندەکە زۆر شپرزە و بە چاوی گریاناوییەوە لێرە دەڕۆن. تێگەیشتن؟ ئێستا دەچن وا بکەن؟

یەك یەکیان، نەبێ ئەوی دیکە هەموویان لەسەر بەفرەکە پێخاوس بوون. هەموو ژنەکان لەچکی ڕەنگاورەنگیان لەسەر کردبوو و کراسی چلکن و پڕ لە پینەیان لەبەردابوو. زۆربەی پیاوەکان چاکەت و بالتۆیان لەبەردا نەبوو و پانتۆڵەکانیشیان پینەکراو بوو. ئەو حەشامەتە کۆنەلەبەرە بەو ڕوخسارە ڕەشهەڵگەڕاوە تاوەسووتەیانەوە لە مەیدانەکە ڕاوەستابوون و نەدەجووڵان و هەر هەموویان وەك پووش و شووڵك کز و لەڕ بوون. هەر پێست و ئێسقان بوون.

کوێخا بەبێ ئەوەی لە جێی خۆی بجووڵێ ماوەیەك سەیرێکی جەماوەرەکەی کرد و گوتی:

- دەی برادەرینە، چیی دیکەتان دەوێ؟

دەنگی هەر ئەو پیرەپیاوەکە دیسان لە پشەوەڕا بەرز بۆوە و پرسی:

- هیچ چاری دیکە نییە، بۆوەی وا بکەین ئەمساڵ عادیل ئەفەنی نەیە؟...

جەماوەرەکە جووڵەیەکی کرد و گیانێکی وەبەر هاتەوە. لە هەر لایەکەوە دەنگێك هەستا:

- ڕێیەکی دی نییە؟...

کوێخا:

- ئەمن ڕێیەك شك نابەم. ناشتوانم بچم پێی بڵێم لێمان خۆش بە. بشڵێم قبوولی ناکا. ئەمساڵ گوندەکەی ئێمە بوو بە نموونە بۆ ئەوانی دیکە. بڕۆن، دەی بڕۆن هەرچی هەتانە و نیتانە بیشارنەوە. ئەمنیش هەر ئێستا خۆم دەچم وا دەکەم. دەی یاڵڵا بڕۆن و دەست پێ بکەن.

کوێخا پشتی تێکردن. مرێمۆك کە بە تووڕەییەوە دارەکەی لە عەرزەکە دەوەژاند، بە پللارێکی ڕێی هاڵاند*. دارەکە وەدەرگای ماڵەکەی کەوت و بەربۆوە.

---

* ڕێهاڵاندن: تێهەڵکردن، زیاتر بۆ هاویشتنی دار و بەرد گوتراوە. پللارێکم/بەردێکم ڕێهاڵاند/ تێمهەڵکرد.

## ٧

شەپۆلێکی شادی بە گوندەکە وەربوو. هەمووان پێدەکەنین و قسەی خۆشیان بۆ یەکتری دەکرد. ئەو لێوانەی پێکەنینیان لەبیر چووبۆوە و وەك تەڵەی تەقیویان لیٚ هاتبوو، ئاخرییەکەی بە پێکەنینەوە هەڵپچڕابوون. هیچ کەس تا ئێستا عادیل ئەفەنیی بەو دەردە نەبردبوو.

لە خۆشییەکی زۆرەوە لە سۆنگەی ئەو دەردەی بە عادیل ئەفەنییان دابوو، بەرەو ماڵەکانیان دەرۆیشتنەوە و لە دڵیاندا گاڵتەیان بە ئەقڵی دەهات. بڕیار درا هەر کەسە و چیی هەیەتی و نییەتی، بیشارێتەوە. جۆرێك نوقمی شادی بوون و بیریان لەو فێڵە دەکردەوە کە بڕیار بوو لە عادیل ئەفەنیی بکەن، ئەگەر یەکێك لەو کاتەدا پێی گوتبایەن وەرن هەموو ماڵەکانتان بە دار و بەرد و خانووەکانیشەوە بشارنەوە، ئەوان بە شوێن ڕێگەیەوە دەگەڕان بۆ ئەوەی گوندەکەش حەشار بدەن. وایان لیٚ دەکرد، ئەگەر یەکێك هاتبایەتە لایان، هیچ ئاسەوارێکی لە گوندەکە بەرچاو نەکەوتبایەوە و جگە لە دەشتێکی وشك و بە بەفر داپۆشراو هیچ شتێکی نەدەدی.

مرێمۆك کە بە غاردان هاتبۆوە ماڵەکەی، ماوەیەك لەویٚ ڕاوەستا و داڵغەی لێدا. ئەو چ شتێکی وای هەبوو شیاوی شاردنەوە بیٚ و دەبوو لە کوێی بشارێتەوە کە هیچ کەس شکی لیٚ نەکا؟

لە بەردەم سندووقی جیازەکەی کە دار و تەختەکانی هەمووی کرمۆڵ و ڕزیبوون و کون کون ببوون و نزیك بە هەشتا ساڵێك دەبوو ساز کرابوو، دانیشت. سندووقەکەی کردەوە و هەرچی تێیدابوو هەڵیڕشتە نێو داوێنییەوە. لەو نێوەدا عەلی"یە درێژ و ژن و منداڵەکەشی هاتنەوە ماڵەوە. عەلی کە مرێمۆکی دی گوتی:

ـ دایە، ئەوە چ دەکەی؟

مرێمۆك بە تووڕەییەوە ئاوڕی دایەوە و لێی مۆڕ بۆوە.

عەلی دووپاتەی کردەوە:

ـ دایە، ئەوان چکاریان بە سەر وردەواڵە و مت ومووررووی تۆوە نییە. ئەوان کورتان و پەلاس و جێوبان و بەرە و پێخۆر و مانگا و مەڕ و ماڵات و قاپ و قاچاغیان دەوێ. ئەو زبڵ و زاڵەی تۆیان بۆچییە. ئەوانە لەسەر جێی خۆیان دانێوە و سندووقەکەشت پێوە دە.

مریێمۆك جارێکی دیکەش ئاوڕی لێ داوە و بەوپەڕی تووڕەییەوە لێی مۆڕ بۆوە.

بەنرخترین شتێکی هەیبوو، ئەموستیلەیەکی زیوی بە نەخش و نیگار بوو، کە برایی مێردی لەگەڵ مام خەلیل لە چەرکەزەکانیان دزیبوو:"فەرموودەی پێغەمبەری لەسەر نقێمەکەی نووسرابوو. دیارە دزێتیشە، بەڵام دیسانیش متفەرك و پیرۆزە. ئەو ئەموستیلەیە لە هەر ماڵێك بێ، خێر و بەرەکەتی بەسەردا دەبارێ. هەموو ئەوانە لەجێی خۆی، یانی عادیل ئەفەنی ئەموستیلەیەکی زیو هەڵناگرێ و نایبا؟ دیارە دەیبا. هەر دەبێ بیشارمەوە." ئەو خەزێمە زیوەی لە لووتی دەکرد و میراتی نەنکی بوو:"دیارە ئەویش لە نەنکییەوە بەمیرات پێی گەیبوو. عادیل چما خەزێمی ئاوای دەست بکەوێ نایبا؟ خەزێمێکی گرانباییە. عادیل خۆ گەمژە نییە."

دوو لەچکی هەورێشمین. یەکێکیان پرتەقاڵی و ئەویدیکە کەسك:"چۆن ئەوانە بەکاری بووکەکانی عادیل ئەفەنی نایەن؟ دەی چۆن نایانبا؟ عادیل ئەگەر ئەوەندە گەمژە و حۆل بوایە، چۆن ئەوەندە دەوڵەمەند دەبوو؟"

"ئەو ملوانکە کووژەکەیەش لە زۆر زۆر کۆنەوە مابۆوە. کە بە دەستییەوەی دەگری وەك ئاو دەخزێ و دەبریسکێتەوە. خودا دەزانێ عادیل چاوی بەوە بکەوێ بۆی شێت دەبێ. چۆن هەڵیناگرێ و نایبا؟ چما شێتە؟...

سێ بازنەی شووشەیی، یەکێکیان زەردی زێڕین، یەکێکیشان کەسك و ئەویدیکە سوورێکی هەناری:"باشە عادیل چۆن ئەوانە هەڵناگرێ و نایانبا بۆ کچەکانی؟ بازنەی ئاوای لە کوێ وەدەست دەکەوێ؟"

کراسێکی هەبوو هەر زۆر لە مێژ بوو، ئی کاتی بووکێنییەکەی بوو مابووی. هەر دوو سێ جارێکی لەبەر کردبوو:"باشە عادیل چۆن ئەو کراسە نابا و نایکاتە بەر ژنەکەی؟"

دەرزیدانێکیشی هەبوو لە چێوی کاژ داتاشرابوو، پڕ لە نەخش و نیگار و سێ دەرزییشی تێدا بوو:"یانی ئەو قوتووە دەرزییە و دەرزییەکانیشی بە کاری ژن و کچەکانی عادیل ئەفەنی نایەن؟ ئای "عەلی"یە درێژی کەر!"

لە سندووقەکەیدا چەند لەتە پەڕۆی ڕەنگاورەنگی دەرهێنا لەگەڵ دوو لەچك، کە یەکێکیان پڕ لە وێنە و ئەویدیکە شڕ و دڕ بوو. پێنج کووژەکەی شینیشی هەبوو، کە بە داوە دەزوویەکییەوە کردبوو. سندووقەکەی بۆنی دارە سێوی لێرەواری دەدا.

بەگومانەوە سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد، دوایی بەخێرایی دەستێکی بردە قوژبنی سندووقەکە و پرێسکەیەکی بچووکی هێندەی چوار قامك کە توند لە جاوێکی پێچابوو و لە مێوی گرتبوو، هێنا دەرێ و لە باخەڵی نا. "عەلی"یە درێژ و ژنەکەی ئەو کارەی ئەویان نەدی. لەو پرێسکەیەدا کە دەتگوت نوشتوویە، دە لیرە دراوی شاردبۆوە.

دەرەگای سندووقەکەی پێوە دا و وردەواڵەکانی کردە کۆشییەوە و هێنایە بەر دەرگا. پەڕۆیەکی زۆر کۆنەی لەسەر عەرزەکە ڕاخست و وردەواڵەکانی لەسەر ڕۆکرد. ئەوجار پێچایەیەوە و بە داوە بەنێك بەستی. ئەوەندەی بادا و پێچای، پرێسکەکە بوو بە گلۆڵە بەنێك. جا ئەوجارە دەبوو چ بکا و لە کوێی بشارێتەوە؟ لە پێشدا بیری لەوە کردەوە لە دووکەڵکێشی کوانووەکەیدا حەشار بدا، دوایی بەخۆی گوت نا دەیدۆزنەوە و دەیبەن.

ماوەیەکی زۆر بیری کردەوە. هەموو کەلێن و قوژبنی ماڵەکەی هەڵسەنگاند، بەڵام هیچ کوێی نەدۆزییەوە. دوای لە ناکاو بەبیریدا هات کە دەبێ چ بکا. لەبەر چاوی بوو. بۆ ئەوەی لە هێلانەی پەڕەسێلکەکانەوە جیقنە نەکەوێتە خوارەوە و وڵاتەکە پیس نەبێ، عەلی لەتە تەنەکەیەکی لە بنەوە بۆ هەڵواسیبوون. ئەگەر پرێسکەکەی لەوێ دانابایە کەس نەیدەدی، بەڵام خۆ دەستی نەدەگەیشتێ لەوێی دابنێ و هەر "عەلی"یە درێژ دەستی دەگەیشتە میچەکە، ئەدی چۆن دەکرا داوا لەو بکا ئەو کارەی بۆ جێبەجێ بکا؟ لەو ماوەیەدا نە عەلیی دواندبوو و نە خەڵکی ئاوایی و نە هیچ شتێکیشی لەکەس ویستبوو، کەچی ئەمجارەیان چار نەبوو. شتێکی واش نەبوو لە بن پێی خۆی دابنێ و بچتە سەری. کۆتەرە دارێکیان هەبوو، بەڵام قەوەی پێی نەدەشکا هەڵیگرێ و بیهێنێ.

پرێسکە بە دەستەوە و چاوی لە چاوەکانی "عەلی"یە درێژ بڕی. عەلی لە تەنیشت ئاگردانەکەوە خەریك بوو جێیەکی هەڵدەکەند. ئەلیف و منداڵەکانیش یارمەتییان دەکرد. قەرار بوو ئارد و ساوارەکە لەوێ گڵەسەر بکەن و عەلیش مرێمۆکی نەدەدی کە چاوی تێوە بڕیبوو.

مرێمۆك وا شڵەژابوو دەتگوت ئێستا نا ئێستا دەگەنێ و دار و نەداری لە چنگی دەردێنن. وردە وردە بەبێ ئەوی بۆخۆی ئاگای لێ بێ، لە عەلیی کە خەریك بوو بە پاچ عەرزەکەی دەکۆڵی، چووە پێشەوە. ئەوەندە چووە پێشەوە ڕێك لەبەردەمی عەلی ڕاوەستا. ئەو پاچەی عەلی بەرزی کردبۆوە

دایهێنابایەوە، کارەساتێك دەقەوما. کە مرێمۆکی لەبەر پاچەکە بینی، گۆڕاندی:"دایە، ئـەوە بۆچـی هاتوویە بەردەم ئەو پاچە؟ چیی وای نەمابوو وەتەپڵی سەرت بکەویّ."

مرێمۆك بەبیّ ئەوەی وەسەرخۆی بێنیّ، یەك دوو هەنگاو کشایەوە و سـەیرێکی کوڕەکـەی و پرێسکەکەی دەستی کرد و چەند جارێك دووپاتەی کردەوە.

عـەلی نـەیزانی چـیی دەویّ. دوایـی مرێمـۆك ڕووی خـۆی هەڵاویـشت و چـووە پێـشەوە و مەچـەکی کوڕەکـەی گـرت و بردییــە بـن هێلانـەی پەڕەسـێلکەکە و بـە ئامـاژە داوای لێکـرد پرێسکەکەی بۆ لەویّ دابنیّ.

عەلی بە پێکەنینەوە پرێسکەکەی لە دایکی وەرگرت و لـە نێـوان میـچەکە و تەنەکەکـەدا جۆرێك جێی بۆ کردەوە چاو نەیدەدی. گوتی:"ئاوا باشە دایە؟ کەس نایبینیّ."

ماڵی بنیادەم بەگیانییەوە بەستراوەتەوە. مرێمۆك بۆ یەکەمین جاری بوو بەزیبوو و شـتێکی لە کوڕەکەی ویـستبوو. بزەیـەکی کـاڵ لـە لێـوی گـەڕا. چـووە قـوژبنێکی دیکـەی ژوورەکـە و کراسەکەی داکەند و بە دەرزی و دەزووەك کە پێشتر ئامادەی کردبوو، پرێسکە لە مێوگیراوەکە لە بن باخەڵییەوە دووری و کراسەکەی لەبەر کردەوە.

عەلی ئـارد و سـاوار و کووپـە ڕۆنەکـە و مەنجـەڵ و قـاپ و قاچـاغەکەی خـستە نێـو ئـەو قووڵکەیەی هەڵیکەندبوو و سەریشی بە پوش و گەڵا و کەوڵی بزن و مـەڕ داپۆشـی و جـارێکی دیکەش دار و چرپیی لەسەر دانایەوە و ئەوجار خۆڵی پێدا کرد. ئەلیف سەر گڵەکەی سواخ دا و بۆ ئەوەی سواخەکە زووتر وشك بێتەوە، ئاگرێکی لەسەر کردەوە.

جا ئەوجار نۆرەی دانەوێڵەی عەمباریّ بوو. عەلی نەیدەزانی چ بکا. دەڵێن بەندەی خودا تا لێی نەقەومیّ، حەزرەتی خدر بەهانایـەوە نایـە. دەسـبەجیّ بەمێـشکیدا هـات کـە وا باشـترە قووڵکەیەك لە عەمبارەکەیدا هەڵکەنیّ و هەموو دانەوێڵەکەی لەوێدا بشارێتەوە.

هەرچـی توورەکـە و گـۆنیی دانەوێڵـە بـوو هێنایانــە دەرەوە و مرێمـۆکیش لـەوکارەدا یارمـەتییانی دا. عـەلی هـەتا نیـوەڕۆ قووڵکەیـەکی لـە عەمبارەکـەدا هەڵکەنـد و تـەختی قووڵکەکەی بە چیلکە و چێو داپۆشیو. بە ئەستووری کای لەسەر ڕۆکرد. گۆنییە دانەوێڵەکانیان بردە نێو قووڵکەکەوە و بە یۆنجە و کا دەورویشتیان داپۆشی. جێویـان و دەسـتەنوێن و هەرچـی دار و نەداریانە هەموویان بە یەکەوە لەویّ دانا. کا و یۆنجەیان بەسـەردا کـردن و سـواخیان دا. نێو ماڵەکەیان و هەموو سندووق و قەرتاڵەکان بەتاڵ بوون.

لـە دەرەوە، مەشـکەیەکی دار مـابۆوە، کـە قـەوزەی گرتبـوو و کەسـك دەچـۆوە و ئـاوی دەدەڵانـد. لەگـەڵ قـاپێکی مــسی و قابڵەمەیـەکی ڕەش و دوو کەوچـکی چـێوی و قـاپێکی

شیوخواردن و لەسەرە لەتە پەڕۆیەك، هێندێ ساوار بۆ خواردنی دوو ڕۆژان لەگەڵ لوێچێك خوێ و بەرە کۆنێك لەسەر عەرزەکە...

"جا ئێستا با عادیل ئەفەنی بێ و هەر هەمووی ڕامالێ و بیبا..."

مابۆوە شاردنەوەی ئاژەڵەکان. ئەوە لە هەمووی گرنگتر بوو. عەلی بە تەنێ ئەوەی بۆ چار نەدەکرا. دەبوو بەهەمموو خەڵکی گوندی بیرێك لەوە بکەنەوە. بە ئەلفی گوت:"بۆ کاروباری مەڕ و ماڵاتەکە دەبێ لەگەڵ خەڵکەکە قسان بکەم. ئەوە دەچم و دێمەوە." و لە ماڵێ وەدەر کەوت.

هەوڵی لەوە گەورەتر هەوڵی حەسەن بوو. شقارتەکانی لە کەلێنی دیوارەکەدا شاردبۆوە. بیری کردەوە ئەگەر بێن و ماڵەکە بگەڕێن بە دڵنیاییەوە دەست لەو کونەش دەنێن و شقارتەکان دەردێنن. غاری دا و لەبەر کونی دیوارەکە داهاتەوە و شقارتەکانی هەڵگرت و نایە باخەڵییەوە و چووە دەرێ. لە دەرەوە بەفرێکی نەرم دەباری.

ئێستا حەسەن ماڵە و ماڵی دەکرد بۆوەی شوێنێك بۆ تاقەتکردنی شقارتەکانی بدۆزێتەوە. لە پێشدا چەند جارێك بە دەوری ماڵەکەی خۆیاندا سووڕایەوە. جێیەکی دڵنیای نەدۆزییەوە. نەنە مریمۆکی چەندە پیتۆڵ بوو. وردەواڵەکانی خۆی لە چ جێیەکی باش شاردەوە. کەس ئەقڵی بەوێ نەدەشکا. ئەویش دەبوو شقارتەکانی خۆی لەوێ شاردبایەوە بۆوەی کەس نەیاندۆزێتەوە. بەشی سەت ساڵیان دەکرد. بەهەموو گوندەکە ئەوەندەیان شقارتە نەبوو.

خەریك بوو لە ترسانا دیق بکا. ئەگەر شقارتەکانی لە شوێنێکی باش شاردبایەوە و ئیدی نەچووبایەتەوە سەریان، تێدا دەچوو. ئەوکات لە خەفەتان شێت دەبوو.

ماڵە چۆلەکان و ڕەوەزکەکانی پشت گوند گەڕا و نەیتوانی شوێنێکی قایم بدۆزێتەوە بۆ شقارتەکانی. دیارە لە قوونەبانی ماڵەکەیان شوێنی وای لێبوو لە قوولکەیان بنێ، بەلاّم جا فایدەی چی. ماڵ و سامانی بنیادەم دەبێ لەبەر چاوی خۆی بێ.

ئەویش وەك نەنکی لە بێ ئۆقرەییدا خەریك بوو دەتەقی. پێی وابوو ئێستا نا ئێستا دەگەنێ و شقارتەکانی لە باخەڵی دەردێنن. لە ئارەقەدا خووسابوو. لە خەفەتان خەریك بوو بخنکێ.

بە گوندەکەدا دەسووڕایەوە. گوندەکە وەك پوورەی هەنگی لێهاتبوو و هەر کەسە و بۆ ئەوەی خۆشەویستترین و بەنرخترین شتەکانی لە جێیەکی قایم و دڵنیا تاقەت بکا و کەس دەستی وێیان ڕانەگا، لە هەوڵ دابوون.

•

حەسەن گوندەکەی سەنگ و سووژن دابوو و هیچ کوێی نەدۆزیبۆوە بۆوەی سامانە گرانباییەکەی لێ بشارێتەوە. بستێك بەفری لەسەر کەوتبوو. بە هەناسەساردی گەڕایەوە و لارەمل لەبەر بەفرەکە لە گۆشەیەکی ماڵەکەیانەوە ڕاوەستا. باشە نەدەبوو هەروا لە باخەڵیدا بن؟ هەر دەستیشی لەسەر هەڵنەدەگرتن. ئەی شەوێ کاتی خەو چی کردبایە؟ ئەگەر دایکی دیتبای و پرسیبای حەسەن ئەوە باخەڵت بۆوا هەڵتۆقیوە؟ چیی گوتبا؟ ئەی قوڕی کوێی وەسەر کردبا؟ دەتگوت شقارتەکان لە باخەڵیدا بوونەتە سکلّ و پسکۆ و دەیسووتێنن. ئاخۆ باشتر نەبوو لە یەکێك بپرسیّ؟ کەسێکی لە گوندەکەدا شك نەدەبرد متمانەی پیّ بکا و نهێنییە گەورەکەی خۆ بۆ باس بکا. ئەریّ ئۆمەخان چۆن بوو؟ ئاخۆ ئەویش بۆوەی نەدەبوو متمانەی پیّ بکا؟ خۆ ئەو هەر دەیزانی.

دەستەکانی لەسەرمان شین و مۆر ببوونەوە. هیچ چاری نەبوو جگە لەوەی متمانە بە ئۆمەخانیّ بکا و پێکەوە ئەقڵیان بکەنە یەك و تەگبیرێکی لیّ بکەن. چووە ژوورەوە، ماڵەکە نیوەتاریك بوو. ئاگری ئاگردانەکە دامرکابۆوە و ئۆمەخان لە تەنیشتییەوە سەری بەسەر سینگیدا شۆڕ کردبۆوە و دەتگوت خەونووچکە دەیباتەوە. حەسەن بەسپایی لێی چووە پێشەوە و دەستی لەسەر شانی دانا و گوتی:

ـ خوشکەکەم، تۆزێك وەرە دەریّ.

بێهیوایی و پاڕانەوەیەك لە دەنگیدا بوو.

پێکەوە چوونە دەریّ. دوای ئەوەی هێندێك لە ماڵەوەیان دوور کەوتنەوە حەسەن ڕاوەستا و دەستی ئۆمەخانی گرت. گوتنی ئەو نهێنییە گەورەیەی بەلاوە ئاسان نەبوو. بە تەتەپەتەوە گوتی:

ـ دەمەویّ شتێك بە خوشکی خۆم بڵێم. ئەتۆ خوشکی منی. لەو دنیایەدا هەر تۆم هەی. ئێمە کەسمان نییە، وا نییە؟

ئەو حاڵەتانەی حەسەن هەمیشە ئۆمەخانی دەترساند. ئەوجارە زیاتریش ترسا.

ـ دەمەویّ شتێکت پیّ بڵێم.

ئۆمەخان هەم دەیزانی دەیەویّ چیی پیّ بڵیّ و هەم کێچیشی لەکەوڵی کەوتبوو.

حەسەن دەنگی خۆی گڕ کرد و گوتی:

ـ ئەگەر ئەوە بە یەکێك بڵێی سەرت هەڵدەقەنم. تیتۆڵ تیتۆڵت دەکەم.

ئۆمەخان لە ترس ئەو هەڕەشەیەی لەرزی و لەسەرەخۆ گوتی:

- نایڵێم. بە کەسی ناڵێم. بۆخۆت دەزانی کەس قسەم لەزاری نابیستێ.

حەسەن بە متمانەوە لێی چووە پێشێ و بە سرتەیەك پێی گوت:

- دەزانم. ئەو شەمچانە لە کوێ بشارمەوە؟ چیی گەڕام لەو بەقوڕێ گیراوەدا شوێنێکم نەدۆزییەوە. خۆ عادیل ئەفەنی بێت و بیانبینێ لێمیان دەستێنێ... دایکم و بابیشم پێی بزانن... ئەگەر گوندییەکانیش چاویان پێیان بکەوێ تالآنی دەکەن.

ئۆمەخانیش داهاتەوە و بە سرتە شتێکی پێ گوت:

- بەتالآنی دەبەن. ئەی لە کوێ تاقەتیان بکەین؟

هەر لەوێ لەسەر بەفرەکە دانیشتن. بەفرەکە یەك پشوو دەباری. ماوەیەك سەیری یەکتریان کرد. دوایی ئۆمەخان سەری هەڵبڕی، ڕوانینەکانی شڵەژابوون. بزەیەکی هاتێ و گوتی:

- ئەها، دۆزیمەوە.

سەری بەرەو لای چەپ وەرسووڕاند و گوتی:

- ئەلێرە...

ئاماژەی بۆ ئەو دارە چنارە کرد کە لەو سەری حەوشەکەیان بوو:

- قەڵشتی ئەو دارە. کەس فکری بۆی ناچێ.

حەسەن کڕ بوو و سەیری دارەکەی کرد. دوایی پرسی:

- یانی کەس ئەقڵی بەوە ناشکێ؟

- ئۆمەخان پێی داگرتەوە:

- ئەقڵی هیچ کەس....

حەسەن لە جێی خۆی هەستا:

- ئەتۆ لێرە ڕاوەستە. با من بچم سەیرێکی بکەم. ئەگەر یەکێك هات زوو ئاگادارم بکەوە.

بە پارێزەوە بەرەو دارەکە چوو. چەند جارێك بە دەوری دارەکەدا خولایەوە. بە غاردان بەرەو ئۆمەخان گەڕایەوە:

- قەڵشتێکی قووڵی تێدایە.

ئۆمەخان لەخۆباییانە گوتی:

- خۆ ئەمن هەر دەمزانی. بۆیە گوتم:

حەسەن ئەو خۆتاریفکردنەی ئەوی لە دڵ گران هات:

- بۆخۆشم دەمزانی بەس دڵم قایل نەدەبوو. دارەکە لەبەر چاوە.

ئۆمەخان:

- دەی باشترە کە لەبەر چاوانە. چون کەس فکری بۆ ئەوە ناچێ ئێمە شقارتەکانمان لەوێدا شاردبێتەوە.

برووسکەیەکی شەیتانانە لە چاوەکانییەوە هەستا.

حەسەن:

- کەوابوو نابێ کەس مانبینێ کە دەچینە بن دارەکە.

ئۆمەخان کە چاوی لە چاوانی حەسەن بڕیبوو پرسی:

وا باشترە نییە ڕاوەستین تا بڕێك تاریك دەبێ؟

- با ئێستا بەلای دارەکەدا هەر نەچین و کەس سۆسەی نەکا.

ئۆمەخان:

بە ڕۆژیش ئاگامان لە دارەکە دەبێ بۆوەی ئەگەر یەکێك لێی چووە پێش، دەسبەجێ دەچین و شقارتەکان هەڵدەگرین و ڕادەکەین.

هەر دوو کیان نیگەران و بێ ئۆقرە لە تەنیشت یەکتری دائلغەیان لێ دابوو. جار و بارە پێدەکەنین و جاروباریش خەفەتبار و جارجارەش بەترسەوە و هێندێ کاتیش شاد و دڵخۆش، چاوەڕێی شەوداهاتنێ بوون. نوقمی چێژ و کەفوکوڵی نهێنییە هاوبەشەکەیان بوون.

"عەلی"یە درێژ چەند سەعات دواتر گەڕایەوە ماڵێ و بە ژنەکەی گوت:

- شوێنیشمان بۆ شاردنەوەی مەڕ و ماڵاتەکان دۆزییەوە. بڕیاردا بیانبەینە ئەشکەوتی پەرییان. ئەو شەکەوتە جێی هەموو ئاژەڵەکانی گوندی دەبێتەوە. تەنانەت بەشی مەڕ و ماڵاتی پێنج گوندی دیکەش دەکا... هێشتاش شوێنی هەر دەمێنێ. کا و تفاقیشیان بۆ دەبەین. هەر ڕۆژەی پێنج کەسی ئاوایی بە نۆرە دەچینە ئەوێ و تاقەتیان دەکەین.

ئەلیف:

- ئەی چۆن مانگاکان بدۆشین؟

عەلی وەڵامی دایەوە:

- هەر کەسە و دەچێ و ئی خۆی دەدۆشێ. بیرمان لەوەش کردووەتەوە. ئاژەڵەکان دەرکە دەرێ.

شەو دادەهات. گوندەکە دەتگوت چۆلە، بەڵام لەو گوندە چۆلەدا دوای ئەو فێڵ و گزەیەی لە عادیل ئەفەنییان کردبوو، شەپۆلی شادی و خۆشی ماڵەوماڵ دەڕۆیی. خەلکەکە و پشیلە و سەیەکان نەبێ زیندەوەر لە گوندەکەدا نەمابوو. نە بزنێك، نە گامێشێك، نە ئەسپێك و نە گوێدرێژێك و نە

مریشکێك و نه کەڵەبابێك... ماڵەکانیش چۆڵ چۆڵ بوون. جەواڵەکان بێ ئارد و ساوار و کووپەکان بێ ڕۆن مابوونەوە. لێفە و دۆشەگ و قاپ و قاچاغ لە گۆڕێ نەمابوون. لە هیچ کوێی دنیایە کەس گوندی ئاوا هەژار و دەستکورتی نەدیبوو. سەر و ڕوخساری خەلکەکەشی چلکن و شڕ و شپرێو بوو، بەلاّم تەنانەت لە قاتی و قڕییە گەورەکانیشدا نەبینرابوو خەلکی ئەو گوندە هێندە ڕووت و ڕەجاڵ بن. منداڵ و پیرمێرد نیوەڕووت بوون و هەمووش پێخاوس.

تاشباش ئۆغلۆ هەر وەك جاری جاران جلوبەرگی لەبەر کردبوو. دەستیشی لە ماڵی خۆی نەدابوو. هیچ شتێکیشی نەشاردبۆوە. ئاژەڵەکانیشی نەبردبووە ئەشکەوتێ. خەڵك بە دەستییەوە و لە داخی ئەو کارانەی خەریك بوو شێت بن و کوێخاش وەخت بوو لە داخانی بدڕێ. کە لە ماڵێ دەهاتە دەرێ هیچ کەس سەیریشی نەدەکرد و تەنانەت ئەزیەتیشیان دەکرد. گوندییەکان دەیانگوت:"ئێمە بە عادیل دەڵێین، بابم، ئەوانە خواپێداو و دەوڵەمەندی ئەو گوندەن. ئەو تاشباش ئۆغلۆە ملیۆنەری هەموو گوندەکانی پشت تۆرووسە. تاشباش ئۆغلۆ ڕێك وەك ئەملیزادەکەی ئاناتۆلییە کە چل باری ئێستری هەر زێڕ هەیە. کوێخا بە کوێخایەتییەکەی خۆی کەڕ لە ماڵی بکەوێ ددانی دەشکێ. ئەە، بچن سەیری بکەن." دەیانگوت:"خودا بتباتەوە تاشباش ئۆغلۆ. خودا غەززەبت لێ بگرێ. لەوەتا هەیە هەروا کەللەرەق بووە."

ئەگەر یەکێك دەهاتە نێو گوندەکەوە و دەچووە ماڵێك، کافریش بوایە ئاور لە جەرگی بەردەبوو.

کوێخاش ماڵ بە ماڵ دەگەڕا و دەیگوت:"ئافەرم، ئافەرم، ئەگەر دێیەك خەلکەکەی ئاوا یەکدەنگ و یەکگرتوو بن و قسەیان تێدا ڕاوەستێ، هەتا هەتایە، هەر دەمێنێ. کوێخای گوندێکی ئاوا وەك پاسەوانەکەی بەر دەرگای بەهەشت وایە. ئای بارەقەڵلا بۆ ئێوە. بارەقەڵلا گوندییەکانی من. ئەو هەمووە کەلوپەل و قاپ و قاچاغە و لێفە و دۆشەگ و دانەوێڵەیەتان چ لێ کردووە؟ هەر دەڵێی عەرز زاری داپچڕیوە و هەڵیلووشیون. جا با ئەوجار عادیل ئەفەنی هەر بێ و با بزانێ ئەنگۆ چەند هەژار و دەستکورتن و بلێ، ئەوە لە قەرزی خۆم خۆش بووم. ئەمساڵیش نەیدەن، ساڵی داهاتووش نەیدەن، هۆ ساڵەکەی دیکەش خودا کەریمە." ئەوەی تۆزێك پیاوەتیی هەبێ، لەوە زیاتر هیچ ناڵێ."

کوێخا پێدەکەنێ و گوندییەکانیش وێڕای ئەو نوقمی شادی بوون.

"هەروەها، ئەگەر عادیل ئەفەنی بێ و بەو حاڵەوە بتانبینێ دەڵێ:"حەوجێتان بە چی هەیە داوا لە من بکەن. هەر شتێکتان بوێ بە قەرز دەتاندەمێ." و دەشڵێ:"لە خراپی و ناڕەسەنیتان نییە قەرزەکەتان نەداوەتەوە، دیارە لە نەبوونی و هەژاریتانە." خەلکی شاری هەر بڕێك گەمژەن. ئەو

چووزانیٚ ئێمه چیمان هەیه و چیمان نییه و ئاوا شاردوومانەتەوە. هەر ئەقڵیشی پیێ ناشکیٚ. عادیل ئەفەنی سبەینێش نەیه، دوو سبەر هەر دیٚ. خۆتانی بۆ ئامادە بکەن و گاڵتە بە ئەقڵی بکەن و تۆڵەی خۆتانی لیٚ بکەنەوە. بۆتان دەردەکەویٚ چ کوێخایەکتان هەیە."

ئەو شەوە گوندەکە جێژنی بوو. ئاشقەکەچەڵە لە ماڵەکەی کوێخا بەسۆزترین گۆرانییەکانی خۆی چریبوو. مچە زەردیش بە تەنەکەیەك تەپڵی بۆ لێدەدا و "دووردومان"یش زورنای دەژەنی و گەنجەکانیش سیٚ پێی و شێخانی و فەتاح پاشایی هەڵدەپەرین. مریٚمۆکیش سەرەرای هەموو توورەیی و قار و قینەکەی چیی نەمابوو هەستیٚ و بە هەوای شمشاڵی کورەکەی هەڵپەریٚ. چیی نەمابوو زار بکاتەوە و لەگەڵ کورەکەی و هەموو گوندییەکان ئاشت بێتەوە و قسە بکا و بڵیٚ:"ئەوە لێتان خۆش بووم. بنیادەم چەندەی خراپیش بیٚ، چەندی زاڵمیش بیٚ، لایەنی باشیشی هەر هەیە." بیری دەکردەوە:"ئەو مام خەلیلە داماوە لەو تۆف و وەیشوومە و بەفرەدا بۆ کویٚ چوو؟ خۆزگە دۆزیبایانەوە و هێنابایانەوە."

حەسەنیش بەشداری شادی و خۆشییەکە بوو. یاریی دەکرد و پێدەکەنی، بەڵام هۆشی هەر بەلای شقارتەکانییەوە بوو کە لە پەڕۆیەکی پێچابوون و لە قەڵشتی دارەکەی نابوون. جار و بارە بەسپایی فیزماڵکی دەدایە و خۆی دەگەیاندەوە دارەکە. دەستی لە قەڵشتەکە دەنا و لە مانی شقارتەکانی دڵنیا دەبووەوە و دیسان بە غاردان دەگەڕایەوە و بە گیان و بەدڵ بەشداری خۆشییەکانی ئەو خەڵکە دەبۆوە.

شەوگار شەق ببوو. حەسەن خەوی لیٚ نەدەکەوت. جاری جاران تا سەری لەسەر بالیفەکە دادەنا خەوی لیٚ دەکەوت. لە فکردا بوو. فکری زۆر ئاڵۆز بوو. نەکا یەکێك لە کاتی شاردنەوەیاندا ئەوی دیتبیٚ... لە کاتی شادییەکەدا دەجاران چووبووە دەریٚ. نەکا یەکێك وەشوێنی کەوتبیٚ و شوێنی شقارتەکانی پیٚ زانیبیٚ. هەر بەراست ئۆمەخان بە کەس، بە دایکی و بابیی نەدەگوت؟ نە ئەو باسی ناکا. ئەگەر پێی خۆش بوو شقارتەیەکیشی دەدەمیٚ. ئەو فکرەی پیٚ خۆش بوو. ئۆمەخان لە تەنیشتییەوە نوستبوو. هەوڵی دا بەخەبەری بێنیٚ. کچە بەخەبەر نەدەهات. نقورچکێکی لە باسکی گرت. کچە کە زیڕاندی حەسەن ترسا و گوتی:

ـ مەقیژێنە. ئەمنم. هەستە. قسەیەکم پێتە.

ئۆمەخان ماوەیەك هەوڵی دا تەواو هەستیٚ. حەسەن پرسی: هەستای؟ ئۆمەخان بە ڕووگرژییەوە گوتی:

ـ هەستام. دەی باشە چیت دەویٚ؟

حەسەن:

ـ یەکێك لە شقارتەکانت دەدەمێ. ئەگەر دەتەوێ دووانیشت دەدەمێ. ئەتۆش بەڵێن بدە بە کەس نالێی. باشە؟...

ئۆمەخان تووڕەییەکەی لەبیرچۆوە و دڵی خۆش بوو و گوتی:

ـ بە کەس نالێم...

حەسەن بەسپایی و بەسرتە پێی گوت:

ـ وەرە سەرێك لە دەرەوە بدەین بزانین کەس نەیبردوون؟

ئۆمەخان:

ـ لەسەرەخۆ، بەسپایی.

لە جێیەکەی هاتە دەرێ و گوتی:

ـ بەبێ دەنگی دەرگاکە بکەینەوە. دایکم زۆر لەسەر هەست دەنوێ. خەویشی لێ ناکەوێ... بێت و بزانێ...

ئۆمەخان دەرگاکەی کردەوە و هەردووکیان چوونە دەرەوە.

حەسەن دەستی برد و شقارتەکانی بەدەستەوە گرت و دەستی پێدا هێنان. دەستیان وێنەکەوتبوو. ئۆمەخان گوتی:

ـ ئەمنیش با دەستیان لێدەم.

حەسەن:

ـ نایەوێ. لە جێی خۆیانن. با زۆر ڕانەوەستین.

ئۆمەخان:

ـ دەی، ئەمنیش حەزم لێیە دەستیان لێ بدەم.

حەسەن کەیفی بەو پێداگرییەی ئۆمەخان نەهات. بڕێك بەغیلیی هات، بەڵام خۆ قوتووە شقارتەیەك هی ئەو بوو. بە تووڕەییەوە بۆڵاندی:

ـ دەی ها. وەرە بیبینە، بەڵام زۆر نا. خێراکە.

دوای ئەوەی ئۆمەخان دەستی لە قەڵشی دارەکە دەرێنا، حەسەن جێیەکی ئەوی گرتەوە و ئەوجارەیان ماوەیەکی زۆر دەستی لەسەر شقارتەکان دانا.

هەتا بەیانی هەر پەرۆشیان بوو و دڵیان خۆش بۆوە و ترسان و قسەیان کرد. چەند جارێك چوونە دەرەوە و دەستیان لە قەڵشەکە نا و هەرکامەیان چەند ساتێك دەستیان لەسەر شقارتەکان دانا.

## ٨

حوسنی لە گۆشەی دیوارەکەوە وەك تارماییەك غاری دا. لە تاریکایی شەوەکەدا و لە ژێر ڕووناکایی بەفرەکەدا، چوونە نێو باوەشی یەکترەوە و بوونە یەك. وا تێکالآبوون، وەخت بوو ئێسقانەکانی یەکتر بشکێنن.

برێك دواتر لێك جویێ بوونەوە. ڕەجەب لە پێشەوە و حوسنی بە دوایدا چوونە نێو ماڵە چۆلەکەوە. ئاگرێکی نێڵدراوی سوور لەئاگردانەکەدا بوو کە تیشکەکەی ژوورەکەی ڕووناك کردبۆوە.

لەبەر سوورایی ئاگرەکە هەروا، برێك بەرەو پێشەوە داهاتبۆوە و ڕاوەستابوو و نووکی قامکەگەورەکەی لاقی خۆڵەکەی بەر ئاگردانەکەی تێك دەدا.

ڕەجەب بێ جووڵە ڕاوەستابوو و سەیری دەکرد و شیلە بزەیەکی لەسەر لێوان بوو و شای بە سەپان نەدەگرت. دەتگوت بارێکی قورسی لەسەر شانی لاچووە، بەلآم خۆشی نەیدەزانی ئەو بارە قورسە چ بوو؟

ئاگرە گەورەکە نێو ژوورەکەی وەك چلەی هاوینێ گەرم داهێنابوو. شەوێکیشیان لە مەزرای چوکووراوا حوسنیی ئاوا دیتبوو. نەیانزانیبوو جەستەیان چۆناوچۆن بە خاکە نەرم و گەرمەکەی کێڵگە پەمۆکەدا ڕۆچووبوو. کە وەخۆ هاتبوونەوە هەموو گیانیان بە خۆڵ و قوڕ سواخ درابوو. هەر لەوێ لە ڕووبارەکەی تەینشت خۆیاندا خۆیان شوشتبۆوە و لەش پیسییەکەیان دەکردبوو. ئەو کات لە ئاوەکەدا هەستی شێتانەیان پشکووتبوو. هەموو خەڵکی ئاوایی بەوکارەی ئەوانیان دەزانی، بەلآم گوێیان پێی نەدەبزووت.

ڕەجەب دەستی حوسنیی گرت و هەڵیستاند. کچە لەسەر پێیان خۆی پێ نەدەگیرا و بەلادا دەهات. ڕەجەب ماوەیەك شانی گرت و بەپێوەی ڕایگرت.

لەو حاڵەدا جەستە ماندووەکەی حوسنی جارێکی دیکەش بووژایەوە و سەرلەنوێ دەستی کردەوە لە لەرزین و مچورکەی چێژ. خۆی خستەوە ئامێزی ڕەجەب. ڕەجەبیش خۆی دایە دەست ئەو ویستە و دیسان لە سەر عەرزەکە تلانەوە و گەوزین.

بەرەبەری بەیانی بوو کە وەخۆ هاتنەوە لە پێشدا حوسنی جلوبەرگەکەی لەبەر کردەوە. دیسانیش وەك جاری جاران حوسنی نەیدەتوانی سەیری ڕەجەب بکاتەوە. پێی وابوو بێت و دوای ئەو کارە سەیری چاوی ڕەجەب بکات، هەموو سیحری چێژەکەیان بەتاڵ دەبێتەوە و هەر بۆیەش بوو نەیدەوێرا و هیچ نەشیدەتوانی غیرەت بنێتە بەر خۆی. حازر بوو بمرێ و ئەو سیحرە بەتاڵ نەکاتەوە.

ڕەجەب پێی وابوو حوسنی وەك جاری جاران، دوای لەبەرکردنەوەی جلوبەرگەکانی دەردەپەڕێتە دەرەوە، بەڵام دیتی وەك جاری پێشوو هاتەوە و لە تەنیشت ئاگردانەکە دانیشتەوە و چاوی بڕییە بڵێسەی ئاگرەکە. سێبەری مژۆڵە درێژەکانی کەوتبووە سەر کولمەکانی. ڕوخسارە ئارەقەکردووەکە وەك پشکۆ سوور دەچۆوە و لێوەکانیشی دەتگوت ئاگر و گوڵە هەنارن.

ڕەجەب چاوی لێ نەدەتروکاند. چەندی وەبیری دەهات، هەر لە سەردەمی منداڵییەوە ئاوا تاسەبارانە سەیری کردبوو. ئێستا دیسان وەك جاری پێشوو چاوەڕێی بوو ئەو قسان بکا. قسەکردنی ئەو شێتی دەکرد، بەڵام چیی چاوەڕێ بوو حوسنی سەری هەڵنەهێنا بۆوەی قسەیەکی بکا. ڕەجەب نەیدەزانی چ بڵێ. دەبوو شتێك هەر بڵێ. دەبوو قسەیەکی باش بدۆزێتەوە و بیڵێ، بەڵام دەبوو چ بڵێ و چۆنی بڵێ؟

ئاخرییەکەی دڵی توند بوو و وەك منداڵان بە زمانێکی پسك گوتی:

ـ باش بوو... هەموو گوندییەکان.. ئەمساڵ دوای لۆکە چنینەوە... هەڵتدەگرم و دەتبەم بۆ چوکووراوا....

حوسنی بە بزەیەکی تژی لە بەختەوەرییەوە چاوی بڕیبووە ئاگرەکەوە.

ـ چوکووراوا لە گوندەکەی خۆمان باشترە... لەو تۆف و سەرما و سەخڵەتەدا ناکرێ بڕۆین... ئەگەر بتەوێ پاییزێ دوای پەمۆ ڕنینەوە ئیدی ناگەڕێینەوە ئاوایی. ئەمن دەبمە شۆفێری تەراکتۆر. پارەی زۆر بە شۆفیریی تەراکتۆر دەدەن. سەرەتەقەیەکی لێ دەکەم. وەستا حەمید گوتی: بە دوو ساڵان دەتکەمە شۆفیری تەراکتۆر. چما دەکرێ لەو زستانە ڕەش و وەیشوومەیەدا وەدەرکەوین و بڕۆین. گورگی گورگ ئاسایی سەر لە لانی خۆی ناهێنێتە دەرێ. خۆت باش دەزانی. لە ڕێگایە ڕەقهەڵدێین و دەمرین. لەو بەفر و بۆرانەدا چما دەتوانین ئەو

چیای تۆرووسە ببڕین و بە سلامەتی بکەینە چوکووراوا. لێگەڕێ با بەهار و هاوین بێ، جا ئەوکات...

چاوی لە ئاگرە دامرکاوەکە بریبوو، بە بزەیەکی بەختەوەرانەوە و نەرم و نیان، بێدەنگ ببوو و دەتگوت هەر لەوێش نییە.

رەجەب هەستا. ئەویش بزەیەکی لەسەر لێوی بوو... لەو ئاوردووەی لە گۆشەی ژوورەکە بوو، چەند ویشکەلێکی هەلگرت و خستییە سەر ئاگرەکە. بۆنێکی تاڵ و مزری لێ هەستا. گەڕایەوە و لەسەر جێی خۆی دانیشتەوە. ساتێك دواتر هەستا و هات و بن گوێچکەی حوسنیی ڕامووسی. گەرمایەکی خۆش دەجەستەی حوسنی گەڕا. بەرەو هەژانێکی شێتانە باڵی دەگرت. وردە وردە سیحرێك ئامێزی پێدا دەکرد و ئەوی بەرەو بەهەشتێکی تژی لە بەختەوەری پەلکێش دەکرد.

رەجەب بە بزەیەکەوە گوتی:

ـ بەیانی عادیل ئەفەنی دێ. بە پەنجا جەندەرمەوە. ماڵ بە ماڵی ئاوایی دەگەڕێ. دەستی لە گونی بارگینیشمان گیر نابێ. بە سەرسووڕماوییەوە و بە تووڕەییەوە هەر ئاوڕ لە پشتەوەی دەداتەوە و ملی ڕێگایە دەگرێ و دەڕوا. دوای ئەوە... ئەوپەڕەکەی ساڵی داهاتوو بە قەرز شتمان ناداتێ. خۆ دووکاندار لەو دنیایە نەبڕاوەتەوە. دیتت گوندی چۆن هەموو شتەکانیان شاردەوە، بەلام ئێمە هیچمان نەبوو بیشارینەوە. ئەمن هەرچی گەڕام دەرزییەکیشم نەدۆزییەوە بیشارمەوە... زۆرم پێ ناخۆش بوو... تا ئێستا هەژاری ئەوەندەی کار تێنەکردبووم. چیی چاوم گێڕا هیچم نەبوو لە عادیلی بشارمەوە... زستانی داهاتوو ئێمە لە چوکووراوا نایەینەوە. ئەمن دەبمە شۆفێری تەراکتۆر. لێفە و دۆشەگ دەکڕم و سندووقێکی ئاوێنەدار و ڕادوێ و ... ئەگەر ڕۆژێکیش عادیل ئەفەنیی ئەوێندەر هات و بەردەرکی بە خەڵکی گوندەکە گرت، ئێمەش ئەوکات شتێکمان دەبێ بیشارینەوە. وا نییە؟...

چیی ئەو زیاتر قسەی دەکرد، ڕوخساری حوسنی گەشتر دەبۆوە. ئەویش شادییەکەی حوسنیی دەدی و یەك پشوو قسەی بۆ دەکرد.

رووبارێکی بەخۆڕ و شلەتێن، بە بن دار چنارە بەرزەکان و بەسەر چەوە سپی و درەوشاوەکاندا لووزەوی بەستووە و حوسنی خۆی تێدا دەشوا و جەستەی لە نێو ئەو بەختەوەرییە روون و ڕەوانەدا دەتوێتەوە.

ـ لە چوکووراوا باغی گەورە گەورەی لێیە، پڕن لە پرتەقاڵی زرد. باغی زۆر گەورە. شەوێك لەو باغانەدا ڕایدەبوێرین. باشە؟...

روخساره ئارەقە کردووەکەی حوسنی وەك گوڵ پشکووتبوو. چاوەکانی لە ئاگرەکە بڕیبوو و بزەی لە لێوی نەدەڕەوی.

ـ لەوانەشە هیچ چاوەڕێی پاییز و لۆکە ڕنینەوە نەبین. لە مانگەکانی بەهاریێدا، هەر لە جێژنەی خدری زیندوودا دەستی یەکتری دەگرین و بەرەو چوکووراوا تێی دەقووچێنین. هەموو وڵات شین و گەش و نوقمی گوڵ...

دەستی حوسنیی گرت. حوسنی بەبێ ئەوەی چاو لە ئاگرەکە بتروووکێنێ، ڕووی تێ کرد. ڕەجەب تیشکی بەختەوەریی لە ڕوخساریدا دی و دڵی خۆش بوو. دەستی حوسنیی توند گوشی و گەرمای ئەو دەستە هەتا ناخی ڕۆچوو. گوتی:

ـ پەلە مەکە با بەهار بێ.

حوسنی دەتگوت لە خەونێدا قسان دەکا. دووپاتەی کردەوە.

ـ پەلە مەکە با بەهار بێ. دەی با بێ.

هیوا و تاسەیەکی بەتەوژم لە دەنگیدا بوو.

کەڵەبابی بەیانی خوێندیان. حوسنی هەستا. چاوی لە عەرزەکەوە بڕیبوو و سێبەری مژۆڵە درێژەکانی دەکەوتە سەر کوڵمەکانی. دەستیان لە نێو دەستی یەکتری نا و وەدەر کەوتن.

ـ پەلە مەکە با بەهار بێ. دەی با بێ.

لێك جوێ بوونەوە.

# ٩

بەیانییەکی تاو و ساو بوو. ئاسمانْ شین و سامانْ بوو. شنەی بایەکیش نەدەهات. بەفر بێ مەوداکەی دەشتەکە دەبریسکایەوە. دەتگوت دەریایەکی بێ بواری تیشك بە پێدەشتەکەدا دەڕوا.

گوندییەکان لە پاناوکەکەی گوندی و لەبەر دەرگای ماڵان، لێر و لەوێ پۆل پۆل کۆزیلکەیان بەستبوو. باس باسی عادیل ئەفەنی بوو. هەر هەمووان باسی ئەویان دەکرد. وا بڕوایان بە هاتنەکەی عادیل ئەفەنی کردبوو ئیدی سات بە سات چاوەڕێی بوون...

ئاخۆ بە ڕاستی یەکێك گوتبووی دێ؟ ئاخۆ عادیل ئەفەنی لێی ڕاسپاردبوون کە فلانە ڕۆژ و فیسارە سەعات دەگەمێ؟ هەرگیز، بەڵام باوەڕیان بە هاتنەکەی کردبوو و بێ پسانەوە باسی ئەوەیان دەکرد کە ئەگەر هات چ دەکا و چ ناکا. بریسکەی شادی لە چاوی ئەو کەسانەدا بوو کە فێڵێکیان کردبوو.

- بێت و بێ و چاوی بەو گوندە بکەوێ دەڵێ:"وەیش خەلکە داماوەکەی "یالاك" خۆزگە خێر و خێراتێکم لە شاری بۆ خڕ دەکردنەوە و بۆم دێنان. کوڕە ئێمە گوندی هەژارمان زۆر دیون، بەڵام چما گوند هەبووە هێندە هەژار بێ؟ ئەمن دەبمە تنۆکێك ئاو، ئەگەر داوای قەرز لە ئێوە بکەمەوە."

- دەڵێ:" نەریتتان شکاندووە؟ قەیناکا، گەردنتان ئازاد بێ. وەختایەکی ئەو گوندە هەر هەمووی هەژار و داماو بێ و ماڵەکانیشی ئەوەندە ڕووت و چۆل بێ، نەریت چییە، دین و ئیمانەکەشی پێخوست دەکا." ئەدی، عادیل وا دەڵێ.

- دواییش دەڵێ:"وەرن لە دەوری خۆم خڕ بنەوە، گوندییە چارەڕەشەکان، خڕ بنەوە با بەهەمووومان تەگبیر و ڕایەك لەو وەزع و ژیانەتان بکەین و ڕێیەك بدۆزینەوە.

- دەی. بلێی ونەلێی ئەویش بنیاددەمە. ئەگەر دلیشی لە بەردیش بێ، دەبێتە ئاو.

گوندییەکان دوای ئەوەی ماوەیەك بەو شێوەیە لە نێوەڕاستی گوندەکەدا قسەیان کرد و چاوەڕێ مانەوە، بەرەو باشوور، بەرەو دەرەوەی گوندەکە و ڕووە و شاری داگەڕان. ڕێگە دیار نەبوو و بەفر دایپۆشیبوو.

چاوەڕێی ڕێبوارێك بوون کە لە خوارۆوە، لە نێومالّی چۆمەکەوە وەسەر بکەوێ. مرێمۆك گەردنی درێژ کردبۆوە و بە هەموو گیان هەستەوە چاوەڕێ بوو. لەسەر تاشەبەردێك دانیشتبوو و دەتگوت هەلّۆیەکە و دەیەوێ لە شەققەی باڵ بدا.

تاشباش ئۆغلّوش چاوەڕێ بوو و دەیویست بزانێ ئەو گەمەیە چیی لێ شین دەبێتەوە. ئاخۆ عادیل ئەفەنی بە دیتنی ئەو خانووە بەتالانە، بڕوا بە هەژارییەکەیان دەکا؟ ئاخۆ پیاوێکی ئاوا دنیادیدە و بە ئەزموونی وەك عادیل ئەفەنی ئاوا سووك و ئاسان هەلّدەخەلّەتێ؟ ئەو هەر پێ بنێتە گوندەکە، دەزانێ گوندییەکان دار و نەداری خۆیانیان شاردۆتەوە. گوندییەکان لەو جۆرە کارانەدا گەمژە دەبن. لەوانەشە لە کەرێتی نەبێ و گەمەی بکەن. ئێستا گوندێکی ئاوا گەورە خۆی بە یارییەکی منداڵانەوە خافڵاندووە. چاو، چاو، سەیرکەن، چەندەش دڵیان بەو گەمەی خۆیان خۆشە. بە هەموو ئەو کارانە وەکەیف دێن و لەوەی دڵیان بەوەش خۆشە عادیل ئەفەنی گوندەکە ئاوا دەبینێ.

"ئەوە وای دانێین عادیل ئەفەنی بڕوا بە هەژاریی گوندەکەش بکا. ئاخۆ لەمەودوا متمانە و بڕوا بە وەها گوندێك دەکاتەوە و بە قەرز شتیان دەداتێ؟"

هەتا نیوەڕۆیە ئاوا قسەیان کرد و ڕایانبوارد و هەلّلا و دەنگەدەنگیان کرد و چاوەڕێ بوون. دوا نیوەڕۆ وەڕەز بوون. خۆشییەکەیان ڕەوییەوە و یەك یەك و دوو دوو بەر جادەکەیان بەردا و چوونەوە مالّەکانیان.

دەمەدەمی ئێوارێ، تەنیا مرێمۆك لەوێ مابۆوە و ملی درێژ کردبۆوە و چاوی لە خوارووی دوورەدەست بڕیبوو. هەتا خۆر ئاوابوو و تاریکی بەسەردا هات هەر لەوێ مایەوە.

کە تەواو هیوا بڕاو بوو، لە جێی خۆی هەستا و خۆی دایە سەر وەکازەکەی و وردە وردە بەرەو مالّێ کەوتە ڕێ. لەبەرەخۆیەوە گوتی:

ـ باشە هەر بەراست عادیل ئەفەنی ئەمڕۆ بۆ نەهات؟

بزەیەکی هاتێ:

"چما ناچار بوو ئەمڕۆ بێ؟... پێویست نەبوو ڕێك ئەمڕۆ بێ کە ئێمە دار و نەدارمان شاردۆتەوە. ئەویش بێ.... لەوانەشە سبەی بێ، یان ئەگەر سبەینێش نەیە، دوو سبەی...

مریەمۆك كەیفی بەو چاوەڕوانییەی ئەمڕۆ هاتبوو.

ئەو شەوە گوندییەكان ئاسوودە نووستن. كەس قریوەقریوی نەكرد و هاموشۆی یەكتریشیان نەكرد و لە دەوری یەكتریش كۆ نەبوونەوە.

كەرەی بەیانی لە خەوێ هەستان. دەیانگوت:"ئیدی ئەمڕۆ هەر دێ..."

چەند ژنێك و لە پێشیانەوە مریەمۆك چوون و لە دەرەوەی ئاوایی لەسەر ڕێیەكە دانیشتن. دیسانیش بەرەبەری ئێوارێ مریەمۆك لەوێ تەنیا مایەوە و دوایی خۆر ئاوابوو و شەو بەسەردا هات و خۆی دایەوە سەر وەكازەكەی و بەرەو ماڵ بۆوە. دیسان بەخۆی گوت:

"دیارە پێویست نەبوو ئەمڕۆ بێ. سبەی دێ."

ئەو شەوەش بێ خەم لێی نووستن.

بەیان ئەنگووت. بەیانییەكی تاو و ساو بوو. ئاسمان ساماڵ و بێ پەڵە بوو. مریەمۆك لەگەڵ منداڵەوردكە و پیرەژنان چووە دەرەوەی ئاوایی و لەسەر ڕێگەی شاری دانیشت و چاوەڕێ بوو.

## ١٠

لەو کاتەوە مەڕ و ماڵاتەکانیان بردبووە ئەشکەوتەکانەوە، گوندەکە حاڵەتێکی سەیری هەبوو. ماڵەکان گەرم دانەدەهاتن. هەر دەتگوت شتێکیان بزر کردووە. لە ماڵە وشك و برینگ و بەتاڵەکانیان دەترسان. تەنیایی و غوربەتێك بەرۆکیان گرتبوو وەك بڵێی لە چول و چیا یان لە ناخی دارستانەکاندا سەریان لێ شێوابێ.

مریەمۆك گۆلکە قاوەییەکەیانی زۆر خۆش دەویست. زۆر غەریبیی کردبوو. ئەگەر ئەو تاسەبارییەی خۆی ئاشکرا نەدەکرد و بەرەو ئەشکەوتان ملی ڕێیەی نەدەگرت، هەر لەبەر ئەو گەنجینەیەی بوو کە لە هێلانە پەڕەسێلکەکەدا شاردبوویەوە. لەوەی ماڵ و سامانەکەی لە هێلانەی پەڕەسێلکە و لەبەرچاوی خۆی بوو، تینی لە دڵی دەگەڕا. لەبەرەخۆیەوە دەیگوت:"ئاخ، خۆزگە ئەو تووك لێکراوە بێ و بڕواتەوە و نەجاتمان بێ."

ڕۆژێکیان کەرەی بەیانی دیسان لە ماڵەکەی هاتە دەرێ. هەمووان پێیان وابوو وەك جارەکانی پێشوو، دەچێتەوە دەم ڕێیەکە و لەوێ دادەنیشێ و چاو دەبڕێتە ڕێگاکە. کەچی دیتیان بەرەو لای دارستانەکە وەرسووڕایەوە و بەرەو ئەشکەوتان دەچێ. منداڵەوردکە کەوتنە شوێنی. سەردەستەی هەمووان حەسەن بوو. ژنەکانی ئاوایی دیتیانن و هەمووان وەشوێن مریەمۆکێ کەوتن. مریەمۆك لە دارستانەکە پەڕییەوە و گەیشتە ئەشکەوتی پەرییان. لەوێ چەند ئافرەتێك خەریکی دۆشینی مانگاکان بوون و چەند پیاوێکیش تفاقیان بە ئاژەڵەکان دەدا. بە زمانی ئاماژە لەو ژنە گەنجەی خەریکی دۆشینێ بوو، پرسیی ئاژەڵەکانی ئێمە لە کام کۆزن و ژنەکەش شوێنەکەی نیشان دا. مریەمۆك کە چووە نێو کۆزەکەوە، هەوایەکی گەرم وەدەموچاوی کەوت. بۆنی گەنمەشامی ـ کە هەر لە بیریشی نەمابوو ـ لووتی پڕ کرد. گۆلکە خەنەیی لە گۆشەیەکی کۆزەکەوە لەسەر یۆنجەکە

خەوتبوو. لەو تاریك و ڕوونەدا جوانتر دەهاتە بەر چاو. چووە پێشێ و سەری گۆلکەکەی لە باوەش گرت و هەر دوو چاوەکانی ماچ کرد. گۆلکەکە هەستا.

مرێمۆك خۆ ئەگەر سوێندی نەخواردبایە کە تەنانەت مێروولەیەکی ئەو گوندەش چییە نەدوێنێ، بە دڵنیاییەوە گۆلکەکەی هەر دەدواند و دەیگوت:"بە قوربانی گۆلکەکەی خۆم بم." بیری کردەوە:"ئەو ئەشکەوتانە هی کێن؟ هی خودا گەورەکەمانە." کەوابوو دەیتوانی لەگەڵ ئەشکەوتەکان قسە بکا. هۆزی پەرییانیش لەو ئەشکەوتانەدا بوون و لەوانەش بوو هەر ئێستا ژنەکەی ئەحە شێت لە تەنیشتییەوە بێ. گوتی:

"کۆزەکان، کۆزەکان! ئەی کۆزەکانی خودای گەورە، ئەی ئەو کۆزانەی خودا ئێوەی بە پەرییەکان بەخشیوە. ئەمن زۆر غەریبیی ئەو گۆلکە خەنەییەم کردبوو. کەس نادوێنم. گۆلکە خەنەییەکەش نادوێنم. لەگەڵ ئێوەمە. ئەی کۆزەکان. خودا بۆنی گۆلکە خەنەییەکە لە ماڵەکان نەبڕێ. تۆخوا وا نییە کۆزەکان؟ گۆلکە خەنەییەکەی منیش دڵی بۆ ئێمە توندببوو. ئەی کۆزە، لەگەڵ تۆمە، نەك لەگەڵ گۆلکە خەنەییەکە، لێگەڕێ با ئەو کابرا هیچ و پووچە بێ و بڕوا جا ئەمن گۆلکەکەم هەڵگرم و بیبەمەوە ماڵەوە. خودا بتپارێزێ کۆزەکە."

چەند جارێك لە دەوری گۆلکەکە گەڕا و جارێکیش چاوەکانی ماچ کرد و گوتی:"خودا بتپارێزێ کۆزەکە. ئەوە گۆلکە خەنەییەکەی خۆم بە تۆ دەسپێرم. ئێستا لەوانەیە ئەو کابرایە هاتبێتە گوندەکە. با بچم بزانم."

لە کۆزەکە هاتە دەرێ. پێی وابوو هەموو ژنەکانی گوند لەوێن. لەبەرخۆیەوە گوتی:"هەموو کەسێك گۆلکێکی خەنەیی بۆخۆی هەیە. سەیریان بکە، بزانە چۆن بە ئەشکەوتی پەرییەکان وەربوون. کەچی جاران هیچ ژنێك زاتی نەدەکرد بەلای ئێرەدا بێ. نەك هەر ژنەکان بەڵکو پیاوەکانیش دەترسان. ئێستا ئێدی ئەوە لێرە دانیشتوون. هەر ئەوەندەی ماوەتەوە گوندەکە هەمووی بێننە ئێرە."

وەڕێ کەوت. منداڵەکان بە شوێنییەوە بوون و حەسەن لە پێش هەموانەوە. مرێمۆك سەیری کرد و بینیی هیچ کام لەو ژنانەی لەگەڵی هاتبوون بە دواوەی نین. دارەکەی ڕاوەشاند. دەتگوت دەیەوێ بڵێ:" یاڵڵا دەی وەرن با بڕۆین. لەوانەیە ئەو ئێستا هاتبێتە ئاوایی با پەلەی بکەین، بەڵام هیچ ژنێك بە هێندی وەرنەدەگرت. چەند کەسێکیان سەریان بە مەڕ و مانگاکانیانەوە و هێندێکیشیان بە بزن و میشکەکانیانەوە خافڵابوو. مرێمۆك توورە بوو و

لەبەرەخۆیەوە گوتی:"مەیەن، مەیەن، ئیشەڵڵا ئێستا هاتووە و جا ئەنگۆ نایبینن، ئیشەڵڵا دێتەگوندی و هەر سەعاتێکی لێ دەمێنێتەوە و دەڕوا."

ملی ڕێگایەی گرت. منداڵەکان لە دەوروپشتی هەقلی مەقۆیان بوو:" باشترین قۆناغی ژیانی بنیادەم منداڵییەکەیەتی. یاخوا ڕۆڵە گەورە بن و تەمەنیشتان درێژ بێ. منداڵەکان، کۆترە سپییەکانی من." چەندەی پێ خۆش بوو بە دەنگێکی بەرز ئەو قسانە بکا، بەڵام ئەو سوێندەی خواردبوو، زمانی پێ گرێ دەدا. خۆزگە ئەو سوێندەی نەخواردبا. گووی سەگ لەو سوێندەی، باشە بۆ خواردی؟ ئەوە دامنا مەولوودیشیان بۆ مام خەلیل دەخوێند. دەی خۆ دنیا قیامەت نەدەبوو. تازە ئابڕووی خۆیان چوو. مام خەلیلیش ڕای کرد و چوو و وەبن ڕنووە بەفران کەوت، بەڵام ئەو نامرێ. بەهارێ کە بەفرەکان دەتوانەوە، دەتدی مام خەلیل ساغ و سەلامەت و قیت و زیت هاتەوە دەرێ. چما ئەو بەرازە تووك لێکراوە دەمرێ. ئەوە دەگەیتەوە گوندی و دەشبینی گەنجەکان دۆزیویانەتەوە و هێناویانەتەوە."

کە لە دارستانەکە دەپەڕینەوە دیتی حەسەن لە منداڵەکان دابڕاوە و بەرەو لایەکی دیکە دەڕوا. خۆی لە گێلێ دا، بەڵام حەزی دەکرد دەیەوێ چ بکا. چاوی لێ نەترووکاند.

حەسەن کە خۆی لە پشت ڕەوەزەکانەوە مات دەکرد، خەریك بوو بە دزییەوە بەرەو شوێنێك دەچوو. مرێمۆك لە ناکاو بەدڵیدا هات بێ و نەبێ ئەو منداڵە شتێکی لەوێ شاردۆتەوە، بەڵام باشە بۆچی لەسەر گوندێکی ئاوا گەورەوە هێناوییەتە ئێرە. باشە ئەو منداڵە دەبێ چ شتێکی هەبێ؟...

حەسەن چوو و لە بن ڕەوەزە بەرزەکەوە ڕاوەستا. مرێمۆك بە جوانیی لێیەوە دیار بوو. حەسەن دەستی لەسەر بەردێك دانا و دەتگوت دەستی بەسەردا دێنێ، دوایی بەهەموو تینی خۆی بەرزی کردەوە و ڕایگرت. چاوێکی لە بن بەردەکە کرد و ڕەنگی گۆڕا. برێك واتر بەردەکەی لەسەر جێی خۆی دانایەوە و وەك هەلووك لەوێ دوور کەوتەوە، بەڵام لەو جەنگەیەدا زانیبووی مرێمۆك لە بنەوە ئاگای لێیەتی. نەترسا. لەبەرەخۆیەوە گوتی:"با بزانێ. خۆ ئەو ناتوانێ قسان بکا. یان لە من بپرسێ."

کە گەیشتنەوە گوندی زانییان هیچ شتێکی تازە نەقەوماوە. کەس نەهاتبوو. هەر ئەو گەنجانەی وا بەشوێن مام خەلیلدا ڕۆیبوون، نەیانـدۆزیبۆوە و دەست لە گونان درێژتر گەڕابوونەوە. مرێمۆك نەیدەزانی بەو هەواڵە شاد بێ یان خەمناك. کە بە نێو ئاواییدا دەڕۆیی، کوێخا بە پیرییەوە هات و گوتی:

- دەمەوێ شتێك پێ بڵێم نەنە مریەمۆك، ئەتۆ دایکی منی و هەروەها ڕێك وەك دایکی خۆشم. سیخوڕێك لەو گوندە دایە. یەكێك كە دوژمنایەتیی لەگەڵ ئەو گوندە هەیە. ئەو دوژمنە چووە و بە عادیل ئەفەنیی گوتووە:"مەچۆ گوندەکە، گوندییەکان دار و نەداری خۆیانیان شاردۆتەوە... و هەروەها بە فەرمانی کوێخاکەشیان." نەنە مریەمۆك، ئەتۆ پێت وایە ئەو سیخوڕە کێیە؟

- دەمی بردە بن گوێی و بە سرتە پێ گوت:

- دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم، ئەوە چوار ڕۆژە هیچ کەس تاشباش ئۆغلوی نەدیوە. چوار ڕۆژە ون بووە. باشە بۆچی ئەو دەمەی گوندی دار و نەداری خۆیانیان شاردەوە ئەو دەستیشی لێ نەدان؟ تەنانەت ئەمنیش چیم هەبوو شاردمەوە. ئەوە کارێکی سادە و ساکار نییە ماڵی کوێخای گوندێکی گەورە و هەروەها کوڕی پیاوێکی وەك کوێخا خدر ئاوا چۆڵ و بەتاڵ بێ، بەڵام ئەمن بۆم گرنگ نەبوو و بەخۆمم گوت، گوندییەکان هەر شتێکیان کرد ئەمنیش وا دەکەم. هەموو ماڵ و سامانەکەم، زێڕەکانی ژنەکانم و هەروەها خەنجەرە زێڕکفتەکەی بابی خواڵێخۆشبووشم شاردەوە. دەی سەرشۆڕی لەوە زیاتر؟ ئەمن لەبەر خەڵکەکەی خۆم ئەو سووکایەتییەم قبووڵ کرد. تاشباش بۆچی تەنانەت پووشێکیشی نەشاردەوە؟ خۆ ئەوجار زانیشت عادیل ئەفەنی بۆچی نەهاتە گوندەکەمان؟ یانی تا ئەو دەمەی دار و نەدارمان شاردووەتەو هەر نایە؟ ئێستا زانیت؟...

مریەمۆك بە سەرلەقاندنەکەی نیشانی دا تێگەیوە. ئاخۆ تاشباش ئۆغلو کاری وای دەکرد؟

هێندەی پێ نەچوو لە زارێکەوە کەوتە شارێك: تاشباش ئۆغلو چووەتە لای عادیل ئەفەنی و پێی گوتووە نەیەتە ئاواییەکە، بەڵام خۆ لەو گوندەدا هەمووان یەکدی باش دەناسن. . ئاخۆ تاشباش ئۆغلو کاری وای دەکرد؟

بڵێی و نەڵێی هەمووان ئەو پرسیارەیان لە خۆیان دەکرد. ئەگەر ئەو قسەیە بۆ کوێخا هەڵبەسترابوایە، یان بۆ گۆملیکسیز ئۆغلو یان بۆ بەکرە شێت، هەر هەمووان بڕوایان دەکرد، بەڵام بۆ تاشباش ئۆغلو هێندەش بە سووك و سانایی نەبوو...

## ١١

کوێخا هەوڵی دابوو هەموو گوندەکە لە تاشباش ئۆغڵو تیژ بکا، بەڵام بۆی نەچووبووە سەری: ئەو گوندییە لاسارانە حازر نەبوون کەس بە تاشباش ئۆغڵو بڵێ پشتی چاوت برۆیە. سەفەر چۆنی دەیزانی خودا یەکە و نابێ بە دوو و وەکی دەیزانی ئەو بەردەی لە دەستیدایە بەردە، ئاواش لێی سوور بوو کار کاری مەمەد تاشباشە، بەڵام چۆن دەیتوانی ئەوە بخاتە مێشکی گوندییەکانەوە؟ ئیدی لە گیانی خۆی وەڕەز ببوو. خودا ئەو لۆکە ڕنینەوەو کوێخایەتی و قەرز و قۆڵەیە بەزیاد نەکا.

دوو ڕۆژ دواتر کوێخا هەواڵێکی دیکەی بیستەوە، بەڵام هیچ پێی سەیر نەبوو: هەموو گوندییەکان و هەر هەموو خەڵکی شاریش زانیبوویانەوە کە گوندییەکانی یالابوك دار و نەداری خۆیانیان شاردۆتەوە. جا ئەوە چۆنیان زانیبوو؟ کێ ئاگاداری کردبوونەوە؟ کوێخا دەیزانی هیچ شتێك لەو گوندانەدا بە شاراوەیی نامێنێتەوە. تەریق دەبۆوە. پەژیوان بوو لەوەی کردبووی. گوندی یالابوك حەیای چووبوو. ئیدی نەیدەوێرا چاو لە چاوی خەڵکی شاری و دەوروبەرەکەی بکا. نەیدەتوانی بچێتە شاریش. بێت و چووبایەتە ئەوێ هەموو گاڵتەیان پێ دەکرد و تانە و تەشەریان لێ دەدا و جنێویان بە دایك و خوشکی دەدا، بەڵام بۆ ئەدی خەڵکی شاری کاتێ دەوڵەت داوای ماڵیاتی لێ دەکردن، ماڵ و سامانەکەیان نەدەشاردەوە؟ یان گوندییەکانی دەوروپشت لە کاتی نووسینی ماڵیاتی ئاژەڵاندا، مانگا و مەڕ و ماڵاتەکانیان لە چیاکاندا حەشار نەدەدا؟، بەڵام ئەوان ئەو کارەیان لەگەڵ دەوڵەت دەکرد نەك لە عادیل ئەفەنی کە ژیانی خۆی بۆ ئەوان تەرخان کردبوو.

دیارە عادیل ئەفەنیش زانیبوویەتەوە و بە بیستنی تفێکی کردۆتەوە و گوتوویە: "بنیادەم شیری خاوی خواردووە. هەموو بوونەوەرانی سەر زەوی دەبنە بنیادەم، بەڵام ئەو ئادەمیزادە نابێتە پیاو، چون شیری خاوی خواردووە. ئەو هەمووە ساڵە چاکەم لەگەڵ کردن، ئەوەش جوابەکەیان." و چەند جاری سەر ڕاوەشاندووە و چەند تفی دیکەی کردووەتەوە و گۆڕاندوویەتی: "بێزم لێیان هەڵدەستێ، ڕشانەوەم دێ."

گوندییەکانیش جڵەوی کارەکەیان لەدەست دەرچووبوو. ئیدی ژنەکان چێشتیان لێ نەدەنا و پیاوەکانیش سەراسوێی ئاژەڵەکانیان نەدەکرد. منداڵەکانیش نەدەچوونە یاری و گەمە. ئیدی کەس دەست و دڵی بۆ کار نەدەچوو. هیچ کەس وستەی نەدەهات. هەر دەتگوت هەموویان مردوون. تەنیا چاویان لە شاری بڕیبوو. لە منداڵی حەوت ساڵانەوە هەتا پیاوی حەفتا ساڵانە، هەر هەموو هەستیان ڕاگرتبوو و بە شەرمەوە چاوەڕێی تروسکەی هیوایەك یان پەیامهێنەرێکی ڕەشی لیقەوماو بوون کە لە شارەوە بێتە لایان. ئەو شادییەی یەکەمجار بۆ ئەو گزەیەی کردبوویان، باروبنەی تێك نابوو. هەر هەمووان باسی عادیل ئەفەنییان دەکرد و بیریان لەو دەکردەوە. جگە لە عادیل ئەفەنی گوێیان بە هیچ شتێکی دیکە نەدەبزووت. خەو و خۆراکیان ببووە عادیل ئەفەنی.

دەتدی ڕۆژێکیان جگە لە مریەمۆك کە لەسەر ڕەوەزە بەردەکەی بەر گوندی نەماوەتەوە و ڕۆژێکی دیکە هەر هەموو خەڵکی ئاواییەکەی لەوێ دەمانەوە. لە ناکاو تارمایی سوارێك کە بە لینگدان لە شارییەوە دەهات، بەرچاویان دەکەوت. بۆ ساتێك لەسەر ڕەوەزەکان وشك دەبوون و خوێنی نێو دەمارەکانیان دەیبەست، دوایی وەخۆ دەهاتنەوە و لە چاوترووکانێکا لەسەر ڕەوەزەکانەوە بەرەو گوند و دارستان و دەشت و شیو و دۆڵەکە بڵاوەیان دەکرد.

لەچاوترووکانێکا گیانلەبەر بەسەر ڕەوەزەکانەوە نەدەمایەوە.

ئەوجار دەیانبینی کەس نایە و ڕێی شاری چۆل و بەتاڵە. چاوەکانیان هەڵدەگلۆفی و لە خۆیانیان دەپرسی کە ئاخۆ خەویان دیتووە یان خەیاڵات هەڵیگرتوون؟

دیسان چاوەڕوانییەکانیان دەست پێ دەکردەوە. چەند ڕۆژ لەسەر یەك هیوادارانە چاوەڕێ دەمانەوە. دوایی دیسان لە چاوەڕوانی ماندوو دەبوون و پەنایان دەبردەوە بەر ماڵەکانیان.

عادیل ئەفەنی وەك هەورێکی ڕەش باڵی بەسەر گوندەکە کێشابوو. عادیل ئەفەنی تێکەڵاوی ئەڤین و ترس و ناڵین و سکاڵا و نانی ڕۆژانە و گەمەی منداڵەکانیشیان ببوو.

چاوەڕوانییەکە لێیان دەبووە بەڵا و شتێکی تاقەتبڕ.

لەو نێوەدا حەسەن پیسی لێ قەومابوو. هەموو شەوێ لەگەڵ ئۆمەخان چەند جارێك سەری قەڵشتی دارەکەی دەدا و بەسەری دەکردەوە. جارێکیان باوکیان دیتنی و پرسیی ئەوە بەو شەوەی بۆ کوێ دەچن؟ حەسەن و ئۆمەخان زمانیان گیرابوو و هیچ قسەیان پێ نەکرابوو. عەلی چەندی پرسیی ئەوان متەقیان لێوە نەهات. ئاخری ماندو بوو و گوتی:

ـ ملتان بشکێنن بڕۆن. هەر گوویەکی دەیخۆن بیخۆن. من کارم بەسەرتانەوە نییە. بڕۆنە دەرێ و لەو تاریکەسەلاتەدا وەك مام خەلیل لە بەفر و بۆرانێدا ڕەق هەڵێن و بمرن.

حەسەن بڕیاری خۆی دا. ئیدی نەیدەویست شقارتەکانی لە نێو قەڵشتی دیوارەکەدا بهێننەوە. هێنانییەوە ماڵەوە و لە کونەکەی پێشوودا شاردنییەوە، بەڵام دڵی ئاوی نەدەخواردەوە. ئەگەرچی دیار بوو ئیدی عادیل ئەفەنی نایە، بەڵام خۆ ڕۆژێك هەر دەهات. لە ناکاو دەگەیشتێ و پێش هەمووان ماڵەکەی ئەوانی ئەویش لە داخی مرێمۆك دەپشکنی... و ئەویش نەیدەتوانی شقارتەکانی ڕزگار بکا...

چەند شەوێك شقارتەکانی لەگەڵ خۆی نواند. چەند ڕۆژێکیش لە نێو جلەکانیدا شاردنییەوە. شقارتەکانی لە پزووی پانتۆڵەکەی دەپێچا و دەیبەست، بەڵام چیی دەکرد لە بن جلەکانییەوە هەر هەڵدەتۆقین.

حەسەن دەیگوت:

بریا ئەو کابرایە هاتبایە و ڕزگاریمان بووبایە.

هەر هەموو گوندییەکان ئەوەیان دەگوت. کوێخاش دەستەوستان ببوو و نەیدەزانی چ بکا. ماڵ بە ماڵ دەگەڕا و دەیبۆڵاند:

ــ هەر بەڕاست ئەو هیچ و پووچە نایەوێ بێ؟ چۆنە بچین و خۆی بخەینە سەر پێڵاوی و بڵێین:"عادیل، هەرچی لەسەر ئێمەت بیستووە، درۆیە. گوندی یالاك زۆر هەژارە. وەرە و بمانبینە چۆنین. ئێمە چیی وامان نییە بیشارینەوە. ئەگەر بڵێین:"وەرە و بە چاوەکانی خۆت ببینە." دیسانیش نایە؟ ئەگەر بڵێین :" بەندەی خودا تا لێی نەقەومێ، حەزرەتی خدر دەفریای نایە، ئەی عادیل ئەفەنییە بە بەزەییەکە، ئەتۆش وەك حەزرەتی خدر فریامان کەوە!" لێمان خۆش نابێ؟ دەبێ پێی بگوترێ:"عادیل ئەفەنی، ئەو گوندییانە خەڵکێکی لێقەوماون. ئەگەر زۆر چاوەڕوان بن، لە کەللەیان دەدا. ئەو ترس و چاوەڕوانییەی هاتنەت ژەهر دەکاتە گیانیانەوە و ئاخرییەکەی شێتیان دەکا. هەر لە ئێستاشەوە زۆربەیان شێت بوونە و وەك گورگی هاریان لێ هاتووە عادیل ئەفەنی..."

لە گوندییەکانیش قەڵس بوو:" ئەگەر زار بەهاوار نەبوایەن، کێ دەیزانی ئەوان دار و نەداری خۆیانیان شاردۆتەوە؟ دیارە چوون و لێرە و لەوێ خۆیان ڕەپ کردووە و هەر و گیڤیان لێ داوە و بە پێکەنین و گاڵتەجاڕانە گوتوویانە:"دەی عادیل ئەفەنی دێ لێیگەڕێن با بێ بزانین چیی پێ دەکرێ. با بێ و لە هەموو گوندەکەدا مشکێکیشی دەست نەکەوێ." ئەی لەو گوندییە بێ ناموسانە، چما لەگەڵ ئەوانە دەکرێ کارێك ڕاپەڕێنی؟... دەی، خۆ دیتتان؟ هەر نایە. نایەوێ بێ. ئەوەندە چاوەڕوان بن تا گیانتان دەردەچێ. چاوەڕوان بن، سەگبابینە چاوەڕوان بن. ئەوەندە چاوەڕێ بن هەتا چاوەکانتان دەبنە چوار، هەشت و شازدەش. هەی کافری بێ دینینە، چاوەڕێ بن....

## ١٢

کوێخا سێ ڕۆژ بوو ئەنجوومەنی گوندیی پێك هێنابوو بـۆوەی تـەگبیر و ڕاوێـژیان پـێ بکـا. پێـشتر لەگەڵ "بەکرە شێت" و "گوملکسیز" و "ئۆکسوزدۆران" و "عەلی‌یە" قسەی کردبوو. خۆ نەترسـابایە و دڵنیا بوایە لەوەی بە قسەی دەکا پرسی بە تاشباش ئۆغلۆش دەکرد. پێویست بـوو بڕیـارێکی گـرنگ بدا. بڕیارێکی وا بوو کە کوێخا سەرکۆماریش بوایە بڕیاری ئاوای بە تەنێ پێ نەدەدرا.

تەگبیری بە هەموو گوندییەکان دەکرد و جوابی وەردەگرتنەوە:"بـەخوای بڵـێین چـی کوێخـا بۆخۆت باشتر دەزانی کوێخا، هەر ئەوەندە بەسە عادیل ئەفەنی بێ و چیی دڵی دەخوازێ بیکا. هەر ئەوەندەیە تۆ بتوانی بیهێنییە ئێرە."

هەموو دەرگاکانیان لێ داخرابوو و تەنیا ڕێگەیەکیان لە پێش بوو. کوێخا ناچار هەر دەبوو وا بکـا. دوای ئەوەی پرسی بە هەموو خەلکەکە و تەنانەت تاشباش ئۆغلۆش کـرد، سـاغ بـۆوە و بڕیـاری خـۆی دا. "زەکەریا"ی کە پێشتر ئەندامی حیزب بوو ناردبۆوە لای تاشباش. زەکـەریا کـوڕە پـووری تاشـباش بوو. دڵی لەویشی تەواو ئاو نەخواردبۆوە زەڵەجاشی ناردبوو. زەڵەجا پووری خێزانەکەی تاشباش بوو.

بەیانییەك لەگەڵ تاوکەوتن، کوێخا سەفەر باشترین جلوبەرگەکانی و ئەو چاکەت و پانتۆڵەی لەبەر کرد، کە لە کاتی ڕۆیشتنیدا بۆ شار لەبەری دەکـردن. بۆینباغەکەشـی گـرێ دا. جـوان و زەریف ڕدێنیشی تاشیبوو. بانگی گزیری کرد. گزیر دەستەونەزەر لەبەردەمی ڕاوەستا و گوتی:

ـ ئەمرکە گەورەم!

سەفەر لەسەرخۆ گوتی:

ـ چۆنی گزیر بەگ؟ وڵڵاهی ئەگـەر لـە هـەموو دێهـاتی تۆرووسـدا گزیرێـك هـەبێ وەك تـۆ لێهاتوو بێ، ئەمن ناوی خۆم دەگۆڕم... جا ئێستا دەبێ جاڕێکی باش بکێشی وابـێ کـەس لـە ماڵەوە نەمێنێتەوە و هەموو لەبـەر دەرگاکـەی مـن کـۆ ببنـەوە. ژن و منـداڵ و پـیر و گـەنج. جاڕێك بکێشی تەنانەت سەگەلی ئاواییش بێن و لێرە کۆ ببنەوە. تێگەیشتی؟....

- تێگەیشتم کوێخا....

گزیر وەك سەربازان پاژنەی جووت کردن و دوایـیش سـەربازانە بـەرەودواوە وەرسـووڕایەوە و بەرەو نێو دێ غاری دا. دەنگی وەك دەنگـی ناشقەکەچـەڵە بەسـۆز بـوو و بـە دەنگێکـی بـەرز دەتگوت حەیران دەڵێ جاڕی دەدا.

لە چاوترووکانێکا بەر دەرگای ماڵی کوێخا دەرزیت لێ هەڵاویشتبایە وەعەرزی نەدەکەوت. تەنانەت تاشباش ئۆغڵوش سوێندەکەی خۆی شکاندبوو و هاتبوو. هەموو گوندییەکان هەست و خوستیان لەخۆیان بڕیبوو و چاوەڕێ بـوون بـزانن کوێخـا دەڵـێ چی. هیـوا و نیگەرانییـەك لـە دڵیاندا بوو. کەس وستەی نەدەهات. دەتگو تـەپوتۆزێکی وەك هـەور سـەر ئـاوایی داپۆشـیوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئاسمان ساو و ساماڵ و ڕوون بوو. تاو لە بەفرەکەی دابوو و بچووکترین پەڵـە لـە هیچ کوێ نەدەبینرا. هەموو شتێك، ئەندامی بنیادەمەکان و تەنانەت جلوبەرگە کۆنەکانیشیان لەو ڕووناکایی و درەوشاوەییەدا جوان و ڕێك دیار بوون، بەڵام دیسان پیاو هەستی دەکرد هەورە تۆزێك، تۆفانێك لە تەپ و تۆزێکی قورس لە هەوادا شەپۆل دەدا.

هـەر کوێخـا لـە ماڵەکـەی هاتـە دەرێ، هـەمووان ڕوویـان بـۆلای ئـەو وەرگێـڕا. هـەڵڵا و هەنگەمەیـەك هەسـتا و لـە چـرکەیەکدا ئـەو بێدەنگییـە قورسـە شـکا. هـەموو هاواریـان دەکرد: "بلێ کوێخا... بلێ... هەواڵی خۆشمان بدەیە...."

مرێمۆك لە پێش هەمووانەوە بوو. ڕێك لەبەر دەمی کوێخـاوە ڕاوەسـتابوو. چـاوەکانی زەق کردبوون و لە چاوی کوێخای بڕیبوون، دەتگوت دەیەوێ قسەکانی هەڵلووشێ.

کوێخا گەرووی خاوێن کردەوە و چەند ئحم ئحمێکی کـرد و دوایـی بێـدەنگ بـوو و نیگـای بەسـەر یەك بە یەکیانـدا گێـڕا و دواجـار لەسـەر تاشـباش ئۆغڵـو گیرسـایەوە. هەرچـی سـۆز و خۆشەویـستیی هەیبوو لە چاویدا کۆی کردەوە و خۆمانە سەیری کرد. دەیزانی ئـەو سـاتەدا گونـدی وەك نیوەشـێتێك وان و بچووکترین هەڵە سەری بە فەتەرات دەدا. بۆ وێنە دەیـانتوانی لەتوپـەتی بکـەن و قاچـی بگـرن و بەسەر بەفرەکەدا ڕایکێشن و هەموو گوندەکەی بگێڕن. دەبوو زۆر وریا بێ و قسەی ماقووڵانە بکا.

سینگی دەرپەڕاند. لاقی ڕاستەی هێنایە پێشەوە و چـەند جارێـك بـە عـەرزەکـەی دادا وەك مەلا قاراتۆپاکلی دەستێکی بە چەناگەیدا هێنا و یەك دووجاران کۆخی.

لە خەیاڵەکەی پێشووی پەشیمان بۆوە. مـاوەیەك بوو زۆر ترسنۆك ببـوو. کـێ لـەو گونـدەدا دەیوێرا دەستی لێ هەڵێنێتەوە؟

"بێت و گوندی بزانن دەترسی - جا بشترسی دەزانن — ئەو کـات چـییان لەدەسـت بـێ پێـت دەکەن، بەڵام ئەگەر سەی هاریش بزانێ لێـی ناترسـی پـەلامارت نـادا. کـەوابوو ترسـی نـاوێ.

تەنانەت مەرگیشت بێتە سەر ڕێ، نابێ بترسی. ترس برای مەرگە. هەر ئەو گوندییانە لە ترسان ئاوایان بەسەر هاتووە."

بە دەنگێکی وەك هەورەتریشقە دەستی پێ کرد.

ـ برادەرینە، هەروەها هاوسێ ماڵ و هەروەها مام و برا خۆشەویستەکان و هاوڕێ گیانی گیانییەکانم...

تۆزە ترسێکیش چییە لە دەنگیدا نەبوو. دەنگی پتەو و دۆستانە بوو:

ـ لە تەنگانەیەکی خراپ داین.

هەموو هاواریان کرد:

ـ لە تەنگانەداین.

ئەو هاودەنگییەی خەڵکەکە غیرەتی وەبەر نا و کوێخای پتر هان دا:

ـ ئێمە چووین دار و نەداری خۆمان شاردەوە... زۆر باشیشمان شاردەوە. تەنانەت پووشێکیشمان لە دەرەوە نەهێشتەوە. ئەوە کارێکی زۆر گرنگ و باش بوو. ئەگەر هەموو پۆلیس و جەندەرمە و کۆنپشکنەکانی کۆماری تورکیا و تەنانەت بەرێز و فاڵگرەوەکانیش هاتبایەن و گوندەکەیان سەنگ و سوژن دابایە تەنانەت سەر دەرزییەکیشیان نەدەدۆزییەوە. ئەمن شانازی بەو کارەی گوندییەکانەوە دەکەم و لە ناخی دڵمەوە پیرۆزباییتان پێ دەڵێم. خەڵکی ئاوا یەکگرتوو نەك لە تۆرووس بەڵکو لە هەموو دنیاشدا پەیدا نابێ، بەڵام کارەکانمان لێ تێك چوون. ئەوەی دڵمان دەیویست نەبوو. ئەو بەردەی هاویشتمان نیشانەکەی نەپێکا. هەموو شار و گوندەکانی دەوروبەرمان بەو کارە ئازایانەیەی ئێمەیان زانی. هەر لێرەوە تا دەگاتە چوکووراوا تێگەیشتن کە ئێمە ماڵ و سامانی خۆمان شاردۆتەوە. عادیل ئەفەنیش بەوەی زانیوەتەوە بۆیە نەهاتە گوندەکەمان. ئەوەندە چاوەڕێ بووین ئاوی چاومان چوو. لە کەنگێوە هەر وا چاوەڕێین و ئەو نایە. کوڕە ماندوو بووین مردین لە چاوەڕوانیدا.

خەڵکەکە لەبەرەخۆیانەوە:

ـ ماندوو بووین، مردین..

ـ جا ئێستا با شەرافەتی خۆمان ڕزگار بکەین. دەبێ هەمووان بزانن... هەموو خەڵك با بزانن کە خەڵکی یالاك بۆ نەدانەوەی قەرزەکانیان هیچ شتێك ناشارنەوە، ئێمەش هیچ شتێکمان نەشاردۆتەوە... باشە بۆچی بشارینەوە. عادیل ئەفەنی با بێ و چیمان هەیە بیبا و بڕوا. هەرچی هەمانە لە بەر چاوانە. وا نییە؟ خەڵکی گوندەکانی دەوروپشتمان و دوژمنە حیزبییەکانمان لە شار بۆ ئەوەی لە نێو خەڵکیدا سەرمان هەڵنەیەی و سەرنەوی بین، ئەو بوختانە گەورەیان بۆ هەڵبەستووین.

"ئەو کابرایە، واتە عادیل ئەفەنی دەهات... لێم سوورە دەهات. ئەمن دەیناسم. ئەو لە گیانی خۆی خۆش دەبێ، بەڵام لە مافەکەی، لە دراوەسووتاوێکی خۆی خۆش نابێ، بەڵام چ بکەین. ئەویش بەو بوختانەی زانیوەتەوە کە بۆیان هەڵبەستووین و بیستوویەتەوە کە ئێمە ماڵ و سامانی خۆمان شاردۆتەوە. بۆیەش توورە بووە و نەهاتووە. دەڵێن چیی پێ دەکرێ؟ چما ئەقڵی ئێمەمانان بەو بەڵایە دەشکێ کە خەڵکی شاری دەتوانن بەسەرمانی بێنن؟

"لەوانەشە بۆیەی وا کردبێ ئێمە لە شەرمەزارییا سەرمان هەڵنەبێ.... کورتی ببڕینەوە دەبێ هەموو خەڵك بزانن ئێمە هیچ شتێکمان نەشاردۆتەوە. عادیل با بێ دار و نەدارمان بەرێ و بڕوا. ئەگەر پێشی خۆشە ئێمە بۆخۆمان هەرچی هەمانە و نیمانە بۆی دەبەینە بەر دەرگای ماڵەکەی و بۆی هەڵدەڕێژین..، بەڵام ئیدی بەسە. بەسمانە. ئیدی خەریکە لە خەفەتان دەمرین. چیی وای نەماوە شێت بین و وەکێوان کەوین.

خەڵکەکە یەکجێ تەقینەوە:

- چیی وای نەماوە شێت بین...

- دەبێ وا بکەین ئەو کابرایە بێنینە ئێرە. بەشکم بێ و هیچیش نەبا، بەڵام ئێمە بەو شەرم و شوورەییەوە ناتوانین بژیین. ئەوە لە نەتەوەی ئێمە ناوەشێتەوە. وەرن و بەرەی بن پێمان و لێفەی سەرمان و قاپ و قاچاغ و هێلەگی ئارد پێژتنمان کە بە دیوارماندا کردووە، دەرزیی دروومانەکەمان، چوارپێی بەر دەرگەمان، هەر هەمووی بەرێ بۆخۆی. خودا بکا بێ. با بێ و تەنانەت پووشێك چییە نەیهێڵێتەوە. با بێ و لەو ئەشکەنجەیە ڕزگارمان بکا. حەز دەکا با منداڵەکانیشمان لێ بستێنێ. هەر گیانێکی شیرنمان هەیە با ئەویشمان لێ بستێنێ.

وەکوڵ هاتبوو. دەیویست دیسان لەسەری بڕوات، بەڵام دەیزانی زۆری ڕستووە و زۆرگوتن لەوانەیە گوندییەکان وەڕەز بکا. پێویست بوو سەری قسانی وێك بێنێتەوە:

- ئەمن بۆ ئەوەی عادیل ئەفەنی بێنمە ئێرە، چیی لە دەستم بێ دەیکەم. سێ کەس لە ئەنجوومەنی گوندیی دەنێرمە لای: پێی دەڵێین:" وەرە و حەقەکەت وەرگرە یان ئەگەر ئەمساڵیش نایەی پێمان بڵێ. ئەگەر تۆ ئەمساڵمان لێ خۆش بی پیاوەتییەکت کردووە کە لەگەڵ شان و شکۆ و ڕەسەنایەتیی بنەماڵەیی و پێگەکەت لێك دەکاڵێنەوە."

"ئیدی لەوە زیاتر قسەم نییە. خێرا بچنەوە ماڵەکانتان و بزانن ئێمە هیچ شتێکمان لە قەرزدارەکەمان نەشاردۆتەوە و هەگیز ناشیشارینەوە. دیارە هەمووشتان لە سەرمایە کەسیرە بوونە. خواتان لەگەڵ بێ برادەرینە و هاوڕێیان و مام و خزم و کەسەکەی من. شتێکیشتان پێ بڵێم: هەر ئەمڕۆ

عادیل ئاگادار دەکرێتەوە کە ئێمە هیچ شتێکمان لێ نەشاردۆتەوە. دیارە هەر ئەو کابرا سیخوڕ و قسەگێڕەوەیەی لەو گوندەدا دەژی و دوژمنی ئەنگۆیە بۆی دەگێڕێتەوە. ئەو کابرایە قەت پێی خۆش نەبووە چاکەیەك لەگەڵ گوندییەکان بکا. جا ئەگەر هەر لەبەر ئەوەش نەیویست ئەو خەبەرە بداتەوە بە عادیل ئەفەنی، ئەمن خۆم دواتر ئەنجوومەنی گوندی دەنێرمەوە لای عادیل.... یاڵڵا دەی خواتان لەگەڵ.

## ١٣

مرێمۆك بە پە هەڵەداوان هاتەوە ماڵێ. هیچ کەیفی بەو وەزعەی نەهاتبوو و زۆریش تووڕە بوو. جنێوی بە گوندی و کوێخا و دار و بەرد و فڕندە و دڕندە دەدا.

هات و لە بن هێلانە پەڕەسێلکەکەوە ڕاوەستا. چاوی بڕییە گەنجینەکەی کە لەوێدا بوو. لە بێنۆقرەییان جینگڵی دەدا. دەتگوت ئێستا نا ئێستا عادیل ئەفەنی دەگاتێ و یەکەوڕێ دەچێتە ماڵی "عەلی"یە درێژ و هەر بشگاتێ دەست دەبا و پڕێسکەکەی ئەو لە نێو هێلانە پەڕەسێلکەکەدا هەڵدەگرێ. هەر ئێستا ناچار بوو کارێك بکا و گەنجینەکەی نەجات بکا. ئەوانی دیکە هێشتا نەهاتبوونەوە ماڵێ. هێندەی نەبرد حەسەن گەیشتەوە.

مرێمۆك ئاماژەی بە حەسەن کرد و هێلانە پەڕەسێلکەکەی نیشان دا. حەسەن گوتی:

ـ خۆ دەستم ناگاتە ئەوێ.

مرێمۆك دەستی لەبەر سینگی هەڵپێکا و لارە مل ڕاوەستا. چاوی لە هێلانە پەڕەسێلکەکە نەدەترووکاند. دەتگوت دەستێکی نەبەدی لە سەرەوە ڕۆدەهێشترێ و کەلوپەلەکانی ئەو دەبا. دەتگوت بێت و ساتێك چاوی لەوێ بترووکێنێ گەنجینەکەی دەدزرێ.

حەسەن ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ خۆزگە بڕێك کەڵەگەتتر بوایەم. وەڵڵاهی دەسبەجێ بۆم دێنایە خوارەوە. ئەگەر دوو ساڵی داهاتوو بوایە، بڕێك درێژتر دەبووم. جارێ ڕاوەستە با بابم بێتەوە...

مرێمۆك بۆڵەیەکی لێوە هات و بە ئاماژە ئەوکۆتەرە دارەی نیشان دا کە لە قوژبنی ئەوسەری ماڵەکەوە بوو. پێکەوە چوون بیهێنن. یەکێکیان سەرێکی کۆتەرە دارەکەوە و ئەویتریش سەرەکەی دیکەی گرتبوو. دەیانەویست کۆلکەکە بکێشنە بن هێلانە پەڕەسێلکەکە و مرێمۆك بچێتە سەری و پڕێسکەکەی بێنێتە خوارێ. چیی تێی نووسان نەیانتوانی لە جێی خۆی بیجوولێنن. حەسەن گوتی:

ـ با خلۆری کەینەوە.

بە هەموو هێزی خۆیان ویستیان بیجوولێنن. لەو جەنگەیەدا عەلی و ئەلیف گەیشتنێ. عەلی بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ ئەو کۆتەرە دارەتان بۆ چییە؟ ... پرێسکەکەتت دەوێ دایە؟ هەر ئێستا بۆتی دێنمە خوارێ.

لەسەر پەنجەکانی لاقی خۆی هەڵێنا و پرێسکەکەی لەسەر هێلانە پەڕەسێلکەکە هەڵگرت و دایە دەستی دایکی کە هێشتاش بە هەناسەبڕکێوە لە کۆلەکەکە نووسابوو. مرێمۆك کە بە لاسارییەوە لە کۆتەرەکە نووسابوو دەستی لێ بەردا و پرێسکەکەی وەرگرت. وەك دایکێك کە دوای ماوەیەك ساوا ئازیزەکەی دەبینێتەوە، ئاوا گەش بۆوە.

لە لاشیپانەی دەرگاکەدا دانیشت. پرێسکەکەی کردەوە. لە پێشدا کراسکەکەی دەرێنا و لەسەر ئەو کراسەوە کە لەبەری دابوو، کردییە بەری. گوارەکانی لە گوێ کردن. خەزێمە زیوەکەی بە لووتی دا کرد. ئەو ئەموستیلەیەیشی وا قسەی پێغەمبەری لەسەر هەڵکۆڵرابوو، لە قامکی کرد. لەچکە سپییەکەی لەسەری کردەوە و لە کە هەوریشمینەکەی لەسەر کرد و لە ماڵێ وەدەر کەوت. بە هەویا نەبوو سەر بە ماڵی کەسدا بکا. هەر دەیویست بە نێو دێدا بسوورێتەوە. ئەوانەی دەیاندی ئاوا خۆی لە تەپڵی گوڵ داوە، بە تانە و تەشەرەوە دەگوت:

ـ نەنە مرێمۆك بۆتە بووك.

ئاخ، نەنە مرێمۆك ئەگەر دەیتوانی قسان بکا، بەخودای وەك ماری پێوەی دەدان...، بەلاّم داخەکەی بە جەرگم... چارەنووسی ئەو ئاوا بوو....

کە گەیشتەوە ماڵێ، دیتی حەسەن و ئۆمەخان دەستیان لە تیتك و قژی یەکتری ناوە و تێكهەڵدەدەن. عەلی و ئەلیف لە عەمبارێ خەریکی دەرێنانەوەی دانەوێڵە و ئاردەکە بوون و هیچ گوێیان لە شەڕی منداڵەکان نەبوو. ئۆمەخان دەیگوت:

ـ بدەیە، هیی خۆم نییە؟ لەو تۆف و سەرمای زستانەدا هەموو شەوێ لەبەر ئەوە نەدەنوستم. تا ڕۆژ دەبۆوە لەگەڵت ئێشکم دەگرت. خۆ ئەگەر لەگەڵت نەهاتبایەم، ئەتۆش دەترسای و لە ماڵێ وەدەر نەدەکەوتی و ئەوانیش دەهاتن و دەیانبرد. هەقی خۆم بدەیە.

حەسەن دەیگوت:

ـ ناتدەمێ. نۆ دانەیە. نابێ ببنەوە هەشت دانە. دیسان با ئی تۆ بێ، بەلاّم هەموان پێکەوە بن.

ئۆمەخان:

- شتی خۆم هی خۆمە. دەمەوێ لە باخەڵمدا هەڵیگرم. بمدەیە، هی خۆمم بدەیە، ئەگەر نەمدەیەی بە زۆری لێت دەستێنم. شەوێ کە نوستی، لێتی دەدزم.

پێك هەڵپرژانەوە و دیسان لێکیان دا.

مریمۆك لە دڵی خۆیدا دەیگوت:"توتکە سەگینە... یەکتری لەتوپەت کەن... وەك سەی برسی."

ئاخری خۆی پێ نەگیرا سەیری لێکدانەکەیان بکا و چوو لێکی کردنەوە. حەسەن لووتی خوێنی لێ هاتبوو. عەلی بە ئەلیفی گوت:

- ئەلیف، دەڵێی چی، نیوەی دانەوێڵەکە هەر لەوێدا بێڵینەوە؟ دوو قاپ و چوار کەوچك دەربێنین و ڕۆنەکەش نەهێنینەوە دەرێ... باشە؟...

ئەلیف دەیگوت:

- دەی باشە.

بەو حاڵەشەوە مریمۆك ترسێکی لە دڵیدا بوو. ئاخۆ واهەبوو عادیل ئەفەنی بنیادەم ڕووت بکاتەوە و شتەکانی بەرێ؟... خەریك بوو شێت دەبوو. ئەو خەیاڵە وەك خۆرە ناخی دەکۆڵی. دەبوو پرسیار لە کێ بکا؟ بێت و لە کوێخای پرسیبایە، ئەو لەڕێوە خۆی بە کابرایەکی گرنگ دادەنا و بە هەموو ولاتی وەردەکرد کە بەڵێ مریمۆك هات و ئەو شتانەی لێ پرسیم. لە "عەلی"یە درێژ؟ وەڵلا بشمردبایە لەوی نەدەپرسی. متمانەی بەهەر کەس لە گوندی، هێنایە بەرچاوی خۆی و ئاخرییەکەی تاشباشی لە هەمووان پێ باشتر بوو. دەسبەجێ چووە لای تاشباش ئۆغلو. تاشباش ئۆغلو لەبەر ئاگردانەکە دانیشتبوو دەتگوت قوزەڵقورتە. نێوچاوانی گووی لێ دەباری. کە مریمۆکی دی، هەستا و فەرمووی کرد دانیشێ. مریمۆك دانیشت. بە ئاماژە پێی گوت بێتە بەر ڕووناکاییەکەی بەردەرگاکە. تاشباش ئۆغلو هات.

مریمۆك قەد و قەڵافەتێکی مەخسەرەی هەبوو. تاشباش ئۆغلو بەزۆری خۆی ڕاگرتبوو پێنەکەنێ. خۆ مریمۆك زانیبای تاشباش ئۆغلو پێی پێدەکەنێ، هەتا دنیا دنیایە سەیری چاوی نەدەکردەوە. ئەو ژنە کە لە تەمەنی خەسووی نووح دا بوو، خۆی بۆ ئاوا لە تەپڵی گوڵ دابوو؟ دیارە نهێنییەك لە گۆڕێ بوو. هاتنی مریمۆکیش لە خۆڕایی نەبوو.

مریمۆك لە پێشدا گوارە و بازنە و خەزێمە زیوەکە و لەچك و کراسەکەی بەریی پێشاندا دا. یەکێك لە گوارەکانی لە گوێی دەرێنا و ڕووی لە شاری کرد و بە ئاماژەی سەر و دەستی ویستی لە هاتنی عادیلی تێبگەیێنێ.

تاشباش ئۆغڵو زانیی دەیەوێ باسی عادیل بکا، بەڵام نەیزان چۆن. گوتی:
- تێگەیشتم. دەڵێی عادیل دێ، بەڵام نەمزانی دوای هاتنەکەی چ دەبێ.
مرێمۆك کراسەکەی بەریی نیشان دا و ئاماژەی بە داکەندنەکەی کرد. دوایـیش جۆرێکی نواند کە بەڵێ هەموو خشڵ و بەرموور و جلەکانی لەبەر دادەڕنن و دەیپێچنەوە و دەیبەن.
تاشباش ئۆغڵو گوتی:
- دایە گیان، تۆ سوێندت خواردووە تەنانەت مێرووڵەیەکی ئەو گوندەش نەدوێنی. حەقتە، بەڵام ئەمنیش وەك تۆ وام. ئەمنیش دەڵێم هەر کەس پێ لەسەر مێزەکەشیان دابنێ گروێ دەبێ. ئەو گوندییانە تووکیان لێکراوە. مردوون و تێدا چوون. مێشکیان پەین و کای تێدایە. وەرە بزانە چۆن ئەو ماڵ و سامانەی دوێنێ شاردوویانەتەوە ئێستا دەری دێننەوە. لەگەڵ من قسە بکە. با لانیکەم بە دەرد و مەرگت بزانم و چارەسەرێکی بۆ بدۆزمەوە. دەی قسە بکە دەی.
مرێمۆك بە تووڕەییەوە سەری ڕاوەشاند و دەریخست کە نەخێر نابێ و هەرگیز قسان ناکا. دیسان بە وردی و لەسەرخۆ و بە هێما و بە ئاماژە دەستی پێ کردەوە بۆ وەی بڵێ مەبەستی چییە. ئەمجارەیان تاشباش ئۆغڵو هەستی کرد تێگەیوە:
- دایە، یانی دەتەوێ بڵێی عادیل کە هاتە ئێرە، ئەو جلوبەرگ و خشڵ و بەرموورانەت لێ دەستێنێ و دەیبا؟ وایە؟ دەتەوێ ئەوە بڵێی؟
- مرێمۆك پێکەنی و دەستی تاشباش ئۆغڵوی لەسەر دڵی دانا و گوشیی. تاشباش ئۆغڵو گوتی:
- هیچ مەترسێ دایە. عادیل ئەمساڵ نایەتە ئێرە. ناتوانێ بێ. ئەگەریش بێ، هیچ یاسا و عورفێك نییە بۆ ئەوەی پیاو ڕووت بکەنەوە. لە تۆقی سەریشتەوە تا بەری پێت لە زێڕدا بێ، ناتوانن تۆزێکیشیت لێ بستێنن. ئەو خەڵکە لە ترسانا شێت بوونە و ئەتۆشیان شێت کردووە. برۆ و خەمت نەبێ دایە گیان.
مرێمۆك هێڕ هێڕ بۆوە. دوای ئەوەی چەند جارێك دەستی تاشباش ئۆغڵوی لەسەر دڵی گوشی، گەڕایەوە و چۆوە ماڵێ. کە گەیشتەوە ماڵەوە، دیتی منداڵەکان هێشتاش هەر لێك دەدەن. دیسان لێکی کردنەوە و دەستی بەسەری هەر دووکیاندا هێنا و بە ئاماژە پێی گوتن، نابێ شەڕێ بکەن. بێت و ئەمجارە پێك هەڵپڕژێن، ئیدی کاری بە سەریانەوە نابێ.
عەلی دوای ئەوەی یەك لەسەر دەی شت و مەکەکانی لە حەشارگەکە هێنایە دەرێ، چووە لای خەلیلە تەمبەڵ. باشە بۆچی چووە لای خەلیلە تەمبەڵ؟ چونکە خەلیل کابرایەکی هێمن و

تـا بلێـی تەمبـەڵ بـوو. ڕۆژی شـاردنەوەی شـت و مەكـەكان، بـۆ ئێـوارێ خـەڵكی ئـاوایی لـە شاردنەوەی شتەكانیان بوونەوە و دڵیان حەسایەوە. تەنیا خەلیل پازدە ڕۆژی پێ چـوو تـا لەبـەر دەرگای ماڵەكەیان قوولكەیەكی هەڵكەنج و شتەكانی تێخست و سـەری بـە هـەڵاش داپۆشـی. ئێستاش لەبەر دەرگای ماڵێیان دانیشتبوو و چاوەكانی لێك نابوون و بە داهێزراوییـەوە مـست مست خۆڵی سەر قوولكەكەی هەڵدەگرت و لایدەدا. بە سەعاتێك هەر هێندەی چوار قامكـانی فڕێ دابوو. ئاوا ڕۆیبا ساڵێكی دەبرد هەتا بتوانێ هـەموو كەلوپەلـەكانی دەربێنێتـەوە. عـەلی گوتی:

ـ یانەڵڵا، كاك خەلیل.

خەلیل كە بە زۆری قسەی دەكرد، بەسپایی جوابی دایەوە:

ـ عەمرت درێژ بێ برالە. وەڵڵا ئـەوە خـەریكم. بـا دەریبێنینـەوە بـزانین. دیـارە دوو ڕۆژی دیكە دەبێ دیسان بیانشارینەوە... وا نییە؟

عەلی گوتی:

ـ ڕاست دەكەی برالە. ماندوو نەبی. قەلبت ساغ بێ.

ژنەكان كە دیتبوویان مریەمۆك ئاوا خۆی ڕازاندۆتەوە، جلەكانیان كە لە بن گڵ دەرێنـابۆوە، كێهەی لە هەمووان باشتر بوو، جلوبەرگی جێژنیان، لەبەر كـردن و هـەموو خـشل و بـەرموو و گـوارە و گۆیـەرۆكیان وەخۆیـان خـست و تەنانـەت ئارایشیـشیان كـرد. گوندەكـە دەتگـوت جێژنەیەتی. كچە هەرزەكارەكان و بووكەكان ئەوەیان زۆر بەكەیفێ بوو.

گوندییەكانی چیی پێویست بوو لە بن گڵ دەریانهێنابۆوە و ئـەوەی دەشـبوو بـشاردرێتەوە، لەوێدا هێشتبوویانەوە، كەچی وایان دەنواند كە بەڵێ هـەموو شـتەكانیان دەرێناوەتـەوە، بـەڵام هیچ شتێ نەگۆڕابوو. گوندییەكان چیی سووك و گرانبایان هەبوو لە بن گڵـێ هێـشتبوویانەوە، كەچی خۆیان قایل كردبوو كە بەڵێ تەنانەت پووشكەیەكیشیان نەشاردۆتەوە.

بەڵام ئاژەڵە و مەڕ و ماڵاتەكانیان كە لە ئەشكەوتی پەریانـدا بـوون، لەگـەڵ ئەشـكەوتەكە ڕاهاتبوون. قەرار بوو تا هەتایە هەر لەوێ بمێننەوە. ئەگەر عادیـل نەفـەنی هاتبایـە دەیتـوانی بـــچێ و لـــەوێ ئاژەڵـــەكان بـــەرێ. خـــۆ ئـــەوانیان نەشـــاردبۆوە.... بەبێ ئەوەی قسەیەك لەسەر ئەوە بكەن، تەواو لەسەری ڕێككەوتبوون. دیسانیش هەر چاوەڕێی عادیل بوون، بەڵام ئەمجارەیان بە خەیاڵێكی ئاسوودە و بەبێ هەستی شەرمەزاری.

## ١٤

ڕۆژ ڕۆژی ئاشقەکەچەڵە بوو. شەش مانگ، ساڵێك، دوو ساڵ جارێك ئاشقەکەچەڵە ئاوا وەکەیف دەهات. لەو ڕۆژانەدا سێ گوڵینگی وەسازەکەی دەخست. یەکێ شین و یەکێ زەرد و یەکێ سوور. لە ڕۆژەکانی دیکەدا تەنیا گوڵینگێکی سپیی بە نووکی سازەکەیەوە کردبوو. کە گوڵینگەکان دەبوونە سێ، هەموو دەیانزانی ئاشقەکەچەڵە تەواو وەکوڵ هاتووە گۆرانی و ئەفسانەی نەبیسرا و نەگوتراو دەچڕێ و گەلێ حەکایەتان دەگێڕێتەوە. دەوروبەری ئاشقەکەچەڵە بەردەوام ئالۆز بوو. ئاشقەکەچەڵە لەو ڕۆژانەدا دوای ئەوەی دەچۆوە سەر جێیەکی خۆی، ماوەی یەك سەعات خەریکی سازەکەی دەبوو. دەستی بەسەردا دەکێشا و دەیلاواندەوە و دەکرا لە هەموو هەڵسوکەوتەکانییەوە بۆت دەرکەوێ گیانی بەو سازەوە بەستراوەتەوە.

شەوەکە، شەوێکی سارد بوو. تاق و لۆق ئەو ئەستێرانەی بە ئاسمانێوە بوون، بە تریفەی کەسیرەیانەوە دەتگوت لەسەرمان هەڵدەلەرزن. مانگی شەوی چواردە بە ئاسمانەوە دەخزی و سێبەری ماڵەکان و تاقەدارەکان و ئەو خەڵکەی بۆ بیستنی گۆرانییەکانی ئاشقەکەچەڵە بەرەو ماڵەکەی ئەنجوومەنی ئاوایی دەچوون، بەسەر بەفرە سپییەکەدا دەکێشا.

ئاشقەکەچەڵ گوتی:

ـ ئاوردوو زۆر باوێنە ئاگردانەکەوە. با ئاگرەکە بڵێسە بستێنێ و شێت بێ.

ئەوەش یەکێك بوو لە خووەکانی ئەو. چ زستان بایە یان هاوین، ئەگەر ئاگرێکی گەورە لە تەنیشتییەوە بڵێسەی نەکێشابا، نەیدەتوانی جوانترین گۆرانییەکانی بچڕێ.

کۆلە لەسەر کۆلە خستییانە ئاگرەکەوە.

ئاشقەکەچەڵە سازەکە لە باوەشی گرت، قیت قیت دانیشت و کڕ بوو. لەو جۆرە ساتانەدا چاوی لێك دەنا و هۆشی بەخۆیەوە نەدەما. ئەو حاڵەتە ئۆین و ئەدا نەبوو. چون ئەگەر وا بایە هەموو دەیانزانی. جاری یەکەم و دووەمیش نەیانزانیبا، ئاخرییە جاری دەیەم پێیان دەزانی.

دوای ماوەیەك، ئاشقەکەچەڵە سازەکەی بە سینگییەوە گوشی. زرینگەیەکی لە تەڵەکەی هێنا و دەستی پێ کرد. ماوەیەکی درێژ سەرخۆشانە لێی دا. لە ناکاو ڕایگرت:

"ئەمشەو، ئەو شەوەیە کە دەبێ بەشی خۆمان لە حەقایەتان وەرگرین... ئای ی ی قاز و قورینگە پۆپنەکییەکان"

سەیرێکی حەشیمەتەکەی کرد. تێکڕا گوتیان:

ـ ئای ی ی ی ... قاز و قورینگە پۆپنەکییەکان.

ـ بەسەری قاراجائۆغلانی باپیرم، بەسەری پیرسوڵتانی باپیرم و بەسەری دادال‌ئۆغلوی باپیرم هێێێێێێێ ئای ای ی ی قاز و قورینگە پۆپنەکییەکان... ئەمڕۆش بەشەر ئاشقی کوردان عەبداڵی زەینۆکێ... هێێێێێێێێێی قاز و قورینگە پۆپنەکییەکان... هێی چیا سەر بە تەم و تۆفانەکان..."

"بەسەر عەبداڵی زەینۆکێ و ڕێبازەکەی ئەو...

"دەڵێن عەبداڵی زەینۆکێ ئەو پیاوە ئازایە، ئەو ئاشقە مەزنە هەر دوو چاوانی کوێرەیە، بۆ چیاو دەشتانە و گۆرانی بۆ مەل و باڵندە و دەعبایان دەچڕێ. ئەو وەك ئاشقەکانی دیکە نییە. هەر لە بەیانییەوە تا شەوێ و لە شەوێوە تا سبەینان بێوچان گۆرانی دەچڕێ. چۆن ئاوی چەم لە ڕۆیینێ ڕاناوەستێ، عەبداڵیش لێی نابڕێتەوە و گۆرانیی ئەو لە بنەی نایەن. لە کێو و چیا و چۆڵان و لە بەندن و دۆڵ و دەستان، لە دارستان و لێرەوار و ڕەوەزان و لە نێو خەڵك و لە هەموو شوێن و جێگەیەك بێ پسانەوە هەر دەچڕێ. کە تەنیاشە و کەسی لا نییە، بۆ دار و ئاو و گڵ و کوێرەڕێیان و بۆ مێرووڵە و جڕ و جانەوەران و بۆ هەر بوونەوەرێکی لەسەر ڕێگەی بێ گۆرانی دەڵێ."

"گۆرانیی ئەو لەبنەی نایە، چل شەو و ڕۆژانیش بێ پسانەوە بیڵێ، دیسانیش هەر دوایی نایە. کەس دوای عەبداڵ نەیتوانیوە وەك خۆی گۆرانییەکانی تا کۆتایی بڵێتەوە. گۆرانییەکانی بە کوردی دەگوتن. بە کوردی دەیچڕین، بەڵام تورك و فارس و عەرەب و ڕووس و ئینگلیزیش لێ تێدەگەن. ڕاز و حیکمەتێکیان تێدا کە لەکەس ڕوون نییە. ئەو عەبداڵە هەموو شەوێ کە تاریکان بەسەردا دێ، دەست بە گۆرانییەکەی دەکا و لەگەڵ کازیوەی بەیانی دەیبڕێتەوە."

عەبداڵی زەینۆکێ گراوییەکی هەیە، نە دیتوویەتی و نە دەشتوانێ بیبینێ و نە دەستیشی پێی ڕاگەیوە."

لەگەڵ ئاوابوونی خۆر تێی دەچریکێنێ، جا ئەو گۆرانییە هەر شتێك بێ، سەرەتا گۆرانییەك بۆ خۆشەویستەکەی دەڵێ."

"جا دوای ئەوەیە گۆرانییە سەرەکییەکەی دەڵێ."

"بەر لەوەی ڕۆژ بێتەوە لێی دەبڕێتەوە و ڕێك ئەو دەمەی خۆر لە ئاسۆوە سەر دەردێنێ گۆرانییەکی دیکە بۆ گراوییەکەی دەڵێتەوە. بەوشێوەیە شەوێك تێپەڕ دەکا.

"هێێێ... قاز و قورینگە پۆپنکەکییەکان..."

حەشیمەت وێکڕا گوتیان:

"هێێیی... کێو و چیا بەفرگرتووەکان... ئەی قاز و قورینگە غەریبەکان..."

ئاشقەکەچەڵە بەسەر سازەکەیدا نووشتایەوە:

"ئەوە عەبداڵە بە ڕێگە چۆڵ و هۆڵەکاندا لەسەر چنگان دەڕوا. ئەو ئەڤینداری چیا بەرزەکان و پێدەشتە بەرین و هەراوەکان و هەموو بوونەوەرەکانی خودا و مرۆڤە باشەکان و ئینسانە خراپەکانیشە. شەوێکی ئەنگوستەچاوی بەسەردا هاتووە. شەوێکی وەك بەرد قورس... پشتی لەبن بارستایی ئەو تاریکەسەلاتەدا کووڕ بووەتەوە... دەست بەسەر ئەو شەوە خەستەدا دێنێ و دەچێتە پێشێ. ئەو دەشتەچۆل و کاکی بە کاکییە ڕێك و بێ هەوراز و نشێوە و عەبداڵ تەمەنی شێست ساڵانەی خۆی تێپەڕاندووە و ڕێبازی گۆرانیبێژەکانی گرتووەتە بەر. عەبداڵ کوێرە. جادەکان نابینێ. دەست بەسەر پشتی شەوە تاریکەکەدا دێنێ و ڕێگە دەبڕێ بۆخۆشی هە وا دەڵێ. لە دنیایەکی چۆلدا بەتەنێ ماوەتەوە. دنیایەك کە تێیدا هیچ گیانلەبەرێك هەناسە ناکێشێ و ناجووڵێ... جگە لە عەبداڵ. هەروا دەچێتە پێش، بە دەستێکییەوە شەوی پێیە و بە دەستەکەی دیکەی چەقۆیەکی دەم بریقەدار کە شەوەکەی پێ دەبڕێ و دەچێتە پێش.

"لە حاڵێکدا عەبداڵ هەر ئاوا دەچێتە پێشێ، لاقی لە شتێکی شلەتێن و نەرم و زیندوو هەڵدەنگوێ. دەست دەبا و سەیر دەکا باڵندەیەکە، بەڵام باڵندە دەبێ هەڵفڕێ. کەوابوو دیارە بەڵایەکی بەسەر هاتووە. ئاخۆ ئەو باڵندەیەش شەوێکی قورس و گران کەوتووەتە سەر شانەکانی؟ چیی بەسەر هاتووە؟

"باڵندەکە لە باوەشی دەگرێ و دەچێتە گوندەکەوە، گوندییەکان لە دەوری کۆ دەبنەوە. عەبداڵ دەپرسێ:"ئەوە چ باڵندەیەکە؟ چیی بەسەرهاتووە؟" گوندییەکان سەیری ئەو باڵندەیە دەکەن وا عەبداڵ گرتوویەتە ئامێز و بەخۆیەوە ڕێك گوشیوە و دەڵێن:"ئەوە قورینگە، باڵێکی بریندارە و باڵەکەی دیکەی دەرهاتووە. ئەو باڵندەیە تازە هەرگیز ناتوانێ هەڵفڕێ.

"عەبداڵ خەمێکی قورس دایدەگرێ و دەڵێ:"سەیرە، یانی ئاوا، ئەمن چاوم نییە و هیچ کات ناتوانم ببینم و ئەو قورینگەش باڵی نییە و هەرگیز ناتوانێ هەڵفڕێ.

"چ دنیایەکە ئەو دنیایە. ئەگەر چاوم هەبوایە، داوام لە گوڵەکانی دەکرد بپشکوێن، بەدەریاکانیم دەگوت شەپۆلان بدەن. بە بارانم دەگوت ببارێن و بەفر و درەوشاوەییم دەدایە چیا بەرزەکانی و باڵی ڕەنگاڵەییم بە جرِ و جانەوەرەکانی دەبەخشی و هێلانەم بۆ مەلەکانی چێ دەکرد و دانم لە هێلانەکانیاندا ڕۆ دەکرد، بەڵام ئێستا تاریکە شەوێکی ئەنگوستەچاو قورساییەکەی خستووەتە سەر شانەکانم و تاقەکاری من ئەوەیە لە ناخی ئەو تاریکییەدا بە دەوری خۆمدا بخولێمەوە.

"قورینگ ئەگەر باڵی هەبوایە، بەسەر ئاوە قووڵ و دوورەکاندا هەڵدەفڕی. بەسەر ئاسمانی شارە گەورەکاندا لە شەقەی باڵانی دەدا. بە شاباڵێك دەریاچەی وانی دەبڕی. چیایەك هەیە پێی دەڵێن بەردەئەستێ. دەچوو و لەسەر لوتکەکەی دەنیشتەوە.

ئەو قورینگانە هەموو ژیانیان لە بەهاردا تێپەڕ دەکەن. کوێ بەهار بێ دەچنە ئەوێ. قەت ڕووی زستان و هاوین نابینن و پەڕ و باڵیان بۆنی بەهاری لێوە دێ.

"ئەوجار لەوانەیە یەکەمین جاری بێ لە هەموو ژیانیدا زستان دەبینێ و بەفر و سەرما دەناسێ.

"دوو چارەنووس لە شوێنێك گەیشتوونەتەوە یەك.

"عەبداڵ قورینگەکە هەڵدەگرێ و دەیباتە چیا. هاوین بەرەو تەواوبوون دەچێ و پاییز بەڕێوەیە. ڕیزی قاز و قورینگان بەسەر سەریانەوە دەفڕن و بەرەو هەواری بەهارانەیان دەڕۆن. عەبداڵ نایانبینێ، بەڵام بە قاووقیژەکەیانەوە دەزانێ ئەوانن تێدەپەڕن.

"عەبداڵ قورینگەکە لە پیش خۆی دادەنێ و لەگەڵ هەڵاتنی خۆرەتاو تێی دەچریکێنێ لە گۆرانییەکەی. لە چۆن بزانێ کاتی ڕۆژئاوابوونە؟، بەڵام عەبداڵ دەزانێ. نابینێ، بەڵام بە گۆشت و خوێنەکەی هەستی پێ دەکا. کاتی زەردەپەڕ، ئیدی گۆرانییەکەی بە ناوی گراوییەکەی دەست پێ ناکا. بە قورینگەکە دەست پێ دەکا و بە قورینگیش کۆتایی پێ دێنێ. عەبداڵ هەتا بەیانی هەتا ڕۆژ دەبێتەوە گۆرانی بۆ قورینگەکە دەڵێ. بۆ قورینگەکە و بۆ مرۆڤەکان و چیاکان و دایکانی زەوی و چەم و ڕووبارەکان و مێرووەکانی خاك و ماسییەکانی نێو ئاو و ئەستێرەکانی ئاسمان و شەوە ئەنگوستەچاوەکانی دەڵێ.

"قورینگەکە لە بەردەمی گوێ لە گۆرانییەکە ڕادەگرێ.

"ڕۆژێك، پێنج ڕۆژ، مانگێك، دوو مانگ، هەر تێی دەچریکێنێ. بێ پسانەوە دەیڵێ و نایبڕێتەوە. دارەکان و گوڵەکان و جروجانەوەر و دەعبا و دایکانی زەوی وەزمان دێن.

"ڕۆژێکیان سەر لە بەیانی کە تاو هەڵدێ و گۆرانییەکەی عەبدالْ تەواو دەبێ، لە ناکاو حالەتێکی سەیری بەسەردا دێ. لە ناکاو ڕووناکاییەك لەبەر چاوی عەبدالْ دەدرەوشێتەوە.

عەبدالْ خۆی لەبەر ئەو تیشکە تیژە پێ ناگیرێ و لە هەمبەر تێکشکاندن و هەڵوەرینی ئەو تاریکییەی لەمێژ ساڵە تێیدا بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە، خۆی پێ ڕاناگیرێ و دەکەوێ. لە ترسانا ناتوانێ چاوی هەڵێنێ. ماوەیەك وەك جەستەیەکی بێ گیان سەری لەسەر خاك دادەنێ و دوایی وردەوردە هەڵدەستێ و چاوەکانی هەڵدێنێ. لە پێشدا ئاسمانی بێسنوور و شین دەبینێ و سەری سوور دەمێنێ. زمانی لەگۆ دەچێ و دوایی چاو لە بەر پێی دەکا و زەوییەکە دەبینێ. خاك وەك دایکێك "بەر"گر پڕ لە نیعمەت و مەیل بزوێنە.... بەسەرسوورمانیشەوە سەیری خاك دەکا. دادێتەوە و خاك و تیشکەکە ماچ دەکا.

"لەو کاتانەدا قورینگەکە لەبەردەمی ڕاوەستاوە، بەڵام عەبدالْ نایبینێ. دوایی لەناکاو سەیر دەکا ئەوە قورینگە پۆپنەکییەکەی لەبەر دەمی ڕاوەستاوە. قورینگێکی جوانی پۆپنەکی. دەستی بۆ دەبا بیگرێ، قورینگەکە لە شەققەی باڵ دەدا و دەفڕێ و ڕێی ئاسمانان دەگرێتە بەر. عەبدالْ تا باڵندەکە لە ئاسماندا دەبێتە خاڵێکی ڕەش، هەر وا چاوی لێ ناترووکێنێ و ئاخرییەکەی لە چاوان ون دەبێ."

تاو هەڵدێ. ئاشقەکەچەڵە ئاخرین زرینگەی لە سازەکەی دێنێ:

"هێێیی ی قورینگە پۆپنەکییەکان، قورینگەکانی عەبدالْ... ئەوانەی چێژێکیان لەو چیرۆکە وەرگرتووە بەخۆیان بنازن. ئەوە بوو بەسەرهاتی عەبدالّی باپیرەم. لەمەودوا عەبدالّی باپیرەم هەتا مردنێ هەر گۆرانیی بۆ ڕووناکی چڕی و تف و لەعنەتی لە تاریکی کرد. ئەوانەی چێژێکیان لەو چیرۆکەی عەبدالّی باپیرەم وەرگرتووە، بەخۆیان بنازن....هێێی... ڕووناکییەکان.... هێێیی ... قورینگە پۆپنەکییەکان... هێ ێ ی ی... مرۆڤەکان بەخۆتان بنازن..."

حەشمەتەکە هاواریان کرد:

- با بەخۆیان بنازن...."

ئاشقەکەچەڵە ماندوو ببوو. سازەکەی ماچ کرد و لە تەنیشت خۆی دانا و سازەکە لە تەنیشت چۆکییەوە خزییە خوارێ.

## ١٥

بەر لەوەی خۆر لە ئاسۆ سەر وەدەر نێ، ئەودەمەی ئاسۆ ڕوون دەبۆوە و سوورایییەکەی خۆی بەسەر بەفرە سپییەکەدا دەکێشا، هەموو خەڵکی دێ لەخەو هەستابوون. دەتگوت خۆیان بۆ نەورۆز یان بۆ جەژنێکی دیکە ئامادە دەکەن.

هەموو ژنانی ئاوایی بۆ لەبەرکردنی جلوبەرگ چاویان لە مریمۆك دەکرد. هەمووان وەك ئەو باشترین جلوبەرگەکانیان لەبەرکردبوو و چیی خشڵ و بەرمووری هەیانبوو بەخۆیانەوە کردبوو و هاتبوونە پاناوکەکەی ئاوایی کۆ ببوونەوە.

لەگەڵ ئاوهەڵات، گوندەکە ڕەنگاورەنگ دەچۆوە: کچەکان وردە ئاوێنەیان لەسەریان دابوو و تیشکی هەتاوی بەرەبەیان لە ئاوێنەکانی دەدا و شۆقی دەدایەوە.

گەنجەکان قۆڵیان لە قۆڵی یەکتری کردبوو و چووبوونە لای "عەلی"یە درێژ و گوتبوویان:

ـ مامە عەلی، ئەو شمشاڵەت دەربێنە و چەند هەوایەکمان بۆ لێدە.

عەلیش هەستابوو و خۆی گەیاندبووە پاناوکەکە و لەگەڵ گەیشتبووە ئەوێ شمشاڵی لە بەرشتوێنی دەرێنابوو و تێی تووڕاندبوو و گەنجەکانیش دەستیان کردبوو بە شایی و لۆغان. کچەکانیش لەلایەکی دیکەوە بە دەفەلێدان و گۆرانی گوتن سەمایان دەکرد.

ئاشقەکەچەڵەش کە شەوێ گۆرانییەکانی خۆی گوتبوون و تەواوی کردبوون، کێچی لە کەوڵی کەوتبوون و خۆی پێ نەگیرابوو. ئەویش بەساڵاچووانی گوندی لە دەوری خۆ کۆ کردبۆوە و بە سازەکەیەوە ئەفسانەیەکی کۆن و بەهێز و هیوادەری بۆ چڕیبوون.

دەتگوت گوندی کوێرەوەری و خەفەتی ئەو چەند مانگەیان فەرامۆش کردووە و هەموو خەمەکانی خۆیانیان وەلا نابوو.

ئەوە کۆتایی دووەمین چاوەڕوانی بوو. ئیدی هەمووان پێیان وابوو ئەمڕۆ عادیل ئەفەنی هەر دێ.

مەحاڵ بوو عادیل ئەفەنی نەیبیستبێتەوە کە هەمووان ماڵ و سامانەکەی خۆیان لە حەشارگەکان هێناوەتە دەرێ. چۆن دەبوو دەمودەست بە شاردنەوەی کەلوپەلەکانیان بزانێ، بەڵام لە هێنانەدەرێی ئاگادار نەبێ؟ و هەر بیستبایەوە، دەسبەجێ جەندەرمەی وەدووی قوونی خۆی دەدا و دەگەیشتێ. کوێخا سەفەر دەیگوت:

ـ خەڵکی هیچ گوندێکی ئەم دنیایە هێندەی گوندییەکانی من ڕەسەن و نەجیم نین. هەروەها لەسەر ئەو زەوییە گوندیی ئەوەندە باش و نازدار دەست ناکەوێ.

هەی گیانم بە قوربانی ئەو گوندییانە. جا ئێستا ئەو عادیلە کە بێ چ دەبینێ؟ لەبری ئەوەی گوندی بە چاوی فرمێسکاوییەوە ببینێ، دەیانبینێ نوقمی شادی و خۆشین."

جاروبارە بیر و خەیاڵێکی ڕەش بە مێشکیدا تێدەپەڕین:"ئەی ئەگەر عادیل نەیە؟ یان ئەگەر ئەمڕۆ نەیبیستبێتەوە کە گوندی هەموو شت و مەکیان لە حەشارگە هێناوەتە دەرێ؟"

دەسبەجێ ئەو خەیاڵەی لە مێشکی خۆی دەردەکردە دەرێ:"ناکرێ نەیە. مەحاڵە بە گوێی نەگەیبێتەوە. ئەو داوی خۆی بۆ ئەو گوندییانە ناوەتەوە، ئەگەر بەیانی لێرە وزەی باڵی مێشێك بێ، تا نیوەڕۆ بەگوێی دەگاتەوە. ئەو خەبەرەشی بێ و نەبێ هەر دوێنێ بەر لە ڕۆژئاوابوون پێ گەیوەتەوە و هەروەها وەڕێ کەوتووە."

نەیدەزانی خەریکە درۆ لەگەڵ خۆیشی دەکا.

گوندی هەتا نیوەڕۆ بەشادی و هەڵپەرکێ هەر چاوەڕێ بوون و ڕێك نیوەڕۆ بە قریوەی خۆشی بەرەو ئەو ڕێیەی دەچۆوە شاری، وەڕێ کەوتن، بەڵام چیی ڕوانیان، کەسیان نەدی بە ڕێگەدا بێ. خۆشیان نەیاندەزانی چ شتێك و چ هەواڵێك ئەوانی هێناوەتە لای ڕێیەکە. کاتێ بە دەستی بەتاڵ دەگەڕانەوە، شادییەکەیان دامرکابۆوە، بەڵام هیوابڕاو نەببوون.

دوانیوەڕۆ، دیسان ئەو خەبەرە بەنێو گوندیدا گەڕا کە"ئەوە دێ"، و دەرپەڕین، بەڵام هەواڵەکە بەدرۆ دەرچوو. لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێوارێ هەر هیوادار بوون. لەگەڵ تاریکی بەسەردا هات.... ئەوەی نەدەبوو ببێ بوو و هیوایان لە دڵێدا نەما. دەستیان خستە بن باڵیان و ماندوو شەکەت بەرەو ماڵەکانیان گەڕانەوە. هیچ کەس لێوی هەڵنەدەپچڕی. چەقۆت لێدابایەن خوێنیان لێوە نەدەهات. وشك هەڵاتبوون.

کوێخاش لە داخان شێت ببوو. دەستی لە قەدی نابوو و تێکشکاوانە ئەوسەر و ئەوسەری ژوورەکەی دەکرد. ژنە بچووکەکەی لە تەنیشت ئاگردانەکەوە داڵغەی لێدابوو و خەریکی نواندنی ئەو ساوایەی بوو کە دوای گەڕانەوەی لە چوکووراوا ببووی. لە دەرەوە باو بۆران و زەمهەریر بوو و ئەو

تۆف و بۆرانەی لە دەشتەکەوە هەڵیکردبوو، لوورەی دەهات. دەنگی شکانی بەفرە بەستووەکان توندتر دەبوو و هەموو وڵاتی دەلەرزاند. کوێخاش پەیتاپەیتا دەیگوت:

- نەبوو عادیل، ئەوە نەبوو. بەو هەمووە چاکەیەتەوە، ئەوەی کردت هیچ باش نەبوو. گوندی بۆوەی نابن گاڵتەیان پێ بکەی. جوان تێبگە هاورێ. ئەتۆ کابرایەکی سووك و چرووکی برالە. ئەتۆ خەریکی گوندییەکانی من ئازار دەدەی. گەرت لە گەڕی من مەهاڵێنە و وەڕەزم مەکە، عادیل ئەفەنی. هەر وەکی گوندییەکانم لە تۆ تۆقاندووە و ترسی تۆم وەبەرناون، سبەینێش هەڵدەستم و بەناوی تۆوە قەرزەکانیان دەبەخشم. عادیل ئەفەنی، کاکی خۆم، دەیبەخشم و ئەتۆش لەجێی شەمامە دەبێ بۆن بە گونیانەوە بکەی. ئەمن نەریت و مەریتم بە گوێدا ناچن. گونیشم پێی نابزوێ. ئەوەندەش کەر نیم. ئەمن خۆم بەو نەریتەی گوندییەکانەوە کەر بکەم و هەروەها ساڵی داهاتوو، کە دەچینە چووکووراوا، پاسلەوان لە گوندەکە بەجێ دێڵم و دەڵێم گوندییەکان پووشێکیش چییە لە عادیل ئەفەنییان نەکڕیوە. کە من حاشام لێ کرد، ئەتۆش کام ڕێگە سەختە ئەویان بگرە و کام بەرد ڕەقە سەرت بەودا بکێشە. ئەوجار بەردەکانیش چاری دەردت ناکەن. هەروەها دوای ئەوە دەچم و لە قەرلان غچۆغلۆ دوژمنە قەستەسەرەکەت، شت و مەك دەکڕم. ئەتۆ لە سەتا یەکم بۆ دادەشکێنی، قەرلان غچۆغلۆ سەتا سێم بۆ دادەشکێنێ. ئەوجار خۆی ئەو داوایەی لێ کردم. ئەتۆ هیچ بەوەت زانیوە؟ ئاغا عادیلی سەت چاو و هەزار گوێ؟...

هەر دەتگوت عادیل ئەفەنی ڕاوەستاوە و ئەو خەریکە قسەی لەگەڵ دەکا، بەڵام ئاخۆ بە ڕاستی لە ڕووی خۆیدا دەیتوانی ئاوا بێ تویکڵ و بێ پێچ و پەنا قسان بکا؟

"بەڵام بڵێی و نەڵێی ئێمە نان و نمەکی یەکترمان کردووە. کەچی تۆ ئەمڕۆ خراپەت کرد. بەو نەهاتنەت دڵی من و گوندییەکانت کردە گۆمی خوێن. لانیکەم سبەی وەرە، گەرچی ئەوە دەرمانی دڵە شکاوەکەی ئێمە نییە، بەڵام قەیناکا هەر وەرە. دەمانەوێ شتێکت پێ بڵێین برالە. ئەتۆ من دەناسی. خۆ هەر گوندییەکانی خۆم نابەمە لای قەرلان غچۆغلۆ، بەڵکو خەڵکی بیست گوند، چل گوند، شێست گوند وێکڕا وەدووی خۆم دەدەم و دەیانبەم. کێ هەواڵی لێ ناردووی ئەوانە شت و مەکەکانیان شاردۆتەوە؟ و کێش دوایی ئاگاداری کردییەوە کە ئەوانە هەموویان دەرهێناوەتەوە؟ و دیسانیش کێ بوو داوای لێ کردی دەسبەجێ بێی؟... هەر ئەمڕۆ بێی و کارەکەت بکەی؟... ئەوەی قسەت لەگەڵ دەکا وڵاغ و چوارپێ نییە، بنیادەمە.

"ئەگەر بنیادەم خۆیشی لای تۆ هیچ بایەخێکی نییە، کەوابوو برادەرایەتیی چل ساڵەشمانت بۆ گرنگ نییە؟ وەڵامم بدەوە. ئەتۆ چۆن دەتوانی قسەی کوێخایەکی گەورە، تاقانە کوێخای

گرنگی گوندەکانی دەوروپشتی تۆرووس وەك قسەی سەگ و پشیلە بخەیتە پشت گوێ؟ ئەتۆ ناتوانی قسەی من بخەیتە پشت گوێ. ئەتۆ دەبێ گوێ بدەیە قسەی من ئەگینا زۆر زەرەر دەکەی. وەباڵی مزگەوت بەستۆی بجێوری. خۆ بنیادەم هەر کارێکی پێ ناکرێ. ئەتۆ ئەگەر برادەری وەك منت نەبێ، چیت پێ دەکرێ؟ هەرچەندە ئێمەش تۆمان نەبی سەگ و شوانمان دێتەوە. جا ئەوە تۆ هەموو سامانی دنیاشت هەبوو بە پووشێك...

ئێستا کە تۆ ئاوات لێ کردین، بەڵێن بێ خاکت بە توورەکە بکێشم. تا ئێستا کاری قۆرت زۆر کردووە، بەڵام ئەمن هەر توورە نەبوومە. پێم گوتی: ئەو ساڵ مەیە ئاوایی گوندی شەڕ و شپرزەن، گوتت نا، دێم. گوتم لێبگەڕێ بۆ ساڵی دادێ و ساڵی داهاتوو قەرزەکەت وەرگرەوە و لەبەریشت پاڕامەوە، گوتت نا هەر ئەمساڵ دێم و گوندییەکان ڕووت ڕووت دەکەمەوە. گوتم باشە وەرە و ڕووتیان کەوە، بەڵام زووتر وەرە، بەر لەوەی گوندی وەڕەز بکەی و شێتیان بکەی وەرە. هەر نەهاتی. گوندی چیی هەیانبوو شاردیانەوە، هەر نەهاتی. ئێستاش کە شت و مەکیان هێناوەتەوە دەرێ دیسان نایەی.

"جوان گوێ ڕاگرە با پێت بڵێم برالە. گوندی هەموو شتێك قبووڵ بکا، ئەوەی پێ قبووڵ ناکرێ، یەکێك گاڵتەی پێ بکا. ئەتۆ هەتا ئێستا زۆرت ئەزیەت داوم، بەڵام ئەمن توورە نەبووم. ئەمجارەیان لە دین دەهری بوومە. وا دەزانم بابمت کوشتووە. هەر ئێستا لە دەستم دێ بتتۆپێنم. بیری لێ بکەوە برالە، بیری لێ بکەوە ئەو تیرەی گوندییە خەڵکێکی لێقەوماون کە وەك قۆچی قوربانی چاوەڕێی تۆن. وەك چۆن قۆچی قوربانی سمی لە خەنە دەگرن و بەنێکی سووریان لە شاخی دەبەستن و دوایی سەریان دەبڕن، ئەو گوندییانەش وەك قۆچی قوربانی خۆیان ڕازاندەوە و چاوەڕێت بوون. دەیانەویست دار و نەداری خۆیانت بە دڵاوابییەوە بدەنێ. دەیانزانی لە برسانیش دەمرن، بەڵام دیسان بەهاتنت شاد و دڵخۆش بوون. لە کوێی دنیا شتی وا هەبووە؟ عادیلی سپلە. دەی بڵێ بزانم شتی وا لە کوێی دنیایە هەبووە؟ عادیلی هیچ و پووچ. دنیایەکت سەروەت و سامان هەیە. لە کوێت هێناوە؟ خۆ کەس نەزانێ ئەمن دەزانم ئەو سامانەت چۆن وەسەر یەك ناوە. چما بە ئارەقەی نێوچەوان پەیدا دەبێ عادیل؟ ئێستا دەتەوێ ڕاستییەکەیت پێ بڵێم؟ هەمووی ئارەقەی نێوچاوانی خەڵکی ئەو شێست گوندەیە کە لە بن قرچەی گەرمای چووکووراوادا دەچنە لۆکە ڕنینەوە و لەوێ گیانیان دێتە سەر لێویان و دەمرن و دەژێنەوە و دەیکەنە گیرفانی تۆوە. چما خۆت بەوە نازانی؟ ئەتۆ نەدەبوو وات کردبا. ئەمڕۆ گوندییەکان، بە هەڵپەڕکێ و هەڵەکەسەما دەچوون بەرەو قوربانی و برسێتی، ئەوە ئاوری تێبەردام. ئەمن دڵم

هەیە. ئەمن گوندییەکانم زۆر خۆش دەوێ، دڵی من وەك سندانی ئەو ئاسنگەرانەیە، بەڵام وەزع و حاڵی ئەو گوندییانە کاری لەو دڵەش کرد. چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسك و ئاورم لە هەناوی بەربوو... ئەتۆش عادیل، لەو کاتەشدا نەهاتی. خۆ ئەگەر هاتبای و ڕووت ڕووتیشت کردبانەوە، لە خۆشیان شاگەشکە دەبوون، بەڵام ئەمجار ئیتر دیار نییە چ دەکەن... خۆ ئەگەر ئێستا بچم و بە زمانی تۆوە پێیان بڵێم ئیدی ئێوە فلسێکیش قەرزباری عادیل نین و هەموو قەرزەکەتان بەخشراوە، تەنانەت بزەیەکیشیان نایەتێ. ئەتۆ هیوابڕاوت کردن. هیوابڕاویی زۆر ترسناکە عادیل. ئەتۆ خەڵکی گوندی ناناسی. ڕۆژێك بە پێکەنین و شادییەوە بەرەو مردنێ دەچن و ڕۆژێکی دیکە تەنانەت بە گریانەوە بەپێشوازی جێژنەوە دەچن. دەبێ ئەو هەلانە بقۆزیتەوە. ئەتۆ ئەگەر بەوەت زانیبایە هەر ئەمڕۆ هەلت لەدەستەخۆت نەدەدا و دەهاتی... ئێستا کە وایە، چیی دەبێ با ببێ، ئەمن هەموو قەرزەکانیان پێ دەبەخشم. دواییش ئەتۆ چیت لەدەست دێ لەگەڵ من بیکە. ئەمن ناتوانم گوندییەکانم لە ژێر ئەشکەنجەدا ڕاگرم. دەپرسی چۆنی دەبەخشم؟ ئەوە بزانە کە ئەو دەفتەرە زەردەی تۆ هیچ نرخ و بایەخێکی یاسایی نییە. ئاخۆ بەڵگەی کاتب عەدلت هەیە؟ نا، کەوابوو ئەمنیش حاشای لێ دەکەم. هەروەها دوای ئەوە ڕێز و حورمەتم پێشکەش بە جەنابت و چاوەکانت ماچ دەکەم، عادیل، ئەوەت پێ باش بوو؟..."

چەندی زیاتر ئەوسەر ئەمسەری ماڵەکەی دەکرد، دڵی توندتر دەبوو. دەبوو شتێك هەر بکا، بەڵام چیی کردبا؟ چما دەکرا هەر ئەمشەو گوندی خڕ بکاتەوە و پێیان بڵێ قەرزەکانتان پاك بوون؟...

"جا با عادیل بێ و پارەی خۆی لە من بوێتەوە. وەڵڵاهی وەبیللاهی لێیان خۆش دەبم. وەك لە ماڵی بابی خۆم خۆش بووبێم ئاوا.... ئەدی ئەگەر بەخۆی و بیست جەندەرمەوە هات؟ کوڕە با بێ.... سەفەر ئەفەنی پادشای کوێخایان ڕێیەك بۆ ئەوەش دەدۆزێتەوە. جا ئەگەر نەتوانێ ڕێگەچارەیەك بدۆزێتەوە بۆچی پێی دەڵێن "پادشای کوێخایان"؟ کوێخا پشتی بە دەفتەرێکی زەرد بەستووە. چیی دڵی بێنێ دەتوانێ تێیدا بنووسێ. ئەمن بەڵگەی فەرمیم لێی دەوێ و هەروەها دەشڵێم هیچ قەرزێکمان لەسەر نییە. هەر پێی بە عەرزییەوە ڕەق دەبێ و نازانێ چ بکا. وەنییە؟ با هەر هەڵبەزێ و دابەزێ. هەتیو سەفەر، بەخوای فکرێکی باشە. ئەتۆ بە ڕاستی پادشای کوێخاکان نی، پادشای عاقڵەکانی. هەی چاوی گەردوون کوێر بێ کە تۆی کردووەتە کوێخای ئەو گوندۆکەیە ئەگینا وەك چۆن نەقە (ماسیی گەورە) لە دەریادایە، ئەتۆش دەکرا مەملەکەتێکی گەورە بەڕێوە بەری."

ئەگەرچی بیری بەخشینی قەرزەکان بە گوندییەکان شاگەشکەی دەکرد، بەڵام خەیاڵیشی زۆر ئاسوودە نەبوو. دڵەڕاوکێیەك تەنگی پێهەڵدەچنی:

"ئەوە دامنا لە هەموو قەرزەکانیان خۆش بووم. ئاخۆ دوای ئەوە قەرلانغچ متمانەمان پێ دەکا و قەرزمان دەداتێ؟ ئاخۆ خەڵکی شاری بەچاوی دوژمنمان سەیر ناکەن و ناڵێن وەختایەکی پاش چل ساڵان ئەوانە ئەوەیان لەگەڵ عادیل کرد، ئاخۆ لەگەڵ ئێمەشی ناکەن؟ سەگ هەرگیز لە لاقی سەگی دیکە ڕۆ نایە."

ئەو شەوە ورد و درشتی گوندەکەی یالاك لە خەفەتان خەوی لێ نەدەکەوت. دەبوو شتێك بۆ ئەو خەڵکە بکا. بە دەوری ماڵەکەیدا دەخولایەوە و لەبەر بێ هیوایی هەر جینگڵی دەدا. هەر دەهات و هەنگاوەکانی توندتر دەکردن، لە چاوترووکانێکا دەگەیشتە دیوارەکەی پێش خۆی و دەگەڕایەوە. هەروا لە هاتوچۆ دابوو... و پەیتاپەیتاش دووپاتەی دەکردەوە:"چیی دەبێ با ببێ، لێیان خۆش دەبم... وەك چۆن لە ماڵی بابی خۆم خۆش دەبم...."

هەوڵی ئەوەی دەدا خۆی قایل بکا. هەموو هێز و تینی دەدایە خۆی:"لێیان خۆش دەبم.... خۆش دەبم.... خۆش دەبم...."

بەو قسەیە خۆی هێور دەکردەوە، بەڵام بێ سوود بوو. ورده ورده تا دەیتوانی خێراتر دووپاتەی دەکردەوە.

وای لێهات زار و لێوی وشك بوون و شەکەتی لەشی داگرت و ترسێك خزییە دڵییەوە. چما پاش ئەوە دەکرا پێشی دێهاتییەکان بگری. ڕاستەوڕێ دەچوون بەرەو لای تاشباش. وەك لافاوێکی بەنداوەکەی شکاندبێ. دوای ئەو هەموو چاوەڕوانی و دوای ساردبوونەوە لەو هەمووە خۆشییەی ئەمڕۆیان شتێك هەر دەقەوما. تۆفانێك بەڕێوە بوو. هەموو دارەکەش لەسەر کوێخا سەفەر ئەفەنیدا، پادشای ئاقڵاندا دەشکایەوە...

"چێشتی خۆش لە ئەنگۆرەی دیارە. کوڕە سەیری ئەو تۆف و بۆرانەی دەرێ بکە. چیی ئەماوە دەشت و ساراکە بە خاك و بەردەوە هەڵگرێ و گوندەکەش هەڵکەنێ و بیباتە سەر لووتکەی تەکەچ. زەوی وا دەلەرزێ. ئەوە چ بۆرانێکە... ئیدی ئەوە چ تۆفانێکە.

ئێستاش ئەو خەیاڵە شوومە هەناوی دەگوشی و چیی دەیکرد ئەو دڵەڕاوکێیەی لە ناخیدا بوو هەر دەهات و لێی گەورە دەبۆوە و لێی دەبووە ترسێکی ڕەش و تاریك:

"سبەی، کەرەی بەیانی، گوندی بەخەبەر دێن و چ ببینن؟... سەیر دەکەن عادیل ئەفەنی بەخۆی و بیست جەندەرمەوە لە چەقی ئاوایی ڕاوەستاوە و چاوەڕێیە. بەفر لەسەر شانی کەوتووە. لە پێشدا

ترسێکی گەورە دەکەوێتە دڵیانەوە. دوایی برێك خۆشحاڵ دەبن... دوایی دیسانیش دڵیان لە ترسانا دەلەرزێ. دەلەرزێ و دەلەرزێ... دواتر ترسەکەیان دادەمرکێ... کەللەی سەریان گەرم دادێ. وردە وردە لە دەوری یەکتری کۆ دەبنەوە. لێك نزیکتر دەبنەوە. وەك مەڕ سەر لەبەر یەکتری دەنێن. پتر و پتر... هەتا وەك کۆگایەکیان لێ دێ... و ئەوجار وەك هەورە تریشقە دادەگژێنە عادیل... کە وازی لێ دێنن ئیدی عادیل هیچی لێ نەماوەتەوە. لەسەر عەرزەکە چەند دڵۆپە خوێنێك و لەوانەشە چەند نەتوکوتە دەست و قاچێ یان نیوەی لووتی مابێتەوە... ئەو قەڵافەتە زەبەلاحەی عادیل چیی لێ هات؟ جەندەرمەکان چوونە کوێ؟... کاتێ گوندی دادەگژێنە سەر عادیل، ئەوان سەریان لێ دەشێوێ و سەری خۆیان هەڵدەگرن و لە گوندی دەچنە دەرێ... گوندی ماندوون و ئیدی عادیل نەماوە. گوندی دەستیان بەرداوەتەوە و سەریان داخستووە. لە گۆڕەپانەکەی گوندی ڕاوەستاون و نازانن چ بکەن. هەر ئێستا منداڵۆچکەیەکی دوازدەساڵانەیان بە تفەنگێکەوە لێ پەیدا بێ هەموویان وەپێش خۆی دەدا و بۆکوێی پێخۆش بێ دەیانبا.

"ئاخ عادیل... ئاخ، هەی بێ ناموس، ئەتۆ چت بەسەر خەڵکی ئەو گوندە هێنا... ئاخ... چیت کرد...؟

ئەمشەو دەبێ ڕووت و قووت ببمەوە و بە پێشوازی ئەو بۆرانەوە بچم. دەبێ بچم ولە بەر بەفرەکە بنووم. بەفر دڵەکوتێ و نیگەرانیی مرۆڤ دەشواتەوە و لەگەڵ خۆی دەیبا، بەڵام ئەو بەفر و بۆرانە پیاو کەسیرە دەکا، خوێنی مرۆڤ دەیبەستێ. دەیبەستێ... دەیبەستێ."

هەم قسەی دەکرد و هەمیش هەنگاوەکانی توندتر دەکردن. خەریك بوو بخنکێ. هانکەهانکی بوو. چاوەکانی ڕەشکەوپێشکەیان دەکرد و سەری لە گێژەوە دەهات. لە ناکاو خۆی لە ماڵەکەی خستە دەرەوە. شەوێکی تاریك بوو. بۆران وەك لافاوێك خۆی بە دەموچاوی دادا. سەفەر لەسەر جێی خۆی وشك بوو.

تاریکی... خشەخشی بەفر لە بن پێیەکانیدا... سەرمای بەستەڵەك... سەفەر بە پەلە گەڕایەوە ماڵەوە. دەرگاکەی داخست.

برێك هاتبۆوە سەر خۆ، بەڵام دیسانیش تووڕە بوو. دەترسا دڵی لەوەش توندتر بێ. خەیاڵێك وەك برووسکە بە مێشکیدا هات:

"کچەکەی قیرسمایل... زۆر لە مێژە قسەم لەگەڵ نەکردووە..."

کە وەبیر کچەکەی قیرسمایل کەوتەوە، مچوڕکەیەك بە لەشیدا هات. گەرمایەك لە هەموو گیانی گەڕا.... دەستەکانی دەلەرزین. مچوڕکەیەکی شیرین و بە چێژ لە لەشی گەڕا... بە ژنەکەی گوت:

ـ ئەو منداڵەی باوەشت لە لانکێ بنێ و بینوێنە... بینوێنە و زوو هەستە بچۆ ماڵی قیرسمایل و کچەکەی بێنە ئێرە... نەمانتوانیوە هیچ کارێك بۆ ئەو کچە داماوە بکەین. خێراتر برۆ و بیهێنە ئێرە.

ژنە ئەو خووەی سەفەری دەناسی. منداڵەکەی لە بێشکەدا نواند و دەرپەڕییە دەرەوە. خۆ تۆزێك وەدرەنگی کەوتبایە کوێخا دەیکوشت.

سەفەر لە دواوەی بانگی کرد:

ـ خێرا بە و زوو هەڵیگرە و بیهێنە.

ئەو ئالۆوشەی لە دەنگەکەی دابوو لەرزێکی خستە دڵی ژنەکەیەوە. ژنە گەنجەکە لەبەردەم با و بۆرانەکەدا هەموو تینی خۆی کۆ کردەوە و بەغاردان دوور کەوتەوە.

سەفەر هەروا بە ماڵەکەیدا پیاسەی دەکرد. حەجمینی نەبوو. تامەزرۆیی و هەوەس بەناخی ئێسقانیدا ڕۆچووبوو و سات بە سات مچوڕکێکی خۆشی بە لەشیدا دەهات.

"وەرەنەوە... زووتر وەرن..."

ترسێك لە ناخیدا بوو. نەکا بەر لەوەی کچە بێ، تامەزرۆیی و هەوەسەکەی بنیشێتەوە. دەستی کرد بە گۆرانی گوتن. جار و بارە دەرگاکەی دەکردەوە و دایدەخستەوە. هەر جارێکی دەیکردەوە، شەپۆلێك بەفر و بۆران هورووژمی دەکردە نێو ماڵەکە.

ژنە گەورەکەی بە منداڵەکانییەوە لەبەردەم ئاگردانەکە کۆزیلەکەیان کردبوو و دانیشتبوون. بەبێ ئەوەی متەقیان لێوە بێ چاویان بڕیبووە ئاگرە سوورەکەوە. سەفەر کە دیتنی ئاوا کپ و بێدەنگن گوڕاندی:

ـ دەی هەستن دەی... بڕۆن بنوون دەی. چاوم پێتان نەکەوێ ها.

ژنە لەسەرخۆ گوتی:

ـ مەیکە هەرا سەفەر... ئەوە شێت بووی؟.. ئەوە دەچین دەنووین. بۆ وات لێ هاتووە؟

ـ بە گۆڕی بابتەوە... بچۆ بنوو..

ژنە چاوێکی سەیری لێ کرد :

ـ ئەوە دیسان هار بووی سەفەر، دیسان چیت بەسەر هاتووە؟

سەفەر بێ دەنگ بوو. لەناکاو تێگەیشت وردە وردە هەژانەکەی نیشتووەتەوە. هەستی کرد ئەو چێژە شیرن و خۆشە تامەزرۆییەی وردە وردە لە لەشی دەچووە دەرەوە.

"کچەکەی قیرسمایل... ئاخ... دایك قەحپە...

دەرگا کرایەوە. لە پێشدا کچە و بە دوویدا ژنە تازەکەی سەفەر و لەگەڵ ئەوانیشدا با و بۆران و زستانی دەشتەکە هورووژمیان کردە ژوورەوە.

سەفەر دەستی کچەی گرت. هەر دەستی وەدەستی کەوت، هەموو گیانی کەوتە لەرزین. مچۆڕك و لەرزینێك بەناخی ئێسقانیدا ڕۆژوو. گوتی:

- وەرە... وەرە کچە جوانەکەم... وەرە جوانکیلەکەم... وەرە... وەرە با چارێکی دەردت بکەم... وەرە تەگبیرێك بۆ مەڵحەمی برینت بکەمەوە...

کچەی برد و لەبەردەم ئاگردانەکەی دانا. خۆیشی لە تەنیشتییەوە دانیشت و بە ژنەکەی گوت:

- ئەتۆش هەستە برۆ... منداڵەکەت هەڵگرە و بیبە. دەمەوێ لەو کچە بپێچمەوە...

ژنە منداڵی بە بێشکەوە هەڵگرت و چووە ژوورەکەی نێوەڕاست.

- دەی بڵێ... بڵێ... خێرابە....

کچە ئیدی خووی گرتبوو. دەیزانی دەبێ چ بڵێ. ئیدی وەك جاران، واتە وەك ڕۆژەکانی سەرەتا لە شەرمان جینگڵی نەدەدا. ڕاهاتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئێستاش برێکی شەرم دەکرد.

- دەی بڵێ کچم، بیگێڕەوە، بیگێڕەوە ئاسکەکەی خۆم... بیگێڕەوە، بیگێڕەوە کە...

ئەوجار کچەش گێڕانەوەی ڕووداوەکەی پێ خۆش بوو. ئەویش لەگەڵ سەفەری پێ خۆش بوو:

- برایمەکەی ئەو گوندە...

- لە برایمی گەڕێ... ئێرە هیچ پێویست نییە.

- پێکەوە لە جێ خۆیانێ دراوسێ بووین.

- لە خەرمان و مەرمانیش گەڕێ...

- خەڵەتاندمی و گوتی دەتهێنم...

- کچێ لەوانەی گەڕێ و باسی نێو ئەشکەوتەکە بکە... ئەو برادەرەکەی تۆیان بردە نێو ئەشکەوتەکەوە... ئەشکەوتەکە پڕ بوو لە شەمشەمەکوێرە کە بە میچەکەیەوە شۆڕ ببوونەوە. چوونە نێو ئەشکەوتەکەوە.

- چووینە نێو ئەشکەوەتەکەوە. هەر وەژوور کەوتین برایم دەستی بۆ ئەوێم هێنا. ئەمن خۆم بە دەستەوە نەدا و هەتا شەوێ هەر یەکتریمان هێنا و برد. دوایی برادەرەکەی هات و خۆم بەدەست ئەویشەوە نەدا.

دەموچاوی کوێخا سوور هەڵدەگەڕا:

- دەی، دەی دەی.. بیگێڕەوە پەلەی بکە.
کچە بێدەنگ بوو. ئەویش چێژی وەردەگرت و چاوەکانی خومار کردن و بزەیەکی هاتێ و زانیی هەموو گیانی هەژاوە و نوقمی نەوسەکە بووە.
- دەی دەی دەی...
ئیدی کچە شارەزا ببوو. گوێی نەدایە و لەسەرخۆ لەسەری ڕۆیشت:
- برادەرەکەی ڕۆیشت و گوتی:"ئەمن دەڕۆم. تاقەتم نییە خۆم بەو کچەتیوەوە ماندوو بکەم. ئەتۆش چیت پێ خۆشە بیکە." دڵم زۆر بە ڕۆیشتنەکەی خۆش بوو. ئەمن برایم خۆش دەویست. برایم خۆی پێدادام. سەیرم کرد چەقۆیەکی بەدەستەوەیە. لە چاوتروکانێکا هەموو جلوبەرگەکانمی لەبەر دادڕیم و لەتوکوتی کردن و ڕووت و قووتی کردمەوە. لەبەر دەرکەی ئەشکەوتەکە ئاگرەکە داییسا. جلوبەرگەکەمی برد و هاویشتییە سەر ئاگرەکە بۆ ئەوەی هەموو بسووتێن. بەری نەدام. دوایی لە باوەشی گرتم. ئەمن خۆمم بە دەستییەوە نەدەدا. ئەویش ڕووت و قووت بوو. گیانی وە گیانم دەکەوت. وەك ئاور داییسا. گیانمی دەسووتاند... ئەمن وردە وردە هێزم لێ دەبڕا و خۆم پێ نەدەگیرا. چیی نەمابوو شێت بم...
سەفەر هەموو گیانی کەوتە لەرزین:
- ئەی دوایی... دوایی؟ دەی خێراکە... خێراکە... دوایی چتان کرد؟...
کچە گوێی نەدایە. هەروا بە هێمنی، هاوکات کە چێژیشی لە هەموو وشەکانی وەردەگرت، لەسەری ڕۆیشت:
- شێت... شێت دەبووم. هیچ شتێك هێندەی لەشی پیاو بەچێژ نییە. چەندی لەشی وە لەشم دەکەوت و ئاگری دەدام، ئەمن زیاتر لە خۆ دەچووم. ئەگەر لە هۆش خۆم چووبایەم، چیی پێی خۆش بایە لەگەڵمی دەکرد و کچێنیمی دەبرد. بەخۆم دەگوت: لانیکەم بەر لەوەی لەهۆش خۆم بچم با کچێنیم بەرێ. لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆریشم پێ خۆش بوو دیسانیش هەر خۆم دەبوارد. برایمیش پتر بەخۆیەوە دەگوشیم و ئێسقانەکانم دەیانزریکاند. سات بە سات بێهێزتر دەبووم و دیتم کەوتوومەتە سەر عەرزەکە و لە خۆڵ و خاکدا دەتلێمەوە. برایمیش هەروا بەخۆیەوەم دەگوشێ...
کچە دەستی کرد بە لەرزین.
سەفەر بێئۆقرە گوتی:

ـ دەیگوشیی..

کچە:

ــ دەیگوشـیم... خـەریك بـوو لـەخۆ دەچـووم... خـۆم بەدەسـتەوە نـەدەدا. دەموچـاوی و هەناسەی ببووە ئاگر. دەیسووتاندم... جەستەی یەکپارچە ئاگر بوو... نیگاکانیشی حاڵـەتێکی سـەیریان لێ هاتبوو. لەبەر نیگای خۆم پێ نەگیرا و شل بوومەوە...

سەفەر هاواری کرد:

دەستی کچەی گرت و وای گوشی، دەستی کچە ژانی کرد. ئەوجار لە باوەشی گـرت. کـچە لە نێو باسك و باهۆی سەفەردا دەتگوت چۆلەکەیە.

لەدەرەوە بەفر و بۆران قیامەتی دەکرد.

## ١٦

"عەلی"یە درێژ لە تەنیشت ئاگردانەکەوە دانیشتبوو و ڕووی کردبووە دایکی و دەیپرسی:
ــ وا نییە دایە؟... سەروەت و سامانی عادیل ئەفەندی هەموو دنیای تەنیوە و ئەوسەرەوسەری شار ئی ئەوە، کوا ئێمەی بیر دێتەوە؟.. ئێمە ئەگەر ئەمسالیش قەرزەکانمان پاك نەکەین، سالّی داهاتوو دەیاندەینەوە. لەوانەیە ئێمەی هەر لەبیریش نەبێ. هەر کەلوپەل و شت و مەك دەشارینەوە و دەریدێنینەوە و ئەوە چەند مانگە ئێمە هەر چاوەڕێی ئەوین. عادیل نایە نا. ئەگەر ویستبای بێ، تا ئێستا لەمێژبوو هاتبوو. ئەوە جاری جاران بوو هەلّدەستا و دەهات. لەبەر چەند قرۆش خەلّکی ئاوایی ڕووت دەکرد. ئەو سەردەم، دەهات و گوندی ڕووت دەکرد و ئاگریشی دەدا... ئەی ئێستا؟... ئێمە لە خۆڕایی هەلّدەچین دایە، وا نییە؟... کەروێشك دەنگی لە کێو گۆڕیوە و کێوەکە هەر ئاگاشی لێ نییە. پێت وا نییە دایە عادیل ئەفەندی هەر ئاگاشی لەو شتانە هەبێ؟ وا نییە دایە؟...
مریەمۆك قسەی نەدەکرد، زاری هەلّنەدەپچڕی، بەلاّم لە دلّی خۆیدا وەلاّمی پرسیارەکانی عەلیی دەدایەوە:
"هەتیوە کەرە لێقەوماوەکەی من عەلی، چما خەلّك لە حەقی خۆیان خۆش دەبن؟... ئادەمیزاد هەموو دنیاشی هەبێ دیسان چاوی هەر تێر نابێ. عادیل دێ وەك هەلّۆ، وەك بارانی ئاگر بەسەر گوندەکەدا دەبارێ و گوندەکە ڕووت دەکاتەوە. هەر دەردە و دەرمانێکی هەیە، تەنانەت مەرگیش، بەلاّم ئەوە دەردی بێ دەرمانە. هەتیوە کەر و شێتەکەی من. ئاخ، خۆزگە زمانم گەڕابایە و قسەم کردبایە و بڕێکم ئەقلّ دەکردە ئەو مێشکە بۆشەتانەوە. خودا غەززەب لەوانە بگرێ وا زمانیان بەستم... عادیل دێ. چما دەکرێ لە حەقەکەی خۆی خۆش بێ. لە چاوەڕوانیدا وەختە بمرن. یەکێك نییە پێیان بلّێ چتان لێ

قەوماوە. ئەوەی دەبێ ببێ، هەر دەقەومێ و ناشتوانن پێشی بگرن، هەی خودا بتانگرێ، ئەوەی دەقەومێ، بۆ ئەوەندە بێئۆقرە چاوەڕوانین؟...

ـ وا نییە دایە؟ کابرایەکی ئەوەندە دەوڵەمەند بێ بۆچی دەبێ گوندێکی هەژار لەسەر ساجی عەلی دانێ؟ وانییە دایە؟...

"دایدەنێ، ڕووتی دەکا، واشی ڕووت دەکا... ڕووتی دەکا و لە خۆشییانیش هەڵدەفڕێ."

عەلی هەستا. کە ئەوەندەی لێ دەرِست و دایکی هەر وەڵامی نەدەدایەوە، خەریك بوو تووڕە دەبوو.

با و بۆرانەکە کردبوویە قیامەت. بە دەنگێکی سامناك، لە دەشتەوە بەرەو چیای تۆرووس بەڕێوە بوو. عەلی ساتێك بەدوودڵییەوە ڕاوەستا. دوایی بەخێرایی بەرەو دەرگا چوو و کردییەوە و وەدەر کەوت. بایەکە وای خۆی بە دەموچاویدا کێشا، وەخت بوو لە عەرزی بدا. بڕێك بەلادا هات و ئاخری خۆی کۆکردەوە و بەرەو ماڵی تاشباش غاری دا. لە کەلێنی تەختەکانی دەرگاکەوە ڕووناکای دیار بوو. بانگی هێشت:

ـ ئەمنم براله، مەمەد.

دەرگا کرایەوە.

لە تەنیشت ئاگردانەکەوە چوارمەشقی بەرەورووی یەك دانیشتن. دار بەڕووەکە لە کوانووەکەدا ببووە ئاگرێکی سوور. جاروبارە لە کولانکەوە بایەك لە ژوورێی دەکرد و سوورایی ئاگرەکەی دەبرد و دەیکردە بڵێسەیەکی سپی. دوایی، ئاگرەکە دادەمرکایەوە.

ماڵەکەی تاشباش هەر ژوورێکی هەبوو. کوانووەکەی(ئاگردان) گەورە بوو. سەر کوانووەکەیان بە قوڕ و قامیش گرتبوو. دیوارەکانیشیان بە قسڵ سپی کردبۆوە. دیوارەکانی ماڵەکەی ئەو وەك دیواری ماڵەکانی دیکە بە کەرسەك و وردکەبەردی نارێك و خوار و خێچ دروست نەکرابوو. لە تەختی ژوورەکەوە هەتا پێنج قولانج بە نەخش و نیگاری جۆراوجۆر ڕازێنرابۆوە. قورینگی باڵگرتوو، دار و درەختی چەماوەی بەر با، باخچەیەکی پڕ لە گوڵ، ئاسکەکێوی و ئەسپی ڕەویوە... تاشباش ئۆغڵو دنیایەکی لەسەر دیوارەکانی ماڵەکەی نەخشاندبوو...

لەسەر کوانووەکەشەوە، ڕێك لە نێوەڕاستەکەیەوە، وێنەیەکی مستەفا کەماڵ هەڵواسرابوو. کڵاوێکی چەرمیی لەسەرنابوو. برۆیەکانی بەرەو سەر بردبوو و حالەتێکی تەوساویی نەرم و نیان بە ڕوخسارییەوە بوو. تاشباش ئۆغڵو هەر جارێکی سەیری ئەو وێنەیەی دەکرد،

هەستێکی وەك بەزەیی تێدا دەگوورا. ئەو مستەفا کەماڵی پێ کابرایەکی باش بوو، جوامێر و ئازاش بوو. بڕێکیش قۆز بوو. باشە ئەو کابرایە بۆ وا بوو؟ زۆری زەحمەت کێشابوو و هەموو گیانی خۆی بە میللەتەکەی بەخشیبوو... زۆری کار کردبوو. زۆر کەند و کۆسپ و تەگەرەی سەر ڕێگەی لابردبوو، بەڵام کەمایەسییەکی هەبوو. شتێکی نەکردبوو. باشاری نەکردبوو. ئەگینا مەحاڵ بوو پیاو دانیشێ ئاوا نەرم و نیان گاڵتەی بە دنیا بێ... و کەسیش پێی نەزانێ.

تاشباش ئۆغلۆ سەیرێکی عەلیی کرد. خەم و خەفەت لە ڕوخساری دەباری. تاشباش لێی پرسی:

- چ بووە عەلی؟

تەوسێکی نەرم لە دەنگیدا هەبوو.

عەلی گوتی:

- خێرە شوکور...

ماوەیەك هەردووکیان چاویان بڕییە ئاگرەکەوە و قسەیان نەکرد. ئاخری عەلی دەستی پێ کرد:

- دەبێ تەگبیرێکی لێ بکەین. ئەو خەڵکە لە پەژارە و بێئۆقرەییدا وەختە دیق بکەن. هاتمە لات دەرمانێك بۆ ئەو دەردەی گوندییەکان بدۆزینەوە. ئەو عادیلە بەرازە تەنانەت نایە گوندەکەش ڕووت بکا. هاتمە لات بەیانی پێکەوە بچینە شار بۆلای عادیل. هەموو شتێکی بۆ باس بکەین و بڵێین یان هەر ئێستا وەرە و چیی هەمانە و نیمانە هەڵیگرە و بیبە یان دەست لەو قەرزەت ڕاگرە تا ساڵی داهاتوو دوای لۆکە ڕنینەوە. خۆ بێت و ئاوا بچێتە پێشێ گوندییەکان شتێك بەسەر خۆیان دێنن. گەنجەکان یاغی دەبن و پیرەکانیش لەگژ یەك ڕۆدەچن. گوندەکە دەشێوێ. هەر لە ئێستاوە دەستی پێ کردووە. دوێنێ پێشمان نەگرتبایە شەڕێك هەڵدابیسا مانگێکیش نەدەبڕایەوە. مەمەد براڵە، دەترسم. گوندەکەمان خەریکە تێدا دەچێ... ئەگەر ئەو عادیلە قەرارە بێ، با بێ. بچین و پێی بڵێین. دەڵێی چی؟

تاشباش بە زۆری خۆی قیت کردەوە. چاوی لە چاوەکانی عەلی بڕی. چاو ڕەشەکانی پڕ بوون لە خەم. لێوەکانی لەبەر یەك کشابوونەوە:

ــ ئەو گوندییانە دەڵێی؟ هەی دایك و خوشك و ژن و منداڵ و هەموو شتێکی ئەو گوندییانەت ب...م... تێگەیشتی براڵە، عەلی! بەخوا تەنانەت نووکی نینۆکیشم بۆ ئەو خەڵکە نابزوێنم. گووی خۆیانە با بیشێلن. لێیانگەڕێ با ملیان بشکێ و هەڵیگرنەوە. ئەو

گوندییانە ئەگەر بەقسەی منیان کردبایە و لـە زینـوێی سـویتلو لـە ڕووی کوێخـادا ڕاوەسـتابانەوە و نەچووبانە ئەو مەزرا وشك و برینگ و بـێ حاسـڵەی هەتیوەکـەی میرئـالای، ئـەو بەڵایـەیان بەسـەر نەدەهات. بڕۆ دەست هەڵگرە کاك عەلی، ئەمن هیچم لەدەست نایە بۆ ئەو خەڵکە. لێیان گـەڕێ بـا بتەقن و بمرن. لێیان گەڕێ با یەکتری بخۆن. ئەو گوندییە هیچ و پووچ و بێ ناموسانە... ئەمن خۆی تێوەرنادەم. ئەگـەر لـە دەسـتم بـێ تاقـە ڕۆژێکـیش لـەو گونـدەدا نامێنمـەوە. ئاخرییەکەشـی هـەر نامێنمەوە. هەر بەهار بێ، باردەکەم و دەچمە گونـدێکی دی. پیـاو لەمـەودوا نـاتوانێ لـەو دێیـەدا بژیێ. ئەمن خەرکم دەخنکێم. نازانم ئەتۆ چۆنی، بەڵام من...

هەتا کەڵەشێری نیوەشەوێ خوێندیان، ئیدی نە ئەو قسەی کرد و نە عەلییش.

چەند جارێکیان لە دوورەوە لە دەشتێ، دەنگێکی وەك تەقینەوەیان بیست و ڕاچەنین.

تاشباش ئۆغڵو هەر بۆی قووت نەدەچوو کە گوندییەکان بۆچی لای کوێخا دەگـرن. خـەریك بوو شێت دەبوو. وەرە پێنج شەش ساڵان زەحمەت بکێشە و هەموو فێڵ و گزەکانی سەفەر بێنـە و بۆیان لەقاو دە، دیسان هەر لای ئـەو بگـرن... باشـە ئـەوە چ کەرێتییەکـە، دەبـێ چ بـەڵا و نەهامەتییەکیان بەسەر بێ...

عەلی هەستا. لاقەکانی تەزیبوون. ماوەیەك نەیتوانی لەسەر عەرزیان دابنێ. لە شەلەشـەل بەرەو دەرگا ڕۆیی و گوتی:

- خوا سلامەتت کا براڵە. حەقتە. هێندەی عەرز و ئاسمان حەقتە.

تاشباش ئۆغڵو لە داخان خەریك بـوو شـێت بـێ. بێـت و زاری هەڵپـچڕیبایە هـەتا بـەیانی دەینەڕاند و ئەو گوندییانەی جنێوباران دەکرد. گوتی:

- بەخێرهاتی عەلی گیان. خـۆت نارەحـەت مەکـە. لێگـەڕێ نەوەنـدە پەتـە بکێـشن هـەتا دەپسێ.

و بەرۆکی عەلیی گرت و گوتی:

- ئاوا بچێتە پێشێ ئەمن شێت دەبم.

عەلی گوتی:

- دەغیلە براڵە، ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی؟

ئەو بۆرانەی لە دەشتکەوە هەڵیکردبوو، کێویتر ببوو. دەرگاکەی لە دەستی تاشباش دەرێنا و دایخستەوە. تاشباش دیسان دەرگاکەی کردەوە و گوتی:

- بەخێرهاتی عەلی گیان. خۆت نارەحەت مەکە. لێیانگەڕێ نەوەنـدە پەتەکـە بکێـشن تـا دەپسێ.

عەلی بەغاردان بەرەو ماڵەکەی ڕۆیشتەوە. ئەلیف لەبەر دەرگا بەپیرییەوە چوو. هەرکات نەهامەتییەك بەرۆکی دەگرتن ئەلیف ئاوا چاو لە دەرکێ و چاوەڕێی دەبوو. هەر دەستی عەلی وەدەرگاکە دەکەوت، دەرگای دەکردەوە و نیگایەکی سەیر و خەمبارانەی لێ دەکرد. عەلی کە لە پشت دەرگاوە دیتی دڵی داخورپا و پرسی:

- ها، چ بووە؟

و خۆی هاویشتە ژوورێ.

دیتی دایکی لە تەنیشت ئاگردانەکەوە ڕاکشاوە و لێفەکەی هەتا بن قورقوڕۆچکەی هەڵکێشاوە و چاوی لێك ناوەو تنۆکی ئارەقە لەسەر تەوێڵی نیشتووە.

- چ بووە؟...

- دەرگاکەی کردەوە و وەدەرکەوت. ئەمنیش پێم وابوو بەرەو بۆشایی دەڕوا. ئیدی هۆشم نەبوو. لەناکاو وەخۆ هاتمەوە دیتم چیی وای نەماوە ببێتە نیوەشەو و دایکم هێشتا نەگەڕاوەتەوە. بەخۆم گوت چی بووە؟ چۆتە کوێ؟ وەدەر کەوتم. لە دەرەوە با و بۆرانێك بوو بنیادەم خۆی بەسەر پێوە پێ نەدەگیرا. باو بۆرانەکە لە نێوەڕاستی گوندەکەدا وەك تۆپ دەتەقێتەوە. چوومە دەرێ و کوێ چۆڵ و هەر جێیەکی لەوانەبوو ئەو ڕووی تێبکا گەڕام. نەمدییەوە. حەسەنم ئاگادار کردەوە. ئۆمەخانیش لەگەڵمان هات. کەوتینە ڕێ بە نێو دێدا. ئێرە و ئەوێ هەموو ئاواییمان سەنگ و سووژن دا. دوایی لە دەروجیرانمان پرسی. لە هیچ کوێ سۆراغی نەبوو. لە ناکاو بەبیرمدا هات نەکا ئەو پیرەژنە لە گوند ڕایکردبێ؟ وەڕێکەوتم و بەرەو ڕێگەی شاری ڕۆیشتم. کە گەیشتمێ، تارماییەکم دی دەجووڵێ. دیم لەسەر بەفرەکە و لە تەنیشت ڕەوەزەکە دانیشتووە و کرووشمەی کردووە. گوتم:"دایە". دەنگی نەهات. یەك دوو جاران بانگم کرد هەر جوابی نەبوو. لە تەنیشتی دانیشتم. دیم خۆی گرمۆڵەکردووە و هەڵدەلەرزێ. بەکۆڵم دادا و هێنامەوە.

عەلی لە تەنیشت دایکی دانیشت و دەستی لە نێوان دەستەکانی نا و گوتی:

- خودا نەکا دایە، خودا نەکا.

ئەوجار ڕووی لە ژنەکەی کرد و گوتی:

- ئەلیف خێرا ترخێنەیەك وەسەر ئاگرەکە بنێ. بیخوا باشتر دەبێ.

مرێمۆك کە ئەو قسەیەی بیست، لەسەرخۆ ناڵاندی و سووڕایە سەر باسکی ڕاستەی.

## ١٧

باو بۆرانەکەی شەوێ ئاسەواری نەمابۆوە. ڕۆژێکی تاو و ساو و خۆش بوو. بەفرە بەستووەکە وا دەدرەوشاوە سۆمای چاوی دەبرد. تاقە دارە دوورەکە لە نێوەڕاستی دەشتەکەوە ئەوەندە نزیك دیار بوو دەتگوت دەستی بۆ بەری وێی دەکەوێ. بەفرە سەهۆڵینەکەی سەر لکوپۆپەکانی دەتگوت لەسەر پێن بۆوەی بە سروەیەك بڕژێنەخوارێ. هەوا ئەوەندە نیان و خۆش بوو لە ڕۆژە پڕ گوڵەکانی نێوەڕاستی بەهار دەچوو. دەتگوت هێندەی نەماوە بەهار بە هەموو خونچەکانییەوە دەکرەوێ و بەفر و بەستەڵەکی سەر زەوی ڕادا و ڕامالێ.

حەسەن لێو بە پێکەنین لە ماڵێ هاتە دەرێ. دەلینگی پانتۆڵەکەی هەتا ئەژنۆی هەڵکردبوون و تەورە بچووکەکەی و پەتێکی پێ بوو. دایکی گوتی:

- لە دەورت گەڕێم حەسەنی خۆم. ئەوجارەیان دار و پووشکەی ئەستوور بێنە. چرپییەکانی جاری دیت، هەر لە ئاگردانت داویشتن، دەسووتان.

ئۆمەخان گوتی:

ئەمنیش حەز دەکەم بچم.

حەسەن گوتی:

- لاچۆ، لەگەڵ من مەیە، لەگەڵ هەر کەس دەچی بچۆ. خۆ ڕێی لێڕەواریان لێ نەگرتووی.

ئۆمەخان لە دەنگێکی گریاناوی، چڵمی هەڵلووشییەوە و گوتی:

- دایە، ئەمن دەمەوێ لەگەڵ ئەو بچم. دەمەوێ لەگەڵ حەسەن بچم. ئەتۆ پێی بڵێ.

ئەلیف فەرماندەرانە گوتی:

- کچەکەش لەگەڵ خۆت بەرە. ئەویش کۆڵێك هەڵدەگرێ. چما خراپە؟ دوو کۆڵ چرپی دێننەوە.

حەسەن:

- دەیبەم، بەڵام نابێ زمانی بگەڕێ. ئەوەندەی لێ دەڕێسێ، مێشکی سەرم دەبا. نۆمەخان گوتی:

- زمانم ناگەڕێ.

وەڕێ کەوتن. لەگەڵ لە ماڵێ وەدەر کەوتن، منداڵی گوندییشیان ڕەگەڵ کەوتن. حەسەن لە ئەوی لە هەمووان گەورەتری پرسی:

- بۆ کوێ؟

کوڕە:

- دەچینە لێڕەواری بۆ پووشکە.

سێ منداڵی دیکەش کە ئەوانیان پێکەوە دیتبوو، کەوتنە گەڵیان. کە لە گوندی وەدەر دەکەوتن، ئاوڕێکیان دایەوە و سەیریان کرد هەموو منداڵی گوندییان وەدوو کەوتوون.

یەك منداڵیش قسەی نەدەکرد، بەڵام ئەوەندە خێرا دەڕۆیشتن دەتگوت دەعبای کێوی سەریان لە دوو ناون. کە گەیشتنە دارستانەکە، هەموو هانکەهانکیان بوو. هەر هەموویان پێخاوس بوون.

هێشتا پشوویان نەهاتبۆوە بەر، دەستیان کرد بە زۆرانبازی. کوڕەکان زۆرانییان دەگرت و کچەکانیش خۆشاردنەوەیان دەکرد.

هەر هەموویان بە تەور و گوریسەوە هاتبوون. پاش ئەوەی جوان جوان لە بەفرەکەدا تلانەوە و هەموو سەروچاویان هەڵمسا و تەواو ماندوو و شەکەت بوون، ئەوجار دەستیان کرد بە چرپی بڕین. وا لە دارستانەکە بەرببوون هیچیان بە دار و لکەکانییەوە نەدەهێشت. وەك ڕەوە کوللەیەك بە دارستانەکە وەربوون.

لە چاوتروکانێکا هەموو کۆڵی خۆیان تێك نا و لەسەر کۆڵەکانیان دانیشت و خەیاڵ بردنییەوە. لە نیوەڕۆ لایدابوو. لە ناکاو دووانیان پێك هەڵپڕژان. ئەوانی دیکە لێکیان نەکردنەوە. ماوەیەك هەر سەیریان کردن. ئەو جووتەش کە دیتیان کەس لێکیان ناکاتەوە، لەخۆوە لێك بوونەوە.

حەسەن چوو و دیسان لە پەنا ڕەوەزەکە ئاگرێکی کردەوە. هەر لەگەڵ کردنەوەی ئاگرەکە شقارتەکەی شاردەوە. منداڵەکان لەگەڵ حەسەن سەیری ئاگرەکەیان کرد و هیچیان نەدی. یەکێك لە منداڵەکان گوتی:

ـ جا ئەو ئاگرە چییە. نە ئەسپی تێدایە و نە ئاسك و نە مەزرای لۆکە...

ئەوانی دیکەش شانیان هەڵتەکاند و گوتیان:

ـ جا خۆ ئەو ئاگرە چیی تێدا نییە...

حەسەن بیری لەوە کردەوە کە باشە ئەو منداڵانە لە کوێ بەو شتەی ئەویان زانیوە و مۆڕەیەکی لە ئۆمەخان کرد.

ئۆمەخان گوتی:

ـ وەڵڵاهی ... ئەمن بە کەسم نەگوتووە...

قینەکەی خۆی خواردەوە و بەبێ ئەوەی وەسەرخۆی بێنێ، بە دەست و پێی ئاگرەکەی بڵاوکردەوە و دوایی بەبێ ئەوەی سەرنجی کەس ڕاکێشێ، هەر وا کە بەگومانەوە سەیری دەوروپشتی خۆی دەکرد، وردە وردە بە بن ڕەوەزەکەدا خوشی. منداڵەکان بە وردی چاویان بەسەرییەوە بوو.

ئۆمەخانیش لە پشت دەرختێکەوە خۆی مات دابوو و چاوی لێ نەدەترووکاند.

حەسەن دەیزانی، بێ و نەبێ یەکێك لە منداڵەکان هەر دەیبینێ و شتێك بەسەر بەردەکەی دێنێ. بڕێك لە تەنیشت بەردەکە ڕاوەستا. پێویست نەبوو هەر ئەمڕۆ بچێ و بن بەردەکەی ببینێ. سبەینێ یان ڕۆژێکی دیکە دەیتوانی بەتەنێ بێ و سەیری بکا، بەڵام ئەوەندە کونجکۆڵ بوو کە بەبی سەیرکردنی بن بەردەکەی نەیدەتوانی بگەڕێتەوە. دوودڵییەکانی زۆری خایاند. ئاخرییەکەی بەخۆی گوت:"ئەگەر بشی بنیىنن، هیچ نابێ". ئەوانە کە بلێسەکان نابینن چووزانن بن بەردەکە چیی تێدایە؟ جگە لەوەش هەرکەسە و سەری بەکاری خۆیەوە خافڵاوە و سەیری ئەو هەر ناکەن... دیسان بە شك و گومانەوە سەیرێکی دەوروپشتی دەکرد و بەبن ڕەوەزەکەدا دەخوشی و بەرەو پێشەوە دەچوو.

ئەو منداڵانەی چاویان بەسەرییەوە بوو، متەقیان لە خۆیان بڕیبوو و بێ ئۆقەر دەیانەویست بزانن بۆ کوێ دەچێ. بەرەوپێش خزینەکەی حەسەن زۆری پێ چوو. ئاخرییەکەی بە ڕاکردن خۆی گەیاندە پشت ڕەوەزە گەورەکە. منداڵەکانیش بە دوایدا وەك فیشەکە شێتە دەرپەڕین و خۆیان گەیاندێ و لە پشت دارەکانەوە مات بوون.

حەسەن هەستا. سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و دوایی چووە بن ئەو ڕەوەزە بەردەی وەك سپیدار بەرز بوو. داهاتەوە و بەردێکی گەورەی بەرز کردەوە چاوی لە بنەکەی بڕی. نەیتوانی چاوی لێ بترووکێنێ و ماوەیەك وەك سیحر لێکراوێك وشك بوو. دوایی وەك شتێکی زۆر پیرۆز

لە جێی خۆی دابنێتەوە، بەردەکەی بە هێمنی و بەسپایی لەسەر جێیەکەی خۆی دانایەوە و بە ترس و دوودڵییەوە سەیری دەوروپشتی خۆی کرد و گورج لەوێ دوور کەوتەوە.

هەر لەوێ دوور کەوتەوە، منداڵەکان لە پشت دارە و دەوەنەکانەوە دەرپەڕین. یەکەم منداڵ کە گەیشتە لای بەردەکە، بە جۆش و خرۆشەوە بەردەکەی بەسپایی بەرز کردەوە. منداڵەکان وستەیان لە خۆیان بڕیبوو و چاوەڕێ بوون شتێك لە بن بەردەکەوە بێتە دەرێ. منداڵەکەی بەردەکەی هەڵێنا و چەقاندی. بەفری سەر بەردەکە ڕژایە خوارێ.

بن بەردەکە خاکێکی ڕەش بوو و ڕەگ و پنجی سپی و زەردباوی ڕەگی گیا. ڕەگێکی باریك بە گۆشەی بەردەکەوە نووسابوو و ڕاکشابوو. خاکە ڕەش و چەور و بەپیتەکە لۆچ ببوو.

منداڵەکان ماوەیەك بە چاوی زەقەوە سەیریان کرد. دوایی بەبێ ئەوەی بەردەکە لەسەر جێی خۆی دابنێنەوە هەر وا بەجێیان هێشت و وەشوێن کاری خۆیان کەوتن. خەیاڵێك مێشکی منداڵەکانی بەخۆوە خەریك کردبوو. ئاخۆ شتێك لە بن ئەو بەردەدا هەبوو کە ئەوان نەیاندەتوانی بیبینن؟

حەسەن لە دوورەوە سەیری کردبوون و دیتبوونی کە بەردەکەیان بەرز کردبۆوە و بە سەرسوورمانەوە سەیری ژێرەوەی دەکەن. هەر منداڵەکان لەبەردەکە دوور کەوتنەوە حەسەن هات و ماوەیەك لە تەنیشتی ڕاوەستا و سەیری خاکەکەی کرد، دوایی دەستی بەسەر بەرەکەدا هێنا و بەسپایی لە جێیەکەی خۆی دانایەوە.

منداڵەکانی دیکە دیسان ڕاوەستابوون و سەیری حەسەنیان دەکرد. حەسەن دوای ئەوەی بەردەکەی لەسەر جێی خۆی دانایەوە، لە تەنیشتی دانیشت و جووڵەی نەکرد.

منداڵەکان لە ناکاو دەستیان کرد بە قریوە و هەرا. حەسەن بەبیستنی دەنگ و هەراکە وەخۆ هاتەوە. منداڵەکان وەك شێتان هەڵدەبەزین و پێك هەڵدەپرووسکان و لەسەر بەفرەکە دەتلانەوە. وەك شێتانیان لێ هاتبوو. حەسەن هەستا و لە بەردەکەی دوور کەوتەوە. دەستی لە نێوقەدی نا و بە شڵەژاوییەوە سەیری کردن. منداڵەکان نزیك بە سەعاتێك هەر پێك هەڵپڕژان و زۆرانبازییان گرت. ئۆمەخانیش وەك ئەوان.

حەسەن لە دڵی خۆیدا گوتی:

- پێت دەڵێم پووتێك چەند کیلۆیە. ئەوە بێ ئەوەی پرسێك بەمن بکا لەگەڵ هەتیومەتیوی لەخۆی گەورەتردا یاری و گەمەی دەکا؟ دواییش لەگەڵ ئەوان دەکەوێ و چاودێریی من دەکا؟

حەسەن چۆوە دارستانەکە و کۆڵە پووشکەکەی هەڵگرت و بەبێ ئەوەی قسەیەك لەگەڵ یەکێکیان بکا، وەڕێ کەوت. نێوچاوانی گرژ کردبوو.

منداڵەکان کە دیتیان حەسەن وەڕێ کەوتووە، هاتنەوە لای باقە چرپییەکانیان و بەکۆڵیان دادا و وەڕێ کەوتن.

هەموو هەوڵەکەیان ئەوە بوو بگەنە حەسەن. بەغاردان خۆیان گەیاندێ.

"وی" کوڕیژگەیەکی ڕەش ئەسمەر و ڕەقەڵە و باریکەڵە بوو. دەتگوت لە هەموو شتێ دەترسێ. لە حەسەن چووە پێشێ و گوتی:

ـ دیتم، شتێی زۆر جوان بوو. چاوەکانی لە تیشك بوون. سەری شەپۆلی دەدا و ڕووناك بوو. کە منداڵەکانی دیکە هاتن، خۆی ون کرد. ئەدی، ئاوا بوو...

حەسەن لە تۆقی سەرییەوە تا بەری پێی سەیرێکی کرد. بزەیەکی هاتێ و ئاوڕی دایەوە.

"وەلی" زۆری پێ ناخۆش بوو گوتی:

ـ باشە بۆ تووڕەی کەللە کەر. ئەوە گووەکەی مرێمۆکە لاسار. بابیشت چۆك درێژێکە دەڵێی چنارە بەرەو ئاسمان هەڵچووە، چما پیاو هێندە درێژ دەبێ...

حەسەن هەنگاوی خۆشتر کرد. هەستی کردبوو بێت و لەگەڵ "وەلی" بەشەڕ بێ، ئەوانی دیکە تێی دەهاڵێن و مارکوژی دەکەن. "وەلی"ش ئەوەی دەزانی، دەنا ئەو پیاوە نەبوو گەڕی لە گەڕی ئەو باڵێنێ.

"وەلی" لە دواوە خۆی گەیاندێ و بە دەنگێکی ترسنۆکانەوە گوتی:

ـ ببوورە هاوڕێ. پێم وابوو ئەتۆ دەتەوێ بڵێی ئەمن لە بن بەردەکە نەمدیوە..، بەڵام من دیتم... وا نییە؟

حەسەن جوابی نەداوە. "وەلی" گوتی:

ـ دەمەوێ پرسیارێکت لێ بکەم. ئەو کابرایەی لە شارە، پێت وایە دێ؟...

حەسەن ساتێك ڕاوەستا. چاوێکی ئاگراویی لێ کرد. "وەلی" سەری داخست. حەسەن بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ ئەرێوەڵڵا، دێ، دێ و گوندەکە دەسووتێنێ....

و گورج وەڕێ کەوتەوە. دیسان لە ناکاو ڕاوەستایەوە و گوێی هەڵخست. لە گوندەوە دەنگێکی سەیر دەهات. دەتگوت خەریکن هەموو خەڵکەکەی ئاوایی سەر دەبڕن. دەنگی ناڵین و شین و هاوار دەهات.

"وەلی" گوتی:

ـ ئەو کابرایە هاتووە حەسەن. خەریکە سەری هەموو گوندەکە دەبڕێ.

هەموو منداڵەکان یەکدەنگ هاواریان کرد.

ـ هاتووە، هاتووە...

وەك مێگەلە مەڕ سەریان لەبەر یەك نا. کۆڵەکانیان داگرت و لەسەری دانیشتن.

هەست و خوستیان لە خۆیان بڕیبوو و گوێیان لەو دەنگانە هەڵخستبوو کە لە ئاواییەوە دەهاتن.

خۆر لە ئاسۆی ڕۆژئاواوە بەرەو ئەودیوی چیا دادەگەڕا. چیا پڕ لە بەفرەکە وا دەدرەوشایەوە سۆمای چاوی دەبرد. بایەکی سارد و تیژ لە دەشتەکەوە هەڵیکردبوو و وردە وردە توندتری دەکرد.

منداڵەکان نە قسەیەکیان دەکرد و نە دەشجووڵان و جاربەجار پتر پاڵیان وێك دەدا. لە ناکاو دەنگەدەنگەکەی ئاوایی بڕایەوە و بێدەنگییەکی سامناك باڵی بەسەر وڵاتدا کێشا.

منداڵەکان نەیاندەتوانی سەیری یەکتری بکەن. "وەلی" لە بن لێوەوە گوتی:

ـ هەر هەموویانیان کوشت. وانییە حەسەن؟...

حەسەن ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ کوشتیانن. هەموویانیان کوشت.

## ١٨

هەروا بێ هەست و خوست دانیشتبوون. ڕۆژ ئاوا ببوو و سەرمایەك هەڵیكردبوو تفت هەڵاویشتبا دەیبەست. تا زیاتر سەرمایان دەبوو زیاتر خۆیان وێك دێنا و خۆیان پتر پێكەوە دەنووساند. گوێیان هەڵخستبوو. بچووكترین دەنگ هاتبایە دەیانبیست، بەڵام بێدەنگییەكی دوور لە باوەڕ بەسەر گوندەكەدا زاڵ بوو.

كوڕەكەی "حەمەچكۆل" گوتی:

ـ ئەمن ئەوە دەڕۆم. با بمكوژن. كوڕە خۆ لەسەرمان مردم. هەركەس پێی خۆشە لەگەڵم بێ.

ماوەیەك ڕاوەستا و دیتی كەس نابزوێ. ئەمجارەیان بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ هەركەس پێی خۆشە لەگەڵم بێ.

ـ كەس نایەوێ بێ؟

پێی بەعەرزدا دا و گورج بەرەو ئاوایی وەڕێ كەوت. كە گەلی منداڵان بەجێ مان و لێی ئەدیو بوون، ترس و خورپەیەك لە دڵی گەڕا و لە جێی خۆی وشك بوو، بەڵام وردە وردە دەست و پێ و هەموو گیانی خەریك بوو كەسیرە دەبوو. ددانەكانی لەسەرمان وێك دەكەوتن و شەققەیان دەهات. لەناكاو شەقەشەقی ددان لە هەموو لاوە هات. هەموان خەریك بوون لەسەرمان ڕەق دەبوون.

كۆمەڵێك دیمەنی سامناك دەهاتنە بەرچاویان. حەسەن كەلاكی ئەسپێكی دەدی. سەگەلێك كە سەرتاپێیان خوێناوی بوو ئەو كەلاكەیان لەتوپەت دەكرد. دوایی لەسەر شیناوەردەكە تەنیا پەڵەی سووری خوێن و ئێسكی سپی بەجێ دەما.

"وەلی"یش كاژەڵاكە سەری دەدی كە ددانە سپییەكانی زەق دەرپەڕیبوون.

منداڵەكان سات بە سات بە دنیایەكی تاریك و سامناكدا ڕۆدەچوون.

"دورمووش" تەمەنی یازدە ساڵ بوو. قژە تەنك و زەردەکەی قرژ ببۆوە. چاوە شینە مەیلەوسەوزەکانی وەك شووشەیەك بەمۆڵەق وەستابوون. کە لە دوورەوە سەیرت دەکرد، هەر نێوشانە پانەکەی ئەو دیار بوو.

لە جێی خۆی دەرپەڕی و پێی بە بەفرەکەدا دا و گوراندی:

ـ ئەمن دەمەوێ ئاگر بکەمەوە. ئەگەر پێیان خۆشە با بێنە ئێرە. بێن بمانبینن خەریکە دەمرین لەسەرمان. خەریکە دەمرین. هەتا بەیانی هەموومان لێرە ڕەق هەڵدێین.

حەسەن هەستا و گوتی:

ـ وا باشترە بگەڕێینەوە و بچینەوە نێو دارستانەکە. لە پشت ڕەوەزەکانەوە ئاگر بکەینەوە. لەوێ کەس نامانبینێ. پووشکەش زۆرە.

ئۆمەخان و کچەکانی دیکە گوتیان: پووشکەش زۆرە.

ئیدی کەس قسەی نەکرد. گەلی منداڵان دانیان بە جەرگیاندا گرت و بە پێی پێخاوس بەسەر بەفرە بەستووەکەدا، بەرەو ڕووەو با سارد و تیژەکەی دەشتێ، بەرەو دواوە گەڕانەوە و ڕووە و دارستانەکە غاریان دا.

هەر لەگەڵ گەیشتنە دارستانەکە دورموش گوتی:

ـ حەسەن شقارتەکەت دەربێنە و لێرە لە نێوەڕاستی ئەو بەردانەدا، لەو قوولکەیەدا با ئاگرەکە بکەینەوە. "با"ش نایگرێ. یاڵڵا منداڵینە دەی بێکار ڕامەوەستن. بچن و ویشکەڵ کۆ کەنەوە. با زۆر وشك بن. پەلە بکەن.

شقارتەکەی لە حەسەن وەرگرت. دووسێ وشکەڵی لە دارەکە شکاندەوە. خولێکی بە دەوری ڕەوەزەکەدا لێدا و گەیشتەوە سەر قوولکەکە. با لە هەر لایەکەوە هەڵیکردبایە، ئەوێی نەدەگرتەوە. دورمووش بانگی کرد: خێرا بن.

لە ناکاو لە هەموو لایەکەوە، بارانێك لە چڵ پۆپە وشکەکانەوە بەسەر ئەو شوێنە گچکەیەی نێوەڕاستی ڕەوەزەکاندا دایکرد. دورمووش دەستەچیلەکەی* ئاگر دا. ئاگرەکە

---

* دەستەچیلە: ئەو پووشە ناسکەی زوو گڕ دەگرێ، بۆیە وەبن دارە ئەستوورەکانی هەڵدەدەن بۆوەی ئەوانی پێوە بگرێن. هەژار لە وەرگێڕانەکەی خەیامدا دەفەرموێ:

....زۆر وشکی دەبی بە دەستەچیلەی ئاگر.... فەرموو وەرە مەیخانە دەمێ تەڕ ببەوە

بڵێسەی سەند. پووشکەیەکی زۆریان لە سەر دانا. بەفرەکەی سەر چرپییەکان قرچەی دەهات و دەتوایەوە.

منداڵەکان لەسەر بەفری دەوری ئاگرەکە کۆزیلکەیان کردبوو و جار بەجار پتر لە ئاگرەکە دەچوونە پێش. وردە وردە گەرم دەبوونەوە و خوێنی دەست و پێ سڕ و کەسیرەکانیان دەکەوتەوە گەڕ. هیچ کامیان، لە ژیانیدا بەشەوێکی زستان لە نێو بەفرێدا نەمابۆوە.

ئەو ترسەی لە هەناوی وەلی"دا بوو، هەر دەهات و پتر دەبوو، بەڵام نەشیدەویست وەسەرخۆی بێنێ. دوایی هەستی کرد خەریکە دەخنکێ. نەیگوتبا شێت دەبوو. لەناکاو تەقییەوە:

- ئەگەر ئێستا گورگ بێن هەموومان بخۆن؟...

حەسەن بەدەنگێکی گڕەوە گوتی:

- گورگ ناوێرن لە ئاگرێ بچنە پێشێ.

"وەلی" هەر دەیگوتەوە:

- دەوێرن...

هەموو منداڵەکان یەکدەنگ هاواریان کرد:

- ناوێرن.

"وەلی" ترسا و بێدەنگ بوو. هەر قسەی کردبا، بەهەمووان دایدەگژانێ.

ئەگەرچی یەکدەنگ گوتبوویان:"ناوێرن"، بەڵام لەهەمانکاتیشدا ترسابووشن... هەمووان لە ناخیاندا چاوەڕێ بوون. چاوەڕێی هاتنی گورگ. ماوەیەك چاویان لە ئاگرەکە بڕی و بێ دەگ بوون. کە پووشکەکان تەواو بوو، بێدەنگ و مات هەستان و پووشکەیان کۆ کردەوە لە لایەکەوە هێندەی ڕەوەزەکەیان پووشکە هەڵدایەوە. هەرکات ئاگرەکە دەهات دامرکێتەوە، یەکێکیان هەڵدەستا و باوەشێکی پووشکە دەخستە سەری، بەڵام هیچیان قسەیان نەدەکرد. ترس و تەنیاییەکی وەك یەك، لە ناخی هەمووان دابوو.

لەبەر چاوەکانی حەسەن، لە نێو بڵێسەکانەوە پۆلی مامز و دوایی ڕەوە ئەسپێك دەرپەڕین. حەزی دەکرد پێشانی منداڵەکانیان بدا، بەڵام سەیری کرد کاتی نییە... تەنانەت سەیریشیان کردبایە هەر نەیاندەدی و دیتباشیان گوێیان نەدەدایە.

"گورگەکان پەلامارمان هەر دەدەن. دەڵێن گورگ گۆشتی منداڵی زۆر پێ خۆشە. گەورەکان وا دەڵێن." چاوەکانی بە ڕووناکییەکە ڕاهاتبوو. کە ئاوڕی دەدایەوە و سەیری دواوەی دەکرد، لەسەر

ڕەوەزەکەوە کۆمەڵێك سێبەری بەجووڵەی دەبینی. لە تاریکاییەکەشدا ڕەوە گورگێکی دەدی کە زاریان داپچڕیبوو و کۆمەڵێك پیاوی چەکداریش بە دووی گورگەکانەوە بوون... حەسەن جارەنەجارێك ئاوڕی دەدایەوە و سەیری دواوەی دەکرد. منداڵەکانی دیکەش هەر وایان دەکرد.

لە ناکاو منداڵێك لەجێی خۆی دەرپەڕی:

- ئەها هاتن... گوێتان لێبوو؟...

- هەموو قوت بوونەوە. لە پەنای ڕەوەزەکەوە کۆبوونەوە. هانکەهانکیان بوو و گوێیان لە ترپەی دڵی یەکتری دەبوو.

یەك دوو منداڵ دایانە گریان. دوایی هەمووان پێکەوە گریان. دەنگەکان وردەوردە نزیکتر دەبوونەوە.

بیستنی دەنگی بنیادەم برێکی ئەهوەن و دڵنیا کردبوونەوە. گریانەکانیان کەمتر بۆوە. ئێستا هێندێکیان لەگریان کەوتبوون و خەریکبوون چڵمیان هەڵدەلووشی.

لە ناکاو لەودیو ڕەوەزەکەوە دەنگێکی ڕوونیان گوێ لێ بوو:

- منداڵینە...

منداڵ دەمودەست دەنگەکەیان ناسییەوە. دەنگی "دوردومان" بوو. لەگەڵ بیستنی دەنگی ئاشنا دیسان لووشمە لووشمی گریانیان دەستی پێ کردەوە.

دوایی دەنگی "عەلی"یە درێژ و بە دوای ئەواندا دەنگی بەکرەشێت و عوسمانۆك هات. و ئەوجار هەموو دەنگەکان تێکەڵ بوون.

قریوەی خۆشی و شادی هەستا و منداڵەکان خۆیان خستە ئامێزی باوکیانەوە.

لە ناکاو بێدەنگییەك زاڵ بوو. گوندییەکان هاتن و لە دەوری ئەو ئاگرەی منداڵەکان کردبوویانەوە، کۆزیلکەیان بەست و جگەرەیان داگیرساند.

گەرم بوونەوە. کەس لە منداڵەکانی نەپرسی بۆچی تا ئێستا لەوێ ماونەتەوە. منداڵەکانیش نەیانگوت و ئاخرییش هەر نەیانزانی ئەو شەوە منداڵەکانیان بۆ لەو دارستانەدا مابوونەوە.

هەر منداڵە و بیانوویەکی هێنایەوە. زۆربەیان بیانووەکەیان دەبردەوە سەر ئەو بەردەی حەسەن هەڵیهێنابوو و سەیری بنەکەی کردبوو. مەسەلەی ئەو بەردە لە پێشدا "وەلی" و لەوانەشە ڕەمەزان هێنابێیە گۆڕێ. لەوانەشە منداڵێکی دیکە، بەڵام هەر هەموو منداڵەکان ئەوەی کە دەیانگوت لە بن بەردەکەدا دیتوویانە، وەك بیانوویەکی ڕزگاریدەر هەر باسیان کرد و وەلایان نەنا.

## ١٩

هێشتا تاو هەڵنەهاتبوو. دایکی وەلی بەسەر کوڕەکەیدا نوشتابۆوە و بەسەرسووڕماوییەوە چاوی زەق ببوونەوە.

ـ بەردەکەی هەڵێنا.. ئەها، هەر بەراست، حەسەن بەر لەوەی بەرەو بەردەکە بچێ بە جوانی سەیرێکی دەوروپشتی خۆی کرد بۆوەی بزانێ کەس ئاگای لێیەتی یان نا؟ لەو کاتەوە گەیشتبووینە دارستانەکە لەو حەسەن بە گومان بووم. حەسەن شتێکی لەبن سەریدا بوو. ڕۆیی ڕۆیی هەتا گەیشتە بەن ڕەوەزەکە و ڕاوەستا. سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و ئەوجار داهاتەوە و بەردەکەی هەڵێنایەوە. چاوێکی لە ژێرەکەی کرد و دەسبەجێ لە جێی خۆی دانایەوە و لەوێ دوور کەوتەوە. دوایی ئەمن چووم و بەردەکەم بەرز کردەوە. لەپڕ تیشکێك لەبەر چاوم درەوشایەوە. چاوم هیچ کوێی نەدی.

هاتم و بۆ منداڵەکانم گێڕایەوە. منداڵەکانیش چوون و دیتیان. هەرکامە و شتێکیان لەبن بەردەکەدا دی... دیار بوو بازاڕێکی زێڕ لە بن بەردەکەدا هەیە و ئەو بەردەش لە سەر دوو ڕێیانێکە و دەچێتەوە سەر بازاڕە زێڕەکە. ئەمن نەمتوانی دەرگاکە ببینم. چون لەگەڵ بەرزکردنەوەی بەردەکە تۆپەڵێك تیشك هات و بە بەر چاومدا بڵاو بۆوە و ئەمنیش هیچم پێ نەبینرا... ئێمەش گومان با هەتا بەیانی دانیشین و چاوەڕێ بین بزانین کێ لە بن ئەو بەردە دێتە دەرێ. ئەگەر نەهاتبایەن و ئێمەیان نەدۆزیباوە بە دڵنیاییەوە بنیادەمەکانمان دەبینی."

ژنەکە بەر لەوەی ترخێنەکە وەسەر ئاگرەکە بنێ لە ماڵێ وەدەر کەوت و بەرەو دارستانەکە وەڕێ کەوت. کە لە ڕەوەزە بەرزەکە نزیك بۆوە سەیری کرد زۆربەی ژن و پیاوەکانی ئاوایی لەوێ کۆ بوونەتەوە. تەنانەت منداڵێکیشی لێ نەبوو.

بە هەڵەداوان دڕی بە حەشیمەتەکە دا و گەیشتە سەر ئەو قوولکەیەی کرد کە پێی وابوو شوێنی بەردەکەیە و سەیری کرد. دیتی نە بەردێکی لێیە و نە هیچ شتێکی دیکە. تەنیا لە نێو سپایی بەفرەکەدا پەڵەیەك خاکی ڕەشی چین چین دەبینرا و کەسیش چاوی لێ نەدەترووکاند.

لەو ژنانەی پرسی وا لە دەوروبەری بوون:

ـ کوا؟

گوتیان:

ـ ئەوەتا، خۆ کوێر نی.

ژنە بە وردی سەیری کرد و پرسیی:

ـ ئەوە جێی بەردەکەیە، ئەی کوا بەردەکە؟

بڕێك لەولاترەوە تەنیشت ڕەوەزە بەرزەکەیان نیشان دا:

ـ هۆ لەوێیە.

ژنە بەرەو لای بەردەکە ڕۆیشت و داهاتەوە و لەسەرەخۆ دەستێکی پێداهێنا و لە هەموو لایەکی ورد بۆوە و نێوچاوانی تێك نا و پرسیی:

ـ جا دڵنیان هەر ئەوەیە؟...و هەستا:

ـ کێ ئەو بەردەی هێناوە و لێرەی فڕێ داوە؟ گوناحە. چووزانن نهێنییەك لەو بەردەدا نییە؟ لەوانەیە چاوی ئێمە نەیبینێ، بەڵام منداڵەکان دەیبینن، ئێمە نایبینین. منداڵ وەك فریشت پاکن. هەر بۆیەشە دەتوانن ببینن. ئەمن ئەو بەردەم پێ هەڵناگیرێ. وەرن، وەرن هەڵیگرین و بیبەینەوە سەر جێیەکەی خۆی. خێراکەن، ئامانە، نەکا بەڵایەکمان بەسەر بێنێ. چما ئەنگۆ شێت بوونە؟

ژنەکان ترسان. دەسبەجێ بە هانایەوە چوون. بەسپایی بەردەکەیان هەڵێنا و بردیان و لەسەرخۆ لەسەر جێیەکەی خۆیانیان دانا.

ڕاستە بەردەکەیان گەڕاندبۆوە سەر جێیەکەی خۆی، بەڵام دیسان نەیاندتوانی چاوی لێ بترووکێنن. چاوەڕوانیی شتێکیان لە بەردەکە هەبوو. دەیانویست تیشکێك ببینن.

مریەمۆك لە دواوەی ژنەکانەوە مابۆوە. خۆی دابووە سەر دارەدەستەکەی و سەیری شوێنی بەردەکە و هەڵسوکەوت و حاڵاتی ژنەکانی دەکرد. ژنەکانی لادا و خۆی گەیاندە نزیك بەردەکە. یەك دوو جاران بە دارەکەی لە بەردەکەی کوتا. بزەیەکی دەهاتێ و هێندێ شتی لە بن لێوەوە دەگوت. ژنەکان گوێیان دایە بۆوەی بزانن چیی لێ تێدەگەن:

"ئای حەسەن، حەسەنە شتۆکەی خۆم، حەسەن ئازاکەی خۆم، ئەو هەمیشە گەمە بە بەرد و باڵندە و زەردەواڵەکان دەکا و ئەو گوندییە گەمژانەش تێ ناگەن."

بەڵام کەس گوێی لە قسەی ئەو نەبوو.

مریێمۆك دوای ئەوەی دوو سێ جاری دیکەش بە بزەبز نووکی دارەکەی لە بەردەکە کوتا، گەڕایەوە و بەرەو ئاوایی کەوتە ڕێ.

لە ناکاو دەنگەدەنگێك لە خەڵکەکەوە هەستا، هەر وا کە بەرەو ئاوایی کەوتبوونەوە ڕێ، بە دەنگی بەرز . یەکتریان دەدواند. هەرکەسە و شتێکی دەگوت.

گەیشتبوونەوە قەراغ ئاوایی، دوو ژن لێیان بوو بەشەڕ. چیی وای نەمابوو لە دوێنێش قەباحەتتر بقەومێ، بەڵام ئەمڕۆ ژنەکان نەیاندەویست تووشی شەڕ بن. لەوانەشە لە شەڕ تێر بووبن. هەر جۆرە شەکەتی و وەڕەزییەکیان پێوە دیار بوو.

دوێنێ کە کچەکەی خدر لە کانییەوە دەگەڕایەوە، دەسکی گۆزەکەی شکا و لە دەستی بەربۆوە و وورد و خاش بوو. خێزانەکەی مەحموود دیتی و گوتی:"وەیش، حەیف بۆ ئەو گۆزە جوانە." کچەی خاوەن گۆزە هەڵچووبوو و ژنەی جنێوباران کرد. ژنەش وەڵامی دایەوە و دەستیان لە تیتکی یەکتری نا و تێك بەربوون. لەو کاتەدا ئەو ژنانەی خزم و کەسی کچە بوون لەسەریان کردەوە. ژنەکانی خزم و کەسی ژنەکەش لەسەر ئەویان کردەوە و بە دوای ئەواندا مێردەکانیشان تێوەگلان. گوندەکە شێوا و بوو بە شەڕێك سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسییەوە و هەتا ئێوارێ خۆیان ماندوو شەکەت نەبوون هەر لێك نەبوونەوە. زۆربەی خەڵکەکە بریندار ببوون. کەس نەمابوو لانیکەم شوێنێکی دانەڕووشابێ. ئەو دەنگ و هەڵڵایەی ڕۆژی ڕابردوو منداڵەکان بیستبوویان، هی ئەو شەڕە بوو...

کە ژنەکان گەیشتەنەوە نزیك ئاوایی، هەر لەوێ ڕاوەستان. کەسیان پێی خۆش نەبوو بچێتەوە نێو ئاواییەکە، بەڵام چییان پێ دەکرا؟ لەوێ لە نزیك ئاوایی برێك بە دەنگی بەرز نەڕاندیان و دەمەقاڵەیان کرد و دوایی لێك جویێ بوونەوە و هەرکەسە و چۆوە ماڵی خۆی.

"هەیە، هەیە، لەو بن بەردە بێ و نەبێ شتێکی لێیە."

سەدا نەوەدی ژنەکان کە گەیشتنەوە ماڵەوە، باوەڕیان وابوو.

دایکی وەلی بانگی کوڕەکەی کرد و بە خۆشحاڵییەوە گوتی:

ــ نەیاندی، کەس دەرگا زێڕینەکەی بن بەردەکەی نەدی. لێگەڕێ باکەفوکوڵەکە دامرکێتەوە، شەوێکیان بەبێ دەنگییەوە بۆخۆمان پێکەوە دەچین. بەردەکە هەڵدەگرین و دەرگا زێڕینەکە دەدۆزینەوە.

"وەلی" کە چاوی لە خۆشیان دەبریسکانەوە گوتی:"دەیدۆزینەوە."

مەسەلەی دەرگا زێڕینەکە دەمودەست هەموو گوندەکەی تەنیبۆوە و هەرکەسە و خۆی ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی لەنیوەشەوێدا دەستی کوڕەکەی خۆی بگرێ و بۆ دیتنی بچێتە لێڕەوار و نەشهێڵێ کەس بزانێ، بەڵام ڕووداوێك هاتە پێشێ کە دەرفەتی ئەو کارەیان نەما. دەرگا زێڕینەکە دوی چەند ڕۆژێك لە بیر چۆوە و کەس لەبیری نەما. ئیدی کەس تەنانەت هەر باسی ئەو بەردەشی نەکردەوە کە لە دارستانەکەدا بوو. بەردەکە و دەرگا و دارستانەکە بوونە ئەفسانە. تەنیا یەك نەفەر مەسەلەی بەردەکەی لەبیر نەچۆوە لە خەیاڵەکەی ناخی خۆیدا پاراستی. هەرکات بیری لە بەردەکە دەکردەوە، خۆشییەکی بەچێژ وەك هەوای بەهاران ناخی دەتەنی، ئەو کەسەش حەسەن بوو.

## ٢٠

تاشباش نۆغڵو خەریك بوو لە داخان شێت دەبــوو. ژنەکـەی لـە شـەڕەکەی ڕۆژی پێـشوودا سـەری شکابوو. ژنەکەی لە "تا"دا چەقوچۆی بوو.

ترسێك کەوتبووە دڵی تاشباشەوە. نەکا ژنەکەی بمرێ. ئەدی ئـەو کەرتکـە منداڵـەی چ لـێ کردبا. دیارە دیسان ژنی دێنایەوە، بەڵام کێ وەك دایکی منداڵەکان ئاگای لێیان دەبوو. کـەس جێی دایك ناگرێتەوە. چووبوو بانگی مرێمۆکی کردبـوو مەڵحـەمێکی بـۆ دروسـت بکـا. "ئـەو پیرەژنە خودا غەززەب لێگرتووەش خۆ قسە ناکا. ناڵێ ئاخری چاك دەبێتەوە یان دەمـرێ..." لە داخان خەریك بوو شێت دەبوو. دەتگوت ئەوەی ئەو گوندییانـە تـا ئێـستا کردبوویـان بـەس نەبوو، شەڕیشیان دەکرد و یەکتریشیان شڕ و شپڕێو دەکرد.

"وەڵڵاهی مرێمۆکیش چاك دەکا. ئەو گوندییانە، ئـەو خەڵکـە گەمژەیـە ئـی وەی نـین بیانـدوێنی. کەوتنە شوێن سەفەر... بە گیانی ناخێریان بەڵێنیشیان دابوو دیـسانیش هـەر چوونەوە وەدووی قـوونی وی کەوتنـەوە... سـەفەریش وەدووی خـۆی دان بردنـی بـۆ ئـەو مـەزرا وشـك و بـێ بەرهەمـە. هـەر قۆزاخەیەکیش چییە دەستیان نەکەوت قـەرز و قۆڵـەی خۆیـانی پـێ بدەنـەوە. دوایـی قـەرزەکانیان پـێ نەدرایەوە و ئاوایان بەسەر هات. ئاخ گوندییە گەمژەکان، ئەوە سەفەرە تووشی ئـەو بەڵایـەی کـردوون و لەسەر زگی ئێوە دەڵـەوەڕێ. ئێـستاش هـەر لێـی نابنـەوە. ئـەنگۆ لۆکـەی دەچـننەوە و ئـەو کـەیف و ئەهەنگی خۆی پێوە دەکا. هەی گەمژەینە، هەی ئەو کەسانەی پێتان ئەناوەتە کۆڵانی ئەقڵەوە.

"نەنە مرێمۆك، برینی سەری دایکی منداڵەکان چۆنە؟

مرێمۆك سـەرێکی لەقاند. یانی:"باشە، نایکوژێ."

جاربەجار دەچووە سەر ئاگردانە دووکەڵاوییەکەوە و شێکی دەخستە نێو قابڵەمە ڕەشـەکەی سەری کە تـەنك ببـووەوە و سـوورایی مـسەکەی وەدەرکـەوتبوو، یـان لێـی دەردێنـا. تەنیـشت

ئاگردانەکە جێگەی نوێن و بانەکە بوو و گۆنییەکانیش بە بەر نوێنەکانەوە بوون. لە لای ڕاستەوە تەبەکی نانەکە هەڵواسرابوو. بەری ڕاستی ئاگردانەکەش ئاوردووی لێ هەڵچنرابوو. ئاگردانەکە دەتگوت سینییەکی گەورەی خۆڵەمێشە.

ئاگردانەکە نێڵەی دەهات و سێ منداڵەکەی تەنیشتی، لە گۆشەیەکەوە کرووشمەیان کردبوو و دانیشتبوون. خەفەت و پەژارەی برینداربوونەکەی دایکیان بە نێوچاوانەوە بوو.

دەرگایەك ماڵەکەی دەکردە دووبەش. لای ئاگردانەکە ماڵەکە بوو و لایەکی دیکەشی ئاخوڕ. دوو گامێش و پانێر* و نێنگوین**ێك و دوو جوانەگا و دوو بزن لە لایەکەوە و لە گۆشەیەکیشەوە هێلانەی مریشکەکانی لێ بوو و ڕێك ڕووبەڕووی دەرگاکەش لۆدە کایەك هەڵدرابۆوە.

"دەبێ بچمە لێڕەوار و بڕێك شوولی داران لێبکەمەوە و بیهێنم بۆ ئەو بزنانە. ئەگینا داماوانە لە برسانا پێڕادێن."

نێومالەکە بۆنی کا و هەڕنەهووت و بۆنی شتێکی وەك ئارەقەی ئاژەڵی لێ دەهات لەگەڵ بۆنی شیاکەی تازەی مانگا...

بۆنی بەهارانەی دارستانی کاژ لە قابلەمەکە هەڵدەستا. ئێستاش بۆنی ئەو مەڵحەمەی مرێمۆك لە هەزار و یەك درەخت و هەزار و یەك گوڵ کۆی کردبۆوە و لێکی دابوون و لەسەر ئاگردانەکەی دانابوو، لە سەرووی هەموو ئەوانەوە بوو:"خۆزگە ئەو بۆنە بەسەر دیوارەکان و پەنجەرەکان و بە بن میچە قورماوییەکەوە بنیشێ و قەت لانەچێ. هەزاران و هەزاران ساڵ بمێنێتەوە. ئەو بەفرەی دەبارێ، ئەو بایەی دەشنێتەوە، ئەو بۆنە لەگەڵ خۆی بەرێ..."

مرێمۆك قابلەمەکەی لەسەر ئاگردانەکە داگرت و لە تەنیشت جێی نەخۆشەکەوە داینا. مەڵحەمە داغەکەشی کە هەڵمی لێ هەڵدەستا، بە کەوچکێك لە پارچە جاوێکی هەڵسوی و دەسبەجێ لەسەر برینەکەی دانا. ژنەکە لە پێشدا هاوارێکی کرد و ڕاچڵەکی. دوایی ددانەکانی لەسەر یەك دانان و دەموچاوی وێك هێنا. هەموو ماسولکەکانی دەموچاوی وێك هاتن و هەروا مایەوە. بەناڵینەوە گوتی:"ئاورم گرت، وەی مردم."

---

* پانێر: گوێرەکەی نێری یەکساڵ تەمەن. گوێلپار....

** گوێلکی مێ پێی دەگوترێ نێنگوین. هی گامێش نێرەکەی پێی دەڵێن: کەڵێچە و مێیەکەی پێی دەگوترێ هێودرە.

تاشباش ئۆغلۆ گوتی:"نەنە مریەمۆك...."

هەستێکی شیرن و خۆش بە گیانی مریەمۆکدا گەڕا. "ئاخ تاشباشەکەی خۆم ئەگەر دەمتوانی زار هەڵپچڕم خوا بزانێ قسەی چەندە خۆشم لە ناخی دڵمەوە بۆ دەکردی. ئەو مەڵحەمە جگە لە خۆم، لەو کوێستانانەی تۆرووسدا کەس نازانێ سازی بکا. کەس جگە لە نەنە مریەمۆك ناتوانێ لە هەزاران گوڵ دەرمانێك دەرکێشێتە دەرەوە ڕۆڵە گیان. بەخوای برینی خەنجەری ژەهراویش بێ، نەنە مریەمۆکی تۆ چارەسەری دەکا. ئێمە لە ڕەچەڵەکی "ساری تانیشمان"ـین. ناسنی گیا و گوڵ و ئەو گژ و گیایانەی دەرمانی دەرد و برینانن، خودا بەو تۆرەمەیەی داوە. هیچ نیگەران مەبە تاشباش گیان، تاشباشە خۆشەویستەکەم، نەنە مریەمۆکت لەسەری گەڕێ. ئەدی تاشباش گیان، کوڕە ئاقڵەکەم، ئای بریا توانیبام دەم لێك کەمەوە ، جا دەتزانی چیها قسەی جوانم بۆ دەکردی."

ئەوجار هەستا، بەسۆز و ڕوخسارێکی گەشەوە و بە سەرلەقاندنێکەوە ماڵاوایی لە تاشباش کرد.

تاشباش گوتی:

- بەخوای دایە کاری چاك دەکەی ئەو گوندییانە نادوێنی. ئەو گوندییانە ئەوەی چاندبوویان هەڵیانگرتەوە و دیسانیش هەر دەیدروونەوە. هەڵگرتنەوەیەك... ئاخ دایە، ئاخ...

مریەمۆك دیسان بە جووڵەی سەر و چاو قسەکانی ئەوی سەلماند و وەدەرکەوت.

تاشباش ئۆغلۆ لە دواوە سەیری کردی. مریەمۆك هێشتاش وەك کچۆڵەیەکی عازەب چالاك بوو. بە پێی پەتی، گورج بەسەر بەفرەکەدا دەڕۆیی. بەخۆی گوت:

- نەنە مریەمۆك، دایکی دایکان، تاقە ئەو گوندە ئەگەر یەك مرۆڤی تێدابێ ئەوە تۆی.

تاشباش ئۆغلۆ لە خۆڕا دڵی توند بوو. جاروبارە تووڕە دەبوو و خەریك بوو لە داخان شێت بێ و جاری واش بوو ڕقەکەی دادەمرکایەوە و لە دڵ توندییان خەریك بوو بتەقێ. لە دوێنێوە کە ژنەکەی بریندار ببوو، دیسان تووڕەییەکی سامناك دایگرتبۆوە. چیی نەمابوو لە داخی ئەو خەڵکە شێت بێ:"هەم وەشوێن سەفەر دەکەون و دەچنە ئەو مەزرایە کەر لێی بکەوێ ددانی دەشکێ، هەمیش بە ترسەوە و ترسنۆکانە چاوەڕێ دەبن. لە تووڕەییان خەویشمان لێ ناکەوێ. چیی وای نەماوە یەکتری بخۆن." تاشباش هەر دەهات و تووڕەتر دەبوو و دەهات شێت بێ. خۆ ئەگەر ماوزەرێکی هەبوایە، دەچووە نێوەڕاستی گۆڕەپانەکەی ئاوایی و هەرچی لە ماڵێ سەری وەدەر نابایە، بێبەزەییانە دەیکوشت.

چووه ژوور سەری ژنەکەی و دەستی لەسەر تەوێڵی دانا و لێی پرسی:

- چۆنی؟...

ژنە بە نیوەنووزەیەکەوە گوتی:

- برێك باشترم.

"جا باشە ئەو ژنە گوناحی چ بوو کە گوندییە کافرانە ئاوایان لێکرد؟ پەلە مەکەن، ئەوە دەیبینن چۆن تێك بەردەبن و یەکتری لەتوپەت دەکەن."

هەرچی چاوی پێی دەکەوت، دەیگوت، ئەو تاشباشە ئەمڕۆ زۆر سەیر گۆڕاوە. جا هەر بە ڕاستی زۆر سەیر ببوو. هەر لەو شەوەی ڕا کە کوێخا لە دۆڵەکەی سویوتلی خەڵکەکەی خەڵەتاندبوو و وەدوای خۆی دابوون، تاشباش ئیتر نەبۆوە تاشباشەکەی جاری جاران.

ئیتر هەردەتگوت تاشباش هەر خەلکی ئەو گوندەش نەبوو و لەو ئاواییەشدا نەدەژیا. دەتگوت ئەو خەلکەی دەوروبەرەکەی هەر مرۆڤیش نین، هەر دەتگوت دار و بەرد و خۆڵ و خاکن.

دوای تێکهەڵدانەکەی دوێنێ، ورد و درشتی خەلکەکە بەپانەوە لەبەردەم ماڵەکەی کوێخای کۆ بوونەوە. لە نێویاندا تەنیا یەك کەس دیار نەبوو، ئەویش تاشباش بوو. تاشباش ئۆغلو بوو کە نێوانی لە هەموو ئاوەدانی گۆڕیبوو. تاشباش بوو کە دەیگوت: بێت و ئەو زستانە بڕوات و بەهار بێ، مەحاڵە لەو گوندە بژیێ. هەتا ئێستا جگە لە حوسێنە کەچەڵ کەس لەو گوندە ڕای نەکردووە و بۆ تاهەتایە ئەوێی بەجێ نەهێشتووە، بەڵام تاشباش سوور بوو لەسەر ڕۆیشتنەکەی. هەر بەهار بەسەردا بێ، شەوێکیان خانووەکەی دەسووتێنێ و ئاواییەکەی بەجێ دێڵێ:"لێیان گەڕێ با ئەو گوندییانە لەگەڵ کوێخا هیچ و پووچەکەیان بێننەوە. با بێننەوە و بەردیان لێ بباریێ. با لەوە خراپتریان بەسەر بێ."

کەس سەرەدەر لە کاری ئەو خەلکە دەرناکا. ئەو خەلکە گوندییە هەر دەڵێی منداڵی حەوت ساڵانەن. ڕێك حەوت ساڵانە... سەرەتاکان، تاشباش بە چاوێکی سووك لە گوندییەکانی دەڕوانی و هەرچی دەیانگوت گاڵتەی پێیان دەکرد. کە چووبووە نێو مەزرا بێ بەرهەمەکەوە و سەیر دەکا لۆکەی بۆ دەرمانیش لێ دەست ناکەوێ، وەك منداڵان دەستی کردبوو بە قریوە و هەڵپەڕین و کڵاوەکەی هەڵاویشتبوو و لەبەر چاوی گوندییەکان بەسەر خۆڵ و خاکە گەرمەکەی مەزراکەدا سەرموقلاتی لێدابوو. دوایی قاقایەکی کێشابوو و لە بن لێوانەوە مڕاندبووی:"چما پێم نەگوتن، چما نەمگوت ئەو سەفەرە و ئەو بەکرە شێتە، دایك و خۆشکتان دەکەنە یەك و دەتانبەنە کێڵگە و مەزرای بێ حاسڵ، جا ئەوجار هەڵیگرنەوە، هەڵیگرنەوە بزانم، ئەگەر تاقە یەك قۆزاخەشتان دۆزییەوە، کۆی کەنەوە."

گوندییەکان خۆیان لەو سووکایەتی و جنێو و قسە ڕەقانەی ئەو گێل کردبوو و گوتبوویان:"تاشباش حەقیەتی. تا خودا حەز دەکا حەقیەتی. هەرچی بیلێ و هەرچی بیکا حەقی خۆیەتی. ئەوەی ئەو دەیگوت ڕێك وەدی هات. گوتبووی ئەو کوێخایە دەتانباتە مەزرایەکی ڕووتەڵان و قاقڕ و دەست لە گونان درێژتر لەو لاوە دەگەڕێنەوە. چیی ئەو گوتی ڕێك وەدی هات. جا لێی گەڕێن چیی پێی خۆشە با بیلێ. ئای لەو تاشباشە، کوا پیاوی ئاوا... کارتان بەسەرییەوە نەبێ. لێی گەڕێن چیی دڵی دەخوازێ بیلێ."

لە هەموو ئەو ماوەیەدا کە گوندییەکان لە مەزرا بێ حاسڵاتەکەدا تاك و لۆ قۆزاخەیان دەدۆزییەوە و کۆیان دەکردەوە، تاشباش گاڵتەی بە ورد و درشتیان دەکرد. ئیتر تاشباشەکەی جاران نەبوو، مارێك بوو ژەهری دەڕشت، ژەهری لە زمانی دەباری، ژەهرێك کە هەر دڵۆپەیەکی، مرۆڤی ڕەق هەڵدێنا، بەڵام ئەو گوندییانە خوویان گرتبوو بە کۆیلەییەوە و سەریان بەردەدایەوە.

کە لۆکە ڕنینەوە تەواو بوو، ئەویش و گوندییەکانیش دەست بەتاڵ مانەوە، تاشباش تەواو گۆڕا و بوو بە بنیادەمێکی دیکە. نوقمی پەژارەیەکی بێ دەرمان و ئیتر زاری لێك نەکردەوە.

کە پاییز داهات و گەڕانەوە ئاوایی، لە ناکاو ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو واتە ترس لە هاتنی عادیل ئەفەنی بەرۆکیان گرت. ئەو جارەش تاشباش ئۆغلۆ، بە شێوەیەکی دیکە گۆڕا. زمانی پڕا. بێ پسانەوە قسەی دەکرد، لەکەڕەی بەیانییەوە دەیگوت هەتا شەوگار شەق دەبوو. ئەوجارەیان، ئیتر نە گاڵتە بە کەس دەکرد و نە جنێو و قسەی تاڵی بە خەڵك دەگوت. بەڵکو بە ئاشکرا ژەهری هەڵدەڕشت و هرووژمی دەبرد. زمانی وەك شمشێر بە بڕشت بوو. کەسی لە ئاواییەکەدا بێبەش نەدەکرد، دەیگوت:"ئەو گوندییە بێناموسانە، دەبێ لەوەش خراپتریان بەسەر بێ، زۆر لەوەش خراپتر."

ڕۆژی وابوو کەڕەی بەیانی لە گۆڕەپانەکەی ئاوایی دادەنیشت و بێ پسانەوە ڕق و قینەکەی خۆی هەڵدەڕشت. گوندییەکانیش لارەمل گوێیان لێ ڕادەگرت و ئاخرییەکەی دەیانگوت:" ئەو تاشباشە ئیتر تەواو هار بووە." و بە ترس و لەرزەوە لێی دوور دەکەوتنەوە و چیی بۆیان لوابایە، و چەندی لە توانایان دابایە، هەوڵیان دەدا لێی نزیك نەبنەوە.

ئێستاش کە ژنەکەی لە شەڕەکەی ڕۆژی ڕابردوودا بریندار ببوو.... ئیتر کەسی نەدەپاراست.

تاشباش لە تووڕەییان شێت ببوو.

بەڵام تاشباش حەقی بوو:"لێگەڕێن تاشباش چیی پێ خۆشە با بیڵێ. ئەو تاشباشە شتێکی هەر بەسەر هاتووە."

هەمووان کەوتبوونە شك و گومانەوە. ئەو تاشباشە؟....

***

تەنانەت باڵندەکانیش بەسەر ئەو گوندەدا نافڕن. ئەوە هەمووی فیتی ئیەنگۆیە. نەگبەتییەکەی ئەنگۆ بەرۆکی هەموو شتێکی ئەو گوندە، دار و بەردەکەی، ئەو بەفرەی کە دەبارێ، باڵندە و دەعباکانی و تەنانەت مێرووڵەکانیشی گرتووە. هەمووی لە سایەی سەری ئەنگۆوەیە. هەی دەستی کوێخا سەفەرتان لەسەر بەزیاد بێ. پیاوی پیاوان. ئەو کەسەی باش دەزانێ چ دەکا. مێرووڵەی بن عەرزی، باڵندەی ئاسمانان و دەعبا و جڕ و ناوەرە کە لە هێلانەکانیاندا بوون، خۆیان لەبەر نەگبەتییەکەی ئەو گوندە ڕانەگرت. مەخلوقە بەستەزمانەکانی خوداش خۆیان لەبەر باری نەگبەتیی ئەو گوندە ڕانەگرت و تێیان تەقاند و ڕۆیشتن. هەمووی خەتای ئەنگۆیە. هەر چاوتان بە ئەسپ سوارێك دەکەوێ کونە مشکتان لێ دەبێتە قەیسەری. بێت و سێ کەس ببینن کە بە ڕێگاکەی شاریدا بەرەو ژوور دێن، ئەنگۆی هیچ و پووچ دەرگای ماڵەکانتان گاڵە دەدەن و گوندە چۆڵ دەکەن.

"هەمووی فیتی ئەنگۆیە، تازە دڵۆپە بارانێکیش چییە بەسەر ئەو گوندەدا نابارێ. لەجێی بەفر ئاگر دەبارێ. خەتای ئەنگۆیە. لەجێی بەرەکەت، نەگبەتی و لە جێی چاکە خراپە و لەجێی ژیان مەرگ دەبارێ. کێڵگەکان دەسووتێن و ئیدی لەو گوندەدا چاوتان بە نان ناکەوێتەوە. ئیدی چاوتا بە گەنمی قژ زەرد ناکەوێتەوە. کێڵگەکان دەسووتێن و هەمووشی فیتی ئەنگۆیە. ئەنگۆ بوونە هۆی ئەوەی ئەو هەمووە نەگبەتی و نەهامەتییە بەسەر ئەو گوندەدا ببارێ. ئەو گوندە نەخۆشی و سیل و تاعوون و بوومەلەرزە دەیبا. هاکا دیتان ڕۆژێك بە هەزاران سەلکی سەوز و بەهەزاران زمانی دووسەر و چاوی سوور.... و سەدان هەزار مار، لەو دەشتەوە دێن و گوندەکە داگیردەکەن. ئەوکات ناتوانن هەر لاقیش هەڵێننەوە و هەر بجووڵێننەوە تەنانەت هەناسەکانیشتان ژەهراوی دەبێت. ئەو هەوایەی هەڵیدەمژن، ئەو ئاوەی دەیخۆنەوە، ئەو نانەی دەیخۆن، ئەو نوێنەی تێیدا دەنوون و ئەو زەوییەی بەسەریدا دەڕۆن، ئاسمانی ساو، لووتکەی چیاکان، هەورەکان و ئەستێرەکان هەموویان دەبنە ژەهر... هەموو شتێك ژەهراوی... ئەوە هەمووی خەتای ئەنگۆیە. واتان لەو دێیە کرد کە تەنانەت مەلی ئاسمانیش بەسەریدا نافڕن.

دوو مانگی ڕەبەق چاوم لـە باڵنـدەی ئاسمـان بـڕی. بـە هـەزاران پۆلـە باڵنـدەم دی، بـەڵام هـەر هەموویان کە دەگەیشتنە سەر گوندەکەی ئێمە، لایاندەدا. دەزانن بۆ؟ چونکە ئەو گوندە ترسی تێدایە، خۆفی تێدایە، مەرگی تێدایە، نەخۆشیی تێدایە، تەنانەت مەل و باڵندەش خۆ لەبەر ئەو شتانە ڕاناگرن. زەردەواڵە و مێشەنگوینم دین بێ هەژمار، کە دەگەیشتنە لای گوندەکەی ئێمە وەك بڵێی دیوارێکی بەرزیان لە پێش بێ، بە وزەوز کۆ دەبوونەوە و دوایی بایان دەدایەوە و بـە ڕێیەکی دیکەدا دەڕۆیشتن و لە گوندەکەی ئێمـە دوور دەکەوتنـەوە. بـە جۆرێـك لـە گوندەکـەی ئێمە ڕایان دەکرد وەك بڵێین بە وزەوز لە دۆزەخ ڕادەکەن.

"باش بوو، هەزار جاری دیکەشی دەڵێمەوە گووی خۆتانە بیشێلن. ئیشەڵڵا ئەمڕۆش نەیـە سبەی، عادیل دێ و دەڕبێ لەبەر ژنەکانتان دادەکەنێ و دەیبا. ماڵ و حاڵتان شـاردەوە چـونکە سەفەرەفەنی گوتبووی و هێناتانەوە دەرێ چونکە سەفەرەفەنی گوتبووی. سـەفەر گاڵتـەتان پـێ دەکا. بۆ خۆشتان گاڵتە بە خۆتان دەکەن. هێشتا دەبێ بیکێشن. عادیل گاڵتـە بـە هـەمووتان دەکا، ئەویش لەبەر چاوی خەڵکی شەست گوند و شارێك.

"عادیل ژنەکانتان لێ دەستێنێ و دەیانبا و لە شاری دەیانفرۆشێ. بەهـەرزان و تـاڵان. زۆر باش بوو. باش بوو وای لێهات. با ژنەکانتان بێدەرپێ بن. چرکەیەك بیهێننە بەرچاوتان. دەزانن چ دەبینن؟ دەستەیەك ژنی بە قوونی ڕووتی، لە بـازاڕدا بـە شـوێن عـادیـل ئەفەنییـەوە، پێتـان خۆشە؟ ئای چەندە خۆش دەبێ، وا نییە؟ هـا.... هـەی گوندییـە بـێ ئاقـڵ و بێناموسـەکانی کوێخا سەفەر؟...

"جا ئەنگۆش لە قوژبنی ماڵەکانتاندا خۆتان دەخزێننە تاریکاییەکەوە و لە شـەرمەزارییان لەڕووتان هەڵنایە سەیری چاوی ژنەکانتان بکەن. لە بەرچاوی خەڵکی گونـدەکانی دیکـە دەبنـە پەڕۆیەکی گواوی.

"ئەنگۆ پیاوی ئەوە نین بچن و بڵێن عادیل، ئەمساڵ بۆ نەگبەتی، تووشی مەزرایـەکی بـێ حاسڵ و بەرهەم بووین و وەرە پیاوەتی بکە و لێمان خۆش بە. خۆ ئەگـەر لێتـان خـۆش نـەبوو، ئەنگۆ ناتوانن سەلکە گرۆییەکەی ئەو بخەنە نێوان دوو تاوێرەبەردەوە و بینەنجنن، لەگەڵ سەلکی سەری ئەو کوێخا ژێرەتان. نەریتەکە دەشێوێ؟ دەی با بشێوێ. ئەگەر گوندەکە چۆڵ بوو چەتە و ڕێگران دێن و دەستی ڕێدەخـەن؟ بـا بـێن و هـەمووی ڕامـاڵن. چما نـاتوانن دوو پاسـەوان لـە گوندەکە دابنێن؟ خودا ئەو نەریتەتان بەرێتەوە. ئەو نەریتە قۆڕە بەزیاد نەبێ. ئـەوجار سـات و سەودا لەگەڵ عادیلیش ناکەن. ئەوە چییە ئەو هەمووە ترس و شەرمەزاری و تۆقینە؟.

"وەها ترسێکتان خستە دڵی دار و بەرد و خاك و ئاو و کێو و شیو و دۆڵ و چوارپێ و ئەسپ و کرد و دەعبای کێوی و باڵندە و ڕێوی و چەقەڵی ئەو گوندەوە کە هەمووان لە یەکتری تۆقیون.

"جوان و زەرف گوێ بگرن، هۆی گوندییە بێناموسەکان، ئەمساڵ بەهاریش لە ترسان نایە. ئەگەریش بێ، گیا و گوڵ شین نابنەوە و دار و دەوەن و چیاو لێڕەوارەکان چرۆ ناکەن. ئەگەر چرۆیش بکەن گوڵیان ناپشکوێن. باڵندەکانیش هێلکە ناکەن. ئەسپ و پەز و بزنەکانیش نازێن و بشزێن، جاشك و جوانوو و بەرخی مردوویان دەبێ. ژنەکانتان لەزگ دەوەستن* و لە زگیش نەوەستن و منداڵیشیان بێ، بە مردوویی دەیانبێ و بۆیان نامێنێتەوە. ئاوەکانیش ڕادەوەستن و ڕاشنەوەستن، هەر خراپتر. ئەو تاشباشە ئەوە حەوت ساڵە قسەتان بۆ دەکا، باسی چاکە و خراپەتان دەکا، بەڵام ئەنگۆ هەر بەلای خراپەکەدا دەڕۆن. بەرەو نەمان دەڕۆن. چما پێم نەگوتن، چاوساغەکەتان قالاوێکە و هیچی تر؟ ئەوە دیسان دەیڵێمەوە. وازی لێ بێنن، لێی گەڕێن با ئەو نەریتە نەمێنێ و جەحەندەمی لێ پڕ بێ. کوڕە ئەو عادیلە سەیر ئەنگۆی تۆقاندووە....

لە ترسانا لە پیاوەتی دەکەون و ژنەکانتان لە زگ دەوەستن. بۆ دوایین جار پێتان دەڵێمەوە، مەترسن، لە چوکووراوا ئەو هەمووە بنیادەمەتان بینی. هیچ بیرتان کردووەتەوە، کە ئەو دەریا و دەشتە کاکی بە کاکییانە تا کوێ چوون؟ هیچ بیرتان کردووەتەوە، کە خۆر چۆن هەڵدێ و چۆن ئاوا دەبێ؟ ئەودیوی هەتاو چیی لێیە؟ ڕادیۆ چۆن قسان دەکا و مەل چۆن دەفڕێ؟ هیچ بیرتان لێ کردووەتەوە؟"

***

جا ئێستا کە ژنەکەی بریندار ببوو، وەرە و زمانی تاشباش قەبووڵ بکە. تاشباش چیی دەیگوت گوندییەکان ناحەقیان نەدەگرت. تووڕە دەبوون و دەهاتنە سەر ئەوەی بیکوژن.... بیریان لەوە دەکردەوە بیخنکێنن و بیکوژن، بەڵام...

ئێستا تاشباشیش لە گوندەکەدا خۆی ترس و سامێکی دیکەی نابۆوە. گوندییەکان عادیل ئەفەندییان لەبیر دەکرد و دەبوو بیر لەوە بکەنەوە کە بەدەست تاشباشەوە دەیکێشن. هەمووان

---

*لە زگ وەستان: نەزۆك کەوتنەوە. نەزۆك ئەوانەن هەر منداڵیان نابێ، بەڵام لە زگ وەستان، حاڵەتێکە دوای منداڵبوون بەسەر ژنان دێ و دوای ئەوە منداڵیان نابێتەوە. واتە پێشتر بوویانە. مامۆستا هەژار لە شیعری "جاش چوونە میسر"دا دەڵێ:

لە ژێر بارا زۆر چەوساون ................ ماندوو بوون، لە زگ وەستاون

بیریان لەوە دەکردەوە. وەك پیاوچاکێك لە تاشباش دەترسان، هەر زاری دەکردەوە، گوندییەکان وا دەتۆقین دەتگوت هەرچی بیلێ وەڕاست دەگەڕێ. ئەگەر گوتبای مار دەبارێ، گوندییەکان چاوەڕێی ماربارینێ دەبوون و تەنانەت هەندێکیان چاویشان لە ئاسمانێ دەبڕی و چاوەڕێ دەبوون.

گوندییەکان لە هەر کوێ تاشباشیان دیبایە، ڕایان دەکرد. تاقە ڕێگەی سەلامەتبوون، ڕاکردن بوو. هەموو گوندییەکان بەخۆیانیان دەگوت:"دەبێ ئەو تاشباشە بکوژین، ئەو بنیادەمە... تەنانەت منداڵەکان لە یاریکردنەکانیشیاندا هاواریان دەکرد:

- دەبێ تاشباش بکوژرێ.... دەبێ سەری ببڕدرێ.

بەڵام وێدەچوو کەس نەوێرێ تەنانەت لێشی نزیك بێتەوە. بێت و یەکێك لێی نزیك بێتەوە ناگری تێبەردەبێ و دەبێتە خەڵوز. هەر کەس لێی ڕاسێ*، ئیفلیج دەبێ و بێت و یەکێك لێی بچێتە پێشێ لاقەکانی ڕەق دەبن. نەك هەر ئەوەی دەستی لەسەر بەرز بکاتەوە یان بیر لە ئازاردانی بکاتەوە، بەڵکو تەنانەت ئەوەش کە قسەی لەسەر بکا، هەر خراپی بەسەر دێ.

برینی سەری ژنەکەی تا خراپتر دەبوو، تاشباشیش تووڕەتر دەبوو و کەفی خەڵدەخڕاند. باشترین برادەرەکەی واتە عەلی"یە درێژ چەند جارێك چووە ماڵەکەی کە پێی بڵێ:" دەست هەڵگرە، بەو زمانە ژەهراوییەت ئەوەندە زوڵم لەو خەڵکە مەکە. دەست هەڵگرە. کوڕە ئەو گوندییانە ئاخرییەکەی بەڵایەکت بەسەر دێنن."، بەڵام تاشباش چاوی لە ژێڵلا هاتن و زاری کەفی کرد و چیی نەمابوو عەلی لە ماڵەکەی دەرکاتە دەرەوە.

تاشباش تا پتر قسەی دەکرد، ترس و خۆف و ڕێز و حورمەتی گوندییەکان پتر دەبوو. دەنگە تاڵ و ژەهراوییەکەی بەردەوام لە گوێیاندا دەزرینگایەوە. هەر دەتگوت لە دامەزرانی ئەو گوندەوە تاشباش هەر ئاوا قسەی کردووە و ئەگەر تاشباش نەبوایە ئەو گوندە هەر نەدەبوو.

لە لایەکەوە ترسی عادیل ئەفەنی و لە لایەکی دیکەوە تاشباش، گوندەکە لە نێوان دوو بەرداشدا دەهاڕدرا.

---

* ڕاسان: ڕاست و چەپ بوون بەمەبەستی لێدان لە یەکێك. کورد دەڵێ: ڕاسان نیوەی لێدانە. یان نیوەی سەرکەوتنە.

## ٢١

حوسنی لە جێویانەکەی دەرپەڕی و بە دەستەکوتە لە تاریکاییەکەدا بەرەو دەرگاکە چوو. دەستی وەپشتی مانگاکە کەوت. مانگاکە کاوێژی دەکرد. لەو دەمەیدا کە دەرگاکەی دەکردەوە، شاخی مانگاکەی گرت. مانگەشەو بوو. بەفر هەموو ولاّتی داپۆشیبوو. تەنانەت ئاسمانیش وەك بەفرەکە سپی دەچۆوە.

بەرەو مالّە چۆلّەکە ڕایکرد. لە نێو مالّەکەدا ئاگردانەکە دایسا و لە تەنیشت ئاگردانەکەوە، ڕەجەب چاوەڕێی بوو. حوسنی لە ئیشقدا شێت ببوو. وەکو دڕندەیەك ئامبازی ڕەجەب بوو. ئەمشەو ڕەجەبیش لەو شێتتر بوو. سێ سەعاتی تەواو جگە لە عیشقبازی و جەستەی ڕووتی حوسنی بیری لە هیچ شتێکی دیکە نەکردبۆوە. خۆشیان نەیانزانیبوو چ بوو و چ نەبوو. دوو جەستەی ڕووت لە چرکەیەکدا بوونە یەك. ماسوولکەکان لە خۆشیانا وا لەبەریەك کێشرابوونەوە دەتگوت دەیانەوێ لەبەر یەك بچن و لێك بنەوە. شۆقی بلّێسەی ئاگرەکە کەوتبووە سەر ئەو دوو جەستەیە کە شەلاّلّی ئارەقە بوون و وەك مار تێك ئالاّ بوون. ماسولکەکان هەستابوون و ئازای ئەندامیان وەك مس سوورەوە ببوو.

حوسنی وەك نیوەزیندووان دەینووزاند. ڕەجەب هەناسەبڕکێی بوو. ڕەجەب بیری لە خاکێکی گەرم و نەرم دەکردەوە. بێستانێکی شووتیی دێنێتە پێش چاوانی خۆی، لە بن کەپری مەزراکە، شووتییە قاش کراوەکان و توێکلّی شووتی و زەردەوالّە خالّسوور بەو بالّە مەیلەو شین و سەوز و نارجیییانەیانەوە، لە نێوقەدی بەرەو خوار هەتا دروێشەی زەردەوالّەکە ناسك و زەردە و وردە مووی هەیە.

لە ناکاو نەرمایی و گەرمای ژنەکە لە بن جەستەیدا ....

ڕەجەب بیری لە زۆر شت دەکردەوە و ژنەکە بە زاری نیوە داپچڕاو و چاوی نیوە کراوەوە دەنالّێنێ.

ڕەجەب بیر دەکاتەوە، کە ئەو دەمەی گوندی ماڵ و سامانەکەیان دەشارنەوە، ئەو هیچی نییە بیشارێتەوە و کە دەریشی دێننەوە، دیسان ئەو هیچ شتێکی نییە لە بن عەرزی دەربێنێتەوە. ئەو خەیاڵانە شێتی دەکەن.

بڵێسەکان بەسەریاندا تێدەپەڕن.

تێك ئاڵانی گەرم و گوناحبارانەی دوو مرۆڤ. ژنەکە نەیتوانی پێش بە هاوارەکەی خۆی بگرێ.

ڕەجەب دەستی حوسنیی گرت و هەڵیستاند. مەمکە خڕەکانی حوسنی بە گەندەمووەکانییەوە، دەتگوت دەستیان لێ نەدراوە. ڕەجەب کە ئەو مەمکە تورتانەی دی، هەر دەتگوت هیچی نەکردووە، ئاگری تێبەربۆوە.

***

حوسنی دەستی ڕەجەبی گرتبوو و دەیگوت:

ـ ئەمن چیدی ناتوانم ڕاوەستم، دوای ئەوە هەموو ژنەکانی گوندی نەزۆك دەبن و لە زگ دەوەستن. بەهارێ گوڵەکان ناپشکوێن و گیا شین نابن. خەڵك قڕیان تێدەکەوێ، بوولەرزە گوندەکە تەخت دەکا.... هەر ئێستا، ئێستا لە گوندەکە ڕا دەکەین. کەس نامانکوژێ، هیچ کەس ناماندۆزێتەوە. هەر ئێستا، خێراکە، خێراکە... سەیرکە بوخچەکەشم لەگەڵ خۆما هێناوە... لە دەرەوەش ئاسمان ساو و سامالە. هەر دەڵێی بەهارە. لەبەر ئێمە...

"ئەگەر تۆش نەیەی من بەتەنێ دەڕۆم... ژنەکان نەزۆك دەکەونەوە... نەزۆك... نەزۆرك... منداڵیشیان بێبە مردوویی دەیانبێ. ئەمن ئیدی ناتوانم لەو دێیەدا بم. ئەتۆش کە تەنانەت پووشێکیشت نەبوو بیشاریتەوە... ئێستا... هەر ئێستا... پەلەی بکە، با هەر ئێستا بڕۆین.

ڕەجەب دەیویست شتێك بڵێ، بەڵام حوسنی وا هەژابوو، گوێی لە هیچ نەدەبوو و قسەی پێ دەبڕی و توند دەستەکانی گرتبوو و دەلەرزی و پەیتاپەیتا دەیگوت:

ـ ئێستا... هەر ئێستا... بارانی مار بەسەر ئەو گوندەدا دەبارێ، سەت هەزار ماری چاوسوور دەبارێ... مەزراکان وشك دەبن، دەسووتێن... مانگاکان گوانیان هەڵدەچۆڕێ... ژنەکان نەزۆك... نەزۆك دەکەونەوە... پەلە بکە... خێراتر... دەی زوو....

ڕەجەب: کچێ لەو تۆف و بەفر و بۆرانەی زستاندا... خۆ دوو هەنگاو هەڵناهێنینەوە کەسیرە دەبین و دەمرین، ڕاوەستە با بەهار بێ.

ـ بەهار نایە... پەلە بکە... پەلە بکە... ژنەکان نەزۆك دەکەونەوە...

ـ مام خەلیلت لەبیرە؟...

ـ مام خەلیل لەسەرمان ڕەق هەڵنەهاتووە... کەسێك ڕەق هەڵێ، تەرمەکەی دەدۆزرێتەوە. ئەی کوا تەرمەکەی ئەو؟... ئەو بەو پیرییەی خۆی نەترسا و سەری لەو بەفر و بۆرانە نا و ڕۆیی... ژنەکان نەزۆك دەکەونەوە... پەلەی بکە...

ـ ئەگەر بەهار داهات...

ـ نایە...

ـ کە بەفرەکان توانەوە...

ـ ناتوێنەوە... پەلەی بکە.. پەلە...

ـ تەرمەکەی مام خەلیل لە بن ڕنووی بەفران...

ـ نایەتە دەرێ...

پریاسکەکەی بە دەستی ڕاستییەوە بوو و بە دەستەکەی دیکەی توند دەستی ڕەجەبی گرتبوو و تنۆکی درشتی ئارەقەی بە نێوچاوانییەوە دیار بوون.

ڕەجەب یەکسەر خۆی دابووە دەست خەیاڵی ڕاکردنەوە. ئەو کەفوکوڵە بەتینەی بۆ ڕاکردن گیانی حوسنیی داگرتبوو، ئێستا ئەویشی گرتبۆوە. ئەویش حەزی لێ بوو بڕوات، لە ناخی شەوەکەدا لە بەفر دەترسا، بەڵام ئیتر ترسیش بەلایەوە مانایەکی نەمابوو. حوسنی کوێی حەزی لێ بوایە دەیتوانی بەرەو ئەوێی پەلکێش بکا. لەو حاڵ و هەوایەدا ئەگەر حوسنی چووبایەتە نێوەڕاستی جەحەندەمیشەوە یان چووبایەتە چەقی دەریاوە، ڕەجەبیش بەبێ سڵەمینەوە بەشوێنیدا دەڕۆیی. هەر دەتگوت سیحری لێکراوە.

لەگەڵ هەمووی ئەوانەشدا دیسان وردە خۆپاراستنێکی تێدا مابۆوە. "ڕاوەستە با بەهار دابێ، بەفرەکان بتوێنەوە، هەوا برێك خۆشی بکاتەوە... تەنانەت ڕۆژێکیش چییە لەو گوندە تووك لێکراوەدا نامێنمەوە..."

حوسنی:

ـ مام خەلیل ئەگەر زانیبای ڕەقەڵدێ و دەمرێ، چما دەڕۆیی؟... پیرەمێردێك، ئەویش لەو تۆف و بەفرەدا...

و هاواری کرد:

ـ پەلەی بکە... نەزۆك... نەزۆك... نەزۆك دەکەونەوە.

دەستی ڕەجەبی گرت و بەرەو دەرەوە و بەرەو شەوەکە ڕایکێشا. شەوەکە سپی دەچۆوە و دەدرەوشایەوە. لە هیچ کام لەشەوەکانی دیکە نەدەچوو. سەرما وەك خەنجەرێکی تیژ بە دەموچاویاندا هات.

ئێستا بە ڕێگەوە بوون. تەنانەت نەشیانزانی کەی لە گوندەکە چوونەتە دەرەوە، کەی وەڕێ کەوتن و کەی ئەوەندە ڕێگەیان بڕی. حوسنی لە خۆشیان باڵی گرتبوو و توند دەستی چەپەی ڕەجەبی گرتبوو و ماچی دەکرد:

ـ خەریکین دەڕۆین و لەو جەحەندەمە نەجاتمان دەبێ. گوێ بدەیە با شتێکت پێ بڵێم. عادیل ئەفەنی بەیانی دێتە ئاوایی. هەموو ژنەکانی گوندی نەزۆك دەکەونەوە... هەر هەموویان... هەموویان...

ڕەجەب هیچی نەدەگوت. خەیاڵ بردبووی و وەك سیحرلێکراوان پەلکێش دەکرا.

ـ بەیانی زوو، کەڕەی بەیانی، بەر لە تاوکەوتنان، دێتە ئاوایی و هەر هەموویان ڕووت دەکاتەوە و تاقە پارەوە نانێك چییە لە ئاواییدا ناهێڵێتەوە. ئەگەر بمابایەوە، چیمان خواردبا؟ هەر هەموو گوندەکە لە برسانا دەمرن. ژنەکانیش تا مردنێ هەر نەزۆك دەبن.

حوسنی دەستی ڕەجەبی کێشا و بە سینگییەوە نا:

ـ دەمرن و لە زگ دەوەستن...

حوسنی چیی قسەی دەکرد، خێراتریش دەڕۆیشت، وا دەڕۆیی ڕەجەبی بەجێ دەهێشت. دەست و لاقەکانی لە سەرمان کەسیرە ببوون، خشەخشی بەفرەکەی لە بن پێیەکانییەوە گوێ لێ دەبوو. ئەو دەمەی گەیشتنە عەلی باستی، بێت و تاو هەڵنەهاتبایە، لەسەرمان ڕەق هەڵدەهاتن. لەگەڵ تاوهەڵاتنەکە حوسنی ڕووی لە خۆرەکە کرد و دەستی بەرەو ئاسمانێ هەڵبڕی و دوعای کرد و دوعاکەشی ئاوا تەواو کرد:

ـ سوپاس بۆ ڕزگاریدەر...

لە ئاسۆوە، تیشك و تیریژێکی زێڕین، لە بەفرەکە و گردە دوورەکانی دەدا. کە خۆر بڕێك بەرز بۆوە، لە خاك و بەفر و کوێستانەکان و شیو و دۆڵەکان و دارەکانەوە، لافاوێکی تیشك بەرەو ئاسمان هەڵچوو.

دوو سێبەری درێژ بەسەر بەفرەکەدا دەخوشین. خۆرەتاو لە پشتەوەیان بوو. سێبەرە ڕەشەکەی ئەوان بەفرەکەی دەلستەوە و لە پێشیانەوە دەڕۆیشت.

حوسنی باسکی ڕەجەبی وا بەتوندی گرتبوو دەتگوت ڕەجەب لەدەستی هەڵدێ و ئیدی وەدەستی ناکەوێتەوە. ئێستا ئەگەر ڕەجەب نەبوایە و حوسنی خۆی پێوە نەنووساندبایە، لە ماندوویی و شەکەتییان نەیدەتوانی هەنگاوێکیش بنێ.

لە دوور و نزیکەوە، هیچ گوندێك بەرچاو نەدەکەوت. ئێستا گەیبوونە بناری چیای تەکەچ. برسییان بوو. ئەو کەفوکوڵەی وا حوسنیی ڕاکێشابوو و هێنابووی، ئێستا دامرکابۆوە و ڕەجەبیش لەو سیحرە هاتبووە دەرێ و وەخۆی هاتبۆوە. ئەوجار دەیتوانی بیر بکاتەوە. گوتی:

- مەترسە، چەند گوندێك لەودیو ئەو چیایەن. بەفر دەبارێ. بارانی بەدوودا دێ، هەورەکان لووتکەی چیای تەکەچیان گرتووە، بەڵام مەترسە بەر لەوەی هەڵکاتە گێژەڵووکە و باڕن، دەگەینە گوندێك. ئەمن ئێرانە باش شارەزام.

حوسنی بە لەبزێکی گریاناوییەوە گوتی:

بەڵام خەریکە هەڵدەکاتە باڕن. هەموو وڵات وا بەرەو تاریکی دەچێ و ئەژنۆکانیشم تینیان تێدا نەماوە.

بەسەری ئاماژەی بۆ لووتکەی تەکەچ کرد و گوتی:

- سەیر کە...

ڕەجەب دڵی دایەوە:

- ئەو گوندانە زۆر لێرەوە دوور نین. ئەگەر تووشی باڕنیش بین، هەر دەتوانین خۆمان بگەیەنینە ئاواییەك.

حوسنی:

- ئەی ئەگەر باڕن نەهێڵێ بڕۆین؟

- ئەمن ڕێیەك هەر دەدۆزمەوە.

حوسنی هەوڵی دا دڵی خۆی بداتەوە. لە بن لێوانەوە دەیگوت:"ئەوان دەمرن... نەزۆك دەکەونەوە... نەزۆك... نەزۆك..." و پەیتاپەیتا دووپاتەی دەکردەوە.

ڕەجەب پرسی:

- ئەوە قسە لەگەڵ خۆت دەکەی؟... دەڵێی چی؟...

حوسنی گوتی:

- پەلەی بکە... پەلەی بکە... تا تووشی باڕنێ نەبووینە... دەربازبوون لە باڕن زۆر ئاسان نییە...

وردە وردە هەواکەی تاڵتر دەبوو. هێندەی نەمابوو خۆرەتاوەکەش ون بێ.

بۆ ساتێك هەموو وڵات بەتاریکیدا ڕۆچوو و دوایی برێك ڕوونی کردەوە.

لە نێوەڕاستی دەشتەکەوە و لە بناری چیای تەکەچ، تەنیا و بێ پەنا... نە باڵندەیەك و نە جرِ و جانەوەرێك و نە چوارپێیەك و نەگورگێك... دوو مرۆڤی تەنیا لە چنگی سرووشتی بێبەزە و بێ سنووردا...

لەناکاو دیسان هەوا تاریك بۆوە. ڕەجەب بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ هەر گوتت نەزۆك دەکەونەوە... نەزۆك دەکەونەوە... کێ نەزۆك دەکەوێتەوە؟ کێ لە برسانا دەمرێ؟ ئەتۆ شێتی. ئەقڵت نەماوە. خودا ئەو زمانەت ببڕێ. خودا ئەو تاشباشەش بەرێتەوە...

حوسنی سەری هەڵێنا و بە دەنگێکی نیوەزیندووانەوە گوتی:

نەزۆك دەکەونەوە ڕەجەب گیان، باش لە زگ دەوەستن، هێشتا زۆرمان ماوە؟...

❊❊❊

هێشتا تاو هەڵنەهاتبوو هەواڵەکە بە ئاوەدانی وەربوو.

ـ ئوکسوز ڕەجەب حوسنیی هەڵگرتووە.

دایکی حوسنی خۆی خستبووە سەر بەفرەکە و دەتلایەوە و دەیقیژاند.

ڕەجەب کەسی نەبوو شینی بۆ بگێڕێ.

هەڵلا و هەنگامەیەك کەوتبووە ئاواییەوە، هەر دەتگوت تازیەیە و بڕێکیش لە خۆشی دەچوو. شادییەکی شاراوە و بزۆزانە.

مرێمۆك ڕوومەتی دابووە سەر دارەدەستەکەی و چاوی لە دوور بڕیبوو.

تاشباش کە هەمیشە لە ماڵەوە دانیشتبوو، دوو شەقاوێك لە ماڵەکەی هاتە دەرەوە.

شادییەکی بەدفەڕانە کە لە بن دەمامکی تازییەدا شارابۆوە، ئەوی تووڕە کرد. گوتی:

ـ خۆزگە زەوی زار داپچڕێ و ئەو گوندە هەڵلووشێ. ئەنگۆ بوونە هۆی ئەوەی ئەو دوو لێقەوماوە بەو بەفر و بارِنە ڕا بکەن... لە هەر سەعاتێکدا وەدەر کەوتبن، ناگەنە هیچ گوندێك. ئەگەر دوێ شەوێ ڕایانکردبێ، مەحاڵە بگەنە شوێنێك و وەبن بەفرێ دەکەون و دەمرن.

ئەو قسەیە لە چاوترووکانێکا بە گونی وەربوو.

ـ وەبن بەفرێ دەکەون و دەمرن.

ـ یەکتریان خۆش دەویست.

ـ بۆ یەکتری شێت ببوون.

ـ کەس نەیدەزانین.

لە سەر چیای تەکەچەوە هەورە ڕەشەکان بە خێرایی بەرەو دەشتەکە دەخزین و بەرەو ئاسۆی خۆرهەڵات دەڕۆیشتن. بایەکی ڕەش و توند هەڵیکردبوو. ئەو بایە شێتترین بای بارِن و کرێوە بوو.

ـ دەبێ جووتێ ئەسپ بدۆزینەوە.

- جووتێك ئەسپی باش لە کوێ بێنین؟... چما لەو گوندەدا دەست دەکەوێ؟...
- دەبێ بگەینە ئاشقە شێتەکان.
- خەریکە کرێوە دەکا.
- ئەگەر دەستیش پێ نەکا و بێت ئەمشەو لە دەرەوە بمێننەوە ڕەق هەڵدێین...
- وەك مام خەلیان بەسەر دێ...
دوای چەندین مانگان ئەوە یەکەم جار بوو گوێیان لە دەنگی مرێمۆك دەبوو:
- لەوەش خراپتر...
بێ ئەوەی خۆی بزانێ لە زاری دەرپەڕیبوو. کە دیتی قسەی کردووە، لێوەکان وا کرۆشت. خوێنیان تێ زا.
لە نێوەڕاستی گوڕەپانەکەی ئاوەدانی، دوو گەنج بەسەر ئەسپەوە ڕاوەستابوون و دیار نەبوو کێن و لە کوێوە هاتوون. گوتیان:
- ئێمە ئێستا دەچین و عاشقەکان دەدۆزینەوە و دەیانهێنینەوە.
لە نێوەڕاستی گوندەکەوە بەرەو خواروو ئەسپیان لینگ دا.
خەڵکەکە چاویان تێوە بڕیبوون. وەك هیوایەك لە گوندەکەوە خزین و وەدەر کەوتن.
تەواوی ئاوایی لە بەیانییەوە تا شەوێ بیریان لە عاشقەکان کردەوە و باسیان کردن. باوکی حوسنی دەیگوت:
- سوێند دەخۆم بێت و نەجاتیان بێ و بێنەوە، تەنانەت پێشیان نالێم پشتی چاوتان بڕۆیە. ئەو گۆلکە سپییەشیان لەبەرپێی سەر دەبڕم. قسەیان لەگەڵ دەکەم و لەگەڵیان ڕووخۆش دەبم. خودایە بۆخۆت ڕزگاریان بکەی.
بەفرەکە لە بەیانییەوە دایکردبوو و دەمەدەمی نیوەڕۆیە خۆشی کردبۆوە. ئێستا ببووە باران و بۆران. بۆرانێکی سارد و ڕەش و پڕ لە نەگبەتی. بۆرانێك کە چاو چاوی نەدەدی.
تاشباش ئۆغڵو چیی سەیری بۆرانەکەی دەکرد، تووڕەتر دەبوو.
دەیگوت:
- لە جێی مانەوە و ژیان لەو ئاواییەدا وا باشترە پیاو خۆی بەو تۆف و باران و بۆرانەدا بدا و لەوێدا بمرێ. لەسەر ئەو گوندە...
دەستی دەکردەوە بە بەربێژییە ترسناك و مەرگهێنەرەکانی و دووپاتەی دەکردنەوە و هەموو تووڕەییەکەی بەسەر خەڵکەکەدا دەڕشایەوە.

# ٢٢

باو و بۆرانێك بوو زەوی و ئاسمانی بەسەر یەكدا دابوو، چۆلەكەكوژ لـە دەرێ نـەمابۆوە و هـەمووان خزیبوونەوە نێو ماڵەكانیانەوەو لە كەلێنی دەرگا و دەلاقەی ژوورەكانیانـەوە سـەیری دەرەوەیـان دەكـرد. كەچی جاری جاران قیامەتیش بوایە، گوندییەكان عادەتیان نەبوو ئاوا سەیری دەرێ بكەن. ئەو رۆژە لـە شەوێكی ئەنگوستەچاو دەچوو كە چاو چاوی نەدەدی. تەنانەت ماڵەكەی ڕووبەڕووش دیار نەبوو. ئـەدی بۆچی ئاوا چاویان بڕیبووە دەرەوە. خۆ جگە لە بەفر و باڕن هیچ شتێكی دیكە نەدەبینرا....

پێش هەمووان گوملكسیز ئۆغلۆ دیتی. پێی وابوو لە كەلێنی دەرگاكـەوە خراپـی دیتـووە. چاوەكانی هەڵگلۆفین و جارێكی دیكەش ڕوانی. بەقای نـەكرد. قەڵافـەتێكی درێـژ و باریكەڵـە بەفر و بۆرانەكە ڕایدابوو و وەك با، بەرەو خوار دەكشا. گوملكسیز ئۆغلۆ گوتی:

ـ ئەو سەگبابەش شێت بووە....

هێـشتا قـسەكەی تـەواو نـەكردبوو، تارماییەكـە گەڕایـەوە و ئـەمجارەیان دەسـتی كـرد بـە هەڵكشان بەرەو لای سەروو.

گوملكسیز ئۆغلۆ گوتی:

ـ سەگبابە ئێستا ڕەق هەڵدێ، بەڵام پەرییەكان ئاگایان لێیەتی. لەوانەشە هەر ئێستا باڵیان بەسەر كێشابێ.

لەودەمەدا، تارماییەكە جارێكی دیكەش گەڕایەوە و بەرەو خواروو ملی پێوەنـا و ئـیتر لـە چاوان نەدیو بوو.

گوملكسیز ئۆغلۆ دیسانیش ماوەیەك لە كـەلێنی دەرگـاوە هـەر وا چـاوی بڕیـیـە دەرەوە و سـەیری دەرەوەی كرد. هەوا وردە وردە تاریكتر دەبوو و سات بە ساتیش با و بۆرانەكە توندتری دەكرد.

هاتە تەنیشت ئاگرەكە و لاقەكانی درێژ كردن و دانیشت. لە دڵی خۆیدا گوتی:

"دەبێ بچم ئەو عادیله بکوژم. چارەیەکی دیکە نییە، بەڵام عادیل زۆر پیرە. لە بنەماڵەی گوملکسیز ناوەشێتەوە دەست لە سەر پیر و پەککەوتان بەرز بکەنەوە. بنەماڵەی گوملکسیز ئەو هەمووە سەرەیان بڕیوە، لە سەلکەسەر منارەیان ساز کردووە، بەڵام نەبووە پیر و پەککەوتەیەک، یان منداڵێك یان هەژارێکیان ئازار دابێ.

عادیل زوڵمێکی گەورە دەکا، ئەو گوندەی ناوەتە نێوان دوو بەرداشەوە و هەر ڕێکی دەگوشێ. خوێنی حەڵاڵە و ئەوەی دەیکوژێ هیچ تاوانێکی نەکردووە. بەیانیی ڕۆژی مەحشەریش بکوژەکەی عادیل بێ سوال و جواب هەڵدەفڕێ و دەچێتە بەهەشتێ، بەڵام چ بکەم، ڕەچەڵەك و تۆرەمەی گوملکسیز دەست بۆ یەکێك نابات کە تەمەنی لە پەنجا تێپەڕیبێ. ڕەچەڵەکی گوملکسیز ڕەچەڵەکی خوێنە. لەوەتا هەن، لەو چیا و چۆڵەدا هەر خوێنیان ڕشتووە. هەتا ئێستا کەی نەیوێراوە تاقە یەك کەسی ئەو گوندە بکوژێ. حوکمەتەکان پادشایان هەیە، چیاکانیش پادشایان هەیە. بنەماڵەی گوملکسیزیش پادشای ئەو کێوانە بوون، بەڵام عادیل بۆ کوشتنێ نابێ. خۆ ئەگەر دوو ساڵ لەمەوبەر بوایە یان دەساڵ پێشتر بوایە، بنەماڵەی گوملکسیز بەڕێی جەحەندەمێیان دەکرد."

بانگی کوڕە دەساڵانەکەی کرد و گوتی:

- ڕۆڵە...

ئەوجار بێدەنگ بوو و خەیاڵ هەڵیگرت و دەستێکی بە ڕدێنەکەی داهێنا:

- لەو دنیایەدا بنەماڵەی گوملکسیز چ بنەماڵەیەکن؟....

کوڕەکە لەسەر یەك، وەك گرامافۆنێکی قورمیشت کردبێ، دەستی پێ کرد:

- مەملەکەتە گەورەکان پادشایان هەیە. جندۆکە و پەری پادشایان هەیە. هەموو کێوانیش پادشایان هەیە. بنەماڵەی گوملکسیزیش پادشای پادشاکانی هەموو چیاکانن. ئەمن دوایین گەورەداری ڕەچەڵەکی گوملکسیزم. هەموو چیاکان گوێڕایەڵی فەرمانی منن. دۆستی هەزاران و دوژمنی ئاغاکانم. بنەماڵەی گوملکسیز هەمیشە لە دەوڵەمەندانی ئەستاندووە و داویێتە هەژاران. ڕەچەڵەکی گوملکسیز دەچێتەوە سەر "دەمیرچی ئۆغڵو" پاڵەوانە ئازاکەی "کوێر ئۆغڵو". هەر ئەو دەمیرچییەی وا چوار ناڵی ئەستی لە نێوان دوو پەنجەکەی خۆیدا شکاند. زیندوومانەوەی ئەو عادیل ئەفەنییە پێچەوانەی عەدالەت و دژی قانوونە، بەڵام ڕەچەڵەك و بنەماڵەی گوملکسیز ناتوانن خوێنە سوورەکەی ئەو بەسەر ئەو خاکە ڕەشەدا بڕێژن. چونکە گوملکسیزەکان دەست لە بنیادەمی پیر و پەککەوتە بەرز ناکەنەوە. یەکێك کە قانوونی بنەماڵەکەی گوملکسیز پێشێل بکا، کوێر دەبێ و نەگبەتی بەرۆکی دەگرێ.

گوملکسیز ئۆغڵو دەستی کوڕەکەی گرت و توند بەرەو لای خۆی ڕاکێشا و گوتی:

- بارەقەڵڵا کوڕم. ئەتۆ دەبێ بزانی کە ئاوی دەریا هیچ کات وشك ناکا و ئەوی لە مشکیش بێ هەمبانە و توورەکەی هەر دەدڕێ. عەمرت درێژ بێ کوڕم، پیر و خەرۆ بی. ئەگەر ئێمە توانیبامان خوێنی ئەو عادیلە بڕێژین، شان و شکۆی گۆملیکسیزەکان دەچووە کەشکەڵانی ئاسمانێ.

کوڕێژگە قسەکەی لە زاری بابی وەرگرتەوە:

-، بەڵام چ بکەین بنەماڵەی گوملکسیز دەست لەسەر پیر و پەککەوتان بەرز ناکەنەوە.

باوکی بۆی سەلماند و گوتی:

- هیچ کات کوڕی خۆم، هیچ کات بەرزی ناکەنەوە.

کوڕە سینگی هێنایە پێشەوە و بە غرووڕەوە گوتی:

- خۆ ئەگەر تەمەنی عادیل کەمتر بوایە، بنەماڵەی گوملکسیز لە ئاسمانێ لەتوپەتیان دەکرد.

گوملکسیز سەری بۆ لەقاند و گوتی:

- ئاخ، دەرفەتێکی گەورەمان لە کیس خۆمان دا. ئەوە کام گوملکسیز بوو ئەو نەریتە قۆڕەی داناوە...

منداڵەکە گوتی:

- بێدەنگ بە بابە گیان، بنەماڵەی گوملکسیز دەزانێ چ دەکا. خۆت گوناحبار مەکە. گوملکسیزەکان هەموو کارێکیان باشە. هەرچی کردوویانە ڕاستە.

باوکە گوتی: چیی کردوویانە ڕاستە. و دیسانەوە چاوی بە کەلێنی دەرگاکەوە نا.

منداڵەکە دەیزانی ئیتر دەبێ بێدەنگ بێ، بۆیە چووە لای مانگاکە. مانگاکە خەوتبوو. چاخەکانی درێژ بوون. کوڕە دەستی بەسەر شاخەکانیدا دەهێنا. گوملکسیز ئۆغڵو لەوە زیاتر تاقەتی نەهێنابوو و چووبوو مانگاکەی لە ئەشکەوتی پەرییانەوە هێنابۆوە ماڵێ. دوای شاردنەوەیان، ئەو مانگایە یەکەم ئاژەڵێك بوو دەگەڕایەوە ئاوەدانی.

گوملکسیز لە قەڵشتی دەرگاکەوە سەیری دەرێی کرد و دیتی تارماییەکە وا بەرەو ماڵەکەی ئەو دێ. بەخۆی گوت:

"دیارە پەرییەکان پێیان گوتووە، ئەحە شێت، بچۆ ماڵی گوملکسیز و میوانی بە. ئەو گەورە ماڵە و مایەی شانازیی ئادەمیزادە.

بەر لەوەی ئەحە شێت بگاتە بەر دەرگاکە، گوملکسیز دەرگاکەی کردەوە و هەرای کرد:

- فەرموو برالە، بەخێر بێی بۆ ماڵەرەسەنەکەی گوملکسیز. ئەوە هۆزی پەرییان ناردوویانی بۆ لای من. ئەگینا ئەتۆ میوانی کەس نابی. هەر بژین ئەوانەی تۆیان ناردووەتە لای مـن. بێ وەی بن. سەر سەر و سەرچاوان بەخێر هاتی. خێر و بەرەکەتت هێنا.

شێتە گوێی نەدایە ئەو قسانە. وەژوور کەوت. سێ هەنگاو چووە پێشێ و ڕاوەستا. بەفر هەموو گیانی داپۆشیبوو.

گوملکسیز لێی چووە پێشێ و گوتی:

- فەرموو برالە. وەرە دانیشە.

شێتە لەوەپتر نەچووە پێشێ. چاوێکی وای لێکرد، گوملکسیز لە جێی خۆی وشك بوو. شێتە دەستی پێکرد:

- دڵدارەکان وەبن بەفرێ کەوتن و ڕەقەڵاتن.

دوایی ڕووی لە گوملکسیز کرد و نەڕاندی:

- ئەتۆش لەو گوندە دای. سەگی ئەو گوندەی.

چەند جارێك بە نەڕنەڕەوە ئەوەی دووپاتە کردەوە. دوایی لەسەرخۆ و بە لەبزێکی گەپچاڕانەوە کە کاری لە ناخی بنیادەم دەکرد لەسەری ڕۆیی:

- بنەماڵە و ڕەچەڵەکی گوملکسیز لە ڕەچەڵەکی سەگن. هیچ و پووچترین و فێڵبازترین بنەماڵەن. سەگ و ئاژەڵ و ژن و منداڵی، گەنج و پیری هەر هەمووی درۆزنن. دەزانی بۆچی پێیان گوتوون گوملکسیز؟ گوایە باپیرەیان کراسەکەی خۆی دەدایە فەقیر و هەژاران و بۆخۆی بەردەوام بە ڕووت و قووتی دەگەڕا و ساڵدەری دوازدەی مانگان کراسی لەبەردا نەبوو. ئەوانە هەمووی درۆن. ڕاستییەکەیت دەوێ، ئەوەندە دەستکورت و هەژار بوو، لە ژیانیدا کراسێکی پێ نەکڕدرا. هەر بۆیەش پێیان دەگوت گوملکسیز. دەڵێن سوپایی بووە. ئاخر ئەو بنەماڵەیە کەنگێ ئەسپێکیان لە دەرکێ بووە هەتا ببنە سوپایی؟ درۆزنانە، بنەماڵەی گوملکسیز، بنەماڵەی گوملکسیز سەگی ترسنۆکن. منارە سەلکەسەرەکەیان بەقوربانی چاویان بێ. گوملکسیزە ترسنۆکەکان لە ژیانیاندا مێروولەیەکیشیان نەکوشتووە. دیارە کارێکی باشیشیان کردووە. خودا جووقەوار لەو کەسانە نەهێڵێتەوە کە لە سەلکەسەر منارە ساز دەکەن. ئەو بنیادەمە درۆزنەش کە شانازی بەو کارەوە دەکا، یاخوا مووی لەسەری زمانی بێ و چاوی کوێر بن و دەستەکانی گۆج بن. ئەو منداڵە مەخەڵەتێنە. لێی گەڕێ با ببێتە بەشەر، نەك وەك تۆ بچێ. ئیتر کارم بەسەر تۆ و باب و باپیرە چەپەڵە سوپاییەکەی تۆ و ئەو بنەماڵە داماوەی گوملکسیزەکانەوە نییە. پادشای درۆزنەکان.

پشتی تێ کرد و گوتی:

- دڵدارەکان ڕایانکرد و وەبن ڕنووی بەفرێ کەوتن. و دەرپەڕی و لە چرکەیەکدا لە چاوان نەدیو بوو. کڕێوە و باڕن کردبوویە قیامەت.

گوملکسیز ڕووی لە کوڕەکەی کرد و گوتی:
ـ شێتە. ئەو شێتانە زۆر درۆیان دەکەن. بنەماڵە و ڕەچەڵەکی گوملکسیزەکان، زیندوویان ـەو کێوانەوە نەهێشتووەتەوە، هەر هەموویان قەڵتوبڕ کردوون. هەر بۆیەشە هەموان لە گوملکسیزەکان تۆقیون. درۆیە، درۆیە، شێتەکان بەردەوام درۆیان دەکەن.
شێتە لەوێوە بە غاردانێ بەرەو ماڵەکەی کوستۆ ئۆغلو چوو. وەژوور کەوت و گوتی:
ـ عاشقەکان وەبن بەفرێ کەوتن و ڕەقەڵاتن، بەڵام کوستو ئۆغلو کابرایەکی چڵمنی داهێزراوە و هەر لە خۆڕایی لەسەر ئەم دنیایەیە. مێشکی کەری خواردووە. چلساڵان کراسەکەی لەبەر دەکات و ـێڵاوەکەی لەپێ دەکات و کۆنیان ناکا. چوارپێی ماڵی خەڵکی حەوت هەشت ساڵان دژیێ کەچی ـەگی ماڵە کوستو ئۆغلێ چل ساڵان دەژیێ. لە جێی خۆی نابزوێ. سەگبابە تەنانەت دەستیشی ناجووڵێنێ. بنەماڵەی کۆستوو هەمووی ئاوا داهێزراون، داهێزراو، داهێزراو، داهێزراو... لە (خەلیل تەمبەڵ)یش داهێزراوتر. دڵدارەکان ڕایانکرد و وەبن کەویی بەفران کەوتن....
ئەو ماڵەی دوای ئەوە وەك با خۆی پێدا کرد، ماڵی (خەلیلە تەمبەڵ) بوو. "تەمبەڵ" هێشتا لەبەر دەرگاکە دانیشتبوو و خەریك بوو خۆڵی سەر قوولکەکەی لا دەدا. خاکەکەی بە دوو پەنجە هەڵدەگرت و لەو لاوە ڕۆی دەکرد، دەتگوت بە مەقاشەکە هەڵیدەگرێ.
شێتە گوتی:
ـ دڵدارەکان ڕایانکرد و لە بەفرێدا ڕەق هەڵاتن.
ئەوجار بەسەر تەمبەڵەوە ڕاوەستا و سەیری جووڵە ئەسپاییەکانی ئەوی کرد و گوتی:
ـ یا ئەڵڵا...
دوایی تووڕە بوو و تفێکی گەورەی لە نێوچاوانی کرد.
خەلیلە تەمبەڵ بە سەرسووڕماوییەوە سەیری کرد. چاوی تێوەبڕیبوو و لەسەر جێی خۆی وشك ببوو.
ئەحە شێتە، ڕقی لەو نیگا بێ واتایانە هەستا و دەرپەڕییە دەرێ و دووپاتەی دەکردەوە:
ـ دڵدارەکان ڕایانکرد و لە بن بەفرێدا ڕەقەڵاتن.
ئەو تەمبەڵانە، ئەو "کوستو"انە هەر وا بوون. ئەو جووتە ئامۆزا بوون. ئەو گاسنەی زەوییان پێ دەکێڵا میراتی باپیرەیان بوو. کەچی گاسنی خەڵکی دیکە سێ ساڵی نەدەبرد و کۆن دەبوو. کوستو ئۆغلو ئەوەندە لەسەرەخۆ بەڕێیەدا دەڕۆیی لە ژیانیدا لاقی لە بەردێك یان ڕەگی دارێك هەڵنەدەنگوت. مەحاڵ بوو پێ لەسەر مێرووەك، گیانلەبەرێك یان تەنانەت گەڵایەکیش دابنێ. خەلیلە تەمبەڵیش هەر وا بوو.
بە لەوەی ڕۆژ بێتەوە، لە ماڵێ وەدەر دەکەوت و لای نیوەڕۆیە دەگەیشتە مەزراکەی. گاسن و نیر و ئامووری دەبەست، هەتا دوو ڕیزی دەکێڵا ئێوارە دادەهات. خەلیلە تەمبەڵیش هەر وا بوو.

باب و باپیرەکانی کوستۆ ئۆغلو و خەلیلەپیریش هەر وا بوون. خەڵك پێیان وا بوو منداڵەکانیان لەوەش خراپتر دەبن، ئەگەر بەیانی لە ماڵێ وەدەر کەون، بۆ نیوەڕۆ ناگەنە بەر دەرگای ماڵی کوێخا. لە لۆکە ڕنینەوەشدا ئەگەر خەڵك بیست کیلۆ لۆکە کۆ بکەنەوە، ئەوان تازە کیلۆیەك خڕ دەکەنەوە.

ئەحە شێت لەوێوە چووە ماڵی قیرسمایل. وەك گلۆڵە بەفرێکی سەهۆڵین وەژوور کەوت. ماڵەکەی هەموویان زراویان لێی چوو. ڕدێنە درێژ و خورماییەکەی وەبن بەفرێ کەوتبوو و برۆیەکانیشی ببوونە یەکپارچە سەهۆڵ.

شێتە زانیی لێی ترساون و گوتی:

ـ مەترسن، مەترسن. خۆ پیاوخۆر نیم. دلدارەکان وەبن بەفرێ کەوتن و ڕەقەڵاتن. کابرا، تۆ لەبری ئەوەی لە من بترسێی ئاگات لە کچەکەت بێ. سەیری ئەو شاخانەی لەسەرت ڕواون. کوێخا وا لە کچەکەت دەکا. چما دەبێ ئاگات لێ نەبێ. لەسەر دوو ژنان-ڕا، کچەکەی تۆشی کردووەتە ژنی سێهەمی خۆی. ئەتۆش خەنی بووی کە کچەکەت دەبێتە ژنی کوێخا. ئەنگۆ خەڵکێکی هیچ و پووچن. لە جێی ئەوەی کچەکەت بدەیتە کوێخای چوارچاو* بۆچی نایدەیتە کوڕەکەی "وەلی"یە کەچەڵ؟ لێی گەڕێ با ئەو داماوەش خۆشی لەخۆی ببینێ. با سمت و سۆڵێك لە باوەش بگرێ. نەخۆشی و گرویێی و سیل ئەو گوندە وێران دەکا. دلدارەکان وەبن بەفرێ کەوتن و مردن.

قیرسمایل و ژنەکەی و ئەوانیتر متەقیان لێوە نەهات. شێتە هەر وا بە هەشتاو دەرپەڕییە دەرێ و تێکەڵی با و بۆرانەکە بوو و لەچاوان ون بوو.

ماڵەکەی "مچە تووڕە" لەو سەری گوندەکە بە شانی ڕاستەوە بوو. دەرگای ماڵیشی لەسەر پشت بوو. ئەحە شێت خۆی خستە ماڵەوە:

ـ دلدارەکان مردن و لە بن بەفرێدا مانەوە. ئەنگۆ لە عادیل دەترسێن. لە مێروولەیەك تۆقیون... تۆش لە تەنیشت ئاگردانێ لێی تخێڵ بووی و گونەکانت گەرم دادێنی. بوویەتە نۆکەر ئەو کوێخا کافرە. کیری فیلت شکاندووە. ەتۆش وەکو هەموو ئەو گوندییانە بوویەتە کابرایەکی زەلیل و هیچ و پووچ. پیاوەتیت لەبیر چۆتەوە. دلدارەکان وەبن بەفرێ کەوتن و ڕەقەڵاتن.

---

* چوار چاو: لە کوردیدا بەو پیاوانە دەگوترێ کە دوو ژنیان هەیە. دەڵێن سێحەبی چوار چاون.

دەیزانی مچە زۆر زوو هەڵدەچێ و بێت و دەستی بێگاتێ ورد و پردی دەکا. لەگەڵ قسەی دڵی کرد، دەرپەڕییە دەرەوە و هەرای کرد:

- هووووووو... هووووووووووووو... هووووووووووووووو....

دەیزانی چیی بەسەر دێ. وەك با دەڕۆیی. بەو حاڵەشەوە مچە گرتییەوە و بە شەپلاغەیەك خستی و لەو با و بۆرانەدا بەجێی هێشت و گەڕایەوە ماڵەکەی خۆی.

ئەحە شێت کە بڕێك دواتر وەخۆی هاتبۆوە، خۆی گەیاندە نزیکترین ماڵ:

- دڵدارەکان وەبن بەفرێ کەوتن و ڕەق هەڵاتن. خودا غەزەب لە مچە تووڕە بگرێ. یاخوا ماڵ و ژن و منداڵی وەبن بەفرێ کەون. یاخوا هەوەر تریشقە لەو گوندە بدا. لەبری بەفر ماری بەسەردا بباریێ.

دوای ئەوە سەری بە ماڵی "ئۆکسوز ئۆغلان" و "هەوا گوڕ" و "حەسەن گواوی" و "عەلی"یە درێژ و "مراد درۆزن" و هەموو خەڵکی ئاواییدا کرد. کە گەیشتە ماڵەکەی کوێخا، هەوا بەرەو تاریکی دەچوو. بەرەوڕووی کوێخا ڕاوەستا و دوو سەعاتی تەواو، چیی لە زاری هاتە دەرێ پێی گوت. لە بابییەوە پێیدا هات. لە چل ساڵ لەمەوبەرەوە هیچ ڕووداوێکی ئەو گوندەی لەبیر نەچووبۆوە. هەموو ڕووداوەکانی بە وردی دەگێڕایەوە. ئاخرییەکەی بە گوڕەگوڕ گوتی:

- ئەو تاشباشە دەتکوژێ. وەبن بەفرێ دەکەوی. بە دەستی تاشباش تێدا دەچی.

و لە ماڵی وەدەر کەوت.

ماڵ نەمابوو لە ئاواییدا سەری پێدا نەکردبێ. ماڵەکەی کوێخاش سێ کەس لە ئەندامەکانی ئەنجوومەنی ئاوەدانی و دوو میوانی گوندێکی دیکەشی لێ بوون.

ئێستا دەچووە لای تاشباش. هێمن و بە ڕێز و حورمەتەوە. کە گەیشتە بەر دەرگای ماڵەکەی، ساتێك بە حورمەتەوە ڕاوەستا. ئەوجار هێدی و نەرم سێ جاران دەرگاکەی ماچ کرد. کوڕەکەی تاشباش دەرگای لێ کردەوە. شێتە وەژوور کەوت. چووە پێشێ و کۆڵەکەی نێوەڕاستی ژوورەکەشی سێ جاران ماچ کرد. بەفرێکی زیاتر لەسەر دەموچاو و ڕدێنی نیشتبوو. چلوورەی سەر و دەموچاوی و سمێڵەکانی درێژتر ببوونەوە. شێتە یەکپارچە بەفر بوو. دەتگوت بنیادەمە بەفرینەیەك وەژوور کەوتووە.

لە ژوورەوە، مرێمۆك لە تەنیشت ژنە بریندارەکەوە دانیشتبوو و بە چاوی لە ژێلڵا هاتۆوە سەیری ئەحە شێتی دەکرد. لەوەتەی گەڕابۆوە گوندەکە، چاوی پێی نەکەوتبوو. لەو سەری

ئاگردانەکەوە عەلی"یە درێژ و زەڵە پیرە و ئۆککەش داغ قوردۆ و مەحموودە گڕوێ و دۆردومان و ئاشقەکەچەڵە دانیشتبوون و قسەیان نەدەکرد.
تاشباش لە لایەکەوە ڕاوەستابوو و پاڵی دابوو بە دیوارەکەوە.
کە چاویان بە ئەحە شێت کەوت، سەریان سوورما. شێتە دەیویست چ بە تاشباش بڵێ؟ دەیانزانی چیی بە کوێخا و ئەوانیتر گوتووە و چۆن دەردی سەگی داونەتێ.
شێتە سەری داخستبوو، وردە وردە هاتە پێشەوە و بەرەورووی تاشباش ڕاوەستا. سەری بەردابۆوە. گوتی:
- دڵدارەکان وەبن بەفرێ کەوتن و ڕەقەڵاتن.
دەنگی وەك نووزە و ناڵەی شینگێڕی تاڵ و دڵتەزێن بوو. تاشباش بەو دەنگە چاوی پڕ بوون لە ئاو.
شێتە سەری هەڵێنا و چاوی لە چاوەکانی تاشباش بڕی و گوتی:
- ئەو گوندە بەهار بەخۆیەوە نابینێ. کێڵگە و مەزرای شین نابنەوە. ژنەکانی لە زگ دەوەستن. بوومەلەرزە و لافاو دەیبا. لە ئاسمانەوە غەززەب و مار دەبارێ و ئەگەر هەتا ئێستاش وێران نەبووە، ئەی تاشباش، ئەوە لەبەر خاتری تۆیە.
لەپڕ چۆکی دادا و سێ جاران خاکی بەرپێی ماچ کرد و هەستا و دەرپەڕییە دەرێ. دەرگاکەی دانەخست. کرێوە و بارنەکە لە دەرگاوە هروژمی هێنا و گەییە بەر ئاگردانەکە. ئەو کلووە بەفرانەی کەوتنە ئاگردانەکەوە، چزەیان لێ هەستا.
تاشباش ئۆغلۆ دوای ماوەیەك بەخۆی هاتەوە و بە چاوی فرمێسکاوییەوە لە بن لێوانەوە گوتی:
- ئەحەی خۆم، ڕۆڵەم، ڕۆڵە شێتەکەی خۆم، پیاوچاکەکەی خۆم، بێ ماڵ و حاڵەکەم.
ئەوەی کە ئەحە شێت ماڵ بە ماڵی گوندەکە گەڕابوو و جنێوی بە هەمووان دابوو، بەڵام کە گەییبووە ماڵەکەی تاشباش، لە هەنتەشی ئەودا چۆکی دادابوو و سێ جاران عەرزەکەی ماچ کردبوو و ئەو قسانەی کردبوونی، دەمودەست کەوتە سەرزاری هەموو گوندەکە.
ئەو شەوە گوندی نەنووستن و تا بەیانی هەر باسی تاشباش ئۆغلۆ و ئەحە شێتیان کرد.

## ٢٣

بێ و نەبێ ئەو تاشباشە شتێکی لە بن سەری دایە. حازرم دەستم بنێمە نێـو ئـاگرەوە ئـەو ماستە بێ موو نییە. ئەگینا چۆن ئـەو شـێتەی خـودای، ئەحـە شـێتەی زاوای شـای پـەرییان، هەموو گوندەکە جنێو باران بکا و دوایی بێ و لەبـەردەم تاشباشـدا چـۆك دابـدات و عەرزەکـە ماچ بکا و دواییش ئەو قسە سەیر و سەمەرانە بکا. دواییش ئەو قسانەی تاشباش کـە پیـاوی شێت دەکەن، کێ دەتوانێ قسەی ئاوا بکا؟ لـە وەتـەی دنیـا دنیایـە، تـەنیا ئەوانـەی ئـەولیای خودان، توانیویانە قسەی وا بکەن.

دوو سێ ڕۆژێك بو کەس سەردانی تاشباشی نەدەکرد. ئەویش لە مـاڵێ وەدەر نەدەکـەوت و هەر خەریکی برینی سەری ژنەکـەی بـوو. مەڵحەمەکـەی مرێمـۆکیش کـاری کردبـوو و بـرینی سەری ژنەکە خەریك بوو سارێژ دەبووەوە.

گوندییەکان سێ ڕۆژ بوو لە تاشباش نزیك نەدەبوونەوە، بەڵام لە دوورەوە چاویان بەسەر هەموو جووڵە و هەڵسوکەوتەکانییەوە بوو و دەیانزانی لە ماڵەوە چیی بە ژن و منداڵەکەی گوتووە و چۆن دانیشتووە و چۆن هەسـتاوە، چـیی خـواردووە و چـیی خواردووەتـەوە. هـەر هەموو ئەو شتانەیان دەزانی. جار بە جاریش پترِی لێ دەترسان. وردەوردە هـەموو فکـر و زیکریان ببووە تاشباش.

چەند ڕۆژێکی بەسـەردا هـات. ئـیتر گوندییـەکان هـەر لـە دوورەوە و بـە دزییـەوە سـەیری ماڵەکەی ئەویان دەکرد. منداڵەکان هەست و خوستیان لـە خۆیـان دەبـڕی و بەسـەری پەنجـەیان بەسپایی لە ماڵەکەی نزیك دەبوونەوە و دوایی بە ترس و لەرزەوە، دەگەڕانەوە و غاریان دەدا.

تاشباش ئۆغڵوش هەستی بەهێندێ شت کردبوو و لە ماڵەکەی وەدەر نەدەکەوت. ئـەویش کەوتبووە بن بارستایی قورسی هەستی بارینی نەگبەتییەك. شتێك بەڕێوە بوو. ئـەو جموجۆڵ و

هەڵسوكەوتەی گوندییەكان پەیوەندیی بەوەوە هەبوو، بەڵام چ بوو؟ بەردەوام نیگـای نیگـەران و تۆقیوی ئەوانی بەسەرەوە بوو. ئەو نیگایانەی وەك خەنجەرێك لە پشتی ڕۆدەچوون...

ڕۆژێكیان لەماڵەكەی هاتە دەرێ بچێ بۆ ماڵی عەلی"یە درێژ. لە نیوەی ڕێیە ناچـار بـوو بگەڕێتەوە. ئەوەندە سەیر و سەمەرە لێیان دەڕوانی لە تاریف نایە. بەساڵاچووەكان چۆنی بـێ دەیانتوانی بەسەر خۆیانا زاڵ بن و هەوڵیان دەدا، هەستی خۆیان بشارنەوە و دەرینـەبڕن، بـەڵام منداڵەكان هەر چاویان بە تاشباش دەكەوت، وا دەترسـان و كورشـەیان دەكـرد یـان ڕایانـدەكرد وەك بڵێی لە كون و قوژبنێك بگەڕێن خۆیانی تێدا وەشارن.

تاشباش ئۆغلۆش پێی وابوو ئەو گوندییانە شتێكیان لەبن سەری دایە. ئەوانـە شـتێك دەزانن. بەخۆی دەگوت:"دڵنیام هەڵسوكەوتی ئەو خەڵكە ئاسایی نییـە. منـداڵ ئاوێنـەی هەڵسوكەوتی گەورەكانن. باشە بۆچی ئاوا بە ترس و لەرزەوە لـێم دەڕوانـن و دوایـیش بـە ترسەوە ڕا دەكەن و خۆیان دەشارنەوە؟ نابێ پەلەی بكەم. دەبێ ڕاوەستم بزانم ئاخری چـیی لێ شین دەبێتەوە."



ـ گوتی ئەو گوندە بەردی لێ دەبارێ... بەردی بە سەردا دەبارێ...

ـ چووزانێ؟...

ـ گـوتی ژنـانی هـەر شەسـت گوندەكـەی تـۆرووس لـە زگ دەوەسـتن. مـەڕ و مانگـا و ئەسپەكانیش تازە نازێن. خاك هیچ گیای لێ شین نابن. گیای ئەو كێوانـەش دەفـەوتێن و هـەر بەردە هەڵبرینگاوەكان لە جێیەكەیان دەمێننەوە. بەردەكانیش ورد و پـرد دەبـن و كێوەكـانیش لەبەر تەپوتۆزی ژەهراوی نابینرێن.

ـ چووزانێ؟

ـ گوتی كاتێ ئاوەكان ڕاوەستن و بمەیێن و "با" لە شنە بكەون و ئـەو تـۆوەی بـە دەچـێنرێ ئیدی شین نەبێتەوە و شیناوەردەكان وشك بن و مرۆڤ دەست و پێی لە جوولە بكەون، واتە كاتێ دنیا بمرێ، لەگەڵ هاتنی نەورۆزیشدا دنیا ناژیێتەوە... نابووژێتەوە و هەموو شتێك تێدا دەچێ.

ـ باشە چووزانێ؟...

ـ ئەو تاشـباش ئۆغلۆوە زۆر شـت دەزانـێ. دەڵـێ چـوكووراواییەكان ئیـدی لۆكـە ناچـێنن، بشچێنن، هەر بە مەكینە دەیڕننەوە و دەیپشكنن.

ئەو نەگبەتییە ئەمرۆش بەسەرمان نەیە سبەی هەر دێ. ئیدی چوکووراوای چی. نابێ هیوامان بە چوکووراوای هەبێ. دەبێ وازی لێ بێنین و لە دڵی ئەو چیایانەدا ڕێگە چارە و گوزەرانێك بۆخۆمان بدۆزینەوە.

- چۆن دەزانێ؟...

- بنیادەم حەزی لە ڕووناکاییە. بۆ تیرۆژە تیشکێك ئامادەیە گیان بدا. ئەگەر وا نەبێ، ئەو پەردە تاریکەی بەسەر خۆماندا کێشاوە، وەك هەورێك دەخزێ و دەورەمان دەگرێ و هەرگیز لە تاریکایی ڕزگاریمان نایە و هەتا مردنێ هەر لە تاریکاییدا دەبین.

- باشە چووزانێ؟...

- گوتی: ئەو دەشتە خۆڵەمێشییە و ئەو زەوییە بێ بەرەکەت و سووتا دەقەڵشێ، لە نێوان قەڵشەکەیەوە بڵێسەی ئاگر دێتە دەرێ و هەموو پێدەشتەکە دەکاتە دەریایەکی ئاگر. لە بڵێسەی ئەو دەریا ئاگرە مرۆڤ تەنانەت لەسەر لووتکەی تۆرووسیش لە ئەماندا نابێ.

- باشە چووزانێ؟...

- ئەو تاشباش ئۆغلۆ شتێکی لەبن سەری دایە. وایە، بابم شتێك هەیە، بەڵام چییە؟... گوتی باڵندەکان و زەردەواڵەکان و تەنانەت فڕۆکەکانیش لە ترسانا بەسەر ئەو گوندەدا نافڕن.

- باشە چووزانێ؟...

- دار و نەداری خۆیانیان شاردەوە و ئەو نەیشاردەوە. گوتی عادیل نایە...

- باشە چووزانێ؟...

- ئەحە شێتووکە ماڵ بە ماڵ گەڕا و جنێوی بەهەمووان دا، بەڵام هات و لە ماڵەکەی تاشباشدا عەرزەکەی ماچ کرد. لە بەردەم تاشباش... و باسی ڕاکردنی دڵدارەکان و ڕەقهەڵاتنیانی کرد...

- باشە چووزانێ؟...

ورده ورده، بە تێپەڕینی ڕۆژەکان تاشباش لە مێشکی گوندییەکاندا دەبووە پرسیارێك. پرسیارەکان هەر دەهاتن و پتر دەبوون و لەوانەبوو زۆریش هەست پێکراو. لە ماڵ وەدەرنەکەوتنەکەی تاشباشیش ئەو دەنگۆیانەی پتر دەکرد.

ئێستا و لەو ساتەدا ئیدی تاشباش هەر ئەو کەسە نەبوو کە لە ئاوایی و لە ماڵەکەی خۆیدا دەژیێ. تاشباش پیاوچاکی ئەو گوندە و ئەو کێوانە بوو کە هەزار ساڵ بوو هەبوو. بێت و بڕێکیان هەوڵ دابایە و هەنگاوێکیان زیاتر نابایە، دەیانتوانی ئەو مەسەلەی تاشباشە بگەیێننە جێیەك کە هەر هەموویان لەخودایان دەویست، بەڵام کەس نەیدەوێرا ئەو هەنگاوە بنێ.

زەڵەجە هەمموو شەوێ لانیکەم دووجاران خەونی بە تاشباشەوە دەدی. چەند جاران ویستبووی ئەو خەونانە بۆ کوێخا بگێڕێتەوە و داوای لێ بکا بۆی لێک بداتەوە، بەڵام کوێخا زۆری لێ تووڕە ببوو و دەری کردبووە دەرەوە.

ـ ئەگەر هات و جارێکی دیکە خەونت بە تاشباشەوە بینی، مەیە لای من. خەونی ئەو کابرایە بۆ من و بنەماڵەکەم بێفەڕە.

زەڵەجەش خۆی پێ نەگیرابوو و خەونەکانی خۆی بۆ هەموو کەس گێڕابۆوە و گوندییەکانی بە گیان و دڵ گوێیان بۆ ئەو خەونانە هەڵدەخست کە ئەو بە تاشباشییەوە دەدیتن و زەڵەش شاگەشکە دەبوو. گەرچی کەس وەك کوێخا سەفەر نەیدەزانی خەونەکانی بۆ لێك داتەوە و هەر ئەوەی کە خەڵکەکە ئاوا بە تاسەوە گوێیان دەدایە گێڕانەوەکەی، ئەو چێژی وەردەگرت:

ـ چارشێوێکم پێدا درا، چارشێوێك لە تاریکایی. تاریکایی وەك ئاو لووزەو دەبەستێ و هەر چوار دەورەم دەگرێ، لە ئاسمانەوە بەسەرمدا دەبارێ. ئەمن کروشمە دەکەم. دەکەومە سەر عەرزی و ڕادەکشێم. تاریکاییەکە دێتە خوارتر، خوارتر و خوارتریش. بە زەوییەوە دەنووسێ. ئەوەندە قورسە پشووم لێ دەبڕێ. خەریکە دەخنکێم. دەست و پێم سڕ بون. لەو دەمەدا تاریکاییەکە وەك بلێی بە شمشێرێك ببڕدرێ، درزی برد و بوو بە دوو بەش. ئەمن لە درزەکەیەوە توانیم هەناسە بکێشم. کە وەخۆ هاتمەوە دەزانن چیم دی؟ دەستێکم دی لەو درزەوە هاتە دەرێ. دەستێ جوان. خوایە ئەوە دەستی کێیە؟ ڕوخسارەکەی پشت ئەو دەستە کێیە؟ سات بە سات نزیکتر دەبەوە، بەڵام ناتوانم سەیری ئەو ڕوخسارە بکەم. چاوەکان بە مۆڵەق دەوەستن. ڕوخسارەکە نوقمی نوورە و سەوزە. بە قژەکەی دەیناسمەوە. ئەو ڕوخسارە دەموچاوی تاشباشە... خۆمی بەسەر پێڵاوەکانیدا دەکێشم. تاریکاییەکە وەك لافاوێك بەسەرمدا دەکشێ و دەڕوا. لە خەو ڕادەپەڕم... دەچمە دەرەوە و خۆم دەگەیێنمە ماڵەکەی تاشباش و چ ببینم...

ـ چیت دی؟...

زەڵەجە ئیدی ئەوەی بە کەس نەدەگوت. نهێنییە گەورەکەی بۆخۆی هێشتەوە. گوندییەکانیش هەستیان دەکرد ئەو ماستە بێ موو نییە. هەر دەهاتن و دڕدۆنگتر دەبوون. زۆریان لە زەڵەجە دەکرد:

ـ چما پیاو بە نیوەشەوێ لە ماڵی تاشباش چی دەبینێ؟...

بەڵام نەیاندەتوانی یەك وشەش لەبن زمانی زەڵەجەی بێننە دەرێ.

زەڵەجە دەیگوت:

ـ قسه مەكەن. قسەمەكەن لەسەرتان گەڕێم. ناچارم مەكەن بیلێم. زارم خوار دەبێ و دەست و پێم وەك وشكەڵەدار وشك دەبن. تۆوخوداكەتان ناچارم مەكەن بیلێم.

بێدەنگییەكەی زەڵەجە دەبووە هۆی ئەوەی لە مێشكی هەركام لە گوندییەكاندا خولیایەك و دنیایەكی تێكەڵاو لەگەڵ ڕاستی و خەون و خەیاڵ بیچم بگرێ. هیچ كەسیش ئەوەی لە مێشكی خۆیدا بوو بەویدیكەی نەدەگوت. لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژەكان، تاشباش دوورتر دەكەوتەوە و زیاتر دەبووە كەسێكی سێحراویی و خەیاڵی.

ــ هەر بەراست تاشباش چیی گوت؟... گوتی شەوێكیان لە خەوێ هەڵدەستین دەبینین تاریكاییەكە نەماوە و مانگ و ئەستێرەكانیش نەماون. ئەوانیان لە ژوور سەرمانەوە هەڵگرتووە و بردوویانن.... تاشباش چیی گوت؟ گوتی ڕۆژێكیان كەڕەی بەیانی لەپڕ دەبینین ئاسمانە شینەكەی ژوور سەرمان نەماوە. ڕاپانكێشاوە و بردوویانە. ڕۆژێك سەیر دەكەین و دەبینین دارستانەكەی تۆرووس نەماوە. بردوویانە. سەبارەت بە عادیلیش گوتی: یان دێ یان نایە.

ـ باشە چووزانی؟...

## ٢٤

کوێخا سەفەر سەری ببووە ماش و قوونی ببووە ئاش. کچەکەی قیرسمایلی لە مێشکی نەدەچووە دەرێ. لێبڕابوو بیهێنێ و بیکاتەی ژنی سێهەمی خۆی. لەو ڕۆژگارە دژوار و تاڵەدا ئەو کچە نەبوایە سەگ و شوانی دەهاتنەوە. کچە ببووە چرای ڕووناکی ئەو ڕۆژە ڕەشانەی و کوێخا تا تووشی تەنگانە دەبوو، دەینارد بۆی بێنن یان خۆی دەچووە ماڵەکەیان.

عادیل نەدەهات. هاتنێك لە گۆڕێ نەبوو. هەر بۆیەش ڕۆژ بە ڕۆژ گوندەکە خراپتر دەبوو. گوندییەکان هەنگاو بە هەنگاو لێی دەتەکینەوە و دوور دەکەوتنەوە. کوێخا ئەوەی بە چاوەکانی خۆی دەدی و بە گوێی خۆی دەیبیست. هەموو ئەو گێچەڵ و کێشانەی ئەو لە بن سەری هیچ و پووچییەکەی عادیلدا بوو.

"جا ئەوجار وەرە بۆ بەزمی تاشباش... گوندی ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ پیاوچاکێکی لێ دروست دەکەن. ئاگرەکەش لە گۆڕی عادیلەوە هەڵدایسێ. گوندی هەر لێی دەقەومێ، بە شوێن پەتێکەوەیە دەستی پێ بگرێ. دەست بۆ هەموو جۆرە پەتێك دەبا و بەری دەدا و ئاخرییەکەی ئەو پەتە دەگرێ کە پێی وایە پتەوترە و ناپسێ، ئیدی بەری نادا. هەر هەموو هیوای خۆی بەوەوە دەبەستێتەوە و پەنای بۆ دەبا. بێت و پەتێکی دەست نەکەوێ، خۆی پەتێك ساز دەکا و دوایی خۆی پێوە هەڵدەواسێ. گوندی بە پێی پەت ناژیێن.

"گوندی کە هیوایان بە هیچ شوێنێك نەما، تاشباش ئۆغڵوش کە مرۆڤێکی ژیر و زیرەکە، دەسبەجێ تێیان گەیشت و دەستی کرد بە جنێودان پێیان و وەك کتێبی پیرۆز تووك لەعنەتی لێ کردن و گوندییەکانیش لێی ترسان.

دوای ئەوەش ئەحە شێتی فێر کرد ئەو کارانە بکا و دواجاریش بێتەوە و لە بەردەمی ئەو چۆك دابدات و زەوی ماچ بکا. دوای ئەوە بوو گوندی بوونە یەکپارچە ئاگر و هەموو شتێکیان

**بووە تاشباش ئۆغلو. بێت و ئاوا بڕوا ـ تاشباش ئۆغلو، گەورەترین دوژمنی ئێمە، خۆی لەو خەڵکە دەکاتە پیر و پیاوچاك و دەبێتە پادشای بێ تاج و تەختی کێوەکانی تۆرووس و ئەوجار بە گوندی بڵێ بمرن، دەمرن.**

**"رۆژێك دادێ، سەیر دەکەی تاشباش ئۆغلو بە گوندییەکانی گوتووە، ئەو کوێخایەتان لە گوندەکەتان و هەروەها لە ناوچەی تۆرووسیش دوور بخنەوە. بێت ئاوا بڕوا، گوندی قسەی لە قسەیدا ناکەنەوە. ئەگەر عادیل نەیەتە ئاوایی و دوو قسەیان لەگەڵ نەکا، حاڵمان شپرێو دەبێ. جا ئەو جارە تۆ ناتوانی بەرۆکی خۆت لە چنگی تاشباش دەربێنی و تاشباشیش قەت ناتوانێ یەخەی خۆی لە چنگی گوندییەکان دەربێنێ."**

**ئەندامانی ئەنجوومەنی گوندەکە، ئەندامی یەکەم "کورت فاکی"، ئەندامی دووەم "زیبی دیك موسلو"، ئەندامی سێهەم "قادرزنجیر دۆغدو" و ئەندامی چوارەم "خەلیل کۆلەسیز ئۆغلو" و کوێخا سەفەر لە دەوری یەك دانیشتبوون و کۆببوونەوە. مەسەلەی تاشباش ئۆغلو کە هەر دەهات و وەك ڕنووە بەفرێك گەورە دەبووەوە، هێنابووە بەر باس و تەگبیر و ڕایان بوو بۆ چارەکردنی.**

**زیبی دیك موسلو گوتی:**

**ـ هیچ بیانوویەکی قانوونیمان نییە دەسبەسەری بکەین. تاشباش ئۆغلو نە لە ماڵەکەی وەدەر دەکەوێ و نە ئیزنیش دەدا کەس بچێتە ماڵەکەی. دیارە جگە لە مرێمۆك.**

سەفەر:

ـ باش خۆی خوێندۆتەوە. پیاوێکی زیرەکە. دەزانێ چی دەکا، بەڵام چیم بەسەر مورتەزای هێنا ئەوەش بەسەر تاشباش ئۆغلوی دێنم. هەروەها بە دەهۆ بۆ کارێکی دەنێرم. تاشباش زادەکەی ئێمە باش لەوەی دەزانێ...

موسلو:

ـ بیانوویەکی یاساییمان نییە. جارێ هیچ بیانووەك نییە. هیچ ناکرێ. ئەوەیان ئیدی مورتەزا نییە. مورتەزا کابرایەکی داماوی دەستەوستانە. تاشباش ئۆغلو لە کوێ و ئەو لە کوێ؟ نیوەی گوندەکە خزم و کەسوکاری تاشباشن و نیوەکەی دیکەش چیی وای نەماوە کڕنۆشی بۆ بەرن و بیپەرستن. دەبێ لێی بترسین. ئەوە بە دەردێکمان دەبا. ئەویش لەو حاڵ و وەزعەدا. گوندی لە هەموو شتێك ماندوو و بێزار بوون و هیوایان بە دنیا نەماوە. بۆوەی دەبێ لێی بترسین.

کوێخا سەفەر ئاخێکی هەڵکێشا و بە شڵەژاوییەوە گوتی:

ـ بۆوەی دەبێ. ئەو کارە هەر دێ و ئاڵۆزتر دەبێ. گوندی ڕۆژ بە ڕۆژ خەریکن تاشباش دەکەنە ئەولیا. ئەو وەزعە نابێ درێژەی بێ. ڕۆژێك دادێ دەبینی تاشباش بووەتە پیاوچاکێك و هەرچی لەولاوە دێ شوێن پێیەکانی ماچ دەکا. ئەو کات جا وەرە و ئەو کەرە لەو قوڕەی دەربێنەوە. عادیل هەر دەبێ بێت و خۆی نیشانی ئەو گوندییانە بدا. لانیکەم با پێیان بڵێ ئەمساڵ قەرزەکانم لێتان ناوێتەوە. من ئەگەر پێیان بڵێم عادیل ئەمساڵ نایە و قەرزەکانی ناوێتەوە، بڕوا ناکەن، تۆ ئەگەر بڵێ بڕوا دەکەن. تەنانەت ئەگەر تاشباش ئۆغڵوش پێیان بڵێ دیسانیش بڕوا ناکەن. ئەوان هەر وا لە چاوەڕوانیدا دەمێننەوە. لە وەها بنبەستێکدا گیرم خواردووە نەبێتەوە. قسەی تێدا نییە عادیل دەبێ بێ. ئەمن ناتوانم لەگەڵ ئێوە بێمە لای عادیل ئەفەنییەکەمان، هەر باش نییە. دەبێ ئێوە بچن و پێی بڵێن وەزعەکە ئاوایە. ئەگەر نەیە ئاڵۆزتر دەبێ. تاشباش ئۆغڵو یەکەم بریسکەیەکە کە لەو گوندە بەرز دەبێتەوە و دوایی دەبێتە سووتمانێك کە سەرانسەری ناوچەی تۆرووس دەگرێتەوە. هەتا تاشباش نەبووەتە بەڵای گیانمان، خۆی بگەیەنێتە ئێرە. ئەگەر سێ ڕۆژی دیکەی پێ بچێ و دەنگۆی ئەوە داکەوێ کە تاشباش پیاوچاکی خودایە، ئیدی هاتن و نەهاتنەکەی بە پووشێك... ئەو ئەگەر بێت و دار و نەداری گوندەکەش ڕامالێت یان هەر نەیەش، جارێ ئێوە بە سەلامەتی بڕۆن و وەرنەوە. ڕووداوەکانی گوندەکە و ئەو حاڵ و باڵەی هەمانە هەمووی بۆ لەبنی کوولەکەی بدەن و هەروەها بشڵێن ئەمن دەستە مویارەکەکانی ماچ دەکەم. ئێوەش لە بیرتان نەچێ هەر گەیشتنێ دەستەکانی ماچ بکەن. دەی خواتان لەگەڵ. خودا ئاگادارتان بێ. بەیانی زوو زوو....

ڕەنگی هەڵبزرکابوو. بەردەوام چاوی دەترووکاند. دەتگوت لە شوێنێکی بەتاڵ دەگەڕێ خۆی تێدا بشارێتەوە. ئەوەندەی قسەکردبوو چەنەی شل ببوو. ئەو ڕووداوەی تاشباش وای تەنگاو کردبوو، بێت و حەوتووەك لەسەر یەك قسەی کردبایە، دیسانیش هەر کەم بوو. قسەکانی لە ناخییەوە هەڵدەقوڵێن.

لە گوندییەکان توورە بوو:" جا وەرە ئەو هەمووە ساڵە وەك سەگی پێ سووتاو، وەدووی کاروبارییان بکەوە و نۆکەرییان بکە، لەبەر خاتری ئەوان سەر بە هەموو شوێنێدا بکە، لەبەر ئەوان هەزاران بەلا و نەهامەتی تووشی خۆت بکە، تازە ئەوان ببنە دوژمنی گیانت و گەورەترن دوژمنی بەخوێن تینووت لێ بکەنەوە ئەولیا....

***

عادیل دەیگوت:

ـ گوێ بدەنێ برادەرینە، عەرزم بە حوزوورتان، ئێستا لەو ڕۆژانەدا ئەمن بەهیچ شێوەیەك ناتوانم هەستم بێمە گوندی. چیی دەبێ با ببێ، تەنانەت قیامەتیش ڕابێ، ئەمن ناتوانم بێم.

نەخێر ناتوانم بێم و دەست بەسەر دار و نەداری گوندییەکاندا بگرم، ناشتوانم بێم و بڵێم ئەمساڵ لە قەرزەکانم خۆش بوومە. ئەوە لەدەستی من نایە. چونکە عەرزی ئاغای خۆم بکەم... چما ئەنگۆ نازانن... جا لە کوێ بزانن. ناتوانن. هەر نەیزانن باشترە. ئەمن ناتوانم بەهیچ کەسێك بڵێم بۆچی نامەوێ بێمە ئاوایی. لە منەوە سڵاو لە سەفەری برام بکەن و پێی بڵێن عادیل دەڵێ، وەزعەکە زۆر شپرێوە و زۆریش شپرز و خراپە. ئەو دەزانێ دەڵێم چی. پێی بڵێن عادیل ئەفەنی دەڵێ با سەی نووستوو وەخەبەر نەهێنێ. پێی بڵێن حاڵ و باڵمان شێواوە و ئیدی قەباحەتی گوندی یالاکیشی نەهێنێتە سەری. چونی لە دەستی دێ، با بۆخۆی ئەو مەسەلەیە ببڕێتەوە. ئەمساڵ ئەو گوندییانە کارێك نەماوە نەیانکردبێ. هەموو نەریتەکانیان شکاندووە و ڕێوشوێنێکی خراپیان بۆ هەر شەست گوندەکەی تۆرووس کێشاوە. کە لە لۆکەچنینێ گەڕاونەتەوە، تاقە کەسێکی ئەو گوندە و تەنانەت سەفەریش نەهاتۆتە لای من. دوای ئەوەش لە هاتنی ئەمن ترساون و دار و نەداری خۆیانیان لە بن گڵ ناوە و لە قوولکە و بن گابەردانەدا شاردوویاننەتەوە. دوای ئەوەش عەرزم بە حوزوورتان، ئەمن منەتی کەس ناکێشم، بەڵام تا من بم پێم نایەتەوە نێو ئەو گوندە. ئەمن دڵم لەو گوندە ئێشاوە. ئەمن گوندییەکانی ئەو ئاواییەم وەك منداڵەکانی خۆم خۆش دەویستن، بەڵام ئیدی ئێستا خۆشم ناوێن و تا زیندووش بم هەر خۆشیانم ناوێ. ئیدی تا من بم، چاو لە چاویان ناکەم، ئەمن سەعات بە سەعات دەزانم لە گوندە چ باسە و بە شوێن دەرفەتێکدا دەگەڕێم. ئەمن لەوەتەی خۆم ناسیوەو فامم کردۆتەوە، نەمهێشتووە کەس ماڵم بخوا. ئەوی پارەی عادیل ئەفەنی دەخوا، هێشتا لە دایکی خۆی نەبووە. بێت و بیخوا لە وەك ئێسك لە قوڕگی دەگیرێ. بەسەفەر بڵێن، خۆی ماندوو نەکا و پەیتاپەیتا لێم ڕانەسپێرێ، وەرە. ئێستا ئەمن ناتوانم بێم و ناشتوانم بڵێم بۆچی ناکرێ بێم. لەوانەیە مانگێك دوو مانگی دیکە ئەگەر بار و دۆخەکە لەبار بوو، دێمە ئاوایی و وەك باز و باشوو لەو گوندییە سپلانەن ڕۆدێم. بە برای خۆشەویستم سەفەر بڵێن، چەند قسەیەکیشم بەو هەیە. دەمەوێ بڕێکی گلەیی لێ بکەم. پێی بڵێن دوای ئەوە چۆن دەتوانێ چاو لە چاوی من بکا؟... ئەمن خۆم دەزانم کەنگێ بێم. ئیدی هەموو ڕۆژێ لەسەرم نەکا. جارێ پێم ناکرێ بێم. لەبەرچی ناکرێ بێم؟ ناتوانم بڵێم لەبەر چی، بەڵام سەفەر دەزانێ ئەمن تۆڵەی خۆم هەر کردۆتەوە. لە گوندییەکانی یالاکیشی دەکەمەوە. هەر کاتی خۆی بێ، حەقی خۆم لە کونی لووتی ئەو گوندییە بێناموسانە دێنمەوە دەرێ. عادیل باش دەزانێ و هەمیشەش زانیوێتی چ لە سپڵەیی ئەو گوندییانە بکا، بەڵام بەسەفەر بڵێن ئەمن جارێ چیم لە دەست نایە. تەنانەت

پەنجەکانیشم ناجوولێنم. سەریشم تێدابچێ ناتوانم هۆکارەکەی بدرکێنم، بەڵام ئەگەر هەلێکم بۆ هەلکەوێ، ئەوکات خۆڵ بەسەر ئەو گوندییانە، دەبێ وەك مار پێوەیان بدەم. بەسەفەر بڵێن لە دوورەوە چاوە ڕەشەکانی ماچ دەکەم. ئەمن جارێ ناتوانم لە ماڵی خۆم سەر بێنمە دەرەوە. ئەگەر بشپرسن بۆچی؟ ناتوانم بە کەسی بڵێم، با هەر لە خۆتان و لە سەفەر بپرسم:" باشە خەلکی یالاك بۆچی وەك ڕۆژی جێژنی نەورۆزان خۆیان ڕازاندبۆوە و چاوەڕێی هاتنی من بوون؟ لە کوێی دنیایە، بنیادەمێکی تۆزە غیرەت و پیاوەتییەکی تێدا مابێ، ئاوا پێشوازی لەو قەرزدارەی دەکا کە دەیەوێ بێ و ماڵ و دار و نەدارەکەی ڕامالێت و بیبا؟ ئەوە دامنا جلوبەرگی نوێشیان لەبەر کرد و خۆیشیان ڕازاندەوە، ئەی ئەو هەلپەڕین و شاییە تا ئێوارێ بۆچی بوو؟ بەسەفەر بڵێن ئەمن ئەوەندەش گەوج نیمە. ئەمن ئەوم بە برادەری خۆم دەزانی. چاوەکانی ماچ دەکەم. چاوەڕوانیی هەموو شتێکم دەکرد جگە لەوەی خەلکی یالاك کاتێ قەرزەکانیان پێ نادرێتەوە، کاری ئاوا بکەن، بەڵام ئەمن لەو دێیەی ڕوون دەکەمەوە. دڵنیابە، دڵنیا بە. ئەو دێیە ڕۆژێك سزای خۆی دەبینێتەوە و خۆشی نازانێ چۆناوچۆن.

"جا ئێستاش عەرزم بە حوزوورتان، سڵاوی سەفەر بگەیەنن. دوو چاوە ڕەشە موبارەکەکەی ماچ دەکەم. با گوندییەکان هێور بکاتەوە. وەك دەڵێن هەر گوندییەی تێلایەکی بەڕووی پێ بووە و هەمووانیش دەمانچەیان لە ماڵی دایە. هەر شەوەی سی چل پیاو... دیارە سەفەر گوندەکەی پێ هەڵناسوورێ. هەموو ڕۆژێ هەواڵی زۆر ناخۆش لە یالاکەوە دەگاتە دەستی من. ئەمن ناترسم. هیچ ناترسم. تەنانەت ئەگەر ماڵ بە ماڵی یالاك تیربار، یان تۆپێکیشیان لە ماڵەوە هەبێ، دیسانیش لێیان ناترسم. چما ئەمن چ خراپەیەکم بۆ ئەو گوندییانە هەبووە؟ ئەوان چوون و سوراو و سپیاویان کردووە و جلوبەرگی نوێیان پۆشیوە و چاوەڕێی من بوونە. ئەوان دەیانەوێ بچمە گوندەکەیان... و کە دەشبینن ناچمە گوندەکەیان، خەریکن لە داخان شێت بن... ئەمن دەزانم ئەوان چییان لەبن سەری دایە، بەڵام ئەمن چاوەڕێ دەبم و ڕۆژێکیان وەك پەتا بەسەریاندا دەدەم. چاوەڕێی ڕۆژێکم ماڵ و حاڵیان بشێوێنم.

(وەکیلی سڵاوان بن بەسەفەر بڵێن دوو چاوە ڕەشە موبارەکەکەی ماچ دەکەم.)

"ئەمساڵ ئەمن هەموو دەسەڵاتی خۆم دەدەمە دەست ئەو. ئەمساڵ خەلکی یالاك لە شەرمی ئەوەی قەرزەکانیان پێ نەدراوەتەوە نەهاتوون بۆ شت کڕینێ. با بێن. بۆیان هەیە بێن و شتومەکی خۆیان بکڕن. دەتوانن دوای لۆکەچنینەوەی ساڵی داهاتوو هەموو قەرز و قۆڵەی خۆیان پاك بکەن. هەر ئەوەندە بە سەفەر بڵێ گوندییەکان دووان دووان و سیان سیان نەنێرێتە دووکانێ. با بەتەنێ یەك یەك

بێن. چییان بویٚ دەیاندەمیٚ. ئەگەر دووسیٚ کەس پێکەوە بێن یان بە پۆل بێن.... نـا، بابـە گیـان وازی لیٚ بێنە، چۆنی کەیفیان دێنیٚ با بێن. بێن و لەو زستانەدا ڕووت و قـووت نـەبن. ئەوانـە گوندییـەکانی خۆمن. ئەوان برای منن. ئەمن بۆ ئەوان کار دەکەم. با ئەوە باش بزانن.

" با بڕۆن و شوکری خودای بکەن. دوعای بکەن. ئەگینا ئەمن دەمتوانی سەت چەکدار کە هـەر هەمووشیان یاغی و ڕێگرن وەدووی خۆم بدەم و بێمە سەریان، بـەڵام گـوتم ئـەو گوندییانـە، گونـدیی خۆمن. برێك سپڵەن، بەڵام هیچ نەبیٚ ئەوە چل سـاڵە ساتوسـەودامان پێکەوەیـە. نـان و نمـەکی چـل ساڵان بایەخ و بەهای خۆی هەیە. ئەمن دەمتوانی بێمە سـەر گونـدیٚ و ژن و منـداڵیان ڕووت ڕووت بکەمـەوە و لـە نێوەڕاستی گوندەکـەدا بـەرەڵڵایان بکـەم. دەمتـوانی تاقـە پـارووە نانێـك و قومـە ئاوێکیان بۆ نەهێڵمەوە. دەمتوانی جێوبانەکانیان و تەنانەت ڕاخەری بن قوونیشیان دەرکێشمە دەریٚ و بیانبەم. هەر کەسیش ملی بادابا، دەمدایە دەست ئەو یاغییە چـەکدارانە بیانکوشتبایە. بـا ڕقـم هەڵنەستێنن. ئەمن دەتوانم هەر ئەمڕۆ بەیانی بەخۆم و سەت چـەکدارەوە بێمـە سـەریان، بـەڵام نـا، تفی بەرەوژوور هەر وەڕووی خۆت دەکەوێتەوە. ئەو گوندییانە گوندییەکانی خۆمن.

"وەکیلی سڵاوان بن بۆ لای سەفەر. ئـەوە دەسـتیم ئـاوەڵا کـرد. هـەر دووچـاوە ڕەشـەکەی مـاچ دەکەم. گوندییەکان باشە بۆچی بەو خشڵ و زێڕ و زەمبەرەوە و بە جلوبەرگی جێژنانەوە چاوەڕێی مـن بوون؟ سلاوی سەفەر بگەیەنن. بەخوای بەردی ئەو گوندە ببێتە زێـڕ و خۆڵەکەشـی ببێتـە گەوهـەر و بڵێن عادیل وەرە، دیسانیش نایەم. بۆچی نایەم؟ ناتوانم هۆکارەکەی بەکەس بڵێم.

"بەڵیٚ، ئێستا قسەی ئاخریم دەکەم. ئەو قـسەیەم بـۆ خـەڵکی یـالاکیٚ بگێڕنـەوە. دەزانم ئەمـساڵ نەیانتوانیوە لۆکە خڕ بکەنـەوە، بۆیـەش قـەرزەکانیان پـیٚ نەدرایـەوە. دەی باشـە، ئـەوە تووڕەبـوونێکی ناویٚ. با بـێن، دەرگـای دووکـانم بۆیـان لەسـەر پـشتە. چـیی کـەیفیان دێـنیٚ بـا بیکـڕن و ببـەن. لـە لۆکەچنینەکەی ساڵی داهاتوودا پارەی هەر دوو کڕینەکە یەك جیٚ دەدەن. ئـەمن تـەواو لـە خەڵکەکـەی یالاك دڵنیام. ئێوەش هەر ئێستا ڕاستەوریٚ بـچنە دووکانەکـە و چیتان دەویٚ بیکـڕن. کـوڕ بکـڕن هـا. ئەگەر نەکڕن سەیری چاوتان ناکەمەوە. ڕاستەوریٚ بچنە دووکانەکە، باشە؟

"سڵاوم بگەیەننە سەفەر. چاوەکانی ماچ دەکەم. ئەمن لە کەس ناترسم با هەموو خـەڵکی یالاك و شاریش باش ئەوە بزانن. ناترسم، ناترسم...."

ماڵەکەی عادیل دوو نهۆمێکی زەردباو بوو. هەشـت ژوور و هـۆڵێکی گـەورەی تێـدا بـوو. خوارەوەی تەویلە بوو و بۆنی شیاکە و میزی ئەسپی لێوە دەهات.

عادیل نەعلی چەرمی و شەلواری شینی لە پێدا بوو و سەعاتێکی زنجیر زێـڕی لـە بـەرکی پەستەکەکەی دابوو. دانیشتبوو و پاڵی وەدیوارەکەوە دابوو.

ددانەکانی عادیل زێرن. ورگنە و بەرخەبەبەی چرچولۆچ بەسەر یەکدا کەوتووە. ڕدێنیشی پاك تاشیوە.

لە هەڵسوکەوتەکانی‌ڕا دیاربوو شڵەژاوە و لە شتێکی نادیار دەترسێ. هەر دەڵێی دەستی لە دنیایە بەرداوە و ئیدی ماڵ و سامانەکەی بەلایەوە بووەتە پووشێك. لە نێو قۆزاخەیەکی ترسدا کە خۆی لە دەوری خۆی تەنیوەتەوە، پەلەقاژەیەتی و لە ترسانا گرمۆڵە بووە. ماوەیەکە هەرکەس دیتوویەتی، ئاوای لێ تێگەیوە. هەر دەڵێی گەرەکییەتی بڵێ: خوا دەکا لەو گێچەڵە ڕزگاریم دێ... ئەو کاتە بۆ هەمموو ئەو دنیایەی دەسەلمێنم.

ئەگەر سەیری بن چاوە هەڵمساو و ڕەش داگیرساوەکانی بکەی، بەخۆت دەڵێی: مامە عادیلەکەمان دەمێکە نەنووستووە. تووڕەییەکی سامناك و ترسێکی لە تاریف نەهاتوو لەسەر ڕوخساری نیشتووە:

- بەخێرچن، بەخێرچن، برۆن برادەرینە. ئەمن لە خوای نەبێ لە کەس ناترسم. گوندییەکان ئازار مەدەن. ئەوان هەر بۆخۆیان شێت بوون. تووشی گۆنگەڵێکمان دەکەن. نەکا ئازرێك بە گوندییەکان بگەیەنن. با بێن و لە دووکانەکەی مندا هەرچی هەی و نییە بیبەن. سڵاوی مامە خەلیلەکەشم بگەیەنن. هەتا هەم ئەو چاکەیەم هەر لەچاودا دەمێنێتەوە کە لەخەقی مندا کردی. چاوەکانی ئەویش ماچ دەکەم. ئەوە لە قەرزەکانی ئەو و کوڕەکەی خۆش بووم. نەکا لەبیرتان بچێ. بە گوندییەکان بڵێن با بێن و چییان بە کەیفییە لە دووکانێدا هەڵیگرن و بیبەن. دوایی چۆنی بێ، سالی داهاتوو پاکی دەکەن. خۆ هەمموو ساڵێ هەر وا نابێ. پێیان بڵێن هیچ نیگەرانی من نەبن. خەلکی یالاك برای خۆمن. بەخێر هاتن. ڕاستەوڕێ برۆنە دووکانێ و بڵێن خاترتان بگرن. لە دەفتەرەکەدا بەنرخی کڕینێ لەسەرتانی بنووسن. ئەمساڵ خاتری هەمموو گوندەکە دەگرم و بۆیان دادەشکێنم. بۆ ئەو برایانەی ئەو هەمووە چەرمەسەری و چارەڕەشییە بەرۆکیانی گرتووە، ئەوە شتێکی وا نییە. بە سەفەر بڵێن چاوە ڕەشەکانی ماچ دەکەم. لەخۆوە با لەسەر داواکەی سوور نەبێ. ئەمن ناتوانم بێمە گوند. ئەگەریش لە هۆکارەکەی بپرسێ، ناتوانم بەکەسی بڵێم.

## ٢٥

مراد چل درۆ دەیگوت و ئاشقە کەچەڵیش وەباڵی بۆ دەکێشا.

مراد چل درۆ دەیگوت:

ـ ئەو بنەماڵەیەی تاشباش بنەماڵەیەکی زۆر گرنگن. کورە خەڵکی ئەو گوندە زۆر سپڵەن وا قەدری بنەماڵەکەی تاشباش نازانن، ئەگینا کوا بنەماڵەی وا. با ئەوەش بڵێم، ئەو بنەماڵەی تاشباشە عادەتێکی تایبەت بەخۆیانیان هەیە و هەر ئەمنیش دەزانم و کەس لەوە ئاگادار نییە. تاشباشەکان هەموویان کوڕیان ناو دەنێن مەمەد. گوێ بدەنێ با هەڵیاندەم. ئەو تاشباشە ناوی مەمەدە. سێ کوڕی هەیە ناوی هەر سێکیان مەمەدە. ناوی بابی تاشباشیش هەر مەمەد و باپیری تاشباش و بابی باپیریشی هەر مەمەد بوو. لەوەتا تۆرەمەی تاشباش لەسەر ئەو عەرزەن، چیی پیاویان هەبووە ناوی مەمەد بووە. ئەوە شتێکی تێدایە. کوێخاکەی ئێمە چەندە جوان دەفەرموێ:"حیکمەتێك لەو کارەدا شاراوەیە." خەڵکی ئەو گوندە ئەگەر مێشکیان بوایە، سەریشیان چووبا نەیاندەهێشت ئەو بنەماڵەی تاشباشەیان لە کیس بچێ. ئەمن ئاگام لە هەموو شتێکە، بەڵام خۆ لەو گوندەدا کەس گوێ لە قسەی من ناگرێ. دەی باشە، گوێ مەدەنێ، بۆم گرنگ نییە.

"ئەو بنەماڵەیە لەکوێوە بوونەتە تاشباش؟ هەر ئەوەی گرنگە. دەبێ وردبینەوە و زۆریشی لێ ورد بینەوە هەتا شتێکمان لێ ڕوون دەبێتەوە و ئاسوودە دەبین. ئێستا پێتان دەڵێم بۆچی بەو بنەماڵەیە گوتراوە تاشباش. ئاخر ناڵێن و ناکۆڵنەوە، هەی کەرینە. بۆچی ناپرسن بۆ ئەوەی بزانن و چۆنی باش و شیاوە وا بجووڵێنەوە هەی بێ مێشکینە. ئەو پلە و پایەی تاشباشە لە کوێوە بۆ ئەوانە هاتووە؟...

"لە کوێوە هاتووە؟ ئەو تاشباشانە لەوەتەی هەن پشتیان بە چیاوە بەستووە. ئەوانە ئەولیا و پیاوچاکەکانی کوێستانن و حیکمەتەکەشیان لە هەموو چیا و کوێستانەکان دایە. گورگ و باڵندە و ڕێوی و چەقەڵ و ورچ و پڵنگ گوێڕایەڵی فەرمانیانن. تۆرەمە و بنەچەی ئەو تاشباشە

فەرمانڕەوای هەموو ئەو گیانلەبەرانەیە. ئەنگۆ نازانن. ئەمن دەزانم. هەر من دەیزانم و ئەو نهێنییە یەزدانییەش بە کەس نالێم، بەڵام ئێستا دیتم کاتی خۆیەتی و پریاسکەی دڵم کردەوە و ناوی مەمبارەکی بنەماڵەی تاشباشم هێنایە سەر زار.

ڕۆژێك لە ڕۆژان تاشباشی گەورە، فەرمانڕەوای کێوەکان، واتە باپیرەگەورەی ئەو تاشباشە، یەکێك لە یەکەمین مەمەدەکان، لە چیا سەر دەکەوت. لە ناکاو چ ببینێ؟ دەبینێ گەنجێك هەتا گەردنی بووەتە بەرد. تەنیا سەری ماوەتەوە کە قسان دەکات و دەگریێ و پێدەکەنێ و باقی جەستەی هەموو بەردە. چاوەکانی درشت و ڕەشن. کاکۆڵی ڕژاوەتە سەر تەوێڵی و نێوچاوانیشی ئارەقەی کردووە. هەر چوار دەور و تەنیشتی لە چیاکان بەهارێکە مەگەرخودا بزانێ. دار و بار و گوڵ و شیناوەرد و هەموو چیاکان لایی لایی دەچڕن.

"تاشباشی گەورە لەو گەنجەی تا قوڕقوڕۆچکەی بووەتە بەرد، دەچێتە پێشێ و لێی دەپرسێ:" ئەوە بۆ وات لێ هاتووە؟" گەنجەکە سەربردەی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە کە بەڵێ:"جادووگەرێك دڵی چووە سەر گراوییەکەی* من، بۆیە بەو دەردەی بردم و خۆشەویستەکەشی برد بۆ خۆی. ئەتۆ مەمەدەفەنییەکەی ئێمە، فەرمانڕەوای ئەو کێوانەی. دەغیلت بم دەرمانی دەرم بدۆزەرەوە." مەممەدی گەورە دەڵێ:" دەیدۆزمەوە، دەست هەڵدەبڕێ و لە بەهەشتێ لقی دار هەنارێك لێ دەکاتەوە. دوایی کرنۆشێ دەبا و هەتا ئێوارێ هەر دەپاڕێتەوە، کە نزا و پاڕانەوەی تەواو دەبێ، بەو شووڵە هەنارە سێ دانە لە جەستەی گەنجەکە دەدا. لەپڕ جەستەکە نەرم دەبێتەوە و دەبێتەوە بە گۆشت و ئێسقان. مەمەدەفەنییە گەورەکەمان، دڵی زۆر خۆش دەبێ، بەڵام کە دەبینێ ئەمجارەیان سەری گەنجەکە بووەتە بەرد، و جەستەی گۆشت و خوێن و پێستە کەچی ئێسقان و سەری بەردە، بەخۆی دەڵێ:"کوڕە خۆ خراپترم کرد." و جارێکی دیکەش کرنۆش دەبا و هەتا بەیانی دوعایە دەکا. کە شنەی بای بەیان هەڵدەکا، سەر هەڵدەبڕێ و دەبینێ هیچ نەگۆڕاوە و سەلکەکە هەر وا بەردە. مەمەد ئەفەنییە مەزنەکەمان تووڕە دەبێ و دەڵێ:"خۆزگە ئەو سەرە وەك خۆی لێ بێتەوە و بە خۆشەویستەکەی بگا و لەبری ئەو سەری من ببێتە بەرد." لە پڕ سەری دەبێتە بەرد. گەنجە دڵدارەکەش نەجاتی دەبێ و بەرەو گراوییەکەی ملی ڕێیە دەگرێ و پێی دەگا.

جا ئەنگۆ پێتان وایە ئەو مەمەدەفەنییە مەزنەمان، واتە باپیرەگەورەی ئەو تاشباش مەمەدە ئاخرییەکەی چیی کردبێ باشە؟ خۆ زاری ناکرێتەوە دوعایە بکا. چاوی نییە ببینێ. مێشکی نییە بیر

---

*گراوی: مەعشووق، خۆشەویست. هێمن دەڵێ: دێم گراویی خۆم لە باوەش وەرگرم.... دێم نەهێڵم بەرهەڵست و بەرگرم

بکاتەوە، گوێی نییە ببیستێ. لەو سەر کێوە، بەخۆی و سەرێکی بەردینەوە تاق و تەنیا ماوەتەوە، بەڵام لە خوای بەزیاد بێ جەستەی ئەو جەستەیەکی مویارەکە و دڕندە و دەعبای کێوی و مار و دوپشك و ورچ ناتوانن زەفەری پێ بەرن. ڕۆژێکیان سوورە گوڵێکی سەد گەڵا لەسەر لەپی مەمەدفەنییەکەمان دەڕوێ. گەڵاکانی ئەوەندە بە نەرم و نیانی لێك دەبنەوە هەر دەڵێی لە ئاخی تاریکستانەوە هاتوونە دەرێ. ئەوە ڕێك ئەو گوڵە سیحراوییەکەیە. جا ئێستا خۆزگە مەمەدەفەنییە مەزنەکەی ئێمە کارێکی ژیرانە بکات و لەپی دەستە گولکردووەکەی بە سەری خۆیدا بکێشێ بۆ ئەوەی سەری لەو بەردینەییە بێتە دەرێ..، بەڵام خۆ ئەو مێشکی نییە تا بیر بکاتەوە و بەخۆی بڵێ ئاخۆ ئەو گوڵانە بۆچی لەسەر لەپی دەستی من ڕواون. لەو جەنگەیەدا هەڵۆیەك دێت و لەسەر تەپڵی سەرە بەردینەکەی دەنیشێتەوە و بە دندوکان بەردەبێتە چاوەکانی و هەر دندوکێکی لێی دەدا سەرەکە تەکانێك دەدا. مەمەد ئەفەنییەکەمان دەستی ڕاستەی بۆ سەری دەبا و گوێچکەی پەلکە گوڵەکە وەسەری دەکەوێ. ڕێك ئەو شوێنە بەردەکەی هەڵدەوەرێ و هەر جارێکی هەڵۆیەکە دندوکێکی لێ دەدا ئەو دەستێك بەسەری خۆیدا دەدا. دوایی هەر دوو دەستەکەی وێکڕا بەسەری خۆیدا دەکێشێت و سەری لە نێوان هەر دوو دەستەکانی دەنێ. سەری لەو حاڵەتە بەردینەییە دێتە دەرێ و نەجاتی دەبێ و مەمەدەفەنییەکەی ئێمە هەر لەوێ دەکەوێ و سێ شەو و ڕۆژان خەوی لێ دەکەوێ. کە دەگەڕێتەوە ئاوایی، ئەوەی بەسەری هاتووە بۆ خەڵکی گوندەکەی دەگێڕێتەوە، بەڵام کەس بڕوای پێ ناکا."

"تۆزۆپۆیراز کە گوندییەکەی بەساڵاچوو بوو، گوتی:

ـ گوێ بدەیە مراد چل درۆ، خودا پێستی سەرت بە لەعنەت بکا. ئەوەی تۆ گوتت بەسەرهاتی تاشباش نییە. بەسەرهاتی "مەلا ئەحمەد"ە. مەلا ئەحمەدیش هیچ کات لە لوتکەی کێوەکە نەهاتۆتە خوارێ. ڕۆژێك لە ڕۆژان چووەتە ئەو سەرە و بووەتە پیاو چاك و پیری هەموو بوونەوەرەکانی کوێستان، هەر لە دڕندە و دەعبای کێوییەوە بگرە هەتا دەگاتە باڵندە و هەرچی هەیە. نان و ئاوەکەشی، هەر دڕندە و دەعبای کێوی و باڵندە و گیانلەبەرەکانی دیکەی کوێستانێ بۆی دەبەن. کورتی بڕینەوە ئەو سەربردەیە، بەسەرهاتی مەلا ئەحمەدە. ئەتۆش کڵاوچیی درۆزن، ئەوە دەکەیە بەسەرهاتی تاشباش.

مراد چل درۆ:

ئەتۆ نازانی. خۆ ئەقڵت پێی ناشکێ. ئەوەی لە لوتکەی چیاکە بوو خۆ مەلا ئەحمەد نەبوو. بەڵکو مەلا مەمەد بوو کە یەکێکە لە تاشباش ئۆغلوەکان.

تۆزۆپۆیراز گوتی:

- هەك خودا غەززەبت لیٚ بگریٚ هەی درۆزن. درۆزنانی، ماڵ كاول.

مراد:

- بۆخۆت درۆزنی. خودا غەززەت لە خۆت و ئەژدادت بگریٚ...

دوایی ڕووی لە گوندییەکان کرد و پرسیی:

- تۆخوا ئەمن درۆزنم یان تۆزۆ؟...

گوندی هەموو گوتیان:

- وەباڵت بەستۆمان ئەتۆ ڕاست دەکەی. تۆزۆ یان بەسەهو چووە یـان بـە ئانقەسـت درۆیـان دەكا. کەس نییە پێی بڵیٚ: ئاخر کابرای بیٚ مێشك، ئەگەر وا بوایە، ئەدی بۆچی بەو بنەماڵەیە دەڵێن تاشباش. هەی بیٚ ئەقڵی بیٚ مێشك. یاڵڵا دەی مراد، بیگێڕەوە.

- کورتی ببڕینەوە ئەو پیاوە مەلا ئەحمەد نییە و بە دڵنیاییەوە هەر "مەلا مەمەد تاشباش ئۆغلو"یە. حاشاکردن لە بنەچە و ڕەچەڵەکی خەڵکی چ قازانجێکی بۆ ئێمە هەیە؟

- تازە، ئەو پیاوە، باپیرە گەورەی تاشباش ئۆغلوەکەی خۆمانە.

- لێگەڕیٚ، هێندیٚ خەڵکی خۆبەزلزان با هەر نکۆڵیی لیٚ بکەن. نازانم چ قازانجێکی بۆیان هەیە.

- بەڵیٚ، باپیرەگەورەی ئەوە. باپیرەگەورە بەڕێزەکەی ئەوە.

- ئەگەر ئەو ڕووداوی بە بەردبوونە بەسەر ئەو نەهاتووە، ئەی بۆچی بـەو بنەماڵەیـە دەڵـێن تاشباش؟...

- پیاو دەبیٚ ئەقڵی بیٚ. هێندیٚ بنیادەمی بیٚ مێشك بۆ ساتێکیش دانانیـشن بـیر بکەنـەوە کە ئەی بۆچی بە وەچە و ڕەچەڵەکی ئێمە ناڵێن تاشباش؟...

- خودا بۆ خۆی ئاگادارە کە ئێمە هەر لە بـاو باپیرانمانـەوە و لـە بـاپیرەی باپیرانمانـەوە ئـەو ڕووداوەمان ڕێك بەو جۆرە بیستووە کە قەوماوە.

تۆزۆپۆیراز دیتی هەمووان لای مراد چل درۆ دەگرن و بەهیچ جۆرێك ناتوانی قایلیان بکا.

***

حەقایەتی بوون بە بەرد لە زارێکەوە کەوتە شارێك. کەس نەبوو بە لانی کەمەوە دوو جاری نەبیستبیٚ. هەر کەس دەرفەتی هەبوایە، دوو سیٚ جاران ئەو ئەقڵەی بۆ خەڵکی دەگێڕایەوە.

لەو جەنگەیەدا و لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا حەقایـەتێکی دیکـەش، واتـە حەقایـەتی چـیای "ئێرجییەس" بە هەموو گوندیٚ وەربوو. تەنانەت کەوتە سەر زاری منداڵەکانیش.

تاشباش ئۆغڵوش ئەو حەقایەتەی بیستەوە.
تاشباش ئۆغڵو گوتی:
- وەڵڵاهی وە بیللاهی ڕەچەڵەك و بنەماڵەی ئێمە شتی وای بەخۆوە نەدیوە و ئەوەندەی ئەمن بزانم کەسی وامان تێدا هەڵنەکەوتووە. ئەمنیش بیستوومە ئەو پیرەی کوێستانان "مەلا ئەحمەد"ە. و ئەوەیش کە چووەتە سەر چیاکەی ئێرجییەس، باپیرەی من نییە، بەڵکو "لوقمانی حەکیم"ە و هەموو کەسێکیش بەوە دەزانێ.
کە گوندییەکانی گوێیان لە قسەکانی تاشباش ئۆغڵو بوو، لە پێشدا تووڕە بوون و جنێوبارانیان کرد و گوتیان:
- ئەو سەگبابە هار بووە، خودا بیکا بە قوربانی ڕەچەڵەك و ئەژدادەکەی. ئەگەر ئەوە بنیادەم بوایە، کوا ئەو گوندە تووشی ئەمرۆ دەبوو.
دوایی بیریان کردەوە و نەرم بوونەوە:
- کوڕە جا داماوە بڵێ چی. خۆ ناتوانێ بڵێ باب و باپیرەکانم هەڵبژێراوانی خودا بوون. کابرایەکی خاکەڕایە ئەو پیاوە نازدارەی ئێمە جگە لە نکۆڵی کردن چیی لە دەست دێ؟...

***

لە کۆنی کۆندا، کابرایەك هەبوو پێیان دەگوت "تاشباش لوقمان". ناوی ئەویش مەمەد بوو، بەڵام لە سۆنگەی هونەرەکانییەوە نازناوی لوقمانیان لەسەر دانابوو. لە سایەی ئەو لوقمان تاشباش ئۆغڵۆوە، هیچ پەتایەك لەسەر زەوی نەمابۆوە و گشتی لەناو چووبوو. لە زەمانی ئەودا دنیا ببووە دنیایەکی دیکە. دنیای مرۆڤگەلێك کە نەیاندەزانی نەخۆشین چییە. ئەگەر سکاڵایەکیش هەبوایە لە دەست مەرگ بوو.
تاشباش لوقمان چۆن ئەو کارانەی پێ دەکرا و دەرمانی ئەو نەخۆشییانەی دەدۆزییەوە؟ هەموو خەڵکی هەر لە منداڵی حەوت ساڵانەوە هەتا پیری حەفتا ساڵانە ئەوەیان دەزانی. ئەو تاشباش لوقمان مەمەدە گەڕیدەیەکی گەورە بوو. لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژئاوا شوێنێك نەمابوو ئەو سەردانی نەکردبێ و نەچووبێ.
دەچووە هەر شوێنێك، گیاوگژ و دار و گوڵ، ڕەگ و خاك و ئاو و ڕەوەز قسەیان لەگەڵی دەکرد. بۆ وێنە کە بە تەنیشت گوڵێکدا تێدەپەڕی، گوڵەکە سەری هەڵدێنا و دەیگوت: "تۆزێ سەبرت بێ لوقمان تاشباش. گوێچکەت بێنە با شتێکت پێ بڵێم. ئەمن دەرمانی چاوێشەم.

ناوم..." و ناوەکەی خۆیشی دەگوت و بۆی ڕوون دەکردەوە کە چۆن دەتوانێ بیکاتە دەرمانە. لوقمان لە لایەکەوە ناوی گوڵەکەی دەنووسی و لە لایەکی دیکەشەوە، لەو جۆرە گوڵە دەیڕنییەوە و پریاسکەکەی لێ پڕ دەکرد. دەچووە هەر شوێنێك، سرت و خورتی گوڵ و گیایەکانی لە گوێدا بوو. هەموو سروشت ئەوی دەدواند.

تاشباش لوقمان، وەك باب و باپیرەکانی خۆی لەو گوندە بوو. زیاتر لە هەموو شوێنەکانی دیکەش بە چیاکانی تۆرووس دا دەگەڕا. چون ئەو گیایانەی دەرمانی گشت دەردانن، لە تۆرووسێ شین دەبن.

لوقمان تاشباش زۆر ماندوو ببوو. ئەوەندە گەڕابوو لە پەل و پۆ کەوتبوو. ئەو بە شوێن دەرمانی باداری*دا دەگەڕا. دەچووە هەر شوێنێك، هەموو سرووشت بانگی دەکرد. دەرمانی هەموو نەخۆشییەکانی دۆزیبۆوە، بەڵام دەرمانی ئەو دەردەی وەچنگ نەدەکەوت، بەڵام ئەو دابوویە باری لاساری و وازی نەدەهێنا. چیا بە چیا دەڕۆیشت هەتا گەیشتە لووتکە بەردینەکەی تۆرووس. ئەستێرە درشتەکان بەسەر ڕەوەزەکانی لووتکەکەوە دەیانجریواند. تاشباش لوقمان زۆر ماندوو ببوو و بە خەوێکی قووڵدا ڕۆچووبوو. دەمەدەمی بەیانی بە دەنگی گوڕەیەکی سەیر ڕاپەڕی. چاوی هەڵێنا و دیتی ئاسمان لەبەر باڵی هەڵۆ دیار نییە. بە هەزاران هەڵۆ لەسەرەوە دادەگەڕێن بەرەو خوار. لە نزیکییەوە کانییەك هەڵدەقوڵێ و ئاوەکەی بە خوڕەخوڕ لە تاوێرە بەردەکانەوە دەڕژێتە خوارەوە و نێو تاشە بەردەکانی کردووتە گۆلێکی کەسك. لوقمان تاشباش سەیر دەکا و دەبینێ ئەو هەڵۆیانە لە ئاسمانەوە ڕاست بەرەو ئەو ئەستێرە دێن.... خۆیان لە ئاوەکە هەڵدەکێشن و دێنەوە دەرێ. سەر ئاوەکە و بەردەکانی دەوروبەری و هەروەها ئاسمانەکەش لەبەر هەڵۆ دیار نین و هەموو شوێنێك پڕ لە فڕەی باڵ و قاو قیژی باڵندان. ئاوی ئەستێرکەکەش لەبن هوروژمی ئەواندا شەپۆل دەدا.

هەتا نیوەڕۆیە هەر وا دەڕوا. هەڵۆ هەر دێن و خۆیان لە ئەستێر هەڵدەکێشن و دەوڕۆن. دوایی لە ئاسمان و لەسەر نووکی ڕەوەزەکان گەمەی هەڵۆیان دەست پێ دەکا. هەڵۆیەك لە پڕ باڵەکانی کۆ دەکاتەوە و وەك گوللەیەکی لێ دێ و بە خێراییەکی سامناك لە ئاسمانەوە لووری زەوی دەبێ.

---

* لە ڕۆماتیزم. ژانە ئێسك

ده بیست مەتری مابێ بۆ زەوی، باڵەکانی دەکاتەوە و ڕادەوەستێ. لەو نێوەدا هەڵۆی وا هەیە ناتوانێ بەو خێراییە خۆی بگرێتەوە و وەك تۆپێك وەعەرزەکە دەکەوێ. لاشەی ئەو هەڵۆ مردارەوە بووانەی لەولا و لەولا کەوتوون، زۆربەیان ئەوانەن کە بەو تەرزە مردوون.

دەمەدەمی ئێواری تاقە هەڵۆیەك چییە بەسەر ئاوی ئەستێرکەکەوە و، بەسەر بەردەکانی ئەوبەروبەری و بە ئاسمانەوە نامێنێتەوە. هەموو دەچنەوە هێلانەکانیان. کە هەموو وڵات چۆڵ بوو تاشباش لوقمان هەڵدەستێ دەچێتە لای ئەستێرکەکە. کە ئەستێرکەکە چاوی بە تاشباش دەکەوێ، دێتە زمان و دەڵێ:"ئەی بەندەباشەکەی خودا، ئەی لوقمان، جوان و زەریف گوێم بدەیە. ئەتۆ زۆر گەڕای، بەڵام ئەوەی بەشوێنییەوە بووی ئەوە دۆزیتەوە. ئاوەکەی من دەرمانی بادارییە. جوان گوێ بدەیە. ئەوانەی لە ئاوەکەی مندا مەلەی دەکەن، با ئەو چەورییانەش بە کەم نەگرن کە لە بن پەڕ وباڵی هەڵۆکانەوە لە دەورەووبەری من ڕژاون. با دوای مەلەکردنێ، بە سەری پەنجەیان ئەو چەورییانە لەو شوێنە هەڵبسوون کە ئازاری هەیە." تاشباش لوقمان ئەوەش لە دەفتەرەکەیدا دەنووسێتەوە. ئەو کانییەی وا بە "قارتال چیمەك" بەناوبانگە و کەوتووەتە نێو ڕەوەزەکانی تۆرووسەوە و هەرکەس خۆی تێدا بشوا نەخۆشیی ڕۆماتیزمەکەی نامێنێ، ئەوە لوقمان دۆزیویەتەوە.

تاشباش لوقمان کە دەرمانی هەموو دەردەکانی دۆزیبۆوە و پەتا و نەخۆشیی لە سەر زەوی بنەبڕ کردبوو، بە دوای ئەوەدا دەگەڕا عیلاجێکی مردنیش بکا و ئەویشی دۆزییەوە...

تاشباش لوقمان سوڵتان لە پێشدا چووە سەر "ئێرجییەس". لە لووتکەی چیای ئێرجییەس گوڵێك هەیە. گوڵێکی زۆر گەورەیە. سەعات بە سەعات، سات بە سات، ڕۆژ و شەو ڕەنگەکەی دەگۆڕێ. ڕەنگەکەی زۆربەی جاران شیرییەی مەیلەو هەنگوینە. هەر دەڵێی چرایەك لەودیوییەوە داییسێ.

هەر مرۆڤ و بوونەوەرێك لەو گوڵە بچێتە پێشێ و بۆنی بکا، قەت نەخۆش ناکەوێ. بشمرێ، بەبێ ئازار و بەبێ نەخۆشی و لەوپەڕی پیریدا دەمرێ. هەرکەس لەو گوڵە نزیك بێتەوە هەتا هەتایە لە بەختەوەری و خۆشیدا دەژیێ. وەك هەموو ژیانی خۆی لە بەهەشتێدا گوزەراندبێ. هەژاری و نەداری نابینێ. هیچ مرۆڤێکیش ناتوانێ زیانێکی پێ بگەیەنێ.

ئەو گوڵە موعجیزەیەکی دیکەشی هەیە: چارەسەری مەرگیشە. ئەوەی پێی زانی و دۆزییەوە ئەوە تاشباش لوقمان بوو. هەر کەس دەستی وەپەلکێکی بکەوێ و ساتێك لە سێبەرەکەیدا ڕاوەستێ، قەت نامرێ. ئەدی نازانم بۆ هەموو خەڵك ناچن و دەستێك لە پەلکەکانی بدەن و ساتێك لەبن سێبەرەکەیدا ڕاوەستن؟ ئەو گوڵە کە هەر پەلکێکی هێندەی دارە سنۆبەرێکە، هەژدیهایەك پاسەوانێتی. ئەو هەژدیهایە لەو لووتکەیە ئاڵاوە کە گوڵەکەی لەسەرە. لە بیست و چوار سەعاتدا تەنیا ساتێك دەنوێ،

بەڵام ئەو لەحزەیە کەنگێیە؟ ئاخۆ شەوە یان ڕۆژ؟ کەس نازانێ. دەبێ ئەو ساتە بدۆزییەوە و بچیتە لای گوڵەکە... هەتا ئێستا کەس نەیتوانیوە لەو گوڵە نزیك بێتەوە. ئاخۆ ئەو هەژدیهایە ناکوژرێ؟ بەهیچ کلۆجێ ناکوژرێ. چونکە هەژدیها نامرێ. تەنانەت ئەگەر ڕێگەیەکیشی بۆ بدۆزیتەوە و لەتوپەتیشی بکەیت و گۆشتەکەشی لە ئاشیدا بکەیتە تۆز، یان بیسووتێنی و خۆڵەمێشەکەشی بە بادا بدەی، دیسان کە سەیر دەکەی ئەوە هەژدیهاکە لە لوتکەکە ئالاوەتەوە. چما ئەو هەژدیهایەت پێ دەکوژرێ کە لەوەتەی دنیا دنیایە، لە سێبەری ئەو گوڵەدا نوستووە؟

تاشباش لوقمان زۆر ساڵان چاوەڕێ بوو تا بۆی ڕوونبۆوە هەژدیهاکەی کەی دەنوێ و بچێتە لای گوڵەکە، بەڵام دوای ئەوەی دەستی لە گوڵەکە دابوو و دەیویست بگەڕێتەوە، هەژدیهاکە دیتی، ویستی بیکوژێ، بەڵام بەزەیی پێی داهات و وازی لێ هێنا، تەنیا سیحری نەمرییەکەی لێ بەتاڵ کردەوە. بێت و هەژدیهاکە لەو ساتەدا چاوی هەڵنەهێنابایە، تاشباش لوقمان بە نەمری دەمایەوە و ئێستا لێرە لەنێوماندا دەبوو.

ئەو تاشباش لوقمانە کە باپیرەگەورەی هەر ئەو تاشباش نۆغلوەیە، کارێکی دیکەشی کردبوو. چوار قوڕنەی دونیایە گەڕابوو و لەو گەڕانەشیدا چیی گوڵ هەیە ڕاز و نهێنیی خۆیانیان پێی گوتبوو، بەڵام ئەو بە شوێن گوڵێکەوە بوو کە نەیدەتوانی نهێنییەکەی خۆی بە کەس بڵێ. گەلێ ساڵان لەسەر هەست، هەر گەڕا و گەڕا و نەگەیشتە ئەو گوڵەی کە ئەو نهێنییەی پێ بڵێ. دوایی هاتە چوکووراوا و زۆر ساڵان لەوێش گەڕا. ئاخرییەکەی لە چیای تۆرووس وەسەر کەوت و لەوێ بەسەر هەزاران گوڵ و گیا و شینکەدا کەوت. هەموو تۆرووسی سەنگ و سووژن دا. ڕۆژێکیان گەیشتە کوێستانەکەی سەرووی تەرسۆس، بەڵام پیر و زورهان ببوو. لەوێ چنارێکی گەوەی لێ بوو و کانییەکی لەبنی هەڵدەقوڵی. تاشباش لوقمان لەو ئاوەی خواردەوە و لە سێبەری چنارەکە سەری وەسەر بەردێك کرد و لێی نووست.

هێشتا بەیان نەئەنگوتبوو کە تاشباش لوقمان لەخەو هەستا. لە ناکاو دەنگی قرچەی شکانێك لە بن چنارەکەوە هەستا و لەوێوە تیشکێك هاتە دەرێ و هەموو دنیای وا ڕووناك کردەوە دەتتوانی قاچی مێروولەش ببینی. لەو ڕووناکاییەوە دەنگێك گوتی:

" ئەمن چارەسەری مەرگم" لوقمان گوتی:"خوایە شوکرت، ئەوە چارەی ئەومیشم دۆزییەوە" و لە دەفتەرەکەیدا نووسی و بە غاردان لە کێوەکە هاتە خوارێ و گەیشتە پردەکەی "مەی سیس". ئیدی هەموو خەلکی تێگەیاند لەوەی" ئەمن چارەی مەرگم دۆزیوەتەوە". خەڵك خڕ بوونەوە. دەرزیت هەڵاویشتبا وەعەرزی نەدەکەوت. چاوەڕێ بوون لوقمان قسان بکا. لوقمان دەفتەرەکەی کردەوە بۆ

ئەوەی ئەو نهێنییەی لەوێیدا نووسیبوو، بۆ خەڵکەکەی بخوێنێتەوە. لەو ساتەدا باڵێکی سپی لە ئاسمانەوە دەرکەوت و لە دەفتەرەکەی دا و بردی خستییە ڕووباری "جەیحان"ـەوە.

***

کوێخا سەفەر ئیتر دەیزانی ئاخری و ئاقیبەتی ئەو کارە بەکوێ دەگا. ئەوەی نەدەبوو ببێ، ببوو. هەموو ئەو ئەفسانە و حەقایەتانە بۆ گەورەکردنەوەی ئاشباش بوو. کوێخا سەفەر دەیزانی و بە ئەزموونیش سەلمێنرابوو کە هەموو پیاوچاکەکان لە ساڵەکانی قاتی و قڕیدا دەردەکەون: ئاخرین نموونەکەی مورتەزایە کە هێشتاش لە شێتخانەیە. هەر ئەو گوندییە بێناموسانە بوون کە بە زۆرەملێ ئەو کابرایەیان کردە پیاوچاك و ئەو بەڵایەیان بەسەی هێنا.

"بەڵام ئاشباش خۆی ئەو حەقایەتانە بڵاو دەکاتەوە. زۆر زیرەکانە ئەو شتانە ڕێك دەخات. لە پێشدا باپیرەیەکی دەبێتە بەرد، دوایی باپیرەکەی دیکە دەبێتە لوقمانی حەکیم. خەڵکیش گوێیان شل کردووە کە بڕوا بەو شتانە بکەن و هیوایان بەو شتانەوە ببەستەنەوە.

"دیسانیش ئەزموون سەلماندوویەتی کە لەوەها بارودۆخێکدا، لە ڕۆژگاری ئاوا دژوار و بێهیواییدا، لە ناکاو ئەو شتانە پەرە دەگرن. ڕۆژێك بەیانی کە هەڵدەستی، دەبینی ئەوە دنیا شێواوە و ئەوەی نابێ ببێ بووە. ئەوجارە کارەکە لە باپیرە و ئەژدادەوە دەستی پێ کرد. ئەگەر دەستی خودی ئاشباشی تێدا نەبوایە، مەحاڵ بوو هەموو شتەکان بەو وردەکارییانەوە لەسەر باپیرە و ڕەچەڵەکی ئەو بن.

"ئاخ، ئەگەر عادیل هەر ئەمڕۆ دەهات و دەیگوت، هۆ خەڵکی گوندی، ئەوە لە هەموو قەرزێکتان خۆش بووم یان گوتبای هاتووم هەر هەمووتان ڕووت ڕووت دەکەمەوە، بەهەر بارێکدا، ئاشباش لە دەستی دەهات.

"خۆزگە عادیل و پیاوەکانی بێن. ئاخۆ هیچ ڕێیەك نییە تا دێن، سەری گوندییەکانی پێوە بخافڵێنم؟ خۆ ئاوا بڕوات، ئەمڕۆ و سبەی پیس دەقەومێ. دەبێ چارێکی بکەین...

"شتەکە ببوو. چیرۆك و حەقایەتەکانی پیاوچاکبوون، وەك کەویی بەفرێ، بەسەر گوندەکەدا دێ. خەونەکانی زەڵەجەی خودا غەززەب لێگرتووش تام و خوێی ڕووداوەکەیە. ئاخۆ ناکرێ شتێك بکەی زەڵەجە خەونێکی سەیر ببینێ و دوو سێ ڕۆژان سەری گوندییەکانی پێوە بخافڵێنین؟ و یان..."

## ٢٦

ئەوە لە هەمووی باشتر بوو، بەڵام هەر بەراست، ئەوە سەری دەگرت؟ خەڵك بە کەینوبەینەی نێوان ئەو و کچەکەی قیرسمایلیان دەزانی. ئەگەر بەسەرییەوەیان گرتبا، ئاخۆ دەیتوانی وابکا بەو کارە تاشباش لەبیر خەڵکەکە بەرێتەوە؟ کەس سەری لەو خەڵکە دەرناچێ. لەوانەش بوو بتوانێ. ئەو گوندییانە جاری وابوو گرنگترین کاریان بە پووشێك نەدەویست، بەڵام جاری واش هەبوو دوو ساڵان سەریان بە کارێکەوە دەخافڵا کە پووشێکی نەدێنا.

ئەگەر بێت و زەماوەندی بکردایە، لانیکەم دوو ڕۆژان سەری خەڵکەکەی دەخافڵاند. لەو دوو ڕۆژەشدا ئەوانەی چوبوونە شاری لەوانەبوو عادیل لەگەڵ خۆیان بێنن و بێنەوە، بەڵام زۆریش ئاسان نەبوو بۆ ئەو زەماوەندە هەموو گوندەکە نان بدەی.

قیرسمایلی بانگ کردە ماڵەکەی خۆی. ئەوەندە شڵەژابوو نەیدەزانی چ بکا. ئەوە بە گیانی ئاخێری دەبوو خوازبێنیکەر بنێرێتە ماڵەکەی قیرسمایل، بەڵام ڕۆژگارێکی قۆڕ بوو....

گوتی:

ـ کاکە سمایل، لێم دڵگران مەبە کە بانگم کردوویەتە ئێرە. دەزانم زۆر بەجێ نەبوو، بەڵام وەزعەکە شپرێوە. دەزانم چ دەکەم. بە کورتی، بەپێی ویستی خودا و فەرموودەی پێغەمبەری دەمەوێ کچەکەت بخوازم. دەمەوێ وەك ژنی سێهەمم، منداڵم لێی هەبێ. ژنە گەورەکەم و زەڵەجە دەنێرمە ماڵەکەت با کچەکەت هەڵگرن و بیهێنن، ئاشقەکەچەڵەش مارەی دەبڕێ. دەی براله چ دەفەرمووی؟

قیرسمایل ملی بەلارەوە نا و گوتی:

- ویستی خودا و فەرموودەی پێغەمبەر لەسەر سەرم، بەڵام ئەمن ئەو کچەم گەورە کردووە و ئەو هەمووە ساڵە بەخێوم کردووە و خەرجم کێشاوە، یانی ناتەوێ بڕە پارەیەکیشم وەك شیربایی بدەیتێ؟

کوێخا وەڵامی دایەوە:

- هەتیوە، خۆ ئەوە کچ نییە... بۆخۆت لەمن باشتر دەزانی و هەموو دنیاش دەزانێ. ئاخر کێ ئەو کچەی دەوێ؟ بچۆ شوکری خودای بکە داوای شتێکیشت لێ ناکەم.

قیرسمایل ترسا لەوەی نەکا پاشگەز بێتەوە و گوتی:

- ئەگەر ویستی خودایە، ئەوە لەسەر سەرم. ئەگەر فەرموودەی پێغەمبەریشە لەسەر چاوەکانم. هەیە و نییە ئەو کچە، کە حازرم لەبەر پێت بیکەمە قوربانی. خوازبینیکەرەکانت بنێرە با کچەکە بێنن.

کوێخا ئەو قسە نەرمانەی قیرسمایلی بەدڵ بوو و گوتی:

- سەیر کە کاکە سمایل گیان. ئەتۆش حەیا و ئابڕووت هەیە. بۆ ئەوەی خەڵکی پاشملە خراپەت نەڵێن، وەك شیربایی کچەکەت مانگایەکت بە گۆلکەکەیەوە دەدەمێ. لای خەڵکیش دەڵێم پێنسەد لیرەشم داوەتێ. دیارە دەبێ بەهارێ مانگاکەم بدەیتەوەو بڵێی پێم فرۆشتووەتەوە. بەو شێوەیە ڕواڵەتی کارەکە ڕادەگرم و ئیدی کەس ناڵێ کوێخایەکی ئاوا گەورە کچەکەی بەخۆڕایی لە چنگ دەرهێناوی.

قیرسمایل دەستەکانی گرت و بە خۆشییەوە گوتی:

- خوا ڕاوەستاوت بکا، ڕاوەستاو بی کوێخا گیان، گەورەی گوندەکەمان. بنێرە با خێرا هەڵیگرن و بۆتی بێنن...

کوێخا:

- هەروەها، لەبەر خاتری خۆت و کچەکەت، سبەینێ هەموو خەڵکی ئاوایی بانگهێشت دەکەم بە ژن و منداڵ و پیر و جوانەوە. دەڵێم چوار بزن بکوژنەوە و دە مەنجەڵ ساوار وەسەر بنێن. تێگەیشتی؟... زەماوەندی کچی تۆ لە هەموو کچە دەست لێنەدراوەکان گەورەتر دەبێ. خۆ قایل بووی؟...

قیرسمایل وتی:

- زۆر سپاس. خودا تەمەن درێژت بکا. ئەتۆ بۆ ئێمە وەك دایك و باب وای...

ئەو شەوە کوێخا، ئەگەرچی دوو ژنیشی هەبوو، لەگەڵ ژنی سێهەمیدا چووە پەردوو. ناشقەکەچەڵە مارەیی بڕین.

هەر ئەو شەوە هەموو خەڵکی ئاوایی بەوکارەیان زانی، بەڵام کەس گوێی نەدایێ. بە لایانەوە ئاسایی بوو. هەمووان بە کەینەوبەینەی کوێخا و کچەتیوەکەی قیرسمایلیان دەزانی و دەشیانزانی کچەتیوەی وەقسە دێنا و دەورووژا و هەڵدەلەرزی هەتا ڕۆژێکیان لەبەر چاوی ژنەکانی لەباوەشی دەکات و دەیباتە نێو جێوبانەکەیەوە.

کەڕەی بەیانی بزنەکانیان سەر بڕی، ئاگردانیان نێڵ دا و مەنجەڵیان لێ وەسەر نان. چێشت لێنرا و ئامادە کرا. ورد و درشتی گوندەکە بانگ کرابوون. هەموو تێرێکیان نان خوارد. هەر هەمووان لەسەر نان، باسی تاشباش ئۆغلو و تایفە و تۆرەمەی ئەویان کرد. ئەو میوانداریتییە لە جێی ئەوەی تاشباش لەبیر خەڵکەکە بەرێتەوە و بەشتێکی دیکەوە بیانخافڵێنێ، وای لێکردن پتر لە جاری جاران باسی تاشباش بکەن. ئەگەر ئەو میوانییە نەبوایە مەحاڵ بوو گوندییەکان هەموو لە شوێنێك کۆ ببنەوە و باسی تاشباش بکەن.

کوێخا خەریك بوو شێت بێ. ئەو فێڵ و تەڵەکەیەشی سەری نەگرتبوو هیچ، پێچەوانەش ببۆوە. بەبێ ئەوەی بزانێ پارووی تاشباش ئۆغلوی خستبووە ڕۆنەوە.

تازە مەحاڵە لە دەستی تاشباش ئۆغلو نەجاتت بێ. بە خوای ئاوا بڕواتە پێشێ، لە پێشدا ئەو گوندە و دواییش هەرچی گوندی تۆرووسە دەخاتە بن چۆکی خۆیەوە. ئیدی لەمەودوا ئەو گوندییانەش قسەی لە قسەیدا ناکەنەوە، لە مەلا تۆپاکلی"یش بەلایانەوە گەورەتر دەبێتەوە. خۆ ئەو وەك مورتەزا گێل و گەمژە و ساویلکە نییە بتوانی بیدەیتە دەستی دوو جەندەرمە و بیخەیتە شێتخانەوە. خۆ ئاوا بچێتە پێشێ، کوێخا و دوو جەندەرمە هیچ، بەڵکو حوکمەتە کۆمارییەکەی تورکیاش ناتوانێ پێی بڵێ پشتی چاوت برۆیە. ئەو ڕۆژە ئیدی ڕۆژی مەرگی تۆیە کوێخا سەفەرەفەنی. ئەگەر بناگوێی خۆتت بینی، کوێخایەتیش دەبینیتەوە. ئیتر گیانی شیرنت لە ئەماندا نابێ. تاشباش ئۆغلو دوو بانگی گوندییەکان دەکا و دەڵێ:"موسوڵمانان، خوێنی ئەو کوێخایە حەڵاڵە. بچن و بیکوژن." هەر ئەوەندە بەسە ئەو قسەیەی لە زاری بێتە دەرێ، خۆ دەمودەست، کوێخای چی، بەخوای عیسمەت پاشاش بی، دەبیتە تڕی بن گۆم."

لەگەڵ پەرەگرتنی چیرۆك و نەقڵ و حەکایەتی جۆراوجۆر لەسەر ڕەچەڵەکی تاشباش، کوێخا سەفەریش ترسی زیاتر ڕێدەنیشت. تاقە یەك ڕێگە چارە مابۆوە ئەویش هاتنی خێرای عادیل بوو. لەوە پتر هیچ ڕێگەیەکی بۆ نەمابۆوە.

کوێخا دیسانیش هەر وا لە حەول و دەول دا بوو. پیاوەکانی و خزم و کەسەکانی خۆی ناچار دەکرد لە هەموو شوێنێك بڵێن ئەو حەکایەت و چیرۆکانە هەمووی هەڵبەستراون. ئەوانیش لای خۆی دەیانگوت باشە، و بەڵێیان بۆ دەگوت، بەڵام کاتێ دەچوونە نێو خەڵکەکە، گاڵتەیان بەو هەڵپەهەڵپەی ئەو دەکرد و پێی پێدەکەنین و بە گوندییەکانیان دەگوت:

"کوڕە ئەو کوێخایە تێك چووە و ئاوای بە ئێمە گوتووە."

کوێخا کە ئەو قسانەی دەبیستنەوە، لە تووڕەییان شێت دەبوو و دەیگوت:

ـ کوڕە کوا هاوڕێی گیانی گیانی لەو دنیایە ماوە، هەرچی هەیە کار بۆ تاشباش دەکەن. هەی گوندیی بێ ناموس. بیکەنە ئیمامزادە و پیاوچاك، با بزانم چیتان پێ دەبڕێ. پەلە مەکەن با پێستی سەرتان هەڵقەنێ و ڕووت و قووتتان بکاتەوە ئینجا بۆتان ڕوون دەبێتەوە."

دوایی دەچووە نێو ئاوەدانی و دەگەیشتە هەر کەسێ دەیگوت:

ـ کوڕە ئەو درۆ شاخدارانە چین، درۆی ئاوا کەس نەیبیستووە. لوقمانی حەکیم بەو هەمووە گەورەییەی خۆی کێ دەڵێ باپیرەی تاشباشە. یان بابی باپیرەی تاشباش چۆن توانیبووی خۆی بگەیەنێتە لوتکەی جبی یەس؟... ئەوە شێت بوونە؟ بە خوای تاشباش خەریکە دەتاقەتێنێ.

لە پیر و گەنج و ژن و منداڵەوە بگرە، تووشی هەر کەس بوایە لەگەڵی ڕادەوەستا و ئەو قسانەی بۆ دەکرد.

گوندییەکان دەیانزانی بۆچی شڵەژاوە و بەوە خۆشحاڵ دەبوون. گوێیان دەدایە قسە لەبڕاننەهاتووەکانی و بەبێ ئەوەی هیچ جوابێکی بدەنەوە ملیان بۆ خوار دەکردەوە و لێی دوور دەکەوتنەوە.

بە شوێن عەلیدا گەڕا: عەلی، کوڕێ مرێمۆك و دوژمنی قەستەسەری ئەو. لە بەیانییەوە هەتا ئێستا سێ جاران چووبووە ماڵەکەی و نەیدیبوو. ئاخرییەکەی لە نێوەڕاستی گوندی، تووشی بوو و گوتی:

ـ ئەوە چییە عەلی؟ دیوتە چ بووە؟

عەلی ساویلکانە وەڵامی دایەوە:

ـ نەخێر، ئەمن هیچم نەبیستووە. چما چ بووە؟

ـ هەیهوو، کوڕە عەلی ئەوە تۆ شێت بووی؟ وەڵڵاهی نەهامەتییەك بەسەر ئەو گوندە دێ هەر مەپرسە. خەڵك خەریکن تاشباش دەکەنە پیر و پیاوچاك. چما نەتبیستووە دەڵێن، لوقمانی حەکیم باپیرەی تاشباش بووە، و ئەو هەمووە قسەیەی دیکەش... هەمووی ئەو قسانە قسەی

گیرفانی تاشباشن و له ڕێی پیاوەکانییەوە لە گوندەکەدا بڵاویان دەکاتەوە. ئاوا بڕوا لەو گوندە و لە سەرانسەری تۆرووسدا لە مەلا تۆپاکلیش گەورەتر دەبێتەوە. مەلا تۆپاکلی لانیکەم وەك ئێمە بنیادەمێکی ئاسایی بوو. سەیر کە کێ دەکەنە بنەچەی تاشباش. لوقمانی حەکیم. چەند ڕۆژی دیکە ئەگەر دوو سێ پێغەمبەری دیکەشیان بە بنەماڵەیەوە بەستەوە، ئەمن هیچ پێم سەیر نابێ. ئەو مەمەد تاشباشەش ئاخرییەکەی یان لە زینداندا دەڕزێ یان لە شێتخانەی دەبینیتەوە ئەوە دەیبینی. تەواوی ئەو کارانەی لە دژی منە. پێی بڵێ نەك بووبێتە پیاوچاك، بەڵکو ببێتە پێغەمبەریش بەر لەوەی خۆم تێدا بچم تۆڵەناو دەبەم. بەر لەوەی خۆم بمرم تۆ دەکوژم. با ئەوەش بە تۆ بڵێم عەلی، دوای من ئەتۆ کوێخای ئەو گوندە دەبی، ئیتر ئەمن پیر بوومە و عومری پیرە مەرێکم ماوە. ئەتۆ زۆر گەنجی. کوێخاییەکە بەتۆ دەسپێرم. ئەوە قەولی پیاوانە. دەمەوێ قورئانت بۆ بخۆم. تاقە کۆسپ و لەمپەری سەر ڕێی تۆ ئەو تاشباشەیە. ئەو ناهێڵێ ئەتۆ ببیتە کوێخا. دەبێ پێشی بگیردرێ. هەتا کارەکە قووڵتر نەبۆتەوە، دەبێ مشوورێکی بخۆین. دەبێ ئەو گوندیيانە لە خەو هەستێنین و ئەوەش یەکێکە لە گەورەترین ئەرکی نەتەوەیی و نیشتیمانیی ئێمە. خۆ بێت و حوکمەت بزانێ گوندەکەی ئێمە شتی ئاوای لێ هەڵکەوتووە، تۆپبارانمان دەکات. وا نییە؟

شانی ڕاستی عەلیی گرت و چاوی لە چاوەکانی بڕی و گوتی:

- ئەتۆ پیاوێکی تێگەیشتووی، جا پێم بڵێ، لوقمانی حەکیم باپیرەی تاشباش بوو؟ باشە ئەوەیان لە کوێوە هێناوە؟ کێ گوتوویەتی؟ لە کام کتێبدا نووسراوە؟ دەی بڵێ دەی، خۆ تۆ پیاوێکی ئاقڵی.

عەلی:

وەڵڵاهی چووزانم...

- هەتیو ئەتۆ شێتی؟ ئاخر چۆن دەبێ لوقمانی حەکیم بەو گەورەییەی، باپیرەی ئەو تاشباشە چڵمنە بێ. چما تۆ بڕوا دەکەی؟

- وەڵڵاهی بڵێم چی...

- بابە گیان، ئەو پیاوە گەورەیەی چارەسەری مەرگی دۆزیوەتەوە، چما دەبێ باپیرەی ئەو سەگبابە پێ پەتییە بێ؟...

- وەڵڵاهی بڵێم چی...

- کوڕە، بۆ لوقمانی حەکیم هەر ژن و منداڵی هەبووە هەتا وەچە و نەوەی وەك ئەو تاشباشە لەچەر و بێ حەیایەی هەبێ؟...

عەلی تووڕە بوو و گوتی:
- لەوانەشە ژنی هەبووبێ. ئەتۆ چووزانی؟ لە کام دەفتەردا نووسراوە ژنی نەبووە؟...
- سەیری من بکە عەلی، سەیرم بکە. ئاقڵ بە و بزانە ویژدانت چیت پێ دەڵێ. لە تۆ دەپرسم: ئاخر شتی وا دەبێ ئەو تاشباشە بەرەڵڵایە ئەوەی لوقمانی حەکیم بێ؟...
عەلی بە دەنگێکی گڕ گوتی:
- چووزانم، بەشکم بی. پلار لە تاریکی مەگرە... ناتوانی لە ڕواڵەتەوە خەڵك بناسیت...
کوێخا کە دەستی لەسەر شانی ئەو دانابوو، پاڵێکی پێوە نا:
- هەر هەمووتان لە زاری یەکتری تفیون و خەریکن شۆڕشەکەی شێخ سەعید دژی حوکمەت دەژێننەوە. جا باشە ئەنگۆ ئەو بکەنە پیاوچاکی خودا با ببێتە خۆرکەی گیانتان. ئەمن باش دەزانم چ لەو بکەم چیش بەسەر ئێوە بێنم.
عەلی لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە:
- بڕۆ کام ڕێگە سەختە ئەو بگرە، کوێخا سەفەرەفەنی...
و بەجێی هێشت.
کوێخا بە بۆڵەبۆڵ گوتی:
- لەعنەتی خودا لە ئابا و ئەژدادی لاسار و شێت و شوورتان. تۆرەمە وەحشییەکەی مرێمۆك. پێتان دەڵێم...
هیچ هیوایەك نەبوو. تاقە ڕێگا، عادیل ئەفەنی بوو. ئەگەر عادیل هاتبایە، پیاوچاکەکەی ئەوان لە چاوترووکانێکا بزر دەبوو:
"بگەیە عادیل بگەیە بابی من، خەریکە تێدا دەچم. ئەتۆش لەگەڵ مندا خەریکە تێدا دەچی. ئەگەر ئەمشەو نەیەی کارم لە کار دەترازێ. خۆت بگەیەنە شێرە پیاو، بەنۆکەرت بمگەیە.
"دەبێ بەر لەوەی پیاوچاکبوونی تاشباش بکەوێتە سەر زار و زمانان، مشوورێکی لێ بخۆین، ئەگینا دواتر بەکەس جێبەجێ نابێ، تاشباش پیاوێکی ژیر و ئازا و چاونەترسە و لە هەمانکاتیشدا وەك ڕێوی بە فرت و فێڵە و ئەوەندەش چاونەترسە گوێی بە هیچ شتێ نابزوێ. بێت و بزانێ خەڵکی تۆرووسی لە پشتن و دەیپەرستن، ئیتر لە هیچ شتێ ناپرینگێتەوە، کوێخای گوندێکی بچووك سەهلە، عادیل ئەفەنییەکی کاسبکاری شارۆچکەیەك هەر هیچ، لەبەر حوکمەتە کۆمارییەکەی تورکیاشدا ڕادەوەستێ و گاڵتەی پێ دەکا. ئەو تاشباشە لە پیاوچاکەکانی دیکە جوێیە. بێت و ڕقی هەستێ، تفەنگەکەی لە شانی دەکا و بە چیا

هەڵدەگەڕێ. هەم دەبێتە ئەولیا و هەمیش یاغی... ئای خودایە گیان، وەیش... لەو چیایانەدا کۆماری تورکییە هیچ، خۆ ئەمریکاش بە بۆمبە ئەتۆمییەکەیەوە بێ، پێی ناگیرێ. خەڵکی تۆرووس هەتا دوا پشوویان پشتی دەگرن..

"کوڕە ئاگات لێ بێ عادیل، ئاگات لێ بێ حوکمەت، ئەوەی وا پێ دەگا، تاشباش ئۆغلۆ، کە سێ هەرێم و چوارسەت پارچە گوند و هەژدە شارەدێی لە پشتن و کەوشەنەکەشی بەرەبەرە فرەوانتر دەبێتەوە. تۆ ئیتر باشاری ناکەی. ئەوە دەگاتێ. چیی وای نەماوە. ئێمە لەمەودوا ئیتر ناتوانین لێرە بژیێن. ئیتر لەمەودوا ئەو گیانە شیرنەشمان کە تا ئێستا پاراستوومانە، گورگ و چەقەڵ دەیخۆن.

"هیچ چار نییە. دەبێ کارێکی وا بکەین، لەبەر چاوی خەڵکەکە سووک بێ. دەبێ بەڵایەك بەسەر ئەو گوندە بێ، تاشباش و ماشباشیان لەبیر نەمێنێ. دەبێ بوومەلەرزە بێ. هەموو ماڵەکان تەخت بکا. تەنیا یەك حەوتوو، لانیکەم حەوتوویەك ئەو خەڵکە نەتوانن بێنەوە سەرخۆ و بیر لە تاشباش بکەنەوە، بەڵام جا فایدەی چی. دوای ئەوە دیسانیش زیاتر پێبەندی تاشباش دەبنەوەو ئیتر دەستی لێ هەڵناگرن.

"دەبێ دەستەیەك چەتە بێن. شەوێك لە شەوەکان بەسەر گوندەکەی دا بدەن و هەموو گوندییەکان قۆڵبەست بکەن و نێوگەڵیان داغ بکەن و لە هەمووشیان زیاتر تاشباش. ئاواش پیاو دەتوانێ بۆ ماوەی حەوتووەك هەلی بۆ بڕەخسێ...

بەڵام دوایی، کاتێك ئاوای لێهات و تاشباش دەستی کرد بە هاندان و دنەدانی خەڵکەکە، ئیتر ناتوانی لە چنگی گوندییەکانی دەربێنیتەوە.

"ئاوا باشترە هەر ئەمشەو سەری تاشباش بە گۆمدا بکەین و لەناوی بەرین. ئاوا نەبێ لە چنگی دەرباز نابین."

هەر ئەو ساتە یەکێکی بە شوێن بەکرە شێتدا نارد. لەو گوندەدا ئەوی کارێکی لەدەست هاتبایە و لەو بارودۆخەدا کە مەسەلەی گیان لە گۆڕێ بوو و بۆوەی دەبوو متمانەی پێ بکەی، هەر ئەو بەکرە شێتە بوو. پیاوێکی دیکەش کە متمانەی پێی بوو "عەلی عومەر" بوو. عومەر گەنجێکی ئازا بوو، بەڵام جار نەبوو گوو لە کارەکان نەکا:

"جارێ با ئەو بەکرە شێتە بێ، با بزانم ئەو دەڵێ چی؟

ـ براله بەکر، لە هەچەڵێکی گەورەدا گیرمان خواردووە. خەریکە جڵەوی کارەکەمان لە دەست دەردەچێ. بێت و کار لە کار بترازێ، دوایی هەزار ئاخ بە پووشێك.

بەکرە شێت گوتی:

- بەڵێ براکەم، بە پووشێك، بێ سوودە. چیی وای نەماوە کار لە کار بترازێ. خەرکە بەڵایەکت بەسەر دێ کە بەسەر هیچ کەس نەهاتووە.

سەفەر ئاخێکی هەڵکێشا و بە لەبزێکی تاڵەوە گوتی:

- بەسەر هیچ کەس نەهاتووە... ئەمڕ و سبەی کە لە هەموو شوێنێ دەنگی دایەوە و مەسەلەکە مسۆگەر بوو، ئیتر کەس لە ترسانی ناوێرێ پێی بڵێ پشتی چاوت برۆیە.... تەنانەت ئەمن و تۆش کە سوور دەزانین ئەوە هەر تاشباشە گێل و شێتەکەی جارانی خۆمانە، بەبێ گوتنی بیسمیللا ناتوانین ناوی بەرین. دەبێ هەر ئەمشەو بەر لەوەی کار لە کار بترازێ سەری بەگۆمێدا بکەین. ئەمشەو دەبێ تاشباش بچێتە دنیایەکی دیکە. ئەگەر ئەو نەڕوا، هاوڕێ ئێمە تێداچووین، دەی ئێستا دەڵێی چی؟ دەکرێ ڕێگەیەك بدۆزینەوە؟ دەتوانین دووبەدوو بیکەین؟ چەکەکەت فیشەکی تێدایە؟ ئەتۆ ساخ بوویەتەوە؟

بەکرە شێت ڕەنگی بە ڕوخسارییەوە نەما. لێوەکانی کەوتنە لەرین. کوێخا کە ئاوای بینی، بە گاڵتەپێکردنەوە گوتی:

- ئەوە چییە؟ پاشگەز بوویتەوە؟ ڕەنگی مردووانت لێ نیشت. بۆ وات لێهات؟ نەکا لە تاشباش ترسابی؟

بەکرە شێت بە نیوەنووزەیەکەوە گوتی:

- ئەمن دەترسم.

کوێخا بە تووڕەییەوە گوڕاندی:

- لە چ شتێکی ئەو سەگبابە دەترسی؟

بەکرە شێت:

- کوڕە بێت و هەر بە ڕاستی لە تۆرەمەی لوقمانی حەکیم بێ یان ئەولیای خودا بێ، خودای ئەو لەناومان دەبا. ئەی ئەگەر ئەودەمەی پەلەپیتکەی دەمانچەی لێ ڕادەکێشم دەستم وشك بوون چ بکەم؟ یان ئەگەر هات و ئیفلیج بووم؟....

کوێخا نەڕاندی:

- کوڕە خۆڵ وەسەر هەمووتان. هەی ژنانیلەبینە... ئەوە هەمووی گووی ئێوەیە من دەیشێلم... و خۆی پێ نەگیرا و سێ تفی لە نێوچاوانی کرد:

- تف لە ڕووت... تف لەو ڕووەت، فت... یاڵڵا لەبەر چاوم ون بە و لە ماڵم وەدەر کەوە. دەی بچۆوە پاڵ ژنە قەحپەکەت بنوو. ئەمن بەهەر شێوەیەك بێ دەبێ ئەمشەو ئەو کابرایە لەناو بەرم. ناچارم وا بکەم. بێت و وستەت لێوە بێ، ئەتۆش دەکوژم. بێت و ئەمن ئەو کابرایە نەکوژم، دوای سێ ڕۆژی دیکە ئەو من دەکوژێ. یاڵڵا هەستە جەحەندەم پڕ کە. گەودای ترسنۆکینە...

بەکرە شێت ملی بەلارەوە نا و گوتی:

- ئەمن دەترسم، بەڵام ئەگەر بتەوێ لەگەڵ دێم، چون ئەگەر سبەی ڕۆژێ مەسەلەی تاشباش ئاشکرا بێ و ئەو لە گوندیدا دەسەڵات بگرێتە دەست، هەردووکمان دەکوژێ.

کوێخا دەستی بەکرە شێتی گرت و گوتی:

- کوڕە ئەتۆ کەی ترساوی؟ ئەتۆ برای منی.

بەکرە شێت دیسانەکەش بە ترسەوە وەڵامی دایەوە:

- ئاخر گوتم ئەو تاشباش ئۆغلوە... ئەگەر ڕاستیت دەوێ کەس نازانێ... بنیادەم چووزانێ... گوتم نەکا هەر بە ڕاستی پیاوچاکێك شتێك بێ... ئەو کات ئاهی ئەو دەمانگرێ و لە بنەمان دێنێ. لەوە تۆقیوم..، بەڵام ئێستا هەر چۆنێك بێ خۆ ئەو هەر ئێمە دەکوژێ، ئەی چار چییە؟

کوێخا ئەوجارە تووڕەتر بوو:

- جەحەندەم پڕ کە و بڕۆ دەرێ. ون بە لەبەر چاوم و بچۆوە لای ئەو ژنە گاندەرەت. سەیرکە ئەمن پێم وابوو تۆ پیاوی... ون بە. لەبەر چاوم ون بە... ئاخر چۆن دەبێ خودا ئەو تاشباشە بێ دەسەڵاتە گێلە بکاتە ئەولیای خۆ؟ چۆن دەبێ ئەو هەتیوە ئەولیای خودای بێ؟... خودا لەوی گەمژەتر نەخولقاندووە.

خەریك بوو دەینەڕاند.

کوێخا خۆشی لە ناخیدا ترسێکی هەبوو کە نەیدەویست بەرووی خۆی بێنێ. ئەو جەندەرمەیەی مورتەزای بردبووە شێتخانە، لە گەڕانەوەیدا لە ئەستەنبوڵ لەسەر پردەکەی دووکانی "گولەك" سەیارە لێیدابوو و کوشتبووی و هەمووان دەیانگوت ئاهی مورتەزا گرتوویەتی کە زوڵمی لێ کردووە.

- تاشباش پیاوچاکبوونی لێ ناوەشێتەوە... مەحاڵە. هەر وەك چۆن شەیتان ناتوانێ ببێتە پێغەمبەر، ئەویش ناتوانێ ببێتە پیاوچاك. چما وا نییە؟ ئەتۆ تا ئێستا دیتووتە تاشباش سەر بە فەرزی خودای دابدا؟...

ـ من نەمدیوە، بەڵام پیاوچاکەکان بە دزییەوە نوێژ دەکەن.

ـ هەر گوویەکی پێی خۆشە با بیخوا، بەڵام ئەو نابێتە پیاوچاک. مەحاڵە هاورێ، مەحاڵە...

دەیویست خۆی قایل بکا.

بەکرە شێت:

ـ ئەوە تۆ لە خۆتەوە کردووتە بە پیاوچاک، کێ گوتوویە تاشباش پیاوچاکە؟ بۆ هەر کەسێك لە تۆرەمەی لوقمان بێ، خۆیشی دەبێتە پیاوی خودا؟ ئەتۆ ئەوەت لە کوێ هێناوە؟...

کوێخا وەڵامی دایەوە:

ـ لە کوێم هێناوە؟

دەتگوت لەخۆی دەپرسێ: هەر بە ڕاستی ئەو قسەیەی لە کوێوە هێنا بوو؟... چۆن بە مێشکیدا هاتبوو؟ ئەو ترس و دەست تێکەڵهاتنە هۆی چ بوو:

ـ ئەتۆ تا ئێستا لە کەست بیستووە بڵێ تاشباش پیاوی خودایە؟ پەرجۆیەك شتێکی لێ بینراوە؟ هیچت بیستووە؟.. دیتووتە کەسێك وەك پیاوی خودای سەیری بکا؟...

ـ هیچ نەمبیستووە.... گوێبیستی هیچ شتێکیش نەبوومە... کەسیش بەو چاوەی سەیر ناکا... تەنیا زۆری لێ دەترسێن. زراویان لێی چووە.

کوێخا ئاخێکی هەڵکێشا:

ـ خراپەکەی لەوەی دایە... ترسان شتێکی خراپە. خەریکە وای لێ دێ. ئەمن باش دەزانم. با جارێ یەك دوو ڕۆژی دیکەش ڕاوەستین. با دەستمان بەخوێنی ئەو پیس نەکەین. تەنیا تۆ ئەمشەو "عەلی عومەر" لەگەڵ خۆت هەڵگرە و بچۆ دەرەوەی ئاوایی. دە پازدە فیشەك بەسەر ئاواییدا بتەقێنە. وریا بە کەس نەتانبینێ...

بەکرە شێت بە خۆشییەوە گوتی:

ـ باشە، هەتا بەیانی گوندەکەت بۆ تیرەباران دەکەم.

***

کە بەکرە شێت ڕۆیشت، کوێخا تووشی دڵەڕاوکێ و ترس هات. بێت و هەر بەیانی مەسەلەی تاشباش دەنگی دابایەوە... ئەگەر فیتی خۆی بێ تاشباش، دیارە هەر بەو زووانە پەرجۆیەکیش ساز دەکا، بەڵام ئەگەر کاری ئەو نەبێ؟... مەحاڵە... فیتی خۆیەتی... لە

پێشدا دەستی کرد بە تووك و لەعنەتی گوندییەکان. دواییش ئەحە شێتۆکە لەبەر پێیانی کڕنۆشی برد. ئەوانە هەمووی دارێژراون. هەمووی لە بن سەری ئەو تاشباشە ڕێوییە دایە. دواییش پەرجۆی باپیرەی تاشباش، ئەو حەقایەتە کێ سازی کردووە؟... تاشباش نەبێ کێ دەیتوانی ئەو درۆیانە بەسەر یەکەوە بنێ. ئاخریش ئەو بەسەرهاتەی لوقمانی حەکیم. نەخێر، ئەمن ناخەڵەتێم، هیچ کەرێك بڕوا بەو فرت و فێڵانە ناکا.

"هەر بەراست، بێت و پیاو بچێ لەگەڵ خۆی قسە بکا، بڵێی بۆی ڕوون نەبێتەوە کە خۆی ئەو فرت و فێڵانە ساز دەکات یان نا؟...

"خودا دەزانێ، لەوانەشە گوندییەکان هەر لە خۆیانەوە سازی بکەن و ئەو تاشباشە قوڕ بەسەرە ڕۆحیشی ئاگادار نەبێ. بەڵێ کاری ئەو گوندییە خودا غەززەب لێگرتووانەیە. ئەوانە ئەگەر کەوتنە تەنگانە جا چ ناکەن؟ .. تەنانەت پێغەمبەرەکانیش لە گۆڕەکانیان دێننە دەرەوە و دەیانهێننە گوندی یالاك. ئەوەندە درۆ بەسەر یەکەوە دەنێن، هەتا سەری ئەو تاشباشە قوڕ بە پەتەوە دەکەن. دەیکەنە پیاو چاك و وای لێ دەکەن ئەو لێقەوماوە سەرلێشێواو و دەربەدەر بێ. ئەگەر کار ئەوان بێ، کێشەیەك نییە، بەڵام بێت و لەبن سەری تاشباش خۆیدا بێ، ئەو کات زۆر مەترسیدارە."

هەستا و لە خۆی پرسی:"هەر بە ڕاستی تاشباش دەرگا لە من هەڵدەگرێ؟... جارێ ڕاوەستە با شەو بەسەردا بێ و ئەو گوندییە سەگبابانە نەمبینن کە من دەچمە ماڵی تاشباش... تاشباش پیاوێکی جوامێرە. بێت و یەکێك لە دەرگای ماڵی بدا، مەحاڵە دەرگای لێ نەکاتەوە."

کە نانی شەوێی خوارد، هەستا وەدەر کەوت و چووە ماڵی تاشباش و لە پشت دەرگاکەی گەرووی خۆی خاوێن کردەوە و بە دەنگێکی خۆمانەوە و بە ڕێزەوە گوتی:

ـ مەمەد، برالە، دەرگا بکەوە. ئەمنم کوێخا سەفەرم. هاتووم چاوم پێت بکەوێ. هاتووم دوو قسەت لەگەڵ بکەم.

خودایە ئەو بەڵایە چ بوو بەسەری دەهات. خەریك بوو دڵی بتەقێ. دەست و لاقی بێ هێز ببوون و دڵەکوتەی بوو.

تاشباش ئۆغلو گوتی:

ـ فەرموو ئاغا سەفەر.

دەرگای لێ کردەوە: بەخێر بێی، گەورەت کردین.

بزەی دەهاتێ. نیگای پڕ لە پرسیار بوو. خێرە بەو نیوەشەوە ئەو پیاوە بۆ هاتووەتە ئێرە؟....

سەفەر هەر لە پەنا ئاگردانەکە دانیشت دەستی پێ کرد:

ـ هیچت بیستووە؟ ئەو گوندییانە خەریکن بەلاّیەکت بۆ ساز دەکەن. هاوڕێ ئەمن دوژمنی تۆ نیم. دوژمنی هیچ مەخلووقێکی خودای و هیچ موسوڵمانێکیش نیم و ناشتوانم ببم. ئەو گوندییانەش وەك برای خۆم وان. ئەتۆش کە خزم و کەسی خۆمی. هەر بۆیەش ئەمشەو هاتوومە لات. دیتم شتەکە خەریکە مەترسیدار دەبێ. خەریکە دەبیتە قوربانیی فرت و فێڵێك. سەیرم کرد ئەو گوندییانە ئاوا بڕوا تووشی هەزار بەلاّت دەکەن. بەخۆم گوت با بڕۆم و داوای یارمەتیی لێ بکەم و لەو نەهامەتییە نەجاتی بدەم. ویژدانم ئازاری دەدام و خۆم پێ نەگیرا. بەخۆمم گوت، پیاوێك خەریکە تێدا دەچێ... سەفەر، وەجاغێك خەریکە کوێر دەبێتەوە. هاوڕێ فریای تاشباش بکەوە. ئەگەر ئەو وەك دوژمنیش سەیری تۆ دەکا، بەلاّم ئێستا کە گوندییەکان خەریکن سەری بە پەتەوە دەکەن، ئەتۆ بەر لەوەی هەڵدێردرێ، بیگەیە و دەستی بگرە و نەجاتی بدە. بەڵێ، ئاوام بەخۆم گوت. و بڕیارم دا و هاتمە لات.

تاشباش بە سەرسووڕماوییەوە و بە گومان و کونجکۆڵییەوە گوتی:

ـ بەخێر بێی، گەورەت کردم، خوا ڕاوەستاوت بکا، بۆ چما خۆم ناتناسم...

سەفەر بزەیەکی هاتێ و پرسی:

ـ هەر بە ڕاستی خۆت دەزانی چ بووە؟...

تاشباش ساویلکانە گوتی:

ـ نەوەڵلاّ، چما چ بووە؟... دیسان خەریکە بەلاّیەك بەسەر گوندەکە دێ؟...

کوێخا:

ـ بەلاّ؟.... ئەویش چ بەلاّیەك، هەم بەسەر ئەو گوندە و هەمیش بەسەر من و لەوە گرنگتر بەسەر تۆ... هەر بە ڕاستی ئاگات لە هیچ نییە؟...

تاشباش گوتی:

ـ بە خوای بێ خەبەرم، چما چ بووە؟...

ـ ئەو کەسەی جووتێ گوڵی لە لەپی دەستیدا ڕووا بوون و کاتێ سەری بیووە بەرد، گوڵەکانی بەسەری خۆیدا خشاند و دیسان وەك خۆی لێ هاتەوە، باپیرەی تۆ مەمەد، تاشباش نەبوو؟

تاشباش بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ زەمانی زوو، حەقایەتێکی وایان دەگێڕایەوە، بەڵام کەس نازانێ بۆچی وەبیریان هاتۆتەوە؟...

ـ یانی تۆ نەتدەزانی؟...

ـ وەڵڵا، بیللا ئاگام لێ نەبووە.

ـ شتێکی دیکەش، ئەو پیرە بەناوبانگە، دکتۆری هەموو دکتۆرەکانی دنیا، لوقمانی حەکیم، دەڵێن باپیرەی تۆ بووە. هەموو گوند پڕ بووە لەو قسەیە، ئەتۆ هیچ ئاگات لێیە؟...

ـ نا، ... ئەوجار ئەوەیان لە کوێ هێناوە؟... ئەوە ئیتر درۆیەکی شاخدارە...

کوێخا سەفەر دەستەکانی ئەوی گرت و چاوی لە چاوەکانی بڕی:

ـ ڕاست بڵێ یانی ئەو هەڵلایەت نەبیستووەتەوە؟.. حەقایەتی لوقمانی حەکیم و تاشباش و ئەو گاڵتە و گەمەیە... و ناشزانی ئاخرییەکەی ئەو قسانە چییان لێ شین دەبێتەوە؟...

تاشباش وەڵامی دایەوە:

ـ نەوەڵڵا نازانم، بەڵام قەی چی دەکا؟ ئەمن فشەم پێی دێ... گوندیین ئیدی. لێیان گەڕێ با بڵێن، هەر بیڵێن و بیڵێنەوە، چتما چ دەبێ؟... هەموو ڕۆژێ هەزاران درۆی ئاوا بەسەر یەکەوە دەنێن.

سەفەر هیچ نیشانەیەکی درۆکردنی لە چاوەکانی تاشباشدا نەدی و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"هەی گووی سەگ بە گۆڕی دایك و بابی ئەو گوندییانە. بەخوای بێ ناموس و هیچ و پووچن." و گوتی:

ـ جا برالە، ئەمن ئەگەر پێت بڵێم چیی لێ دەکەوێتەوە زراوت دەچێ. ئەگەر بزانی ئەو گوندییانە چیت بەسەر دێنن و دەیانەوێ بتکەنە چی، هەرچیت بەسەر زاریدا بێ پێیان دەڵێی. جگە لەوەش، ئەتۆ وەك برای خۆم وای، ڕەسەنترین پیاوی ئەو گوندەی، سەیر بکە، ئەمن ئیتر ئەوە پیر بوومە و حەوت هەشت ساڵی دیکە ئەتۆ لەجێی من دەبیتە کوێخای ئەو گوندە. ئەمن خۆم یارمەتیت دەکەم. بەڵێنت پێ دەدەم. ئەمساڵیش با دۆزینەوەی مەزرای لۆکە لە ئەستۆی تۆ بێ. خۆت دەبێ بگەڕێیت و بدۆزیتەوە، نەك بەکرە شێت. پارەی گرتنەکەشی هەر بۆخۆت دەبێ و ئەگەر ئەمن قرۆشێکم لەو پارەیە لێ ویستی، خودا گول و کوێرم بکا.

تاشباش ئۆغڵو گوتی:

ـ ئەمن هیچ شتێکم ناوێ. هەر ئەوەندەم دەوێ گوندییەکانی جارێکی دی تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشە نەبنەوە.

کوێخا دەنگی بەرزتر کردەوە:

ـ ئەوجار گوندییەکان، هەتا منی ڕووڕەش زیندووم، ئیتر قەت ڕۆژی وا نابیننەوە. کام زەوی پڕ پیت و بەرەکەتە لە چوکووراوا، ئەویان بۆ دەگرم. ئەو گوندییانە دەوڵەمەند دەبن و ئیتر پێیان ناچێتەوە مەزراکەی کوڕی میر ئالای. ئەوجار پیاوانە بەڵێن بە تۆ و گوندییەکانیشم دەدەم. ئێستا با بێینە سەر ئەو بەڵایەی چاوەڕوانی تۆیە.

خۆی خەفەتبار کرد و دوو دڵۆپ فرمێسك لە گۆشەی چاوەکانیا قەتیس مان. بە دەنگێکی گریاناوییەوە گوتی:

ـ براله، ئەوە بۆ تۆ زۆر مەترسیدارە و ئەستەمە لێی نەجاتت بێ. ئەگەر زووتر وەخۆ نەکەوی، دڵنیا بە سووتاوی و تێداچووی. هەر خۆت دەتوانی پێش بەو کارە بگری. ئەمن هەموو هەوڵی خۆمم دا. گوتم بابە گیان، لوقمانی حەکیم عەرەب بووە و مەحاڵە باپیرەی تاشباشەکەی خۆمان بووبێ، بە گوێیاندا نەچوو. گاڵتەیان پێ کردم. کوڕە خەریکە کارەکە ئاڵۆز دەبێ. ئەو گوندییانە دەیانەوێ پەندەکەی مورتەزا بەسەر تۆش بێنن. جاری ئەوە نان و ڕۆنەکەیەتی. ئەگەر هەر ئێستا بتوانی پێشی بگری باشتر، ئەگینا تێدا دەچی. بێت و دەنگ بداتەوە، ئەتۆ هیچ، پێغەمبەریش بێ، ناتوانێ پێشی بگرێ. حوکمەت و عادیلیش چاویان لێمانە. ئەوان بە ناوی ئەوەی دینی نوێمان داهێناوە، دەمانخەنە گرتووخانەوە و ئەتۆش بە ناوی ئەوەی خۆت وەك "مەهدی" ناساندووە، دەبەنە شێتخانە و حەیای گوندەکەمان دەچێ. برێك بیر بکەرەوە. بیر لە ئاخری و ئاقیبەتی ئەو کارە بکەوە. برالە تاشباش، بیر بکەوە. سۆمای چاوەکانم. بیر بکەوە و بزانە ئاقیبەتی ئەو کارە چارەڕەشی و لەناوچوونە و لە مەرگیش خراپترە.

تاشباش ڕەنگی بە ڕوخسارەوە نەما و گوتی:

ـ هێندێ شتم هەست پێ کردووە، بەڵام نازانم ئەو کارە بۆچی ئاوا تەنیوێتەوە و گەیشتووەتە ئێرە. ئەوە زۆر خراپە. نازانم چی بکەم...

ـ کەوابوو برۆ بە هەمووان بڵێ، ڕەچەڵەکی من پیاوچاکیان تێدا نەبووە و شتی وا نەبووە...

تاشباش ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ بڕوا ناکەن، دەبێ ڕێگەیەکی دیکە بدۆزینەوە.

کوێخا:

ـ ئەتۆ پیاوێکی ژیری. خێرا زانیت ئاقیبەتی ئەو کارە بەکوێ دەگا. ئەتۆ لە من باشتر ئەو گوندییانە دەناسی. هەموو پیاوچاکەکان، لە ساڵانی قاتی و قڕی و پەتا و شەڕەکاندا دەردەکەون. ئەو کاتەی سەربازەکانی ئێمە لە "ساری قەمیش" شەڕیان دەکرد، لەو کێوانەدا هەموو ڕۆژێ مەهدییەك دەردەکەوت. گوندییەکان لەبری ئەوەی پەنا بۆ خوای بەرن، هەموو هیوایان بەوان بوو. شەڕ بڕایەوە، شەڕی یونانیش بڕایەوە. دوای ئەوە هەموو مەهدییەکان لەبیر چوونەوە. ئەو مەهدییانەی سەردەمانێك گوندییەکان دەیانپەرستن، دوایی کە دیتیان کەس تەنانەت سەیریشیان ناکەن، زۆربەیان لە داخان دیقیان کرد، ئەوانیدیکەش ڕایان کرد و چوونە شوێنی دیکە. هێندێکیشیان دەستیان کرد بە پیاو کوشتنێ. مەهدییەکیش لێرە پەنجا کەسی لە دەوری خۆی کۆ کردەوە و یاغی بوو و دەوڵەت گرتی و لە بەندیخانەی توند کرد. جوان گوێ بدەیە بزانە دەڵێم چی، برالە تاشباش. ئەم ڕۆژانە ڕۆژی مەرگ و ژیانی ئەو گوندییانەیە. دەیانەوێ تۆ بکەنە پشت و پەنای خۆیان. هەڵتدەکێشن و بەرزت دەکەنەوە هەتا کوێرەوەرییەکانیان تەواو دەبێ و بێ خەم دەبن، ئەو کات لەو سەرەوە فڕێت دەدەنە خوارەوە و پاشقولت دەدەن. سەیر کە، تا ئێستا دیتبووت ئەو مەلعوونانە نوێژێ بکەن؟ ئێستا لە یەکتری کۆ دەبنەوە و بەبێ پێشنوێژ نوێژەکەیان دادەبەستن بە جەماعەت. سبەی کە کێشەیان نەما، جگە لە ئۆککەش داغ قوردو، کەسی دیکە خودای لەبیر نامێنێ. هەر عادیل بێ و ترس و نیگەرانییەکانیان نامێنێ. ئەتۆش ئەگەر تا ئەو کات نەخرابێیتە زیندانەوە یان نەنێردرابێیتە شێتخانە، لەو نێوەدا بەتەنێ دەمێنیتەوە. ئەوجار دەکەونە شوێنت و هۆیت هۆیت لێ دەکەن و گاڵتەت پێ دەکەن و دەڵێن:"وەرنە سەیری ئەو پیاوەی خودا". ئەمن لەبەر تۆ و لەبەر گوندەکەمان و لەبەر خۆم ئەو شتانەت پێ دەڵێم. وەرە و پێشی ئەو کارە بگرە.

تاشباش لە بن بارستایی نیگەرانییەکی توندا گوتی:

ـ هەموو قسەکانت ڕاستن. زۆریش ڕاستن. گوندی کە شتێك بچێتە مێشکیانەوە تازە تەواو. کەس باشاریان ناکا. چارە چییە؟...

هەر دووکیان چوونە فکرەوە و داڵغەیان لێ دا. سەفەر پاش چەند ساتێك سەری هەڵێنا و چاوی لە ئاگردانەکەوە بەرەو چاوەکانی تاشباش وەرسووڕاند و گوتی:

ـ تەنیا یەك ڕێگە هەیە. ئەویش ئەوەی تۆ هەر ئەمشەو واز لەو گوندە بێنیت و بڕۆی بۆ چوکووراوا. ئەمن لەوە پتر ئەقڵم ئیش ناکا.

تاشباش پێکەنی و گوتی:

ـ کوڕە قوڕتر دەبێ. ئەو کات ئیدی هەر یەکسەر دەمکەنە پیاوی خودا... هەر ئەوەندەی دەمێنێ ئیدی وەك حەزرەتی عیسا بچمە ئاسمانان.

دیسان بێدەنگ بوونەوە. تاشباش لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە. "ئەو سەفەرە بۆ ئەوەندە دەترسێ؟ دەبێ هۆیەك هەبێ. ڕەنگە پێی وابێ ئەگەر ئەمن ببمە ئەولیا، ئازاری دەدەم."

لە دڵی خۆیدا تێر بەو فکرە پێکەنی:"بەڵام ئەو حازرە بمرێ و نەهێڵێ ئەمن ببمە پیاوی خودای. هەزار، بەڵام بەسەر دێنێ. جارێ ئەوە هەموو هەڕەشەکانی خۆی کرد. با بزانین ئاخرییەکەی چی لێ دێتەوە."

سەفەریش بیری دەکردەوە. ئەو سەگبابە خۆی لێ گێل دەکا. هەر هەمووی لەبن سەری خۆی دایە. حەوت ساڵە بۆ لەناوبردنی من چیی لە دەستی هاتووە کردوویەتی و دەیکا. ئەوەش دوایین فێڵ و تەڵەکەی ئەوە. با بزانین ئاقیبەتەکەی بە کوێ دەگا."

هەر وا کە چاویان بڕیبووە ئاگرەکەوە، بیریان لە ڕێگەچارەیەك دەکردەوە بۆ وەی نەهێڵن تاشباش بکرێتە ئەولیای خودا. لە ناکاو ڕاچڵەکین. دەنگی تفەنگێك لە پشتماڵەکەی تاشباشەوە و لە نزیکەوە هات. تەقەکە بەردەوام بوو.

کوێخا دەرپەڕی و هاواری کرد:

ـ بەسەر گوندەکەیان دادا. ئەتۆ تفەنگ و فیشەکت نییە؟ دە بڕۆ خێرا بیهێنە."

تاشباش ئۆغڵو گوتی:

ـ کوڕە ئەمن تفەنگ و گوللەم لە کوێ بوو؟

ـ با من بڕۆمەوە. بابچم پێشیان بگرم. ئەگینا دێن و ڕشەکوژیمان لێ دەکەن.

دەرپەڕییە دەرەوە.

شەڕی نێوان کوێخاو بەکرە شێت سەعاتێکی پتر خایاند. گوندییەکان هەر نەشیاندەزانی چ باسە. باشە یاغییەکان بۆ پەلاماری گوندێکی ڕەشوورووت و برسی دەدەن؟ گوندێك لە قەرزەکەی خۆی پێ نەدراوەتەوە.

***

لە پەنجەرەی ماڵەکەیەوە تیری بە تاریکاییەکەوە دەنا، بەڵام دەشیزانی ئەو کارەی لەخۆڕایە. گوندییەکان یەك دوو سەعاتێك باسی ئەو هێرشەی دوێ شەوێیان دەکرد و دوایی بایاندەدایەوە و دەچوونەوە سەر باسی تاشباش. دەیزانی ئەو فیشەکانەی

دەیانتەقێنیٚ، بەفیڕۆ دەچن. کارەکەی ئەمشەوی بەخۆڕایی چوو. دەبوو ڕووداوێکی زۆر گەورە قەومابایە جا ئەو خەڵکە لە تاشباش سارد دەبوونەوە، بەڵام چ ڕووداوێك؟ لە ناکاو گوتی:"دۆزیمەوە". و لە جێی خۆی دەرپەڕی. تفەنگەکەی بە عەرزی دادا و بە غاردان بەرەو ماڵەکەی تاشباش ڕۆیشتەوە.

کە سەفەر دەستی لە تەقە هەڵگرت، بەکرە شێت و عومەریش ئیدی تەقەیان نەکردەوە. سەفەر، کە وەك لافاوێکی خۆشی و شادی خۆی بە ماڵەکەی تاشباشدا کردبوو و هاواری کرد:

ـ کوڕە نازانم کیٚ بوون هێرشیان کردە سەر ئاواییەکە، بەڵام خۆ دیتت بە نیوسەعات چۆن بێدەنگم کردن. خۆ دیتت مەمەدەکەی خۆم. برالە. دیتت لەبەر خاتری گوندییەکانی خۆم گیانیشم دادەنێم. بەبیٚ دوودڵی.

بەرەو تاشباش چوو کە ڕووبەڕووی ڕاوەستابوو و بە کەفوکوڵەوە لە ئامێزی گرت و گوتی:

ـ دۆزیمەوە، دۆزیمەوە، مەمەد گیان، برالە، ڕێگەیەکی باشم دۆزییەوە. هەم تۆ و هەمیش خۆم و هەمیش گوندییە لێقەوماوەکانی خۆمم لەو بەلاّ و نەهامەتییە نەجات دا. دوای ئەوە ئیتر کەس ناتوانیٚ وەك ئەولیا سەیری تۆ بکا. ئەگەر هەولّیش بدا، بیٚ سوودە و خۆشیان بکوژن ناتوانن. ئاخ... کوڕە خۆ ڕزگارمان بوو..

وا هەژابوو خەریك بوو بخنکیٚ. تاشباشی بەردا و لەسەری ڕۆییشت:

ـ با دانیشم و جاریٚ پشوویەکم وەبەر بێتەوە. هەر ڕێگەچارەکەم دۆزییەوە بەغاردانیٚ هاتمەوە لات. کە دەهاتم لە خۆشیان سەرم لە گێژەوە دەهات. چیی وای نەمابوو بکەوم و بمرم.

هێشتا پشووی نەهاتبۆوە سەرخۆی و خەریك بوو هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا. تاشباش ئۆغلو گوتی:

ـ خودات لیٚ ڕازی بیٚ برالە سەفەر گیان. من دەزانم ئەتۆ هەر لە خەمی گوندییەکانت دای و خەمی منیش دەخۆی.

سەفەر هەستی بەو تەوسە کرد وا لەو قسانەیدا بوو، بەڵام وەڕووی خۆی نەهێنا. بەیٚ ئەوەی بێلیٚ کاریگەریی قسەکانی کاڵ بێتەوە لە تاشباشی پرسی:

ـ پێت وایە پیاو دەبیٚ لەو دنیایەدا دەبیٚ چی بکا و خۆ لە چ گوناح و تاوانێك بدات کە نەیکەنە ئەولیا و پیاوی خودای؟

بریسکەیەکی بە تەوژم و زیرەکانە لە چاویدا بوو کە زیاتر لە چاوی ئەو کەسانەدا دەبیٚ کە داوێکیان ناوەتەوە.

تاشباشیش بەرپەرچی دایەوە. دەیزانی سەفەر دەیەوێ سەری قسەکان بەرەو کوێ بەرێ. گوتی:

- هەر گوناحێکی دەیکا با بیکا، خودا لە گوناحی بنیادەم خۆش دەبێ، بنیادەم بەهۆی ئەو چاکەکارییانەی کردوویەتی دەتوانێ ببێتە پیاوچاك و ئەولیا. عەرەبێك...

سەفەر قسەکەی پێ بڕی..

- ڕاست دەکەی، حەقتە. ئەمن دەمەوێ ئەو گرێپووچکەیەت بۆ بکەمەوە. دەمەوێ گوناحێك بکەی ئەو گوندییانە دەست بەرۆکت بەردەن. خەریکم لێت دەپرسم کە ئەگەر بێت و بنیادەم دزییەك زیناحێك بکا یان لەگەڵ ئاژەڵێکی ماڵی یان کێوی جووت بێ، یان پیاوێك بکوژێ، دیسانیش خەڵك هەر بە پیاوچاك و ئەولیای دەزانن؟

تاشباش لەسەرخۆ گوتی:

- چووزانی هەر بە ئەولیای دانانێن...

سەفەر گڕی گرت:

- چۆن دەبێ داینێن؟ یانی ئەگەر ئەتۆ بەسەر کەرێکەوە بگرن، دە نەفەر بێن و بتبینن کەر دەگێی، دیسان هەر بە پیاوچاکت دەزانن؟

- کەس نازانێ. ئەگەر بیانەوێ کارێکی بکەن، هەر دەیکەن.

- پێشنیارێکم هەیە بۆت. گایینی کەر و ماین و دێڵە سەگ، کارێکی پیسە. کردەوەی سەردەمی هەرزەکارییە. خۆ لەو تەمەنەدا پیاویشت پێ ناکوژرێ. دزیکردن کارێکی سادەیە، بەڵام ئەتۆ ئەوەشت لەدەست نایە. ئەی چ ماوە؟ زیناح، خۆ دەتوانی بیکەی. حەزیشت لێیە...

پێکەنی و لەسەری ڕۆیشت:

- ئەتۆ بەوە ناوبانگت دەرکردووە... لە کێلگەی پەمۆ کچ نەماوە دەستێکت پێدا نەهێنابێ. لەو جەنگەیەدا ئەگەر ئەمن و ئەنجوومەنی ئاوایی، لەبەر چاوی گوندییەکان، بەسەر ژنێکەوە بتگرین، ئیتر نە پیاوچاکبوونەکەت پێوە دەنووسێ و ئەولیابوونەکە... ئەو کات ئەتۆش نەجاتت دەبێ. ئەمن و گوندییەکانیش... لەو نێوەدا تۆش کەیف و نەهەنگی خۆت دەکەی و ژنیش ئەوە ئامادەیە. شاجوان، ژنی بەکرەی برامان. بەکرە شێت خۆ ئاگای لە هەمموو کارەکانی ژنەکەیەتی. ڕقیشت لێ هەڵناگرێ. جگە لەوەش، بەر لەوەی کارەکە ڕێك بخەین، ئەمن بەگوێیدا دەخوێنم.

چەندەی پتر قسەی دەکرد، ڕەنگی تاشباش پتر هەڵدەبزرکا. لە تووڕەییان دەست و پێی دەلەرزین. ئاخرییەکەی تەقییەوە و نەڕڕاندی:

ـ کوڕە ئەوە دانارزێی سەفەر؟ ئەتۆ دەزانیێ ئابڕوو و ناموس یانی چی؟ ئاخر تۆش بنیادەمی؟ دەزانم پیاو نی، بەڵام پێشم وانەبوو ئەوەندە سووك و چرووك و پیس بی. ئەگەر تۆزێك شەرمت کردبایە نەتدەگوت بڕۆ دەزیێ بکە، بڕۆ پیاو بکووژە و بڕۆ کەر و سەگ و ماین و بەراز بگێ. خۆ گوتت... جا جوان و زەریف گوێت بکەوە... دەزانم لە چی ترساوی. ئەگەر بشمرم ناهێڵم لەبەر چاوی ئەو گوندییانە قسەیەکم بێتەوە سەری و حەیام بچێ. ئێستا نەك بمکەنە پیاوچاك، بمکەنە پێغەمبەریش، بمکەنە مەهدییش، هەرچیم بەسەر دێ گرنگ نییە. ئەتۆش چیت پێ خۆشە دەست مەگێڕەوە. دەزانم لە چی دەترسی. هیچ نیگەران مەبە. گوندییەکان بنیادەمێکی وەك من ناکەنە پیاوچاك. بۆ کاری ئاوا لە یەکێکی بەستەزمان و لێقەوماو دەگەڕێن کە بە هەوای هەموو بلوێرێك هەڵپەڕێ. پیاوچاك دەبێ کابرایەکی ساویلکە و برێکیش شێتۆکە بێ. وای دانێ ئەو خەڵکە بەپیاوچاکیشم بزانن، ئاخۆ دەتوانن خۆشم قایل بکەن؟ ئەتۆ پێت وایە خەڵك نازانن؟ ئێستا ئەگەر گوندییەکان بچنە لای ئۆککەش داغ قۆردوو، و پێی بڵێن خەرمانەیەکی تیشکمان لە پێش دەرگایماڵەکەت دی و ئەتۆ بوویەتە پیاوی خودای، ئەو لێقەوماوە دەمودەست بڕوا دەکا، بەڵام ئەتۆ هیچ نیگەران مەبە و هیچ مەشترسە. کاری ئاوا گلاویش مەخە پێش من. با کلاومان تێکەڵ نەبێ و برایەتیمان نەچێ.

سەفەر کە زانی تاشباش لە دین دەهری بووە، و هیچ پێشنیارێك قەبووڵ ناکا گوتی:

ـ، بەڵام بزانە، کەس ناتوانێ فریات کەوێ لەو چارەنووسەی لە پێشتە. سەرت بە پەتەوە دەبێ.

تاشباش:

ـ باشە، با ببێ

سەقەر:

ـ ڕاستە، گوندی بنیادەمێکی وەك تۆ ناکەنە ئەولیا. هەمووی ئەو قسە و حەقایەتانە خۆت خستووتتە سەر زار و زمانی ئەوان. شەوانە پیاوەکانت کۆ دەکەیتەوە و ناچاریان دەکەی ئەو قسە قۆڕ و تورەهاتانە لەبەر بکەن و بەیانی بە نێو خەڵکەکەدا بڵاویان بکەنەوە.

تاشباش گوڕاندی:

ـ درۆ مەکە کاکە.

سەفەر:

ـ نەوەڵڵا، ئەمن باش دەزان ڕاست ڕاستە.

هەستا:

- هەرچی دیتت لە چاوی خۆتی دەبینی. ناتوانی بەرۆکت لە چنگی ئەو گوندییانە و سەرت لە پەتی سێدارە نەجات بدەی. گووی خۆتە بیشێلە...

تاشباش هەستا. چیی وای نەمابوو بەرۆکی سەفەر بگرێ و هەڵیتلیشێنێ و وەبەر مست و پێلەقەی بدا، بەڵام سەفەر لەماڵی ئەو بوو. بۆیە تووڕەییەکەی خۆی خواردەوە و گوتی:

- ئەوپەڕەکەی مردن نییە؟ گیانێکی سووکمان هەیە و ئەویش دەدەینەوە. قسەت ما؟

سەفەر:

- مادام کارەکەت گەیاندووەتە ئێرە و پەتی سێدارەت قەبووڵ کردووە و هەروەها ئەگەر بیرت لەوەش کردووەتەوە کە بەسەر گوندی و من و ژن و منداڵەکەت دێ، ئیتر قسەیەکم نییە. ئەگەر هەموو ئەو گوندە دەرکەن و بیانبەنە ئەو سەری ئەو دەشتە کاکی بە کاکییە، ئاخر گۆڕی دایك و باب و ئازیزەکانمان لێرە جێ دەمێنن و لە بیر دەچنەوە و خاپوور دەبن. ئەگەر ئەتۆ هەموو ئەو شتانەت لەبەرچاو گرتووە، ئیتر ئەمن قسەیەکم نییە.

تاشباش ئۆغڵو گوتی:

- بەڵێ، قەبووڵم کردووە.

لە تووڕەییان وەخت بوو شێت بێ.

سەفەر دەیزانی تووڕەیە و دەیدی وردە وردە خەریکە تەواو هەڵدەچێ، لەحزەیەك هەستی کرد ئیتر تاشباش ئاسایی نییە. بە ترسەوە خۆ لە ماڵەکەی خستە دەرێ.

# ٢٧

"دیسان هەمان تاس و حەمام"با بزانین ڕۆژی نویٚ چ هەواڵێکی تازەی پێیە. با بزانین ئەو فیشەکانەی دویٚ شەویٚ هاویژراون، کاریگەرییان لەسەر خەڵك چ بووە؟"

لە کەڕەی بەیانییەوە سەفەر پیاوەکانی بە ئاوایی وەرکردبوو. خەونێکیشی بۆ نەنە زەڵەجە پێکەوە نابوو، ئەو خەوەشی بۆ لێك دابۆوە و زەڵەجەشی ناردبوو بۆ خەڵکەکەی بگێڕێتەوە.

ئەو خەونە، دژی تاشباش بوو و خەونێکی زۆر پیس بوو. زەڵەجە چەندی هەوڵی دابوو نەیتوانیبوو بۆ خەڵکی بگێڕێتەوە، و دەیزانی قەت قەت ناوێریٚ. هەر بە ڕاستی ئەو سەفەر کابرایەکی زۆر پیس بوو. زەڵەجەی خەونی وای هەر نەدیبوو. وای دانێین، دیتبێتیشی، مەحاڵ بوو بۆ کەسی بگێڕێتەوە. چیی سەری دێنا و دەبرد، پێی شەرم بوو و ڕقی زیاتر لە سەفەر هەڵدەگرت.

پیاوەکانی سەفەریش کەم نەبوون. هەر هەموویان بە ئاوایی وەربوون و دژی تاشباش قسەیان هەڵدەبەست و شتی سەیر و سەمەرەیان بەسەر یەکەوە دەنا. ئەوەیکە تاشباش چی کردووە و چیی نەکردووە، چیها دزیی کردووە، ماڵی هەتیوانی خواردووە، دەستدرێژیی کردووەتە سەر کچێکی دوازدە ساڵانەی هەتیو و لە گەنجیدا کاری ئەو هەر کەر گایین و بەراز گایین بووە. ئەگەر مەلا کاراتۆپاکلی نەبوایە، ئەو دەستی لەو کارانە هەڵنەدەگرت. دەڵێن دڵی چووبووە سەر مامزێك و شەو و ڕۆژ بە شوێنییەوە بووە. مەلا کارا تۆپاکلی دوعایەکی لەسەر خوێند و تاشباش توانیی لەو عادەت و خووە چەوتەی ڕزگاریی بیٚ و بتوانیٚ تێکەڵاوی ئادەمیزاد بیٚ. ئەو دەمیش چووە زگ کچانی تەمەن هەشت ساڵان و دایك و باوکیان ئازار دا و تۆقاندنی. هەروەها چووە زگ هەتیو مەتیوانیش.

"چما بنەماڵەی ئاوا پیاوچاکی لیٚ دەکەوێتەوە؟ باپیرەی پیاوێکی ئاوا مەحاڵە لوقمانی حەکیم بیٚ. وەها بنیادەمێك بۆوەی نابیٚ لە نێو مرۆڤاندا بژییٚ، چۆن دەتوانیٚ..."

مەسەلەی کرنۆشەکەی ئەحە شێتۆکەش، بە شێوەیەکی دیکە لێك دەدرایەوە:" شێتە، چووبووە هەر ماڵێکی، گوناح و تاوانەکانی کابرایە بەچاوی دادابۆوە. بۆ وای کردبوو؟ ئەوە یانی ئەوەیکە، لەم دنیایە هەر کەسە و گوناحێکی هەیە. دەکرێ گوناحی هەر کەسە و بە ڕووی خۆیدا بدەیتەوە، بەڵام گوناحی تۆ بۆوەی نابێ بە ڕووتیدا بدەنەوە. چونکە گوناحەکانی تۆ ئەوەندە زۆرن، ئەی تاشباش، ئەتۆ بەبێ پرسیار و جواب دەخرێیە جەحەندەمەوە. هەر بۆیەش لەم دنیایەدا هەر بۆوەی دەبی، خاك و خۆڵی بەر پێت ماچ بکەن. جگە لەوە ناکرێ هیچ شتێکی دیکەت بۆ بکەن. ئەتۆ لەو دنیا، گۆڵمەزێك بەسەر دێ و تووشی عەزابێك دەبی، کە لەم دنیایە لە زەوی ماچکردنی بەرپێت بەولاوە هیچی دیکەت لەگەڵ ناکرێ."

ئەو پیاوانەی سەفەر ڕایهێنابوون و ناردبوونییە ئاوایی، لە هەموو ماڵ و کۆڕ و مەجلیسێکدا و تووشی هەر کەس بوایەن، بێ پسانەوە ئەوەندەیان لەو پسانە دەکرد هەتا زاریان کەفی دەکرد و زمانیان وشك دەبوو، بەڵام خەڵکی ئاوەدانی، لەو گوێچکەیەوە دەیانبیست و لەوی دیکەوە دەیانخستە دەرەوە. جاری وابوو ئاکانی پێچەوانەشی دەبوو.

ڕۆژێك نوێ دەستی پێ کرد. سەفەر زۆری هیوا بەو ڕۆژە بوو. لە خۆی دەپرسی ئاخۆ ئەو پیاوە چەنەوڕانەی ڕایهێنابوون و ئەو سەربردە و حەقایەتانەی هەڵیبەستبوون و ناردبوونی بیگێڕنەوە، و هەروەها ئەو فیشەکانی دوێ شەو هاویژرابوون، هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر ئەو وەزعە دەبوو؟

هەڵسوکەوتی دوێ شەوی تاشباش وەك خەنجەرێك جەرگی هەڵدڕیبوو. ئیتر شەڕی نێوانیان هەڵایسابوو، بەڵام ئەو شەڕە هیچ لە شەڕەکانی پێشوویان نەدەچوو. ئەو شەڕە، شەڕێکی تەواو دەستەوئێخە بوو. یەکێکیان دەبوو ئەوی دیکە لەناو بەرێ. ئەو ڕۆژانە ڕۆژی مەرگ و ژیان بوو. ئاخۆ خودا کامیانی بەسەر ئەویتردا سەردەخست؟ ڕۆژی سەر تێداچوون بوو و جارێ تاشباش لەگەڵ پیاوە باوەڕپێکراوەکانی خۆیدا خەریك بوو لە سەرکەوتنێ نزیك دەبۆوە... هەر کەس لە دوورەوە سەیری کردبایە، دەیزانی جارێ تاشباش سەرکەوتووە.

"ئاخ عادل، کوڕە بە نۆکەرت بم، بمگەیە. بمگەیە، با ڕیسەکەی تاشباش بکەینەوە خوری. ئەگەر ئەمڕۆ بگەیەی، باشە، ئەگینا... دەزانم حاڵت شڕ و شپڕێوە... ئەگینا مەحاڵ بوو قسەم لە عەرزی دەی. چما ناتناسم؟ چما تۆ برا و برادەری خۆم نی؟ خۆزگە ئەمڕۆ بمگەیەی.

"ئەوە تۆ و ئەندامانی ئەنجوومەنی دێ چیتان بەسەر هاتووە؟ چەند ڕۆژە ڕۆیشتوون. چییان بەسەر هاتووە؟ بۆچی نایەنەوە؟ ئاخۆ بەفر و بۆرانەکەی دوێ شەوێ ڕێی گرتووە؟

ئاخۆ هەورەکانی چیای تەکەچ، ڕێیان نادەن؟ خۆ ئێمە هیوامان بە هیچ کوێ نەماوە، خۆزگە لانیکەم ئەندامەکانی ئەنجوومەنی دێ بگەڕێنەوە. دەکرا واز لە هەموو کارەکان بێنم و بچمە شاری و خۆم بخەمە سەر پێڵاوەکانی عادیل و هەموو شتێك و مەسەلەی شەڕە چارەنووسسازەکەشی بۆ باس بکەم، بەڵام ناکرێ ئەوانە بەجێ بێڵی. تاشباش بۆوەی نابێ یەك سەعاتیش لێی خافڵ بی. جگە لەوەش ئەگەر ئەو عادیلە کۆك و پۆشتە نەبێ، خۆشت بکوژی هەر نایە. ئێستا با ڕاوەستین و بزانین برادەران و ڕدێن سپییەکان و خزم و کەس و هاوڕێیانمان چ خەبەرێکی نێو ئاوەدانیم بۆ دێنن.

پێش هەمووان مووسا قوڵەبنە هاتەوە. مووسا قوڵە باوەڕپێکراوترین پیاوی سەفەر بوو لە دێیەکەدا. ئەو هەتیو بوو. تا گەیشتە تەمەنی سەربازی، هەر لە ماڵی ئەم و ئەو گەورە بوو و دواییش کوێخا داڵدەی دابوو. کوێخا ژنی بۆ هێنا بوو و بە یارمەتیی خەڵکەکەش خانوویەکی بۆ دروست کردبوو. هەر بۆیە هەموو شتێکی ئەو ئی کوێخا بوو. مووسا قوڵە، پێی وابوو ئەگەر کوێخا نەبێ، ئەو ناتوانێ لەو دنیایەدا بژیێ.

سەفەر گوتی:

ـ ها مووسا گیان، خەڵك چۆن باسی تەقەکەی دوێنێ شەوێ و هێرشەکەی چەتە و یاغییەکان بۆ سەر ئاوایی دەکەن؟

مووسا قوڵە، کە هەر هێندەی منداڵێکی هەشت ساڵان دەبوو، ئەوەندە کز بوو، سەگ کلکی لێدابا دەکەوت. ڕوومەتی تێك قوپیبوون. هەمیشەی خودا ڕەنگی زەرد بوو و نیگەران دیار بوو. هەر دەتگوت ئێستا نا ئێستا یەکێك دێ و لێی دەدا. دەتگوت پێی لە سەر ئاسنی سوورکراوە دادەنا.

ـ دەڵێن ئەوە چ یاغییەك بوون. گەڕان و گەڕان و گوندێکی ڕەش و ڕووت و قەرزباریان دۆزییەوە تالانی بکەن. ئەوە چ یاغی و چەتەیەکی کەر و گەمژە بوون کە دەیانەویست ئاگردانی ئاگرێکی کوژاوە بدزن. لەوە پتر باسی تەقەکەی دوێ شەوێیان نەدەکرد. هیچ بۆیان گرنگ نەبوو.

ئاخێکی هەڵکێشا و لەسەری ڕۆیی:

ـ ئەمڕۆ دیسان باس باسی ئەو بوو. هەر هەموو باسی باب و باپیرانی تاشباشیان دەکرد... یەکێکیشیان... واتە، ئۆککەش داغ قۆردوو، دەیگوت: یەکێك کە هەموو ئەژدادی کەرامەتیان بووبێ و غەیبزان بووبێن، مەحاڵە خۆیشی وا نەبێ و پیاوێکی ئاسایی بێ و ئاشبێ نەبێ.

" هەموو ئەو گوندییانەی لەوێ بوون، وێکڕا دەیانگوت:"ئامەننآ، ڕێك وایە، یەکێك باپیرەی ئاوهای بووبێ، مەحاڵە خۆیشی کەرامەتێك شتێکی نەبێ. "

ــ یانی ئاوایان دەگوت. جا خراپەکەی لێرەی دایە. تازە بێسوودە. تازە ئاگرەکە هەڵاییساوە. پێویست بە هیچ شتێکی دیکە ناکا. تازە حوکمی ئیعدامی ئێمە دەرچووە. تازە پەتی سێدارە بە ملمانەوەیە. ئەمن بەرامبەرەکەی خۆم دەناسم. هەر لە ئەوەڵەوە دەمزانی ئەو ئۆککەشە کافرە، بەو پێنج فەرزە نوێژکردن و ڕۆژووی سێ مانگەیەوە، بەندەی خودا نییە، بەڵکو کۆیلەی تاشباشە. تاشباشیش باش دەزانێ یەکەم بڵێسەی ئاگرەکە بەدەستی کێ بخاتە کادێنەکەوە....

ئەو بنیادەمە هێندەی دنیایەك زیرەك و ژیرە، بەڵام بەرامبەرەکەشی لەو کەمتر نییە. دەبێ ئەوەی لێ سوور بێ. مووسا گیان ڕۆڵە، ئەو هەواڵانەی هێناتن باش بوون. ئاخۆ حەقایەتی تازەشیان بۆ باپیرانی هەڵبەستووە؟ دەبێ هەڵیانبەستبێ. ئەو کارە بە حیسێب و کتێب دەچێتە پێشەوە. ئەگەر هەموو ڕۆژێ حەقایەتێکی نوێ نەخەنە سەر زاری خەلکەکە، ئاگرەکە دادەمرکێتەوە. هەر بۆیەش تاشباش ناچارە هەموو ڕۆژێ حەقایەتێکی نوێ بهۆنێتەوە. ئێستاش بڵێ بزانم، ئەمڕۆ ئیتر کامە پیاوی خودایان کردووەتە باپیرەی تاشباش؟

مووسا قوڵە گوتی:

ـ وەڵڵاهی نازانم ئەولیا بووە یان نا، بەڵام دەڵێن تاشباش باپیرەیەکی هەبووە کە پیاوی وەك ئەو لە دنیایەدا نەبووە.

و پێکەنی.

سەفەر قسەکەی پێ بڕی و لێی پرسی:

ـ ئەدی لەسەر ئەو قسانەی ئەنگۆ کردتانن وەك دزیکردن و زیناح و دەستدرێژییەکانی تاشباش، دەڵێن چی؟

موسا قوڵە ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ پێت وایە ئەو دێهاتییە بێناموو‌سانە قسەیەکیان هەیە بیڵێن. دەتوانن بڵێن چی ئەو هیچ و پووچانە. دەتوانن بڵێن چی. نایانەوێ تۆز و گەردێك بە داوێنی تاشباشەوە بنووسێ. دەڵێن ئەو قسانە هەمووی بوختانن و ئیتر ئیزن نادەن ئێمە قسە بکەین. گوندەکە وای لێهاتووە کە ناکرێ لەگەڵ منداڵێکیش دژی تاشباش قسە بکەی.

سەفەر گوتی:

ـ ئەوەی نەدەبوو ببێ بوو. بڕیاری سێدارەکەمان بۆ دەرچووە و سێدارەکەمانیان لە گۆڕەپانەکە چەقاندووە. ئەو تاشباشە بێت و بە دەسەڵات بگا، کەسی کوێخا لەو گوندەدا ناهێڵێ و هەمووان دەردەکا و ئاوارە و دەربەدەر و سەرگەردانیان دەکا. لە داریان دەدا.
موسا قوڵە و ئەوانیتر بە ترس و لەرزەوە سەریان بۆ لەقاند و وەباڵیان بۆ کێشا.
ـ ڕێی نەجاتمان نییە.
و بە ڕاستیش ڕێگەی نەجات هەر نەبوو.
ئۆککەش داغ قوردوو یەکەم بلێسەی لە عەمباری بارووتەکە دابوو. شتێکی وای نەمابوو بتەقێتەوە و جا ئەو جار وەرە و سەیری تەقینەوە بکە و ئەو بەڵایەی بەسەر سەفەر و کەس و کارەکەی و لایەنگرەکانی و ئەو گوندییە بێ ئەقڵانە دێ...
سەفەر شێت و شەیدای ئەو حەقایەتانە بوو کە بۆ بنەماڵەی تاشباشیان هەڵبەستبوون. ئەو بێ دین و ئیمانانە، حەقایەتی ئەوەندە جوان هەڵدەبەستن پیاو سەری سوور دەمێنێ. ئەگەر سەفەر نەیزانیبا ئەو قسانە لە ڕاستیدا حوکمی مەرگی ئەون، حەزی دەکرد، بە تام و خوێوە بۆ هەمووانیان بگێڕێتەوە. بە مووسا قوڵەی گوت:
ـ دا بڵێ بزانم مووسا، ئەی ئەمڕۆ بنەماڵەی تاشباش چ شتێکیان کردووە؟ هەر بە ڕاستی دەمەوێ لەتۆ بپرسم: ئەقڵت چۆن بڕ دەکا؟ ئەو حەقایەتانە کێ پێکیانەوە دەنێ؟ و کێ بڵاویان دەکاتەوە؟
مووسا قوڵە گوتی:
ـ لە بیرت چوو پێت گوتوومە، یەکەم کەسێك کە چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە، ئەوە خۆی هەڵیبەستووە. ئەمن زۆرم هەوڵ دا، بەڵام بۆم ڕوون نەبۆوە تاخۆ کێ ئەو حەقایەتانە هەڵدەبەستێ. هەر دەڵێی خاك و گڵ و بەرد و با و ئەو بۆران و باڕن و کرێویەی دەبارێن، بە گوێی مرۆڤەکانیاندا دەخوێنن. لەوانەشە لەو دەشتە کاکی بە کاکییەوە هەستێ و بێ. زۆرم هەوڵ دا، بەڵام بۆم دەرنەکەوت بزانم کێ سازیان دەکا. ئەگەر هەموو بنیادەمە ژیرەکانی دنیاش هەوڵ بدەن دیسانیش بۆیان نادۆزرێتەوە. هەموو شتێکیان پێ دەدۆزرێتەوە و ئەوەیان بۆ نادۆزرێتەوە. نەوەڵڵا.
سەفەر گوتی:
ـ دەزانم بۆیان نادۆزرێتەوە. گۆرانییەکانیش هەر وان. هیچ کەس نازانێ کێ سازی کردوون. هێندێ شت هەن کە هەمووان دەیزانن و هێندێ شتیش هەن کەس پێیان نازانێ.

❊❊❊

باپیرەی ئەو تاشباشە، هەر ئەو مەمەد تاشباشەی گوندەکەی خۆمان... باپیرەی باپیرەی... و هەر ئەو بنەماڵەیەی کە تاشباش ئۆغلۆیان پێ دەڵێن، هەر هەموو ئەو پیاوانەی ئەو بنەماڵەیە کە پێیان دەگوترێ مەمەد، ئەگەر دانیشی و حیسابیان بکەی ، لەوانەیە لە هەزار مەمەدیان پتر هەبێ.

دەڵێن لە لای مەغریب، لە دەم دەریا، کێوێکی لێیە بە ناوی "غاز داغی"... گومبەزی "کچی زەرد"* لەوێیە. ئەو کێوە پیاوچاکێکی لێ بووە. ئەو دەم، لەو کوێستانەدا تەنیا دوو پیاوچاك هەبووە. یەکێکیان لە غاز داغی و ئەویتر لەو تۆرووسەی خۆمان بووە... پیاوچاکەکەی تۆرووی باپیرەی ئەو تاشباشەی ئێمە بوو و ناویشی "مەمەد تاشباشی گەورە" بووە.. ئەوی دیکە "کچی زەرد" بوو لە غاز داغی.

کچی زەرد، پادشای مەلانی ئاسمانێ بوو. و تاشباشە گەورەکەی ئێمەش پادشای گاکێوی و بزنە کێوییان. سازی قیز بۆ هەر کوێ دەچوو، بە هەزاران جۆر باڵندە و هەر کامەی لە رەنگێك، لە ئاسماندا و لە خەرمانەیەکی نووردا شەپۆلیان دەدا. کە غاز داغی بە رێیەدا دەڕۆیی، دەورووپشتی وەها پڕ دەبوو لە باڵندە، زەوی و ئاسمان و گیا و گژ و دار و دەوەن و ئەستێرەکان ون دەبوون. کچی زەرد هەروەك لە ناوەکەیەوە دیارە، بە قژە زێرینەکەیەوە کە وەك تاڤگەی زێڕ بە شانیدا دەڕژانە خوار، لە چیای غازی داغیدا دەهات و دەچوو.

چاوە درشت و شینەکانی دەبریسکانەوە. لێوەکانی وەك گوڵەهەناریان لێ هاتبوو. کچی زەرد کچێکی هەژدەساڵان بوو.

تاشباشەکەی ئێمەش گەنج بوو. بەژن و باڵا جوان بوو. ردێنێکی خورمایی هەبوو دەگەیشتە سەر سینگی. کەڵەگەت بوو. برۆکانی پڕ و چاوی گەورە و رەش و نێوشان پان. سواری یەکێك لەو کەڵە کێوییانە دەبوو، رۆژێکیان پادشای کەڵەکێوییان لە حاڵێکدا بە هەزاران کەڵەکێویی شاخ گەورەی بەشوێنەوە بوون بەرەو دەشتەکەی چوکووراوا خلۆر بوونەوە. هیچ مرۆڤێك، هیچ مەخلووقێکی نامۆ نەیدەتوانی زیانیان پێ بگەیەنێ. تاشباش دەچووە نێو لانی کەڵەکێوییەکانەوە و لەگەڵیان دەیخوارد و دەخەوت. خواردنی ئەویش هەر چۆرێك شیری مامزەکێوی و تۆزێك هەنگوینە کێوی و لوێچێ گەنم و چۆرێ ئاو بوو.

---

* کچی زەرد بە تورکی واتە کچە زەردەکە. من نەمویست ناوەکەی وەرگێرم و هەر تورکییەکەیم دانا.

ڕۆژێکیان باڵندەیەك هات و لە بەرانبەر پادشای کەڵە کێوییەکان لەسەر بەردێك هەڵنیشت. باڵندەکە ئەوەندە جوان و ڕەنگاورەنگ بوو هەر دەتگوت لە بەهەشتێوە هاتووە. تاشباش نەیدەتوانی بۆ چرکەیەکیش چاو لەسەر ئەو باڵندەیە هەڵگرێ وا لە بەرامبەریدا نیشتبوو. لە دڵی خۆیدا بە ئاواتەوە بوو بچێ و بیگرێ و دەست بە سەر باڵ و پەڕە ڕەنگینەکانیدا بێنێ. لەو کاتەدا بیر لەوە دەکاتەوە، باڵندەکە ڕاست دێ و لەبەردەمی هەڵدەنیشێ. تاشباش دەست دەبا و دەیگرێ و دەست بەسەر باڵ و پەڕە جوانەکانیدا دێنێ. لەو دەستپێداهێنانەدا، لە ناکاو سندووقە زێڕێکی بچووك بە بن باڵی باڵندەکەوە دەبینێ. کە سندووقەکە دەکاتەوە، گلۆڵە لۆکەیەکی وەك بەفری سپیی تێدا دەبینێ. سەیرێکی لۆکەکە دەکا و لەوێدا تاقە تاڵە موویەکی زەرد دەبینێ. تاشباشی مەزن تێدەگا ئەو مەلە لە کوێوە و بۆچی نێردراوە. تاڵە مووە زێڕینەکە هەڵدەگرێ. تاڵە موویەکی زۆر درێژ بووە. لە گەڵا زیتوونێکییەوە دەپێچێ و بە ملی خۆیدا دەکا و دوایی دەست دەبا و لە ئاگردانەکەی "چل سوارەی غەیبی" کە هەتا ڕۆژەکەی قیامەتێ هەر داییسێ، پشکۆیەك هەڵدەگرێ و دەیخاتە نێو سندووقە زێڕینەکە و سندووقەکە دەخاتەوە بن باڵی مەلەکە و بەرەڵلای دەکا. پشکۆی ئاگرەکەی چل سوارەی غەیبی، لۆکەکەی کچی زەرد ئاسووتێنێ. تاشباش پادشای کەڵەکێوییەکان بەو جۆرە دەیەوێ بڵێ:"تۆ بە منت گوت وەك لۆکە نەرمی. ئەمنیش دەمەوێ بڵێم وەك ئاگرەکەی ئاگردانی چل سوارەی غەیبی داییسێم، بەلآم ئاگرە بەتینەکەم، لۆکەکەی تۆ ئاسووتێنێ."

مەلەکە دەڕوا و سندووقەکە دەباتەوە بۆ "کچی زەرد". کچی زەرد، کە سندووقەکە دەکاتەوە، زمانی لە گۆ دەچێ و دەڵێ:"ئەو، هەم لە من ئاشقترە و هەمیش لە من پتر لەخوای نزیکە. ئەمن دەبێ بچمە هەنتەشی و کڕنۆشی بەرم."

هەر لەو ساتەدا پادشای کەڵەکێوییەکان بە چاوی دڵ سەیری دەکا و دەبینێ کچی زەرد بەڕێوەیە. هەموو باڵندەکان لە دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە و زەوی و ئاسمان لە باڵندان جمەی دێ و هەورێکی سپییش بەشوێنیدا دەڕوا. بەخۆی دەڵێ:"ئەوە لە من ناوەشێتەوە، دەبێ پەلەی بکەم، بەر لەوەی لای کچی زەرد و هەموو مەخلووقاتی دنیایە حەیام بچێ..." خۆی دەخاتە سەر کەڵە کێوییەکەی. کەڵە کێوییەکە وەك برووسکە لە چایەکەوە باز دەداتە سەر چیایەکی دیکە و دەڕوا. لەو جەنگەیەدا تاشباشی پادشا، ئاوڕێك دەداتەوە و چ ببینێ، بە هەزاران ڕەوە کەڵەکێوی و بە هەزاران ئەستێرەی بە شوێنەوەن. کەڵەکێو و ئەستێرە و ئەستێرە و کەڵەکێوی تێکەڵ بوون. کە ئاوڕێکی دیکە دەداتەوە، دەبینێ ئەوا چیا مەزنەکەی تۆرووس بە دار و بەرد

و ڕەوەز و کانیا و جۆگە و جۆبار و مار و مێرووییەوە کەوتووەتە شوێنی و بەدوویدا دەخشێ. تاشباشی گەورە لە ناکاو دەبینێ دنیایەکی وەشوێن خۆی داوە و بە پێشوازی کچی زەردەوە دەچێ. بەخۆی دەڵێ:"ئەوە دروست نییە. لەوانەیە کچی زەرد بەخۆیدا بشکێتەوە و بڵێ سەیری ئەو پیاوە بکە دەیەوێ لەبەر چاوی من خۆی وەك پادشای ئەولیا بنوێنێ، هەر بۆیەشە کێو و دەشتی وەشوێن خۆی داوە و دێ." تاشباش بەو فکرەوە دەگەڕێتەوە و بە تۆرووس دەڵێ: "ئەی چیا پیرۆزەکە، ئەتۆ لێرە ڕاوەستە. ئیزن نادەم لەگەڵما بێی." و تۆرووس لەوێ دەچەقێ. هەر بۆیەشە سەرێکی تۆرووس گەیوەتەوە ئەزمیر. دواییش ڕوو دەکاتە ئەستێرەکان و دەڵێ:"ئەی ئەستێرە جوانەکان، ئێوەش لە ئاسمانەکەی خۆتانا بمێننەوە." ئەستێرەکانیش بە ئاسمانەوە ڕادەوەستن. هەر بۆیەشە ئاسمانەکەی چوکووراوا پڕە لە ئەستێرە و ئەستێرەکانی چڕ و زۆرن و شەپۆل دەدەن.

لە یەك ساتدا، دوو ئەولیای ئاشق لە ئانتالیا و لە تەنیشت بورکانەکەی "یانار تاش" دەگەنە یەکتری. ئەو یانارتاشەی ڕۆژ و شەو بڵێسە دەدا، ئاگری ئەو پێکگەیشتنەیە کە تا ڕۆژەکەی قیامەتێ هەر دایسێ. ئەو دوو ئاشقە کەلە تەنیشت ئاگرەکەی یانار تاش پێك گەیشتوون، دەچنە غاز داغی. لەوێشەوە دەێنە تۆرووس. هەر دەگەنە ئەوێ، پۆل پۆل باڵندە و ڕەوە ڕەوە کەڵەکێوی و مامز لە ئەشکەوتی داغی و دوایی لە تۆرووس دەگەنە یەکتری و هەموو وڵات پڕ دەکەنەوە.

تاشباش پادشای کەڵە کێوییەکان بە کچی زەرد دەڵێ:"ئەگەر تۆ بمری، لە داوێنی غاز داغی و ئەگەر منیش مردن ئەوا لە بناری تۆرووسێ دەمنێژن. گۆڕی تۆ لە نێو باڵندەکانتدا و ئی منیش لە نێو کەڵەکێوییەکانما دەبێ." و بەو جۆرە ئاد و بەڵێن پێك دەدەن.

کچی زەرد دەڵێ:

ـ ئەگەر پێت ناخۆش نەبێ، دەمەوێ بڵێم چونکە منداڵەکانی ئێمە لە تۆرووسدا دەژیێن، ئەمن دەبێ دیارییەك بدەمە تۆرووس.

تاشباشی مەزن دەڵێ:

ـ حەقی خۆتە. وا بکە. بۆ ئەو خاکەی نەوە و تۆرەمەی تۆ پەروەردە دەکا، هەرچی بیکەی جێی خۆیەتی.

کچی زەرد مستەخۆڵێك لە خۆڵەکەی قازداغی هەڵدەگرێ و لە داوێنی تۆرووسدا و لەسەر ڕێی چوکووراوا دەیچێنێ و دەڵێ:

ـ ئەو دارە یارمەتیدەر و دەستگری لێقەوماوان دەبێ و ڕووناکایی شەوە تاریکەکانیان و لە هەر شوێنێ خدری زیندوو بە هانای لێقەوماوانە نەهات با ئەو دارە بێ.

ئەمامی گوێزەکە گەورە دەبێ و شەوێك لە شەوەکان دەبێتە یەکپارچە نوور و بەرە و ئاسمان هەڵدەچێ. هەر کاتێکیش مرۆڤەکان دەکەونە تەنگانەوە، داوای یارمەتی لەو دارە دەکەن و دارەکەش بە هانایانەوە دەچێ و ئەوەش هەتا ڕۆژەکەی قیامەتێ هەر هەیە.

ئەو پادشای کەڵەکێوییانە، تاشباشە گەورەکەی ئێمە و هاوسەرەکەی کچی زەرد، باپیرەی ئەو تاشباشەی خۆمانە.

هەر بۆیەشە ئەو گوندییانە تۆرووس ڕاوی کەڵەکێو و مامزیان پێ گوناحە. دەزانی بۆ؟ لەسەر ئەوەی پادشای کەڵە کێوییەکانی خۆمانە.

سەفەر پرسی:

ـ گوندییەکان بڕوایان بەو چیرۆکە هێناوە؟....

موسا گوتی:

ـ نەخێر هیچ کەس بڕوای نەکرد. گوتیان ئەو پیاوچاکە، نە باپیرەی تاشباشە و نە هیچی دیکەش. دیارە لە ڕابردووشدا وەها پیاوچاکێك بووە، بەڵام ئەو ئی زۆر زۆر کۆنە. جگە لەوەش لەگەڵ کچی زەرد زەماوەندی نەکردووە. درۆیەکەی ئەو مەسەلەیە لەوەی دایە کە کچی زەرد هەر شووی نەکردووە و هەر بە کچی، کەوتووەتە گەڵ چل سوارەی غەیبی.

سەفەر گوتی:

ـ کارمان تەواوە. حوکمی سێدارەمانیان بە ملماندا کردووە. بێت و بڕوایان بەو مەسەلەیە کردبایە دیاردەبوو کە شتەکە زۆر قووڵ نەبووەتەوە، بەڵام ئێستا دیارە شتەکە قووڵ بۆوە. جا وەرە و بتوانە پێشی تاشباش بگرە. بەخوای لافاوێك بەرێوەیە هەموومان ڕادەماڵێ.

سەفەر بە ئاماژەیەك ئەوانەی تێگەیاند کە لە ژووری بوون، بڕۆنە دەرێ. هەمووان نێوچاوانیان گرژ بوو. بە ناقایلی چوونە دەرەوە. هەر دەتگوت لە کۆڕی پرسەی دەچنە دەرەوە.

سەفەر گوتی:

ـ کوڕم، عەلی عومەر، تۆ ڕاوەستە. دوو قسەم پێتە.

عومەر گەڕایەوە و لە تەنیشت ئاگردانەکە دانیشت. چاوی لە بەرپێی بڕیبوو.

سەفەر هێشتاش چاوەڕێ بوو لە ئاواییەوە هەواڵێکی بۆ بێ. دیارە هیوای بە عادیل نەمابوو، بەڵام دیسانیش هەر چاوەڕوانی بوو. بەخۆی دەگوت:" بێ و نەبێ شتێك هەیە بۆیە

هێندەیان پێ چووە. لەوانەیە عادیل پێی گوتبێن جارێ یەك دوو ڕۆژان بێننەوە پێکەوە دەڕۆین. لەوانەیە ئەندامەکانی ئەنجوومەن مزگێنییەکی خۆشیان بۆ هێنابێم، بەڵام کەی؟ ئەگەر ئەمڕۆ بێنەوە باشە، بەڵام بگاتە سبەری، ئیتر پێم وا نییە بەکارم بێ. تازە کار لە کارێ ترازاوە.

هەتا ئێوارێ، بە بێهیواییەوە چاوەڕوان بوو، بەڵام کەس دیار نەبوو. نە کەس هات و نەکەسیش چوو...

گوتبووی:"دیسان هەمان تاس و حەمام". گوتبووی "ڕۆژێ نوێ هەواڵی نوێی پێیە."

بەڵام هیچ هەواڵێکی نوێ نەبوو. ڕۆژ بە ڕۆژ و سەعات بە سەعات کارەکە خراپتر دەبوو... تاشباش سات بە سات لەو ململانێ گەورەیەدا براوەتر دەبوو.

خۆر ئاوا بوو. کە شەو بەسەردا هات، ترسێکی گەورە، ترسی مردن، ناخی پڕ کرد. تاشباش دوای ڕووداوەکانی دوێ شەو، ئیتر لێی خۆش نەدەبوو و بە دڵنیاییەوە ئامادە بوو ڕۆحی بکێشێ. چما گوندییەکانی چوکووراوا، بە تایبەتی ژنەکانیان، کۆ نەدەبوونەوە و ئەو ئاغایانەی وا زوڵمیان لێ دەکردن، لەتوپەت نەدەکرد؟ تەنانەت دڵۆپەخوێنێکیش چییە وەك ئاسەوار لەو ئاغا لەتوپەتکراوانە، لە سەر زەوی نەدەمایەوە. ورد و پردیان دەکرن. ئاخۆ تاشباش ئەوەی نەدەزانی؟ چما نەیبیستبوو؟ چما حەزی لێ نەبوو ئەو بەڵایە بەسەر منیش بێنن؟ ئەگەر حەزی لێ نەبوو بۆچی هەوڵی دەدا خۆی لەو خەڵکە بکاتە ئەولیا؟

دوای ئەوەی خەڵکەکە ڕۆیشتن، بێدەنگییەك باڵی بەسەردا کێشا. عومەر هەر خۆی کەمدوو بوو و نقەی نەدەهات. سەفەریش هیچی نەگوت. کچەکەی قیرسمایل سفرەی نانی هێنا و ڕایخست بەبێ ئەوەی قسەیەکیش پێکەوە بکەن، نانەکەیان خوارد و کشانەوە.

دوای خواردنێ، سەفەر گوتی:

ـ عومەر گیان، ئیتر کار لە کار ترازا. تازە وەجاغەکەی کوێخا خدر، دوای ئەو هەمووە ساڵە کوێر دەبێتەوە. وەجاغی ئەو بنەماڵە ڕەسەنەی کە پەناگە و داڵدەی هەموو هەژار و لێقەوماوێك بوو، ئەو وەجاغە شەریفە و ئەو بنەماڵە گەورەیە کە خانەخوێ و میوانداری سوڵتانی عوسمانی بوو، دەبێتە تۆزی بانان. هەمووان بۆ کوێرکردنەوەی ئەو وەجاغە، کلکیان لە کلکی یەك ئاڵاندووە. چ لەو گوندەوە چ لە دێهاتەکانی دیکەوە، زۆر کەس بۆ کاولکردن و کوێرکردنەوەی ئەو بنەماڵەیە شاڵاویان هێناوە. تا ئێستا لە خوای بەزیاد بێ و دوای ئەوەش بە یارمەتیی خەڵکێکی جوامێر و ئازای وەك تۆ، پێشمان گرتوون، بەڵام ئەو تاشباش ئۆغڵوە،

بۆخۆت دەزانی ئەوە حەوت ساڵی ڕەبەقە تێی هەڵکێلاوین. ئەو بنەماڵەی تاشباشە، هەر لە ئەوەڵەوە دوژمنایەتییان لەگەڵ ئێمە هەبوو. حەو ساڵی ڕەبەقە، بە تاقی تەنێ، لە بەرانبەر پەلامارەکانی تاشباشدا ڕاوەستاوم. هیچ داوای یارمەتییەکیشم لە ئێوە نەکردووە. سوپاس بۆ خودا کەسی هیچ و پووچ لە بنەماڵەکەی کوێخا خدر هەڵنەکەوتووە و هەمووان وەك قەڵایەکی پتەو، لە دەوری ئەو بنەماڵەیە کۆ بوونەتەوە و پاراستوویانە.

"جا، بەڵام، دوژمنەکەی ئێمە، پەنای بۆ هەر فێڵ و تەڵەکەیەك بردبێ، ئێستا، فێڵێکی گەورەتری لەبن سەری دایە کە جنۆکەش ئەقڵی پێی ناشکێ. ئەو فێڵەی ئەمجارەیان لە هەر هەمووان مەترسیدار ترە. تاشباش کە بەتاقی تەنێ، باشاری منی نەکردووە، ئێستا هەر دەرفەت بێنێ، خۆی وەك ئەولیا دەناسێنێ. زۆر لە مێژە چاوەکانی من، وەك چاوی هەڵۆ، بەسەرییەوەن. ئەو وەها بەرنامەیەکی بۆ ئەو بانگەشەیەی خۆی دارشتووە پێت سەیر دەبێ.

عومەر گیان، ئەتۆش کابرایەکی ژیری. وەك هەموو ئەندامەکانی بنەماڵەکەی کوێخا خدر. ئەتۆش لەو شتانە ئاگاداری. ئەگەر هات و خۆی وەك ئەولیا ناساند و خەڵکی ئاواییش، ملکەچی بوون، دەی پێم بڵێ چیمان بەسەر دێنێ؟ ئاخۆ تۆزێکی بەزەیی پێماندا دێتەوە؟ دەی بڵێ بزانم، جووقەوار لە بنەماڵەی کوێخا خدر نابڕێ؟ بڵێ دەی."

عومەر بە تووڕەییەوە گوتی:

- دەیبڕێ.

- کەوابوو، بەر لەوەی ئەو ئێمە لەناو بەرێ...

عومەر گوتی:

- ئێمە ئەو...

- باشت زانی... ئای بارەقەڵڵا...، بەڵام چۆن؟

عومەر گوتی:

- بۆخۆم دەچم دەیکوژم... هەر ئەوەندەم بەسەر ئەتۆ وەك ئەندامێکی بنەماڵەی کوێخا خدرم دابنێی.

- ئەوە وام دانای. هەروەها، ئەتۆ گەورە و سەروەری بنەماڵەی کوێخا خدری. و گوتیشی:

- نا عومەر، نا، ئەتۆ دەبێ ئاگری بن کا بی. وا بجوولێیتەوە کەس ڕۆحیشی ئاگادار نەبێ... تاشباش وا لەناو بەری، کەس شك نەکا.

عومەر گوتی:

- کوڕە ئەو شتانە باش دەزانم. هەرچی تۆ بفەرمووی دەیکەم.

- گویٚ بدەیە ڕۆڵە، عومەر، ئەمن هیچ کەیفم بە پیاوکوشتنیٚ نایە، مرۆڤ مەخلوقی هەڵبژێراوی خودایە. ئەمن نامەویٚ ئەو گیانەی خودا پێی داوە لێی بستێنم، بەڵام چ بکەم چارم ناچارە. خۆ ئەگەر هەر خۆم لە مەترسی دا بوایەم، دیسانیش قەیدی نەدەکرد، بەڵام چ بکەم ئەو کابرایە، هەموو بنەماڵە و بنەوبنەچەکمی خستووەتە مەترسییەوە و دەمن ناتوانم لێی گەڕێم بژییٚ. لە بیرتە ئەحە شێتۆکە چیی گوت؟ هەر ئەو ڕۆژەی تۆ خۆت لێرە بووی؟ خۆت گەورەترین شایەتی ئەو قسەیەی. پێمی گوت:" ئەتۆ بەهیچ نامری بە دەستی تاشباش نەبیٚ." ئەتۆ بەو گوێیانەی خۆت گوێت لیٚ بوو. ئەمنیش گوێم لیٚ بوو. هەموو دنیا گوێی لیٚ بوو. وابوو ئەمڕۆ بڕیارم دا بەدەستی تاشباش نەچم.

هەڵچوو و تووڕە بوو و دەمارەکانی لاملی هەستان:

- هەروەها، ئەو بە دەستی من تێدا دەچیٚ. ئەمشەو بەر لەوەی ئەو تاجی ئەولیایی لەسەر بنیٚ، گیانە شیرینەکەی دەنێرینە جەحەندەمیٚ.

هەستا و ڕووی لە عومەر کرد و گوتی:

- وەرە ئێرە.

چووە ژوورەکەی پشتەوە. عومەریش بە دوایدا چوو.

- جا ئێستا، کوڕم، ئەو مەسەلەیەم باش لێك دایەوە. هەتا تۆم هەیە کارەکە زۆر ئاسانە. ئەوەی کە تاشباش خۆی بە ئەولیا دەزانیٚ، بەکارمان دیٚ. ئەتۆ دەتوانی لاسایی دەنگی عەلی"یە درێژ بکەیتەوە؟

عومەر هونەرێکی سەیری هەبوو. دەنگی خۆی دەگۆڕی و کێی پیٚ خۆش بوایە دەنگی وەکی هی ئەو لیٚ دەکرد. دەنگی عەلی"یە دریٚ و گۆملیکسیز و تاشباش... و تەنانەت حەزی لیٚ بوایە ڕێك وەك مریشۆك قسەی دەکرد. ئەگەر یەکێك گوێی لیٚ بوایە، نەیدەزانی ئاخۆ ئەوە مریشۆك خۆیەتی قسان دەکا یان عومەرە لاسایی دەکاتەوە.

- ڕێك وەك خۆی قسان دەکەم.

- زۆر باشە، جا ئێستا خۆمان ڕووت دەکەینەوە. تەنیا جلەکانی بنەوەمان دێڵینەوە. مەترسە. هەرچی هەمانە لە بن ژێرکراسەکەوە لەبەرمانی دەکەین. مەترسە سەرمامان نابیٚ.

- ئەمن گوێم بە سەرمایە نابزویٚ.

کوڕە هەر ڕووت دەبینەوە. چارشێوێکی سپی وەك کفن لە خۆمانەوە دەپێچین، بەڵام چارشێو، لە لاق و لەتەرمان دەئاڵێ. دەموچاومان بە قورم ڕەش دەکەین و جامانەیەکی سپی لەسەر دەنێین. نیوەشەوێ دەڕۆینە بەر دەرگای تاشباش، ئەتۆ لە دەرگا دەدەی و دەنگی عەلی دەردێنی. هەر تاشباش دەرگاکەی کردەوە، ئەو گۆنییەی بەسەریدا دەکەین و هەڵی دەگرین و دەیبەینە دەرەوەی ئاوەدانی. لەوێ دەیخنکێنین و دەیخەینە نێو "بیرە وشکەکەوە". دوایش دێینەوە و بە گوندی وەردەکەین کە "چل سوارەکەی غەیبی" تاشباشیان بردووە. باشە؟...

عومەر گوتی:

- زۆر باشە، بەڵام ئەی چ لە ژنەکەی بکەین؟ دەبێ هەتا ئێمە تاشباش دەبەینە بیرە وشکە، یەکێك نەهێڵێ ژنەکەی بێتە دەرێ و پەڕۆیەك یان هێندێ گیای لە زاری بئاخنێ...

سەفەر گوتی:

- ئەك مامە بەقوربانی ئەو مشوورەت بێ... حەقتە. ئەو کاتەی ئێمە تاشباش دەبەین... دەبێ یەکێکیش هەبێ زاری ژنەکەی بگرێ نەیکاتە قیامەت و گوندیان وەسەر نەگێڕێ. نابێ ئەو جۆرە کارانە بە بێگانە بسپێرین.

دەبێ یەکێکی وەك خۆت بێ. لە ڕەچەڵەکی خدر کێ هەیە ئەو کارەی لە دەست بێ؟

عومەر لووتبەرزانە گوتی:

- کەس.

سەفەر:

- بە ڕاستی بنەماڵەیەکی دەستەوستانمان هەیە کە یەکێکی تێدا دەست ناکەوێ دەرەقەتی ژنێك بێ.

عومەر هەر بەو لەبزەوە گوتی:

- نییە ئیدی... ئەگەر ئەمنیش نەبوایەم...

- ڕاستە کوڕم، ئەگەر تۆش نەبای، خۆ ئەمن تێدا چووبووم. ئەگەر تۆ نەبای، ئەمن بە تەنێ بەو کارەی نەدەوەستام. ئیتر تاشباشیش ئێمەی لە بنە دێنا.

عومەر گوتی:

- دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم. و بڕێك ڕاوەستا.

سەفەر گوتی:

- بڵێ، بڵێ، ئەتۆ دەریای ئەقڵی...

عومەر:

- وا باشترە کەسێکی دیکە، ئەگەر برای خۆشمان بێ، نەهێنینە نێو ئەو مەسەلەیەوە.

سەفەر:

- ڕاستە. مەسەلەی مەرگ و ژیانە.

عومەر:

- ژنەکەشی هەڵدەگرین و دەیبەین و دەیخەینە نێو بیرە وشەکەکەوە.

سەفەر:

- ژنی داماو، ئاخر ئەو چیی کردووە؟

- دەی با ژنی نەبایە. ئەوە بوو بە ژنی ئیدی، بەڵام ئەو دەمەی ئەو دەیویست خۆی بکاتە پیاوچاك، نەدەبوو بیڵێ. ئەوە دامانننا بوو بە پیاوچاك. نەدەبوو چاو ببڕێتە بنەماڵەی کوێخا خدرەوە.

سەفەر لە مشتومڕ و دڵەڕاوکێیەکەی ماندوو ببوو:

- ئەو چەکانە باش تاقی بکەوە. سەیر بکە هیچ ڕاوەستان و گیریان نەبێ. ئەوجار بڕۆ سەیر بکە بزانە هەوا چۆنە. بۆ ئەو جۆرە کارانە، هەوا زۆر گرنگە. یاڵڵا دەی بچۆ سەرێکی دەرێ بدە.

عومەر چوو و گەڕایەوە:

- بۆران لە دەشتەکەدا قیامەتێکی نابۆوە. هیچ گیانلەبەرێك نەیدەتوانی لە دەرەوێ خۆی ڕاگرێ. هەرچی دەعبایە لە گورگ و ورچەوە بگرە تا دەگاتە باڵندە و جروجانەوەرە، خزیونەتە لانی خۆیانەوە.

- عومەر!

- فەرموو گەورەم.

- ئەو پیاو کوشتنە کارێکی خراپە، وە نییە؟

- نا ا ا ا !

- ئەتۆ تا ئێستا پیاوت کوشتووە، عومەر؟

- نەمکوشتووە، بەڵام ئەوەندەم حەز لێیە ئەو تاشباشە بکوژم هەر مەپرسە... پێنج شەش ساڵی دیکەش دەتوانم بە هەمووان بڵێم. دەتوانم یان نا؟

سەفەر گوڕاندی:

- هەتیو ئەوە شێت بووی؟ ئەو قسانە بۆوەی نابن بە هیچ کەسیان بڵێی. ئەتۆ پێت وایە بنەماڵەکەی تاشباش تۆڵەی تاستێننەوە؟... حوکمەت بەرۆکمان ناگرێ... بێت و قسەت تێدا ڕانەوەستێ پاشگەز دەبمەوە ها.

عومەر:

- کوڕە گاڵتەم کرد... گاڵتەم کرد. چما ئەو کارانەی بۆوەی دەبن بە کەسیان بڵێی؟...

سەفەر پشوویەکی هاتەوە بەر و گوتی:

- دیارە نابن کوڕم. یاڵڵا دەی، جا هەستە بچۆ خەریکی چەکەکان بە. ئەمنیش لێرە تاوێک پاڵ دەکەوم. کە کەڵەبابی بەیانی خوێندی، وەرە بەخەبەرم بێنە.

لەسەر قەرەوێڵە چێوینەکە لێی ڕاکشا و چاوەکانی لێك نان. ئارا و قارای نەبوو. بۆ ساتێك هەموو گیانی کەوتە لەرزین. "ئەو پیاوکوشتنە چۆنە؟ قوڕگی دەگوشیت و چاوەکانی لە ژێلڵا دێن و پەلەقاژەیەك دەکا و لینگی ڕەق دەبن. دوایی لینگەفرتێیەك دەکا، وەك شێتان لینگەفرتێ دەکا. دوایی دیسان گیانی ڕەق دەبێتەوە و خۆی لەبەر یەك دەکێشێتەوە و ئیتر شل دەبێتەوە. شل دەبێتەوە و وردە وردەش سارد دەبێتەوە. دوایی هەڵیدەگری و دەیخەیە نێو بیرە وشکەکەوە. دەی باشە، جا ئەوە چییە. عومەر گەنجێکی بەغیرەتە. دەشزانێ چی دەکا. عومەر ئەوەی لە دەست دێ. کەس وەك ئەوی پێ ناکرێ... لەو دنیایەدا ئەوە بە کەسی دی ناکرێ... هەر بە عومەر دەکرێ.

"چۆنە وازی لێ بێنم. با بچم و لەبەر تاشباش بپاڕێمەوە و بڵێم وەرە دەست ماڵ و نامووس و کوێخایەتییەکەی من هەڵگرە. ئەمنیش بۆ ئەولیابوونەکەت یارمەتیت دەدەم و دەتکەمە پیاوچاکی ئەو ناوچەیە، بەڵام ئەو کابرایەکی لاسارە و سەیرە. قەبووڵی ناکا. وەك جاری پێشوو پیاو لە ماڵەکەی دەکاتە دەرێ و حەیاشی دەبا.

"سەری مەڕ و بەرخ و مانگا و گامێش و مریشك و کەڵەشێر و هەموو ئاژەڵێك وەك ئاوخواردنەوە دەبڕن و مێشێکیشیان لێ میوان نییە، بەڵام کە دەیانەوێ پیاوێك بکوژن..."

دیسان دەست و پێی کەوتنەوە لەرزین و شەکەتی و داهێزراوی هەموو گیانی تەنییەوە:"هەر بە ڕاستی ئەگەر تەرمەکەی لە بیرەکە دەربێننەوە چی؟ ... یان ئەو کاتەی دەیبەین یەکێك بمانبینێ، چی؟... دوایی زیندان... و دواییش سێدارە..."

"ئەی ئەگەر پاشگەز ببمەوە چ دەبێ؟... و ئەگەر لێی گەڕێم تاشباش بژیێ، چ زیانێکی بۆ من دەبێ؟... هەر ڕۆژی یەکەمی کە بوو بە ئەولیا بە خەڵکەکەی دەڵێ:"بچن ئەو کوێخا بێ

دین و ئیمانە ونجڕ ونجڕ بکەن." جا گوندییش دێن و لە ماڵێ دەمکێشنە دەرەوە و دەمبەن و لە گۆڕەپانەکەی ئاوەدانی، دەمهاڕن."

"چەند ساڵ لەمەوبەر بوو؟..." سەفەر هەوڵی دا بیهێنێتەوە بەرچاوی خۆی:

وەرزی لۆکە ڕنینەوە بوو. لەوانەیە پازدە ساڵ پێش. ئەوان خەریک بوون لە یەکێك لە گوندەکانی چوکووراوا لۆکەی یەکێك لە ئاغاکانیان دەڕنییەوە. مەزرای لۆکە، بە بەر ئاواییەوە بوو. لە تەنیشت دیواری یەکێك لە ئاخرین ماڵەکانەوە دەستی پێ دەکرد. هەموو ماڵەکانی ئاوایی، زەوی و زار و کێڵگە و هەرچی لە گوندەکە هەبوو، ئی ئاغا بوو. ئاغا دەیویست گوندییەکان لە دێیەکە دەر بکا، بەڵام ئەوان نەیاندەویست بڕۆن. دوو ساڵ بوو قڕە و کێشەی نێوان ئاغا و گوندییەکان بەردەوام بوو.

دوا نیوەڕۆی یەکێك لە ڕۆژەکان، هەمووان سەرقاڵی لۆکە ڕنینەوە بوون. چەند ساتێك بوو ئاغا هاتبوو ماندوونەبوونیی لێ کردبوون و ڕۆیبوو. ئاغا تەنانەت لە گۆڕەپانی ئاوایی و لە حەوشە و نێوان ماڵەکانیشاندا هەر لۆکەی چاندبوو. خەریکی ڕنینەوەی لۆکەی حەوشەکانیان بوون. لە ناکاو دەنگەدەنگێك لە ئاواییەوە بەرز بۆوە. دەنگەدەنگ نەبوو. هاوار و هەڵڵای بنیادەم بوو. دەستیان لە کار هەڵگرت و ڕابوون. دە هەنگاو لە پێشیانەوە ئاغاکە خەریك بوو ڕایدەکرد. بە دوایدا لەوانەیە بڵێم سێسەت و لەوانەشە پێنسەت ژن دابوویانە بەر بەردان و هەوڵیان دەدا بیگەنێ. ئاخرییەکەشی گەیشتنێ. حەشیمەتی ژنەکان دەمودەست وەك هەڵۆ دایهاتنێ. ماوەیەك هەر وا مانەوە، دوایی بە زیقە زیق و زریکاندنێ، هەر وا کە خۆیان بەسەر ئاغاکەدا دابوو، لێك جوێ بوونەوە. هەر کەسە و بەرەو لایەك ڕایدەکرد. و دوایی دەسبەجێ بێدەنگییەك زاڵ بوو گوێت لە دەنگی باڵی مێش دەبوو. پیاوەکان چوونە پێشێ، چ ببینن؟ دەبینن ئەوە تەنیا لاقێکی لە خوێن شەلاڵی ئاغا و دەستێکی خوێناو و نیوە جەستەیەکی خۆلاویی لەخوێن گەوزیوی لێ ماوەتەوە. ئەدی لەتوکوتەکەی دیکەی چیی لێ هاتبوو؟ هەموو جێیەکیان بۆ دۆزینەوەی لەتوکوتەکانی دیکەی سەنگ و سووڕن دا و چییان نەدییەوە.

ئەو ڕووداوە لە گوندێکی چوکووراوا، لە بەر چاوی هەموو خەڵکەکەی یالاك ڕووی دا. دواتر هەواڵ هات، کە سێ مانگ زیندانییان بڕیوەتەوە بۆ هەر ژنێکی کە ئاغای کوشتووە.

ئیتر دوای ئەو ڕووداوە، عادیل نەدەچووە گوندان. سەفەر خەریك بوو تێدەگەیشت:"عادیل، عادیل، براکەم..."

"نەكا دیسان لەوەها شتێك تۆقیبێ و نەهاتبێ؟ لەوانەشە... ڕاستە ماوەیەكی زۆر بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕیوە، بەڵام بنیادەم كوا ڕووداوی ئاوا گرنگی لەبیر دەچێتەوە؟ قەت لەبیری ناكا..."

دوو مانگی ڕەبەق لە چوكووراوا لۆكەیان ڕنییەوە و دوو مانگ لەسەر یەك، نیوەجەستە لە خوێن شەڵاڵەكەی ئاغایان لە پێش چاوی بوو. بۆ چەند ساڵان ئەو لەتوكوتبوونەی ئاغایان لەبەرچاویان، هەر لەبیر نەكرد.

ئەحە شێتۆكە چیی گوت؟ گوتی:"هاوڕێ، ئەتۆ بەدەستی تاشباش تێدا دەچی." دەڵێن شێتەكان جاری وایە وەك پێغەمبەرەكان و ئەولیاكان قسە دەكەن. هەر بۆیەشە دەبێ پێشی ئەو كارە بگرین. نابێ بێڵی لەتوكوتت بكەن.

"ئەمشەو هەر شتێك دەبێ با ببێ. چار نییە. هیچ چار نییە. خۆشت فریو مەدە سەفەر، قایم بە. مەترسە سەفەر. یا تاشباش تۆ دەكوژێ، یان تۆ ئەو دەكوژی. تازە كار گەیشتووەتە ئێرە. هاوڕێ! ڕێگەی دیكەت نییە. هەرچی دەبێ چش. ئەمشەو تۆ پەلاماردەری. جا چونكە عادیل قەت ناتوانێ بێ، چاری دیكەت نییە... ئاخ، ئەو لەرزینە تووك لێكراوە چییە؟ ئەوە چ دڵەڕاوكێیەكە؟

كە چاوی بە نیوەجەستەی ئاغاكە كەوتبوو خوێنی لێ دەچۆڕایەوە، دڵی تێكەڵ هاتبوو. سەری لەگێژەوە هاتبوو. بەر چاوەكانی ڕەش ببوون و گوێیەكانی زرینگابوونەوە. ئێستاش خەریك بوو وای لێ دەهاتەوە. جگە لەوەش خەریك بوو بڕشێتەوە...

خۆی سەركۆنە دەكرد و دەیگوت:"هۆی سەفەر، ئای، چما تۆ دەبێ پیاو بكوژی؟... خۆ ئەتۆ هیچ ناكەی. عومەر دەیكوژێ، دەی باشە ئەی چیت دەوێ؟ ئای ئای، لەو ئازایەتی و غیرەتە؟ تۆخوا تۆش پیاوی؟... كوڕە خۆ وەك بینی ئاو دەلەرزێ.

"دەبێ واز لەو كارە بێنم. ڕاستە، بەڵام ئەی چ بە عومەر بڵێم؟... زۆر سادەیە. پێی دەڵێم كوڕە ئەولیا بۆوەی نابێ دەستی لێ هەڵێنیتەوە. هەرچی دەستی لێ هەڵێنێتەوە، دەستی ڕەق دەبێ. عومەریش بێت و ببیستێ دەست و لاقی وشك دەبن و ناتوانێ لە جێی خۆی بجووڵێ.

"هەر بەڕاست نەكا بە ڕاستی ئەو بنەماڵەیە پیاوچاك بن؟..."

بەخۆی پێكەنی:"ئەگەر ئەو پیاوچاك بوایە، تەنانەت تۆزێكیش چییە، دەسەڵاتی غەیبی هەبوایە، لەو حەوت ساڵەدا جا چیی نەدەكرد؟ تاشباش پیاوێكی بێ ویژدانە. سەیری فرمێسكی چاوی بنیادەم ناكا.

"ئەكا هەر لەم ڕۆژانەدا بەو پلەیە گەیبێ؟ نا، نا، مەحاڵە. ئەوە ئەولیابوونی لێ ناوەشێتەوە. نە نوێژێ دەکا و نە ڕۆژووی دەگرێ. کوا پیاو بە دانیشتن و دووعاو پاڕانەوەی وەك پیرەژنان دەبێتە پیاوچاك"...

"ئەو هەمووە خزم و کەسەی هەیە. ئاخۆ ئەوان ناکەونە پێ و شوێنی تەرمەکەی و بکوژەکەی؟"

ئاخ، خۆزگە ناچار نەبوایە هەر ئەمشەوە بیکوژێ. ئەگەر حەوتووەك، تەنیا حەوتووەکی دەرفەت هەبوایە، دەچووە شاخ و لەوێ چەللۆ یاغیی دەدۆزییەوە و خۆی بەسەر پێلاوانیدا دەکێشا و ناچاری دەکرد ئەو، ئەم کارەی بۆ بکا.

باشە ئەی یاغی بۆ چی دەبێ؟ هەر بۆ پیاوکوشتنێ.

لە ناکاو هەستی کرد ئیتر نە دڵی تێکەڵ دێ و نە سەری لە گێژەوە دێ:"جا بە ڕاستی هەر دەبێ بکوژرێ؟ ئەحە شێتۆکە چیی گوت؟ گوتی"یان ئەو، یان تۆ"

ئێستا کە هاتبۆوە سەر خۆی... دەرپەڕی و هاواری کرد:

ـ عومەر.

ـ فەرموو گەورەم.

ـ کەڵەبابەکان...

ـ چیی وای نەماوە بخوێنن.

ـ یاڵڵا با جل بگۆڕین.

خێرا جلوبەرگیان گۆڕی. چاکەت و پانتۆڵەکانیان لە بنەوە لەبەر کرد و شمەکەکانی بنەوەیان لەسەرەوە. قاپێك قورم و ڕەژوو، لە ئێوارەوە ئامادە کرابوو. دەست و دەموچاو و لامل و گوێچکەی خۆیانیان تەواو ڕەش کرد. کوێخا گوتی:

ـ هەر بۆ قایمکاری، وا باشترە هەر کامێکمان سەرچەفەیەکی سپیش لەگەڵ خۆمان بەرین. هەر کەس شتی کەفنپۆش ببینێ، پێی بە عەرزییەوە ڕەق دەبێ.

دەرێ ئەوەندە تاریك بوو، چاو چاوی نەدەدی. جگە لەو ئەنگوستەچاوە، بەفر و بۆرانیش قیامەتی نابۆوە. بەفر و بۆرانەکە چەند جارێك سەفەری بە عەرزی دادا و عومەر هەڵیستاندەوە.

دیسان سەفەر گیانی کەوتبۆوە لەرزین. دەشبوو بلەرزیبایە. ئەوە کارە گاڵتە نەبوو. دەچووە پیاوکوشتنێ. ئەویش بنیادەمێك کە تڕ و تایەفەی هەموو پیاوچاك بوون.

ـ لایتەکەت هێنا؟
ـ پێمە.
ـ خۆ فیشەکت لەبیر نەچووە؟
ـ سەت و پەنجا دانەم پێیە.
ـ ئەمنیش پێمە. لایتەکە هەر پێ مەکە. باشە هەر بەراست بەو تاریکییە ماڵەکەی دەدۆزیتەوە؟
ـ وەك ئاو خواردنەوە.
ـ عومەر...!
ـ فەرموو گەورەم...
ـ ئەگەر هات و ئێمە ئەومان پێ نەکوژرا و ئەو ئێمەی کوشت؟ و وەجاغی بنەماڵەیەکی گەورە کوێر بووەوە؟ ئەحە شێت چیی گوت؟
ـ گوتی دەتکوژێ.
سەفەر ئەژنۆی لەرزین. چیی نەمابوو بە عەرزا بکەوێ. هیچ حەزی لە پیاوکوشتنێ نەبوو، بەڵام تا لە ماڵەکەی تاشباش نزیکتر دەبوونەوە، قینەکەی ئەستوورتر دەبوو و خۆی تووڕەتر دەکرد.
رێك بە پێچەوانەی ئەوەی بیری لێ کردبۆوە، رووی دا. پێی وا بوو تا دەگەنە بەر دەرگاکەی تاشباش، لە ترسان ئەژنۆی دەشکێ، بەڵام وا نەبوو... بە پێچەوانەوە، هاتەوە و دڵەڕاوکێی نەما. ئێستا تەنانەت دەیتوانی بە دەستەکانی خۆی تاشباش بخنکێنێ و هیچ نارەحەتیش نەبێ.
بە بیستنی دەنگی "عەلی"یە درێ ڕاچڵەکی و توند چەکەکەی گرت، بەڵام کە دیتی عومەر وەپێش کەوتبوو و لە دەرگای دەدا، تێگەیشت. دەنگی ژنەکەی تاشباش هات:
ـ ئەتۆش کاکە عەلی؟ مەمەدت دەوێ؟ بەخوای لە ئێوارێوە چاوەڕێی ئەوم. هێشتا نەهاتۆتەوە ماڵێ، نەکا شتێکی بەسەر هاتبێ؟...
دەرگاکەی هەڵگرت. مەشخەڵێکی بە دەستەوە بوو. کە دوو پیاوی کفنپۆشی بینی، زیقاندی و دەرگاکەی لەسەر داخستن. عومەر شانی دایە بەر دەرگاکە و کردییەوە و بە سەفەری گوتی:
ـ مامە خەلیل. ئەتۆ ئاگات لە دەرگاکە بێ کەس نەچێتە دەرێ. و وەژوور کەوت. سەفەر هات و لە لاشیپانەی دەرگاکەدا ڕاوەستا و دەستەکانی بە چوارچێوەی دەرگاکەوە نا.
عومەر خەریك بوو لە نێو ماڵەوە دەیگوت:

ـ بلێ... دەی بلێ هەی ماکەر. ئەو مێردە سەیەت بۆ کوێ ڕای کردووە؟ لایتەکەی هەلکردبوو و لە عەمبار و ئاخوڕکاندا بە شوێنیدا دەگەڕا. ئاخرییەکەی بەسەر ئاگردانەکەدا نووشتایەوە و تیشکی لایتەکەی لە دووکەلکێشەکەی گرت و ورد سەیری کرد. کەسی تێدا نەبوو.

ـ تاشباش چووبووە کوێ؟

ژنەکەی وشك هەلاتبوو و زمانی شکابوو.

ـ بلێ بزانم چووەتە کوێ؟... کارمان پێیەتی. ئەگەر نەلێی دەتکوژین. بە قۆناغە تفەنگەکەی بە عەرزیدا دا. ژنەکە هەر تەنیا نووزەیەکی لێوە هات و بێدەنگ بوو.

عومەر ترسابوو. دەسبەجێ لە مالەکەی هاتە دەرێ و دەرگاکەی پێوەدا و گوتی:

ـ با ڕاکەین.

ئەو لە پێشەوە و سەفەر بە دوایدا هەتا مالەکەی سەفەر ڕایان کرد. هەر دووکیان وا دەلەرزین، کە بەبێ ئەوەی بەفرەکە لە خۆیان بتەکێنن، خۆیان گەیاندە بەردەم ئاگردانەکە.

ماوەیەکی پێ چوو جا وەخۆ هاتنەوە. بەلام ترسەکەی ناخی عومەر هەر دەهات و زیادی دەکرد.

ـ هەموو ولاتم سەنگ و سووژن دا... عەمبارەکە، سندووقخانەکە، ئاخوڕەکە، تەنانەت کەلێنی جەوال و تەلیسەکان و نێو دووکەلکێشەکەش... لە هیچ کوێ نەبوو. باشە بەو نیوەشەوە دەبێ چووبێتە کوێ؟

خەریك بوو پشووی لێ ببڕێ. ئیتر قسەی پێ نەکرا. چاوەکانی لە ترسان لە زێللا هاتبوون.

سەفەر ئیتر خۆی دابووە دەست قەزا و قەدەرەوە:

ـ هەر بە ڕاستی

بەو نیوەشەوە دەبێ چووبێتە کوێ؟...

## ٢٨

دویَ شەویَ کاتیَ کەڵەباب خوێندیان، بە دەنگی دەرگای وەخەبەر هاتم و دوایییش لە پشت دەرگاوە گوێم لە دەنگی کاکە عەلی بوو. گوتم با بزانم بەو نیوەشەوە چ کارێکی پێمانە؟ و دەرگاکەم لێی کردەوە. دوو چەکدارم دی وەك دێو و درنج، خۆیان لە پەڕۆی سپییەوە پێچابوو. دەموچاویشیان ڕەش کردبوو. یەکێکیان هەر لە کاکە عەلی‌یە درێژ دەچوو بەڵام سیَ هێندەی چی، پێنج هێندەی ئەو دەبوو. کابرایەکی چوارشانەی زل، قەڵافەتێکی دیکە هەر دەتگوت مام خەلیلە، بەڵام پێم وایە دە هێندەی ئەو دەبوو دەتگوت دارچنارێکی بەرزە. لە ترسان زمانم شکا. قەڵەمی دەست و پێیانم شکا. ئەوەی لە کاکە عەلی‌یە درێژ دەچوو، پرسی:"تاشباش لە کوێیە؟" ئەمنیش گوتم:"لە ژوورەوە نووستووە." وەژوور کەوت و تیشکی چراکەی لە قەرەوێڵەکە گرت. سەیرم کرد و دیتم مەمەد لەویَ نییە. کچیَ خۆ هەر چەند ساتێك پێشتر لەویَ بوو و گیانی وە گیانم دەکەوت و وەك منداڵێك نوستبوو. بەو کابرایەی لە دێو دەچوو گوتم: "هەر ئێستا لێرە بوو". گوتی:"نییە. ئەوەتا نییە. ڕای کردووە." گوتم:"جا دەبیَ بۆ کویَ هەڵاتبیَ، خۆ ئێمە لەبەر دەرگایە بووین و ماڵەکەش هەر ئەو دەرگایەی هەیە." کابراکە گوتی:"ئێستا مادام وایە دەبیَ جوان و زەریف ماڵەکە بگەڕێم." گوتم:"دەی بگەڕیَ." تفەنگێکی زلی بەشانەوە بوو. ئەو کابرایە ئەوەندە درێژ بوو و تفەنگەکەشی ئەوەندە گەورە بوو کە بۆوەی سەری وەمیچەکە نەکەویَ، خۆی نوشتاندبۆوە. هەموو ماڵەکەی سەنگ و سووژن دا. تەنانەت ئاخوڕ و کادێن و دووکەڵکێشی ئاگردانەکەش گەڕا. سەری بە کونە مشکەکانیش داکرد. زانیم بنیادەمێکی باش نییە و بێت و مەمەد بدۆزێتەوە دەیکوژیَ، بەڵام ئەگەر نەیدۆزێتەوە. مەمەد بۆ کویَ چووبوو کە ئەو نەیدەدیتەوە؟ ئەمن بۆخۆم سەرم سووڕ مابوو. کابراکە گوتی:"ئاخ، کوڕە خۆ بۆم نەدۆزرایەوە. خۆ دۆزیبامەوە، بەڕێی جەحەندەمم دەکرد." ئەمنیش پێیم گوت:"ئاخر برا گیان. ئەتۆ بەو ڕووە

ڕەشەتەوە، خۆت لێ کردووینە عەلی‌یە درێژ و هاتوویە ماڵمان. جنۆکەی؟ مرۆی؟ چیی؟ بڵێ...
خۆ ئەگەر عەلی‌یە درێژ بوایەی، مەحاڵ بوو بۆ کوشتنی برای گیانی گیانیی خۆت هاتبێی."
کابرا ددانی لێ دەچیڕەوە بردم، دەنگی ددانی هەر دەتگوت دەنگی هەورە تریشقەیە. زراوم چوو.
گوتی:"ئای، خۆزگە ئەو تاشباشەم ئەمشەو دەست بکەوتایە..." و ئیتر وەدەر کەوت. لە دەرەوە
با و بۆرانێك بوو دەتگوت قیامەتە. زەوی و ئاسمانی دەلەرزاندەوە. ئەوان بەرەو چیاکەی تەکەچ
وەڕێ کەوتن. ئەوەندە درێژ بوون لەو شەوە ئەنگوستەچاوەدا وەك شەوە دەبینران. کە لەچاوان
نەدیو بوون، گەڕامەوە ژوورێ. هەموو ماڵەکە گەڕام. مەمەد نەبوو. دەتگوت زەوی زاری
کردۆتەوە و هەڵیلوشیوە، یان میچی ماڵەکە قەڵشیوە و لەوێوە چووەتە ئاسمانێ. سەرتان
نەیەشێنم مەمەد ئاسەواری نەبوو. چوومە سەر جێوبانەکەم، بەڵام خەم لێ نەدەکەوت. بەرەبەری
بەیانی بوو لە دەرگا درا. نەمکردەوە. لە ترسانا نەمدەوێرا ببزووم. لەو کاتەدا گوێم لە دەنگی
مەمەد بوو. دوودڵ بووم.

نەکا ئەو جارەیان خۆیان کردبێتە مەمەد و گەڕابێتنەوە. لەو کاتەدا گوێم لە دەنگی
مەمەد بوو. پەیتاپەیتا لە دەرگای دەدا و بانگی دەکردم:"کچێ ئەوە مردووی؟ دەرگا
هەڵگرە."ئاخرییەکەی بەخۆمم گوت: چش، وەڵڵا دەیکەمەوە. چووم دەرگاکەم هەڵگرت. دیتم
مەمەدە. لەسەرمان هەڵدەلەرزی. ڕچیبوو. دەموچاو و شمەکەکانی نوقمی بەفر بوون. دەتگوت
پەیکەرەیەکی بەفرینەی دەسکردی منداڵۆچکانە. بە زەحمەت خۆی گەیاندە تەنیشت
ئاگردانەکە. هەموو شتێکم بۆ لە بنی کوولەکە دا. خەیاڵ هەڵیگرت. نە شتێکی پرسی و نە
هیچیشی گوت. هەستا و وەدەر کەوت. پرسیم بۆ کوێ:" مەمەد بۆ کوێ دەچی" گوتی:"زۆر
دوور نارۆم." ڕۆیشت، تاو هەڵاتبوو کە گەڕایەوە. دیسانیش بەفر دایپۆشیبوو کە گەڕایەوە.
هەڵدەلەرزی. ئێستا ئەوە لە ماڵێ دانیشتووە و چاوی بڕیوەتە ئاگردانەکە و جووڵەی نییە.
تەنانەت پاروو نانێکیشی نەخواردووە."

ژنەکە، ئەو ڕووداوەی لە پێشدا بۆ مرێمۆك و عەلی"یە درێژ و دواتر بۆ هەموو خەڵکی
ئاوەدانی گێڕایەوە. هەر دەتگوت ئەو بنیادەمانە خێو و جنۆکە بوون، بەڵام خێو و جنۆکە
تفەنگی بۆ پێیە؟.

ـ ئەوان لەوانەیە باوباپیرانی تاشباش بووبێتن کە هاتبوون یارمەتیی خەڵکە لێقەوماوەکەی
ئەو گوندە بدەن.

ـ ئەگەر وا بوایە، ئەی تاشباش بۆچی ڕای کرد:؟

ـ چما مرۆڤ هەیە ئەوەندە کەڵەگەت بێ؟ هەر جن و خێو دەکرێ ئەوەنـدە درێـژ بـن. دیـارە کاری خێرێیان بە دەستەوە بووە.

ـ ئەی ئەو تفەنگانەیان بۆ پێ بووە؟

ـ، بەڵام جن و خێو، بنیادەم بە تفەنگ ناکوژن. دەستی لێ دەوەشێنن.

ـ ئەی ئەگەر کاری خێرێیان بە دەستەوە بووە، تاشباش بۆچی ڕای کرد؟

ـ هەر بە ڕاستی، ئەوان چکارێکیان بەتاشباش بووە؟ دەیانەویست چیی پێ بڵێن؟..

ـ دەیانەویست پێی بڵێین: هاوڕێ، ئەو گوندییانە خەلکێکی هەژار و لێقەوماون. مێشیان لە دەمی خۆیان پێ دەرناکرێ. هەر دایاندەپەڵۆسن و ڕسق و ڕۆزییان لێ دەبڕن. ئەو گوندە بـە تـۆ دەسپێرین. بیپارێزە.

ـ دەی ئەگەر ایە، ئەی تفەنگیان بۆ پێ بووە؟

ـ لەوانەیە ئەوانە، یاغیە غەیبییەکان بن؟

ـ باشە ئادەمیزاد یاغییان هەیە، ئەدی بۆ خێو و جنۆکە نەیانبێ؟

ـ دیارە، بنیادەم ئەقڵی هەیە. جا بۆ نەیبێ؟...

ـ یانی ئەوان دێنە لای تاشباش و ناشزانن ئەو لە کوێیە؟

ـ باشە ئەگەر خێو و جنۆکە بوون، ئەدی تاشباش بۆ ڕای کرد؟

ـ، بەڵام چما ئادەمیزاد هەیە دە هێندەی عەلی"یە درێژ بێ و سەر و چاویشی ڕەش بێ؟

ـ ئادەمیزاد چۆن دەتوانێ ئەوەندە زل و زەبەلاح بێ و خۆشی بکاتە عەلی"یـە درێـژ و مـام خەلیل؟....

ـ هەمووان دەزانن مام خەلیل ڕای کردووە و ڕۆیشتووە و ئەو شەوەش عـەلی"یـە درێـژ لـە ماڵەکەی خۆی بووە.

ـ مەحاڵە. بێ و نەبێ خێو و جنۆکە بوونە...

ـ ئەگەر وایە ئەی تاشباش بۆچی ڕایکرد و لە نواڵە بەفراندا خۆی شاردەوە؟

ـ نەتانزانی. تاشباش ڕای نەکردبوو. هیچ دووریش نەڕۆیبوو. هەر لە ماڵەکەی خـۆی وەدەر کەوتبوو، بەڵام چاوی ئەوان نەیدیبوو.

ـ ڕاستە. دواییش لەگەڵ خێو و جنۆکان بەرەو تەکەچ چوو.

ـ دوایی نوقمی بەفر گەڕایەوە.

ـ جارێکی دیکەش بانگیان کردەوە و ئەویش چوو و بەرەبەری بەیانی گەڕایەوە.

ـ ئێستا بڵێی خێو و جنۆکان چییان پێ گوتبێ کە وا تاشباش چاوی بڕیوەتـە ئاگردانەکـە و هەر بیر دەکاتەوە؟

ـ ئەو جۆرە بنیادەمانە بەردەوام چاو دەبڕنە ئاگردانەکەوە.

"دوێ شەو دوو کەس بە جلوبەرگی سپییەوە هاتوونە ماڵەکـەی تاشـباش و ئـەویان زیـارت کردووە. دوایی تاشباشیان نەبەدی (غـەیب) کردووە و لەگەڵ خۆیان بردوویانەتە چیای تەکەچ بۆ کۆشکی خێو و جنۆکان و لەوێ ڕاوێژیان پێ کردووە و دواییش هێناویانەتەوە ماڵەکـەی خـۆی. بە ئانقەست لەو بەفریان وەرداوە و هێناویانەتەوە دەرێ بۆ ئەوەی هەمووان وا بیر بکەنـەوە کـە ئەو بە پێیان چووەتە چیای تەکەچ و گەڕاوەتەوە."

کوێخا کە گوێی لەو دەمکۆیانە بوو، هەر شێت بوو. نەشیدەتوانی بڵـێ:"کـوڕە بـابی بـابم، ئەو دوو کەسە ئەمن و عومەر بووین کە چووبووین بیکوژین و شانسی خـۆی نەماندۆزییـەوە و ڕزگاری بوو."

"باشە ئەو نامەردە چۆن توانیی خۆی دەرباز بکا؟ چۆن سۆسەی کردبـوو و وەدەر کـەوتبوو؟ چەند بە باشی کەڵك لە هەموو شتێك وەردەگرێ. ئێستا ژنەکەی بەرداوەتە ئـاوایی کـە بەنـد و باوی بۆ هەڵبەستێ."

کوێخـا بـەیانی بەیانییەکـەی زانیبـووی ئـەو شـەوە تاشـباش لـە مـاڵی عـەلی"یـە درێـژ بـووە و بیستبووشییەوە هەتا بەیانی بەبێ ئەوەی چاو لێك بنـێن، دانیـشتوون و قـسەیان کـردووە. سـیخوڕێکی لەسەر عەلی"یە درێژ دانابوو، بەیانی هاتبووە لای و هەموو شتێکی بۆ لە بنی کوولەکە دابـوو:" ئـەك خودا پێستی سەری ئەو گوندییانە بە لەعنەت بکـا." کفـن لەبـەر دەکـەی و دەچـی یـەکێك بکـووژی، دەتکەنە خێو و جنۆکە. کابرا دادەنیـشێ هـەتا بـەیانی لـە ماڵەکـەی عـەلی"یـە درێـژ و لـە تەنیـشت ئاگردانەکە خۆی گەرم دەکاتەوە، ئەوان دەیکەنـە وەلـی و پیاوچاك و دەینێرنـە چـیای تەکـەچ. نـەخێر، لەمەودوا کەس باشاری ئەو گوندییانە ناکـا. دەبـێ وازی لـەو گونـدە بـێنی و بـڕۆی و لـە شارۆچـکەکە دووکانێك دانێی، بەڵام تۆ خوا حەیف نییە؟... ئەو گونـدە بـەو کـارە نـاوی نـازرێ؟ چـما خـەڵك نـاڵێن ئەوانە نەیانتوانی کوڕەکەی کوێخا خدری مەزن ڕاگرن و ئەو لێقەوماوە بەناچاری بەجێی هێشتن و لێیـدا ڕۆیی و چوو لە شاری دووکانێکی دانا؟ گوندی بمرن باشترە نەك قسەی ئاوایان وەدوو بکەوێ.

هەر هەنگاوێك ماوە و گوندییەکان ئەو هەنگاوەش دەنێن. ئەو گوندییە سەگ و سەگبابانە کاتێك ئەوانەی چوون تاشباش بکوژن دەکەنە خێو و جنۆکە، دەی دیارە ئەویش دەکەنە وەلی و پیاوی خودا و تەنانەت پێغەمبەریش.

"یەك ڕێگە چارە ماوە... بمگەیە عادیل بە نۆكەرت بم، چاری دەردی مـن هـەر تـۆی... فریام كەوە... دەست و قاچت ماچ دەكەم، براله بمگەیە... خۆزگە لانیكەم ئەمڕۆ ئەندامەكانی ئەنجوومەنی دێ بگەڕێنەوە و هەواڵێكی باش یان خراپ بێنن.

"ئاخ، خۆزگە ئەو گوندە بـە عـەرزدا ڕۆچووبایە. خۆزگـە هـەروەك تاشـباش گوتوویـەتی، بوومەلەرزیەك دەهات و داری بەسەر بەردییەوە نەدەهێشت: گوندەكە خـاپوور دەبـێ... لـە بـن داروپەردووی ماڵەكانـەوە دووكـەڵ هەڵدەسـتێ... مریشكە بێدەنگەكـە هـاوار دەكـا: "ڕزگـارم بكەن، ئەمن مریشكم." "ئەتۆ، چما هـەر ئـەو مریشكـە نـی، كـە دەتگـوت لـەبزم دەلـەبزی تەنانەت مێرووەكی ئەو گوندەش ناگەڕێ ؟ كەس بە دەنگتەوە نایە. هەر لەوێدا بمێنەوە و بمرە، هەی پیرە سە." كۆڵەكەی ماڵە كاولبووەكان قوت بوونەتەوە و كاولاشـەكان بـەفر داپۆشـیون. تەنیا چل پەنجا كەسێك ڕزگارییان بووە و ئەوانیش هەموو خـزم و كەسـەكانی سـەفەرن. عـەلی عومەر، ژنەكانی و منداڵ و براكانی..

لایەنگر و ئاژەڵەكانیشی... تەنیا ئەشكەوتی پەرییان ماوەتەوە. ئەویش لە سـایەی بەمـشووریی سەفەرەوە. ئای، گوندییە بێ ناموسەكان، ئەگەر سەفەر نەیگوتبا، چما ئەقڵتان بەوە دەشكا مـەڕ و ماڵاتەكەتان بەرنە كون و ئەشكەوتان؟... باشـە نەتانبردبایـەن، چـما ئـەوانیش لـەو بوومـەلەرزەیـەدا وەك خۆتان تێدا نەدەچوون؟ كوڕە خۆ ئەو دێهاتییانە بۆ چاكەی نابن."

لە خەیاڵی خۆیدا گوندەكە وێران بووە و ماڵ بە ماڵ دەگەڕێ: "لـە بـن داروپـەردووی ماڵێكـەوە، دەنگی كۆستو ئۆغلو دێ. سەفەر لەبەر خۆیەوە دەڵێ، وا باشە ئەوە ڕزگار بكـەم. بنیـادەمێكی بـێ زەرە و نەجاتی دەدا. بەفر دەبارێ. لە دوورەوە، لە قووڵاییەوە، لە بن داروپەردووی مـاڵێكی دیكـەوە دەنگی نیوەنووزەی "ئۆككەش داغ قۆردوو" دێ: "هەی ئۆككەش داغ قـۆردوو، ئـەی تـۆ نەتـدەگوت قەرار وایە بچیتە بەهەشتێ. لە زاری خۆتت دەگرتەوە و پارەت وەسەر یەك دەنا بچیتە حەجێ. شـەو و ڕۆژێ نەدەسرەوتی. سەرت چـووبایە نوێـژ و ڕۆژووت نەدەچـوون. دەی باشـە ئێـستا ئـەوە دەتبەنـە بەهەشتێ ئەی ئەو هاوار و هەڵلایەت لە چییە. باشە، باشە، كوڕە با ئەو ئۆككـەش داغ قـۆردووەش نەجات بدەم. هەر باشە برێك درەنگتر دەچێتە بەهەشت.

"ئەی ئەوەیان دەنگی كێیە؟ دەنگی بنیادەمێكی نیوەزیندوو. میچی ماڵەكـەی یەكـسەر بەسـەردا تەپیوە. دیارە لە قوژبنێكدا ماوەتەوە و نەمردووە. برێك دواتر یان پـشووی لـێ دەبـڕێ و دەخنكـێ یـان ئەوەندە خۆی ڕادەپسكێنێ چیی خـۆڵ و خاكـە بەسـەریدا دەرژێـت و دەیخنكـێنێ. ئـەی ئـەوە نالـەناڵی كێیە؟ سەیرە، لە بن ئەو هەمووە بەرد و گڵەدا هەر ماوە. ئـەوە دەنگـی تاشباشـە وەلییەكـەی خۆمـە.

باشه خۆ تۆ پیاوی خودای بووی و هەموو شەوێ لە چیای تەکەچ دەچوویتە کۆشکی خێو و ئەشقیا و لەسەر سفرەی ئەوان هەر لە شیری مریشکەوە بگرە تا دەگاتە ڕۆحی بنیادەمی لێ بوو، دادەنیشتی و خەڵکت چەواشە دەکردن، ئێشتا بۆچی لەو بن داروپەردووەدا ماویتەوە؟ ئەی بۆچی نایەیتە دەرەوە؟ ئەی بۆچی خێو و جنۆکان نایەن دەستت بگرن و بتهێننە دەرێ. هەی درۆزنە گەورەکە.

"ئەو کابرایە شیاوی ئەوەی نییە ڕزگاری بکەین. هەروەها هەبوونەکەشی زیانی بۆ جسناتی مرۆڤ هەیە. لێی گەڕێ با هەر لەوێدا بمێنێتەوە و بمرێ."

تای لێبوو و وەخت بوو ئاگر بگرێ و لە ناخەوە هەستی دەکرد، ئەو بوومەلەرزە سامناکە هاتووە و ئەو خەڵکە ئاوا لە مردن و گیانداندێ دان:

"ئەی ئەگەر ئەمشەوە هەر بەو قەڵافەتەوە بچێتەوەماڵەکەی تاشباش و ماڵەکەی بداتە بەر فیشەکان، ئەو جار ئەو گوندییە بێ ناموسانە چیی بۆ هەڵدەبەستن؟ دیارە دەڵێن، چما خێو و جنۆکەش تەقە دەکەن؟...

- عومەر!

- بەڵێ گەورەم...

- چ بکەین عومەر؟... ئەو کابرایە بێتامی کردووە. سەیر کە. تەنانەت ئێمە کە چووینە ماڵەکەشی، بووینە خێو و فریشتە. ئەوە بەخێر چووبووین بیکوژین. خۆ ئەگەر وەك دۆست و برادەر چووباین، هەر دەیانکردینە پێغەمبەر. نا تۆخوا؟

- ڕاست وایە مامە گیان.

- دەڵێی چی ئەمشەو لە جێیەك بیخەینە تەڵەوە و بیکوژین؟

- ئەمشەو لە هیچ کوێ دەستمان ناکەوێ.

- بۆ؟...

- ئاخر چونکە ڕا دەکا.

- هەر بە ڕاستی ئێمە بە هیچ جۆر ناتوانین ڕێگەیەك بدۆزینەوە بۆ کوشتنەکەی، عومەر؟ ... باشە ڕۆڵە ئەوە کاری تۆیە. هەر کەسە و لە شتێك شارەزایە. ئەتۆش لە پیاوکوشتنێدا لێهاتووی. دەی باشە دەڵێی چی عومەر؟...

- کوشتنی مەحاڵە.

- دەی باشە، ئەگەر هەر ئێستا بڕۆی و چەند فیشەکی لەسەر دڵی بدەی، ئێستا کە لە تەنیشت ئاگردانەکەی دانیشتووە و چاوی بڕیوەتە ئاگرەکەی، چ دەبێ؟... دەڵێی چی؟...

- یانی بە ڕۆژی ڕووناك؟...

- دەی جا چییە؟ با ڕۆژی ڕووناك بێ، ئەمن ئەجاتت دەدەم. هەر یەك دوو ساڵان لە زیندانێدا دەبی، لەوانەشە هەر نەشکەویتە زیندانەوە. هەموو گوندەکەت بۆ دەکەمە شایەت کە بڵێن، ئەگەر تۆ ئەوت نەکوشتبا ئەو تۆی دەکوشت. دەی، دەڵێی چی؟ دیسانیش ناکرێ؟...

- یانی دەفەرمووی بە نوێژی نیوەڕۆ، ئەویش پیاو کوشتن؟

- یانی ئەوەندە ئەستەمە عومەر؟...

- کوڕە ئەوە پیاوکوشتنە، خۆ مریشك سەربڕین نییە.

- یانی ئەتۆش دەترسی عومەر؟... یانی تۆش باوەڕت کردووە تاشباش وەلی بێ؟

- نا، نااا!...

- ئەی چی؟

- کوڕە بە نوێژی نیوەڕۆ؟...

- بەڵێ، چما چییە نوێژی نیوەڕۆ؟...

عومەر بێدەنگ بوو. سەفەر پرسیاربارانی کرد و عومەریش هیچ وەڵامی نەدایەوە. سەفەر نەڕاندی:

- هەی ترسنۆکینە، بێ دینینە. کوڕە مەگەر بە چاوی خۆت نەتدی ئەو قسانە درۆن؟ تەنانەت خۆ دیتت ئەمن و تۆشیان کردە پیر و پیاوچاك. بە گوێی خۆت بیستت کە... دوێ شەو تاشباش هەتا بەیانی لە ماڵەکەی عەلی"یە درێژ بوو، ئیتر لە چی دەترسی؟

عومەر وەڵامی نەدایەوە. سەری بەردابۆوە و گوێی دابووە جنێو و سووکایەتییەکانی سەفەر کە نەدەبڕانەوە:

- عومەرێك کە لە دایك و بابی خۆی زیاترم زەحمەت بۆ کێشا.لە چنگی جەندەرمە و پۆلیسانم قوتار کرد. عومەرێك کە نەمهێشت تەنانەت ناوی لە دەفتەری سەربازیشدا بنووسرێ. وەك کوڕەکەی خۆم پێی ڕاگەیشتم. لە زاری خۆمم گرتەوە و لە زاری ئەوم ئاخنی. لەبەر خۆمم کردەوە و دەبەر ئەوم کرد. کەسێك کە لەو دنیایەدا بە تاقە پشتوانی خۆمم دەزانی، تاقە هیوا و پشت و پەنام بوو. بەخۆمم گوت، ئەو ئامادەیە لەگەڵم بمرێ. پێم وابوو جوامێری نێو مێرخاسانە. چاونەترس و ئازایە. کوڕم، کوڕێژگەکەم عومەر، ئەتۆش؟...

ئەوەندەی هەست بە تەنیایی دەکرد چیی وای نەمابوو لە بێهیواییدا دیق بکا و هەڵنەستێتەوە. پێی وابوو بەتەنێ و بێکەس و بێدەر مانەوە، لە مەرگیش خراپترە. لەوانەشە مەرگ هەر ئەوە بێ. هەر ئەو تەنیایی و داماوییە.

عادیل پشتی تێکردبوو. گوندیش هەر پشتیان تێهەڵکردبوو. خزم و کەسیش لایان لە لای دەدا و عومەر... تەنانەت عومەریش...

"ئیتر ئەو دنیایە بۆوەی نابێ تێیدا بژێی. دنیایەکی پیس و بێزارکەرە. لە نێو ئەو هەمووە بنیادەمە هیچ و پووچەدا؟ وا باشترە پیاو بمرێ و نەژیێ. تەنیا هیوایەکی لە دڵدا مابوو. ئەویش ئەوە بوو ڕیش سپییەکانی ئەنجوومەنی دێ، هەواڵێکی خۆشیان پێ بێ. ئەگەر ئەوانیش بە خەبەری ناخۆشەوە هاتبانەوە، ئیتر ئەو کات...

چ دەبوو ئێستا خۆی چووبایە و لە سەر ئاگردانەکە تاشباشی دابایە بەر فیشەکان؟... باشە چ بوو؟... لانیکەم پازدە ساڵ دەخرایە زیندانەوە، بەڵام پازدە ساڵ زیندان بۆ ئەو وەك مردن وابوو. ئەو کات کێ کوێخایەتیی دەکرد؟ دەی باشە دیارە. "عەلی"یە درێژ، کوڕە مل شکاوەکەی مرێمۆکی خۆ لاڵ کردوو. هەر ئەوە وا لە پشت تاشباشەوە ڕاوەستاوە ئێمەی تێك بەرداوە. قازانجەکەی بەو دەبڕێ، جوانی لێك داوەتەوە.

"هەی دایك سەگ، چ بکەم؟"

"بە گورگیان گوت، بۆ وا ملهوڕی، گوتی، لەبەر ئەوەی خۆم کارەکانی خۆم دەکەم. دەی سەفەر گیان، ئەتۆش دەبێ بۆخۆت کارەکانی خۆت ڕاپەڕێنی. بێت و خەبەرێکی ناخۆشت لە لای عادیل ئەفەنییەوە بۆ بێ، ئیتر سەڵات لێ ڕادەبێ*، ئەو کات پازدە ساڵ زیندانەکە بە گیان دەکڕی و کارەکەت ڕادەپەڕێنی. هیچ چارەی دیکەت نییە، بەڵام لە کاتی خۆیدا مشوورێکی هەتیوەکەی مرێمۆکیش دەخۆین. چار نییە. بەشی ئێمە وا بڕابوو."

ئەو شەوە تۆزە خەوێك چییە نەچووە چاوی سەفەرەوە. لە سەر جێیەکەی هەر جینگڵی دەدا. تف و تووکی لە دنیا و ئەو خەڵکە سپڵە و پێنەزان و بێغیرەتەی دەکرد. بێت و لە دەست ئەو تاشباشە بە سەلامەتی دەرچووبایە، قسەیەکی لەگەڵ ئەو خەڵکە دەکرد. هەروەها دوژمنەکانی دەبوایە سزای خۆیان وەرگرنەوە.

لەبەرە خۆیەوە بۆڵاندی:

"وەرن، دەی، وەرن. بە خەبەری خۆش یان ناخۆشەوە. ئیتر بەسە. وەرن با ئێمەش مشوورێکی خۆمان بخۆین و بە دەستی خۆمان چاری تاشباش بکەین. وەرنەوە، دەی، براکانم."...

---

* سەڵا لێ ڕابوون: هاوار لێ هەستان. لێ قەومان.

## ٢٩

تۆفان کردبوویە قیامەت. ئەو ڕۆژە بەیانییەکەی ئەوی گیـانی لەبـەردابوو لـە دەرەوە نـەدەبینرا. کەس سەری لە ماڵەکەی نەدێنایە دەرەوە. تەنانەت سەگ و پشیلەش لە دەرەوە نەمابوون.

هـەڵۆ گـەورەکانی چـیا سـەربەرزەکانیش پـەنایان بردبـۆوە هێلانـەکانی خۆیـان و سـەری شکۆمەندی خۆیان نابووە بن باڵەکانیانەوەو گوێیان لـەو قیامەتـە هەڵخستبوو کـە لـە دەرەوە ڕابببوو. گورگ و ڕێوییەکانیش خزیبوونە لانـی خۆیانـەوە و خـەوتبوون و ئـەوەش تاقـە ڕێگـەی ڕزگاربوونیان بوو لە سەرما. ئەگەر چەند ڕۆژان لەسەر یەك برسی بوایەن و ئەو تۆفانەش هەر وا خۆشی نەکردبایەتەوە، لەوانەبوو هیچ بوونەوەرێك لە هێلان و لانەی خۆی نەیەتە دەرەوە. دیارە ئەو تاقە سپێدارەش کە لە بیابـانێ و لەبەرامبـەر ئـەو هـەمووە تۆفانـەدا ڕاوەسـتابوو، ئـەمڕۆ بشکێ. دەنگی شکانی دارەکانی لێرەوار تێکەڵاوی ویزە و گڤەی بایەکە دەبوو.

باڕنەکە، ئەو کولووە بەفرانەی وا هەر بە ئاسمانەوە ببوونە سـەهۆڵ، وەك دەنگـە زیـخ بـەولاولادا دەدا. لە ناکاو دەتدی لە قوژبنێکی گۆڕەپانەکەی ئاوەدانی تەپۆڵکەیەکی سەهۆڵ دروست بووە.

لەو باو بۆران و زەمهـەریرەدا، پیاوێـك کـە سـەری نـابووە قـەپیلکی خۆیـەوە و چـاوەکانی قووچاندبوون، وەك بریسکە لە ماڵێکەوە بەرەو مـاڵێکی دیکە ڕا دەکا، بـەڵام بـاڕن و بۆرانەکـە ڕێگە نادا لەو کابرا کۆماوەیە نزیك ببیتەوە کە لەو ماڵەوە خـۆی دەکوتێتـە ماڵەکـەی دیکـە. ناهێڵێ یەك دوو مەترێکی لێ نزیك ببیتەوە و سـەیرێکی بکـەی و بزانـی ئـاخۆ کێیـە. نـەخێر مەحاڵە بیناسی. ئەو "مەمی دیك"ـە. ڕاوچییە. وەك بۆ خۆی دەڵێ، لە سـۆنگەی ئـەو ڕاوەی وا لە زستانێدا دەیکا، لەو گونـدەدا، لـە هـەمووان تێرتـرە. مـەڕ و مـاڵات و بـزن و ئەسـپ و مانگای نییە، بەڵام هونەرێکی بەرزی هەیە و ئەویش ڕاوە. وەك بۆخـۆی دەڵـێ لـەو هەرێمـەی تۆرووسدا کەس وەك ئەو تەڵە بۆ سمۆرە نانێتەوە. هەموو سمۆرەکانی ئەو تۆرووسە گەورە، تەنیا

**یەك کەس ڕاوی کردوون، ئەویش "مەمی دیك"ـە. جا ناویشیان ناوە "مەمی دیکە چەقەڵ". نەك لەبەر ئەوەی لە چەقەڵ بچێ، بەڵکو ئەو ناوە بێ جێیەیان بۆیە لێناوە، چونکە لە ڕاوکردنی سمۆران زۆر شارەزایە. لەو گوندەدا لاوی لەو کورتە بالاتری تێدا نییە. کاتێ کچەکان پێی دەڵێن:"ئەی تۆ کەنگێ هەڵدەدەی مەمی دیك؟ ئیدی خەریکە پێ دەگەی. هەر دوو پەنجەی دیکە بالا بکەی، مێردت پێ دەکەم." هیچ کاری تێناکا. سەری بەر دەداتەوە و دوور دەکەوێتەوە. پێی وایە ئاخری ڕۆژێك هەڵ دەدا. کوڕە خۆ بنیادەم بە ڕۆژێك بالا ناکا.... وردە وردە، لەسەر خۆ... تازە مەمی دیك، هەر نایەوێ بە قەدرایی عەلی"یە درێژ کەڵەگەت بێ یان وەك گۆملیکسیزی لێ بێ. خوا نەکا. تۆ خوا ئەوەش قەد و بالایە؟... سەیر و سەمەرە... زەوی و ئاسمان دادەگرێ.**

**باوکی مەمی دیك، کاتێ هێشتا ئەو شەش مانگانە بوو، مردبوو و دایکیشی لەو کاتەوە بە بێوەژنی مابۆوە.**

**دایکی بە مەمی دیك دەڵێ:"**

**"خەمت نەبێ کوڕم. بابی تۆ وەك خەڵقی دارەچنار کەڵەگەت بوو. چما تۆ تەمەنت چەندەیە؟ ئەتۆش کەڵەگەت دەبی. زۆریش کەڵەگەت. گوێت بە تانە و تەشەری کچەتیومچەتیوانی ئاوایی نەبزوێ. ئەوان ئاوا سوعبەت لەگەڵ کورتەبالایان ناکەن، لەگەڵ کەم تەمەنەکان ئاوا جەفەنگ لێ دەدەن."**

مەمی دیك یەك دوو ڕۆژان باوڕ بەو قسانە دەکا، بەلام دوایی، سەیرێکی بەژنی خۆی دەکا و دەڵێ:"نا، نا، ئەگەر بەژنم هەڵیدابایە، تا ئێستا هەڵی دابوو، بەلام چ دەکرێ، بەژنیشم کورت بێ، ئەوەی باشە، بۆ ڕاوی سمۆرەی بەکاری خۆی دێ، لە قوژبنێك خۆت مەلاس دەدەی و مات دەبی. ئەو کاتە نە سمۆرە دەتبینێ و نە باڵندەش."

بەلام ئەوانە هەمووی قسەی قۆڕ بوون. تەشەری کچان، شێتیان دەکرد. ساڵ و مانگان تێدەپەڕین و ئەو پەنجەیەکیش تەنانەت نیو پەنجەش هەڵی نەدا بوو. مەمی دیك، وردە وردە کەمتر دەهاتە نێو خەڵکی و زیاتر کاتەکانی خۆی لە ڕاو و لە چیاکاندا دەگوزەراند.

زۆر باشە، لەو با و بۆرانەدا، ئەو کوڕە، خۆ چاوئێشەی نەبوو ئاوا خۆی بەو دەرگا و ئەو دەرگادا دەکرد؟

بەر لە هەر شتێ، با چاوی لە ژێلەلا هاتۆوە لە ترسان، چۆوە ماڵەکەی خۆیان و هەر گەیشتەوە دانیشت و دەستی کرد بە گێڕانەوە بۆ دایکی. دەست و پێی سڕ ببوون. سەر و ملی

کە بردبووە نێو قەپیلیکی خۆیەوە دەتگوت هەر لەوێدا بەستوویەتی و ماوەتەوە. مەمی دیك، لە سەرمان گرمۆڵە ببوو. دەیگوت:

- دیتم، بەڵێ دیتم...

چاوەکانی لە ژێڵڵا هاتبوون و لێوەکانی دەلەرزین. دایکی دەیگوت:

- مەمی دیك، کوڕی خۆم، بەفرەکەی سەر و دەموچاوت بتەکێنە و وەرە سەر ئاگردانەکە دانیشتە و ئەوجار بیگێڕەوە. لەو قیامەت و بەفر و بۆرانەدا، خوا بزانێ لە سەرمان چیت لێهاتووە.

مەمی دیك، هیچ گوێی لەو قسانە نەبوو کە دایکی بەردەوام دەیکردنەوە. دەیگوت:

- دیتم. بەڵێ دیتم. خوا کوێرم بکا ئەگەر درۆیان بکەم.

بە دوو پەنجەی چاوەکانی هەڵدەگلۆفین و دەیگوت:

- بەو دووچاوەی خۆم دیتم. بەو دووچاوەم، هەر بەودووانە، بەوانە... کەس بڕوا ناکا. بەقا ناکەن، بەڵام... ئەمن خۆم دیتم. زۆر باشیش دیتم.. چۆنت بۆ بگێڕمەوە... جوان جوان دیتم. یەکێکیان ئەمن دیتم و یەکێکیشیان... کێ دیتی؟ هیچ کەسی دیکەی نەیدی.. هەر خۆم دیتم. ئەو دوو گلێنەیەم بێنە دەرێ، دیتم. ئەمن دیتم. هەر دوێ شەوێ.

" ڕۆژ خەریك بوو ئاوا دەبوو، کە لایەکی ئاسمان ڕوون بۆوە. دەنگێکی لێوە هات و ڕوون بۆوە. بەخۆمم گوت: ئەی ماڵوێران، بەخوای نهێنییەکی تێدا هەیە. ترسێك خزییە دڵمەوە..، بەڵام ئەمن چووبووم تەڵەی بنێمەوە. بەخۆمم گوت ئەو ڕووناکاییە مەیلە و سەوزە کە شەپۆلان دەدا، هێمای ئەوەیە سمۆرەیەکی زیاتر پێوە دەبن. چوار تەڵەم لە بەر هێلانەی چوار سمۆرە دانا. تۆفانەکە هەڵی کرد. ئەمن پەنام بردە بەر ئەشکەوتەکەی پەرییان. پووشکەم کۆ کردەوە و ئاگرێکم کردەوە. تۆفانێك بوو لەو کێوە، ئاسمان و زەویی پێکەوە دووریبوو. کەس نەیدەزانی شەوە یان ڕۆژ. ئیدی وابوو دیتم. بڕوام نەدەکرد. چاوەکانم جوان هەڵێنان. دیسان، دیسانیش سەیریم کردەوە. بڕوام نەدەکرد. کزەی سەرماکەش بێ وێنەبوو. بەردەکان ببوونە سەهۆڵ و لە سەرمانا درزیان دەبرد. سپیایی بەفرەکە ڕەشایی شەوە شێتەکەی داپۆشیبوو. ڕێك کاتی سمۆرەگرتنێ بوو. لە دڵەخۆمدا گوتم:"مەمی دیك، چوار سمۆرە دەگری."ئەدی، بە چاوانەی خۆم دیتم. دەیڵێم. بە هەموو کەسی دەڵێم. بە زەوی و ئاسمان و باڵندە و دەعبای کێویی دەڵێم. ئەگەر سەریشم بە فەتەرات بچێ هەر دەیڵێم. ئەگەر تووشی تووك و نەفرەتیش ببم، هەر دەیڵێم. ئەدی، بەو دوو چاوانەی خۆم دیتم. لە ناکاو دیتم دەنگی ناڵینێك لە زەوییەوە هەستا.

سەیری زەویم کرد، ترسام. ڕاستە کاتێ بنیادەم بە تەنێ بێ، گوێی لە دەنگی زەوی دەبێ، بەڵام لە عومرمدا گوێم لە ناڵینی ئاوا نەبیبوو. دوایی دیم ڕەوەزەکان دەزریکێنن. دوایی لە ناکاو هەستم کرد دەنگی زریکە و ناڵینی زەوی و ئاسمان و ڕەزەوە ز و لێڕەوار و بۆرانەکە تێکەڵ بوون و کردوویانەتە قیامەت. ئەوەندە ترسام هەر مەپرسە... ڕۆحم هاتە لەسەر لووتم... ئەو زریکە و ناڵەیە برێکی دیکەی کێشابایە، یەکسەر زراوم دەچوو. لەو کاتەدا لە ناکاو دیتم، نە دەنگێك مایەو و نە ناڵین و زریکەیەکیش... نە تۆفانێك مایەوە و نە بۆرانێك. نە شوێنەوارێك لە کزەی سەرمایەکە نایەوە نە سەرماکە خۆی. هەواکە خۆشی کردەوە و شەوەکە وەك شەوێکی بەهاری لێ هات. لە هەر چوار لاوە عەتری گوڵی تازەپشکووتوو هەستا. تا ویستم بڵێم سوبحانەڵڵا ئەوە چییە، دیتم حەوت تۆپەڵەی نوور، هەر کامەیان هێندەی دوو بنیادەم، لە خوارەوە بەرەو ژوور هەڵدەکشێن. تۆپەڵە نوورەکە بە سەماکردن و خولانەوە بەرەو دەشتەکە دەهاتن و دنیا نوقمی نوور و بەهار و هەوایەکی خۆش و عەتری گوڵەکان ببوو. هەموو وڵات ڕووناك ببۆوە. تەنانەت دەتوانی شوێن پێی مێروو بدۆزیتەوە... لەو کاتەدا... گوێ بدەیە دایە.. بەو چاوانەی خۆم دیتم. خۆ بە چاوەکانی خۆم نەمدیبایە، بڕوام نەدەکرد. لە پێش ئەو حەوت تۆپەڵە نوورەوە کە بەرەو من دەهاتن، کابرایەکم دی، جلوبەرگێکی سپی لەبەردا و خەرمانەی نوورێکی سەوز بە دەوری سەرییەوە و بەرەو لام دەهات. نوورێك لەو کابرایەوە بە چوار دەوریدا دەباری، کە ئەو حەوت تۆپەڵە نوورە لە بەرامبەریدا هەر هیچ نەبوون. بەڵێ... ئەو کابرایە ئاوا نوقمی نوور بوو.. سەرم لێ شێوا بوو. بەخۆم گوت: ئەو تارماییە کێیە؟.. بەڵێ، دیتم. بەو چاوانەی خۆم دیتم. جوان جوانیش دیتم. دیتم ئەو کابرایە بە خەرمانەیەکی نووری کەسکەوە بەسەر سەرییەوە و لە پێش حەوت تۆپەڵە نوورەوە، بە جلوبەرگێکی سەرتاپێ سپیی نوقمی نوور، خەریکە دێ. بەڵێ دایە، دەستم کرد بە هەڵلەرزین. گوتم بێ و نەبێ شتێکی تێدایە. نەکا ئەو بنیادەمە پیر و پیاوچاك بێ. دار بوو بنیادمێکی ئاوا حەوت تۆپەڵە نووری هێندەی کێوێکی بەدوای خۆی دابێ، لە چاوترووکانێکا سارد و سەرماش ناهێڵێ و هەوا دەکاتە هەوایەکی بەهاری، دەبێ وەلی و پیاوچاك بێ. گوتم هەتیو، نەکا خەون بێ. نووکی چەقۆکەمم لە ڕانی خۆم کوتا. ڕانم ژانی کرد. بەخۆمم گوت/ مەمی دیك، ئەوە چ خەونێکە؟..، بەڵام ئیتر دەرفەتم نەمابوو. ئەو بنیادەمەم دی، کە بە حەوت تۆپەڵی نوورەوە بە بەر دەممدا تێپەڕی و بەرەو چیای تەکچ خوشی. تەنیا بۆ ساتێك ڕوخساریم دی کە لە نووردا شەپۆلی دەدا. دواییش هەم خۆی و هەمیش حەوت تۆپەڵە نوورەکە لەبەرچاوان ون بوون. ئەوجار تاریکییەك وڵاتی داگرت چاو

چاوی نەدەدی. دواتر چیم دی؟ هەر بەو دوو چاوەی خۆم دیتم، نە خەون بوو و نە خەیالیش. لە ناکاو لە نێوەڕاستی ئەو تاریکییەوە دیسان ڕووناکییەك تەقییەوە. تەوژمی نوورەکەی هێندە زۆر بوو بەعەرزیدا کەوتم. نوورەکە وا بڵاو بۆوە، هیچ کوێم نەدی. پێم وابوو کوێر بوومە. هەرچی کردم، نەمدەتوانی لەجێی خۆم هەستمە پێ و نەشمدەوێرا چاوەکانم هەڵێنم. دڵم وا کەوتبووە لێدان، خەریك بوو لە سینەم بێتە دەرێ. باشە ئەو نوورە چ بوو لە ناخی ئەو تاریکاییەوە هەستا؟ ئاخۆ زەوی قەڵشیبوو و نوورەکە لەوێوە هەستابوو یان ئەستێرەکانی ئاسمان ڕژابوونە سەر زەوی؟ چ قەومابوو؟ قیامەت ڕاببوو؟ پەرجۆ بوو؟ هەر شتێك بوو، من نەمدەتوانی چاوەکانم هەڵێنم و ببینم. زۆرم حەز لێ بوو برێك چاوم هەڵێنم و لە درزی چاومەوە لانیکەم بزانم کوێر بوومە یان نا؟ چونکە ئیدی زۆر زۆر لەوەیان دەترسام. ئاخرییەکەی لە دەرزی چاوەکانمەوە ڕوانیم. دیم ئەو کابرایەی لە بەر جوانی، دڵت نایە تێر سەیری بکەی، حەوت تۆپەڵی نووری لە پشتەوە، لەبەردەمم ڕاوەستاوە. هەر بەو دوو چاوەی خۆم دیتم. ئەو کابرا کەڵەگەتە ڕووبەڕووم ڕاوەستابوو. دوایی بەرەو ئاوایی کەوتە ڕێ. زۆر زۆر کەڵەگەت بوو. ئەمن لەو تاریکاییەدا مامەوە. برێك دواتر بینیم نوورەکان لە خوارەوە سەرەوژوور دەکشێن. بژاردمن. ڕێك حەوت تۆپەڵی نوور بوون. وەك حەوت ئەستێرە، ئەمجارە، تۆپەڵە نوورەکان وەك ئەسپی ڕەسەنی عارەبی، بە سەما و هەڵبەز و دابەز، بە دوای ئەو کابرایەدا لە ئاواییەوە دەگەڕانەوە و بە شوێن یەکتریدا ڕیزیان بەستبوو و تۆپەڵە نوورەکەی دواوەیان لە هەموویان ڕووناکتر بوو.... ئێستا کابراکە نوقمی نوورە کەسکەکە بوو، نوورێکی کەسك لەسەر و چاوی و جلوبەرگ و هەموو گیان و بە شوێن پێیەکانیشی دەباری.

دیتم شەوێ، بەفرەکە و چیای تەکەچ و ڕەوەزەکان و هەر هەموو وڵات نوقمی نوورێکی کەسکە. بەفرەکان نووری کەسکیان لێ هەڵدەستا. چاوەکانم بە شەوارە کەوتبوون. بەردەوام چاوم دەپتاندن. دیسان نوورەکە بەرەو من دەهاتەوە. وەی، دایکە، خەریك بوو لێم نزیك دەبۆوە. حەزم دەکرد ڕا بکەم، بەڵام ئیدی دەرفەت نەبوو. لە ترسان زمانم بە مەڵاشوومەوە نووسابوو. لاڵ ببووم. نەمدەتوانی لە جێی خۆم هەستم. شەلالی ئارەقە بووم.

لە ناکاو دیم، تارماییەکە گەیشتووەتە بەرامبەرم. دیسان هەر لە جێیەکەی پێشوو، ڕاوەستا. دەزانی چیم دی؟ دەزانی ئەوەی بەرەورووم ڕاوەستا بوو کێ بوو؟ ئەو تارماییەی دڵت نەدەهات تێر سەیری چاوە جوانەکانی بکەی؟ کاکە تاشباشەکەی خۆمان بوو. بەڵێ، گەورەی هەموومان تاشباش ئۆغلو، حەوت تۆپەڵەی نوور بە دوایەوە وەك حەوت ئەسپی زەبەلاح و هەموو گیانیشی سەوز بوو. لە ئازای ئەندامییەوە و لە زەوی و ئاسمانیشەوە نوور دەباری.

گوتم:"کوڕە بە نۆکەرت بم تاشباش ئەفەنی! بمانبوورە." وام گوت، بەڵام دەنگم دەرنەهات. لە ترسان نەمدەزانی چی بکەم. دەمەویست بچمە پێشەوە و خۆم بەسەر پێڵاوەکانیدا بکێشم و بڵێم، ئەمن، ئێمە، دایکم و گوندەکەمان ببوورە، بەنۆکەرت بم، بەڵام قەڵەمی دەست و پێم شکابوو و نەمتوانی هەستم. وەك بای شەماڵ بە پێشمدا تێپەڕی و بە حەوت تۆپەڵە نوورەکەیەوە کە بە دوایدا دەخوشین، دوور کەوتەوە.وەك بای شەماڵ وابوو. چۆنی بۆتی دەگێڕمەوە ئاوام دی بەو چاوانەی خۆم. بەرەو چای تەکەچ خۆشی و ڕۆیی. نەمدەتوانی چاو لە تاشباشی گەورەمان هەڵگرم کە دەخوشی و دەڕۆیی. بڕێك دواتر دیم، لووتکەی چیای تەکەچ نوورباران بووە و شەپۆل دەدا. بە غاردان بەرەو ماڵەوە هاتمەوە."

مەمی دیك، هەر قسەکانی تەواو بوون، بەبێ ئەوەی گوێ بداتە داوای دایکی کە دەیگوت:"تۆزێك ڕاوەستە، مەمی دیك"، و لە ماڵێ دەرپەڕییە دەرەوە.

ڕۆژ درەنگ ببوو. با و بۆرانەکە هەر وا بوو، بەڵام خەڵك لە ماڵ هاتبوونە دەرەوە. دەچوونە ماڵی یەکتری و دەیانگێڕایەوە. پەیتاپەیتا مەمی دیکیان ناچار دەکرد باسی نوورەکە بکاتەوە. گوندەکە نوقمی شادی و خۆشی بوو. هەمووان بە گیان و دڵ گوێیان دەدایە بەسەرهاتەکە و لە ناخی خۆیاندا چێژیان لێ وەردەگرت. ئەوانەی لە ئاوەدانیدا لەوانی دیکە بە دەمودووتر، هەر کامەیان چەندین جاریان دەگێڕایەوە. جار بە جار ژمارەی ئەوانەی لە دەوری ئاگردانەکە کۆ ببوونەوە زیاتری دەکرد و بەردەوام ئاگردانی دیکەشیان هەڵدەکرد.

## ٣٠

مەمی دیك دەچوو بۆ ماڵی کوێخا کە بۆی بگێڕێتەوە چیی دیتووە، لە سەر ڕێیە ئۆکسوز دوران پێشی پێ گرت و گوتی:

ـ هەتیو، چما شێت بووی مەمی دیك؟ کوڕە بەخوای کوێخا یەك قسەی ئاوات لە زاری ببیستێ، دەستبەجێ دەتکوژێ.

بۆیە مەمی دیك پاشگەز بۆوە و نەچووە ماڵی کوێخا.

ڕووداوەکە لە چەند ڕێی جۆراوجۆرەوە، دەمودەست بە گوێی کوێخا گەیشتەوە و شێتی کرد. ئیتر ئەوەی نەدەبوو ببێ، ببوو و مەسەلەکە تەواو ببووە شتێکی فەرمی. ئەوەی لێی دەترسا بەسەری هاتبوو. ئێستا ئیتر هاتن و نەهاتنەکەی عادیل وەك یەك وا بوو: "بە جەحەندەم با بێ و بە دەرەك با بڕوا. ڕێگە ئاوەڵایە."

"ئەو مەمی دیکە، کێی لە پشتە؟ ئەوە گرنگە. مەمی دیك، چییە، هەتیوێکە و هیچی دی. خۆ دەستوپێوەندی تاشباشیش نییە. دایکیشی بۆرە خزمایەتییەکی لەگەڵ ئێمە هەیە... ئەو مەمی دیکە شتێکی لەگەڵ دەکرێ."

چیی زیاتر بیری لێ دەکردەوە، پتر لە مەمی دیك تووڕە دەبوو. فەرمانی دا بەگزیرەکەی:

ـ دەسبەجێ ئەو مەمی دیکەم بۆ بێنە. ئەگەر نەشهات، بڵێ حوکمی حاکمە... بە شەق بیهێنە.

بانگی عومەری کرد و پێی گوت:

ـ لەوانەیە ئەو تووتکەسەگە لاساری بکا. ئەگەر نەیویست بێ، پڕی پێدا بکە و بیهێنە. لانیکەم ئەو کارەمان بۆ بکە. دیتت چەند بە جوانی پێشبینیم کردبوو کە ئەو کابرایە ئەمڕۆ دەکرێتە وەلی؟... هەر بە ڕاستی عومەر، ئێمە تێداچووین؟ یانی مردین و نەماین؟

عومەر سەری داخست و لەگەڵ گزیرەکە چووە دەرێ.

سەفەر بە بێ ئۆقرەیی، چاوەڕێی مەمی دیك بوو:"ئەو تووتکە سەگە، دەبێ بدرێتە بەر شەق و پێلەقە و پشتی لە زگی نەرمتر بکرێ. ئەو قسە قۆڕانەت لە کوێ هێناون؟" ئەو حەقایەتەی تاشباش بە حەوت تۆپەڵە نوورەت لە کوێوە هەڵبەست؟ یانی ئەو شەخسە تاشباش بوو، هەتیوە چڵمنە؟... ئەوەی تۆ دیتووتە، چما "سوڵتان نووری قەراچەداغ: نەبوو؟... چما تۆ نازانی هەتیوە گەمژەیە "سوڵتان نوور" چ شەو بێ و چ ڕۆژ، حەوت تۆپەڵە نوور بە سەر سەرییەوەن؟ ئیتر تاشباش لە کوێ بوو بە سوڵتان نوور، هەتیوە کەرە. هیچ بیرت لەوە نەکردەوە کە بە پێلەقە دەتپلیشێنمەوە؟ هەتیوی چارەڕەش.

"مەمی دیك، ئەو چیرۆکەی سوڵتانی نووری لە کوێ بیستبوو و بۆ تاشباشی هەڵبەستۆتەو؟ نەکا خۆی تاشباش لە گوێی خوێندبێ؟ دەبێ هەر هەموو ئەو شتانەی لە بنی زمانی دەرکێشم. هەر بەراست نەکا، ئەو هەتیوە بوودەڵەیە، تەنیا بۆ ئەوەی بڵێ "ئەمنیش ئەزم" ئەو حەقایەتەی هەڵبەستبێ؟ یان خەونی دیوە کە... یان ئەوەی... هەر بەراست تاشباش وەك سوڵتانی نوور خۆی پێشان داوە؟

" مەسەلەکە هەر شتێك بێ، دەبێ ئەو مەمی دیکە بیرازێك بکرێ. بۆ ئەوەی تەمبێ بێ و جارێکی دیکە درۆی ئاوا هەڵنەبەستێ."

هەر وا کە چاوەڕێی هاتنی مەمی دیك بوو، جار بە جاریش تووڕەتر دەبوو. ئەوەندە تووڕە دەبوو حەزی دەکرد بیکوژێ، بەڵام کە ملە باریك و چاوە پرووشەکانی و قەڵافەتە لەڕ و نارێکەکەی دێنایە پیش چاوی، ڕقەکەی دەنیشتەوە.

"بەڵام ئاخر چ قازانجێك بەو دەگات، بێ و خۆی لەو کارانە هەڵقورتێنێ و ماڵی من وێران بکا؟ ڕاستە مەسەلەکە، هەر وای لێ دەهاتەوە، بەڵام خۆ ئەگەر مەمی دیك نەدەبوو، دیسانیش چەند ڕۆژێکم دەرفەت هەر دەبوو. وا نییە؟

"گووت لە ژیانی من کرد مەمی دیك، ماڵوێرانت کردم. کردتمە تۆزی بانان، مەمی دیك. مردەلۆخەش بی، سیرمەکۆنێکیش بی، سزات هەر دەدەم...."

ئەو زیانەی لە مەمی دیك پێی گەیبوو، خەریك بوو شێتی دەکرد. مستی توندکردبوو و قەپی لێ دەدان. لە دین دەهری ببوو.

رێك لەو کاتەدا مەمی دیك لە پێشەوە و گزیر و عومەر لە دواوەی وەژوور کەوتن. سەفەر هەر چاوی پێی کەوت، دەرپەڕی و پەلاماری دا. مەمی دیك، هەر کە دیتی چاوەکانی لە ژێلڵا

هاتوون و ڕەنگی بە ڕوخسارییەوە نەماوە و لێوەکانی دەلەرێنەوە، لەبەر پەلامارەکەی کە دەیویست بیخنکێنێ، هەڵات خۆی خزاندە قوژبنێکی ژوورەکەوە و کرووشمەی کرد. سەفەر کە لێی چووبووە پێشێ وەخۆ هاتەوە. بێت و ئەو مستەی داهێنابایە، مەمی دیک هەر جارێک زاری پێکدا دەدا، یان بۆ تا هەتایە نقوستان دەبوو. سەفەر بەخۆی گوت: "کوڕە ئەوە چ دەکەی سەفەر؟ خەریکە لەخۆتی دەشێوێنی ها."

تۆزێك ڕاوەستا و گوتی:

ـ کوڕی خۆم مەمی دیك، بەخێر بێی. برالە گیان، چۆن پیاو سەر بە هەمووماڵێک دادەکات و نایەتە ماڵی مامە سەفەری خۆی؟... ئێستاش ئەمن بۆیەم بانگ کردی بۆوەی ئەوەی دیوتە بۆمی بگێڕیتەوە...

مەمی دیك ئەوەندەی پێ سەیر بوو واقی وڕمابوو. نەیدەزانی چ بکا.. ئەو کابرایە کە وەك تۆفانێك پەلاماری دابوو، کتوپڕ بۆچی وا نەرم و نیان و مێهرەبان ببۆوە؟ هێشتاش لە ترسان گیانی دەلەرزی.

ـ ئەوە چتە کوڕم؟ بۆچی خۆت خزاندۆتە ئەو قوژبنەوە؟ وەرە کوڕی خۆم. وەرە و چیت بینیوە بۆم لە بنی کوولەکەی بدە.

مەمی دیك وردە وردە وەخۆ دەهاتەوە و دڵنیا دەبۆوە. قەڵافەت و چاوەکانی سەفەر وردە وردە ئاسایی دەبوونەوە.

دەستی گرت و هێنایە بەر ئاگردانەکە و بانگی کرد:

ـ ژنەکە، کچەی قیرسمایل، دا چایەکمان بۆ بێنە...

ژنە لە چادانەکەی دەم ئاگرەکە، کووپێك چای تێکرد و دوو کڵۆ قەندی تێخست و لەگەڵ کەوچکێك کە هەر دەسکەکەی پێوە مابوو، تێکی وەردا و دایە مەمی دیك.

سەفەر کەوتبووە پێکەنین و سەیری مەمی دیکی دەکرد کە خەریکی چا خواردنەوە بوو. مەمی دیکیش سەیری ئەوی دەکرد و بزەی دەهاتێ و لە دڵی خۆدا دەیگوت:

ـ هەر هەمووی درۆ بوو. ئەو گوندییانە هەر هەموویان درۆیان دەکەن. ئاخر، چما ئەو مامە سەفەرە پیاوێکی خراپە؟ بنیادەمی وا لە کوێ هەیە؟... مامە سەفەر کابرایەکی نازدارە. لە پێشدا کە لە دوورەوە سەیری دەکەی، پیاو زەندەقی لێی دەچێ، بەڵام کە لێی نزیك دەبیتەوە، زۆر لەبەر دڵانە. ئەو گوندییانە خەڵکێکی باش نین. ئاخر ئەو مامە سەفەرە چ خراپەیەکی هەیە؟ چەندە پیاوێکی باشە. چەندە جوانیش پێ دەکەنێ. بنیادەمێك ئاوا جوان پێ

بکەنیّ، چما دەکریّ خراپ بیّ؟... لەمەودوا ئەمنیش هەر لەسەر مامە سەفەر دەکەمەوە... تازە، مامە سەفەر خزم و کەسی ئێمەیە. دەبێتە خالّی دایکم. دیارە زڕخالّێتی. دەی با زڕ بیّ چییە؟ خۆ هەر خزمی خۆمانە."

مەمی دیك سەری هەلّێنا. فرمێسکی لە چاویدا قەتیس مابوون. دلّی پڕ بوو لە خۆشەویستی. بابیشی زیندوو بایە، هەر هێندەی سەفەری خۆش دەویست، ڕێك هێندەی ئەو سەفەرەی بەرامبەری دانیشتبوو. حەزی لێبوو دەستی لەئەستۆی بکا و باوەشی پێدا بکات و دەستەکانی ماچ بکا.

هەموو عیشق و خۆشەویستییەکەی لە چاوەکانیدا کۆ کردەوە و سەیری سەفەری کرد و گوتی:

ـ مامە سەفەر، تۆ خالّی دایکمی. خالّی خۆشمی. لەمەودوا من لایەنگری تۆم. تا مردن چیی تۆ بفەرمووی لەسەر چاومی دادەنێم.

مەمی دیك گەڕابۆوە سەردەمی منداڵیی خۆی و ئێستا خەریك بوو خۆی دەکردەوە منداڵێکی حەوت ساڵانە.

سەفەر دەستی برد و بە سەر و قژی و شانەکانیدا هێنا و گوتی:

ـ دیارە، ئەتۆ خوشکەزای خۆمی، بەڵام ئەنگۆ خۆتان لە من دوور ڕادەگرن، ناشزانم بۆ؟ لە حالّێکدا ئەنگۆم هەر بە خزم و کەسی خۆم زانیوە و دایکیشتم وەك کچی خۆم سەیر کردووە.

بیرێك وەك بریسکە بە مێشکی سەفەردا تێپەڕی. دەیویست قەشمەرییەك بەو دێهاتییانە بکا، زەوی و ئاسمان بلّێن دەست خۆشز لەو قەشمەرییانە... ئێستا کە مەمی دیك، هەر ئەو مەمی دیکەی ئەفسانەکەی تاشباش و حەوت تۆپەڵە نوورەکەی هەڵبەستبوو، لەبەر دەستی خۆیدا بوو... های ی هەی... ئاخری ڕۆژگار خولێکی بە کەیفی ئێمەش لیّ دا. "بەقوربانی بەشت بەم خوایە گیان، ئێستا دەبیّ وایان بەچۆك دا بێنم نەبێتەوە. هەر بژی کوڕی خۆم، مەمی دیك." و بە خۆشەویستییەوە سەیرێکی مەمی دیکی کرد و دەستی بەسەر شانیدا هێنا:

ـ بەلّیّ، مەمی دیکی خۆم، مەمی دیکی ئازا و ژیر و باشی خۆم. دوژمنەکان دەیانویست ئێمە لێك بکەن. خودا چاوی دوژمنەکانمان کوێر بکا. چما نینۆك لە گۆشت جویّ دەکریچتەوە؟ تۆ برای خۆمی. ئێمە لە یەك خوێن و گلّین. لێگەڕیّ دوژمن چییان پێی خۆشە بیلّێن. چیی دلّیان دێنیّ با بیڕێسن. ئەتۆ ناتوانی لە من جویّ ببیتەوە. چما وا نییە؟...

مەمی دیك بەبێ ئەوەی سەر هەڵێنێ بە سەر لەقاندن بۆی دەسەلماند. ئەو مێرمنداڵە لە خۆشەویستی و سۆزدا توابۆوە. لە خۆشیان شاگەشکە ببوو. هیچ کەس تا ئێستا ئاوا لەگەڵی نەجووڵابۆوە و قسەی ئاوا خۆشی بۆ نەکردبوو.

"خزم و کەس بوون، بۆخۆی شتێکە. دیارە. چما کەس جێی خزم و کەست بۆ پڕ دەکاتەوە. کوێر بن ئەوانەی وا خزم و کەسان لێك دەکەن و نینۆك لە گۆشت جوێ و کوڕ لە باب و کچ لە دایك و ئاشقە و ماشقە لێك دەکەن، پێستی سەریان بە لەعنەت بێ ئەو دوژمنانە."

ـ ببوورە مامە سەفەر. ئەمن نەمدەزانی ئەوەندە مێهرەبان و پیاوی چاکی و کەسیش نازانێ ئەتۆ ئەوەندەت خزم و کەسی خۆت خۆش دەوێ.

سەفەر ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ با نەزانن کوڕم. ئەو خودایەی لە ژوور سەرمانە خۆی دەزانێ....

مەمی دیك بەبێ ئەوەی سەری هەڵێنێ بۆی سەلماند: ڕاستە. دیارە دەزانێ.

سەفەر:

ـ دەڵێی چی ئەو بەسەرهاتەی ئاشباشم بۆ بگێڕیتەوە...

چیت دی.... چیت بیست؟... بۆمی بگێڕەوە کوڕم. ئەو مەسەلەیە زۆر گرنگە. ئەو مەسەلەیەی ئاشباش پێویستە من بیزانم. بۆ حوکمەت و دەوڵەت و حوکمەتی کۆماریی تورکیا و بۆ دەمیرقیراسی زۆر گرنگ بووە.

مەمی دیك، لە خۆشیان باڵی گرتبوو. سەرۆکی گوند، کوێخای مەزن و لە هەمانکاتدا گرنگترین پیاوی ئاوایی و خاڵی خۆی سەفەر ئاغا، داوای لێ دەکرد چیی بە چاو دیتووە بیگێڕێتەوە. هەروەها پێشی دەگوت قسەکانت بۆ حوکمەتی دەمیرقیراسیی تورکیا زۆر گرنگە.

دەستی کرد بە گێڕانەوە. تا زیاتری دەگێڕایەوە کەفوکوڵەکەی پتر دەبوو. لە سۆنگەی ئەو هەڵچوون و کەفوکوڵانەوە، وشەکان وەك لافاو لە زارییەوە هەڵدەڕژان. نوورەکان ئەمجارە لەبری ئەوەی هێندەی دوو کەس بن، بە قەدرایی سپیدارەکانیان لێ هاتبوو و لەبری ئەوەی حەوت تۆپەڵە نوور بن، ببوونە بیست و پێنج یان پەنجا تۆپەڵە. دوایی دەشتەکەی خوارروو و بناری چیای تەکەچ بە هەزاران و بە سەدان هەزار تۆپەڵەی نووری هێندەی سپیدارێك ڕووناك دەبۆوە. لە پێشەوە، گەورەمان ئاشباش ئۆغلو مەمەد ئەفەنیی خاوەن شکۆ و بە دوایدا هەزاران تۆپەڵەی ڕووناکی وەك دارستانێکی نوور، هەموو کێو و دەشت و ڕەوەز و داوێن و بنارەکانی پڕ کردبوو و بەرەو چیای تەکەچ دەخوشین و دەڕۆیشتن...

مەمی دیك وا هەژابوو کە ئەگەر لە دەستی هاتبایە، لـە بـری تاشباشـێك باسـی هـەزاران تاشباشی کردبا، بەڵام هەرچی هەبوو تاشباش هەر تاشباشێك بوو و بەژن و باڵاکـەی یـەك دوو مەتر درێژتر بۆوە.

مەمی دیك، دوای ئەوەی چیی لە دڵیدا بـوو لـە بـنی کوولەکـەی دا، پـشوویەکی کێشا. ئارەقەی کردبوو:

- بەڵێ، ئاوا بوو، مامە سەفەر. ئەمن هەمووی ئەوانەم دی... چۆن بوو؟ پێت باش بوو؟

مەمی دیك، نوقمی شادی و غروور بوو. ئەو جارەیان زۆر لە جارانی پێشووی باس کردبوو.

سەفەر ئاغاش، کوێخای مەزنی گوندەکەش مەست و سەرسوورماو، چاوی لە زارییەوە بڕیبوو.

- جوانت باس کرد. زۆرم پێ خۆش بـوو مـەمی دیکـی خـۆم، بـەڵام ئەوانـەی باسـت کـردن هیچکامیان ڕاسـت نین.

مەمی دیك پێی سەیر بوو. سەری سووڕ ما. یەکەم جـار بـوو یـەکێك لـە ئاوەدانیـدا پێـی دەگوت قسەکانی ڕاست نین.

- زۆریش ڕاستن. هەر چۆنی دیتوومە گێڕامەوە. ئەو دوو چاوەم کوێر بن ئەگەر درۆم کردبێ. بە خودا و بە پیر و پێغەمبەر بەو دوو چاوەی خۆم دیتم...

سەفەر: بێدەنگ بە. سوێندێ مەخۆ مەمی دیك، ڕۆڵە، ئـەمن خـاڵی تـۆم و زڕخـاڵی تـۆم. ئەوەی تۆ باست کرد خۆت هەڵتبەستووە، بەڵام جوانیشت هەڵبەستووە ها...

مەمی دیك سوور هەڵگەڕا. بڵێسەی لە ڕوخساری دەبۆوە:

- وەڵڵا، بیللا، هەڵمنەبەستووە. بەو دوو چاوەی خۆم دیتوومە.

سەفەر تێگەیشت ئاوا بە هیچ کوێ ناگا و ناتوانێ قایلی بکا. ڕێیەکی دیکەی گرتە بەر.

- کوڕی خۆم، ئەمن ناڵێم هەڵتبەستووە. ئەتۆ لە ئەشکەوتەکەدا خەوتبووی و خەونت دیوە. ئاگرێکیشت لە بەردەمی خۆت کردبۆوە و سەیری ئەوت کردووە و ڕووناکاییت دیـوە. لـە پـشت ئاگرەکەشەوە سێبەری دارێك هەبوو کە وەك بنیـادەم و نـوور هاتۆتـە بەرچـاوت. جـا ئـیتر وەك تاشباش هاتۆتە پێش چاوت و ئەها. ئەدی ڕۆڵە ئاوا بووە. ئەتۆ خەونت دیوە.

مەمی دیك گوتی:

- ئەمن بەتاقیشم کردەوە. بـەخۆمم گـوت نـەکا خـەون ببیـنم. نـووکی چـەقۆکەمم لـە ڕانم ڕۆکرد. جێگەکەی کزایەوە و خوێنی لێ هات. تێگەیـشتم هـەر بـە ڕاسـتی بەخەبـەرم و خـەون نابینم و ئەوەی لەبەردەمم ڕاوەستاوە، تاشباشی خاوەن شکۆمانە.

سەفەر تووڕە بوو و گوتی:
- ئەوەندە بەو سەگبابە مەڵێ ئاغا و خاوەن شکۆ.

مەمی دیك گوتی:"ئەستەغفیرۆڵڵا، ئەستەغفیرۆڵڵا" و دەستی کرد بە دووعا کردن و لەسەری ڕۆیی:

- تۆبەی بکە، تۆبەی بکە مامە سەفەر. ئەگینا زارت خوار دەبێ.

سەفەر ترسابوو:"نەکا بە ڕاستی ئەوهەتیوە شتێکی دیتبێ. نەکا هەر بە ڕاستی ئەو تاشباشە نهێنییەکی هەبێ..." و بەوجار بەخۆی گوت:"نا، نا. شتی وا لە گۆڕێ نییە. تاشباش هیچ کارەیەك نییە." بزەیەکی هاتێ:

- هیچ نابێ کوڕم مەترسە. تاشباش لێی ناوەشێتەوە وەلی و شتی وابێ. ئەو ئەوەندەی گوناح کردووە هەر مەپرسە... ئەتۆ خەونت دیتووە."

- خەونم نەدیوە. سەیر بکە، ئەوەتا جێگەی نووکی چەقۆیەکە لەسەر ڕانمە...

و دەلینگی شەلوارەکەی هەلکرد و شوێنی نووکی چەقۆیەکەی نیشانی دا:

سەفەر چاوی چووە پشتە سەری. گوڕاندی: درۆیە.

مەمی دیك بە زمانێکی نەرم و قایلکەرانەوە وەڵامی دایەوە:

- درۆ نییە. مامە سەفەر درۆ نییە. ئەمن پێت دەڵێم بەو چاوانەی خۆم دیتم. چۆن درۆیە...

سەفەر گوتی:

- درۆیە و هەزاران جاریش درۆیە.

ئەو مشتومڕ و دەمەقاڵەیەی نێوانیان هەر درێژەی هەبوو. مەمی دیك هەوڵی دەدا قایل بکا و سەفەریش دەیوست ناچاری بکا بڵێ: هیچی نەدیوە و خۆی هەڵیبەستووە یان بەخەون دیتوویەتی.

سەفەر ئاخری زانیی ئەو کارە کردەنی نییە و کوڕەتیوە* لە قسەی خۆی پاشگەز نابێتەوە. ئاخرییەکەی گوتی:

- سەیر کە ڕۆڵە گیان. قبووڵمانە، ئەوەی گوتت ڕاستە. هەر هەمووی باوەڕ دەکەین، بەڵام ئەوەی لە پێش تۆپەڵە نوورەکانەوە بوو تاشباش نەبوو، لێشی ناوەشێتەوە ئەو بێ. ئەتۆ یەکێکی

---

*کوڕەتیو: کورتکراوەی "کوڕە هەتیو" ئەوە کچان لە خۆشەویستیدا بە یارەکەیانی دەڵێن کاتێ بانگی دەکەن.

دیکەت دیتووە و وەتزانیوە ئەوە و دواییش کە بیرت کردووەتەوە تێگەیشتووی ئەوەی نووری کەسکی لێ هەڵدەستا، زیاتر لە من دەچوو. دواتریش کە جوان لێی ورد بوویەتەوە، سەیرت کردووە ئەو نە لە تاشباش دەچێ و نە لە منیش. ئەو کابرایەت تا ئێستا نەدیوە و ناشیناسی.

مەمی دیك بە لەبزێکی زیرەکانەوە و ژیرانەوە گوتی:

ـ نا، نا، مامە سەفەر، ئەو پیاوە تاشباش خۆی بوو. ئەمن بەو دوو چاوەی خۆم دیتم.

ـ تازە ئەگەر خودی تاشباشیش بووبێ، ئەتۆ دەبێ ماڵ بە ماڵ بگەڕێی و چیی من پێتی دەڵێم ئەوە بڵێی.

مەمی دیك بزەیەکی هاتێ و گوتی:

ـ ناتوانم شتی وا بڵێم مامە سەفەر. ناتوانم. ئەو تاشباش خۆی بوو.

سەفەر:

ـ چما تۆ خوشکەزای من نی؟ ئازیزی من، جەرگ و دڵی من نی؟ دەبێ وا بڵێی، بە چیت پێ دەڵێم ئەوە بە خەڵکی ئاوایی بڵێی....

مەمی دیك وەڵامی دایەوە:

ـ ئەمن ناتوانم درۆ لەگەڵ هەموو خەڵکی ئاوەدانی بکەم. ئەوجار پێم دەڵێن "درۆزن" و هەتا دەمرم بەو ناوەم بانگ دەکەن. ئیدی لە ڕووم هەڵنایە چاو لە چاوی کەس بکەم. ئەگەر ئێستا بچم و بڵێم من هەر چاوم بە نوور و شتی وا نەکەوتووە و شتی وام هەر نەدیوە و ئەو پیاوەش تاشباش نەبووە، ئەوان دەمکوژن. ئەگەر نەشمکوژن، ناهێڵن لەو گوندەدا بژیم و لەمەودوا بە سەگێکیشم دانانێن. تەنانەت دایکیشم قسەم لەگەڵ ناکا. ئەمن ئەتۆم زۆر خۆش دەوێ. تەنانەت لە بابیشمم خۆشتر دەوێی. چیت پێ خۆشە بۆتی دەکەم، بەڵام ڕووم لێ مەنێ بۆ ئەوەیان. بڕوات بێ، بەو دوو چاوەی خۆم دیتوومە. چاوم کوێر بێ ئەگەر درۆیان بکەم. ئەتۆش خۆت لە تیخی خودا و پێغەمبەر مەدە. ئەوەی بە دارستانێك نوورەوە بەرەو چیای تەکەچ دەخوشی و دەڕۆیی، ئاغامان، تاشباش ئۆغلو بوو.

سەفەر نەڕاندی:

ـ ڕاستییەکەم پێ بڵێ مەمی دیك، ڕاستییەکەم پێ بڵێ. ئەتۆ درۆیان دەکەی, ئەوجار بە نەرمییەوە گوتی:

ـ ئەگەر بێت و بڵێی خەونت دیتووە چ دەقەومێ؟ چ شتێکت لە کیس دەچێ؟ خەڵکی گوندەکەش هیچت لێ ناکەن. ڕۆڵە گیان، لەگەڵ تۆمە. ئەگەر تۆ حاشا لەو قسانەت نەکەی،

یان لانیکەم نەڵێی ئەوەی دیتووتە تاشباش نەبووە... وەجاغی کوێخا خدری، کوێر دەکەیتەوە. ئەمنیش تێدا دەچم و ئەتۆش...

ئەوجار بۆ مەمی دیکی ڕوون کردەوە کە چۆن تێدا دەچن و جووقەواریان لێ دەبڕێ و دوایی:

ـ با وای دانێین کە ئێمە تێدا چووین و هیچ گرنگیش نەبێ، بەڵام سەبارەت بە حوکمەتەکەمان، غرووری شارۆچکەکەمان و ناوە باشەکەی گوندەکەمان دەڵێی چی؟... تازە هیچ دووریش نییە کە بێن و هەر هەموومان بەرنە بەندیخانە...

بۆ مەمی دیکی باس کرد کە حوکمەت لە جێدا دژی ئەو فرتوفێڵانەیە و جگە لەوەش جارێکیان لە ڕابردووشدا، هەموو خەڵکەکەی یەکێك لە گوندەکانی چوکووراوا بە ژن و منداڵیانەوە، ماوەی پێنج ساڵان، خرابوونە بەندیخانەوە هەر لەبەر ئەوەی فریوی خوانەناسێکی وەك تاشباشیان خواردبوو.

ـ کورتی ببڕینەوە مەمی دیك، خەڵکی ئاوەدانی دوای ئەو حەقایەتە هەڵبەستراوەی تۆ، شێت و شەیدای تاشباش بوونە. ئەگەر بەڵایەك بە سەر ئەو گوندە بێ و ئەگەر تاشباش لە سێدارە بدرێ، هەر هەمووی ئەوانە لەسەر ئەو حەقایەتە درۆیینەی تۆن و دەکەونە ئەستۆی تۆ. لەوانەیە حوکمەتیش خاکی ئەو گوندە بە توورەکە بکێشێ و بە مەرەدی گوندەکەی چوکووراوامان بەرێ. هەر هەمووشی لەسەر تۆ... هەتا دەرفەت هەیە بڵێ درۆت کردووە، دەنا بڵێ خەونت دیتووە با هەم گوندییەکان نەجات بدەی و هەمیش سەری تاشباش بە پەتەوە نەکەی.

مەمی دیك وەك پیاوان، بەمتمانە بەخۆییەوە و بە دڵنیاییەوە گوتی:

ـ، بەڵام ئەمن بەو دوو چاوەی خۆم دیتم. ئەوەی لە پێش دارستانێك نوورەوە بوو، ئاغاکەمان تاشباش ئەفەنی بوو.

سەفەر وردە وردە تووڕەتر دەبوو. لە پێشدا هەڕەشەی ئەوەی کرد و گوتی: لە زیندانێدا دەبزرێنێ، هەر لەبەر ئەوەی گوندییەکان ڕزگار بکا، و چونکە تاشباشی لیقەوماویش لەو نێوەدا هیچ تاوانێکی نییە، دەبێ ئەویش ڕزگار بکرێ. خودا هەڵناگرێ، دەی چ دەبوو ئەگەر لە پێناوی خەڵکی شارۆچکە و گوندێکدا، کوڕەتیوێکی چلمنەی وەك مەمی دیك لە بەندیخانەدا برزێ. هەرچەندە کوێخا کزەی لە جەرگی دەهات لەوەی یەکێك لە خزمەکانی خۆی بخرێتە بەندیخانەوە و ئاوری لە هەناوی بەردەبوو، بەڵام چاری نەبوو:

ـ دەی ڕۆڵەم مەمی دیك، ئێستا دەڵێی چی؟ ئاخۆ ناتەوێ گوندەکە و شارۆچکە و شەرەف و ئابڕووی ناوچەی تۆرووس ڕزگار بکەی؟

- مەمی دیك گوتی:

- بۆخۆم بەو چاوانەی خۆم دیتم. بەخوای درۆم پێ ناکرێ. خەونیشم نەدیوە.

دیسان برینەکەی کردەوە و نیشانی دانەوە:

- ئەوەش بەڵگە، کە خەونم نەدیوە...

سەفەر لە دین دەهری بوو و دەستی کرد بە جنێودان و قسەی سارد و سووك. ئەوجارە هەڕەشەی کوشتنی لێ کرد و لێی پرسی، چما دایکی هەر ئەو کوڕەی نییە، ئەی چۆن قایل دەبێ لە خۆڕایی بمرێ؟

مەمی دیك بە زمانی یەکێکی کە بیری لە هەموو شتێك کردبێتەوە گوتی:

- ناتوانم. ئەمن قەت قەت ناتوانم قسەی وا بکەم. تەنانەت ئەگەر سەریشم تێدا بچێ.... هەر ئەوەیە کە گوتم.

سەفەر دەستی کرد بە پاڕانەوە. دەپاڕایەوە و دەلالایەوە و مەمی دیکی دەبردە ئاسمان. ئاخرییەکەی گوتی:

- ئەتۆ هێشتا گەنجی. ئەمن شتێك لە تەمەنم نەماوە. ئەتۆ لەجێی کوڕی منی. ئەوە سەفەر هانای بۆت هێناوە. مەمی دیك. مامە سەفەرت بەری پێت ماچ دەکا. وای دانێ بابتی کوشتووە و خۆی لە ماڵت هاویشتووە. نەکەی مەمی دیك کاری کردنێ نییە. هەرچی دەتەوێ بۆتی دەکەم. چیت بوێ دەتدەمێ.

مەمی دیك تەنیا بە یەك وشە جوابی دەدایەوە:

- ناتوانم.

ئەو هەتیوە بستە بالایە، دەیتوانی بە یەك وشە ژیانی ئەو ڕزگار بکا، بەلام سەگبابە ملی بادەدا. چما چ دەبوو. گوندییەکان دەیانتوانی چی لێ بکەن؟ پێ دەگوت:" مەترسە. لە گوندییان مەترسە. تەنانەت لە ئیزرائیلیش مەترسە چونکە مامە سەفەرت وەك کێو لە پشتتە."

دوایی تەماحی وەبەر دەنا. گوتی ئامادەیە ژنی بۆ بێنێ، ماڵ و حاڵیشی بۆ پێکەوە بنێ. تەنانەت وای لێ هات گوتی: ئامادەیە کوێخایەتییەکەشی بەو بسپێرێ.

بەلام مەمی دیك دیسانیش گوتی:

- ناتوانم.

کوێخا ئارا و قارای لێ بڕابوو. چیی فرتوفێڵە دەکاری کرد، بەلام بێ سوود بوو بە گوێیدا نەدەچوو.

سەفەر زانیی ئەو هەتیوە بە زمانی خۆش حاڵی نابێ:

- ڕۆڵە گیان مەمی دیك، دوایی ئەوەی دیوتە لە چاوی خۆتت دیوە. ئەوەت قەت بیستووە؟ دەتکوژن و کەلاکەکەت فڕێ دەدەن. جوابی ئەحە، پەحەیە. ئەو قسە بەجێیەشت بیستووە؟ خوێن بە خوێن دەشۆنەوە. ئەوەش قسەیەکی ماقووڵە، بیستووتە؟ دەرزییەك بکە بە خۆتا و سووژنێك لە خەڵکی ڕۆبکە. ئەوەش لەو قسە باشانەیە، بیستووتە؟

مەمی دیك سەری داخستبوو و هیچ هەستێك لە ڕوخساریدا بەدی نەدەکرا. بەبێ ئەوەی جووڵەیەك بکا گوێی دابوو قسەکانی سەفەر. سەفەریش لە تووڕەییان دەست و پێی دەلەرزین و بەخۆی دەگوت، ژیانی گەورە پیاوێك بە دەستی ئەو گونە گیسکە چڵمنەوەیە و بەو دوو قسەیەوە بەستراوەتەوە کە لە لە زارییەوە بێتە دەرێ. ئەویش بە چەقی لەعنەتدا چووە و هیچ ناڵێ. ئێستاش هەڵیدەگرێتەوە. هەرای کرد:

- عومەر!

مەمی دیك لەو تووڕەیی و نەفرەتە ترسا کە لە دەنگی ئەودا بوو. کرووشمەی کرد و سەری هەڵێنا و بە بێهیواییەوە سەیری ڕوخساری کرد.

- فەرموو گەورەم.

- عومەر، بەو برایەمان، مەمی دیك، حازر نەبوو بۆ ڕزگارکردنی بنەماڵەکەی مەزنی کوێخا خدر و گیانی من و تۆ و گیانی خۆی و هەروەها گیانی هەموو خەڵکی ئاوەدانی، دوو قسەی حیسابی بکا. ئەو برایەمان، مەمی دیك، خزم و کەسی نزیکی تۆیە. تەنگۆ هاو تەمەنن. باشتر لە زمانی یەکتری تێ دەگەن. مەمی دیك هەڵگرە و بیبە بچۆ ژوورەکەی خوارێ و لەوێ قسان بکەن، بەڵام هیچ نامەوێ هات و هەرا و تێهەڵدانی تێدابێ. بە تایبەتی بە بێ قرە و هەرا. دانیشتن و جوان و زەریف قسان بکەن.

و ئاماژەیەکی بە عومەریش کرد.

عومەر چووە دەرێ و بە تێلایەکی گەورەی دار بەڕووەوە گەڕایەوە. بە تووڕەییەوە پیلی مەمی دیکی گرت و گوتی:

- هەستە وەپێشم کەوە بزانم.

لە تەنیشت ئاگردانەکە ڕایکێشا و هەڵیگرت: چەند قسەیەکم پێتە، پوورزا.

مەمی دیك، بە دیتنی تێلاکەی دەستی عومەر و تووڕەبوونەکەی، دووقڕانییەکەی کەوت و زانیی چ باسە. چاوی لە چاوی سەفەر بڕیبوو و چاوەڕوانی یارمەتییەك بوو.

عومەر هەر وا کە بەرەو ژوورەکەی خوارەوە دەیکێشا، لە بن لێوییەوە جنێویشی دەدایە. مەمی دیك هێشتا هەر چاوی لە سەفەر بوو و چاوەڕوانی ڕێگەی دەربازبوونێك بوو. کە گەیشتنە بەر دەرگای ژوورەکە، عومەر پاڵێکی وای پێوە نا، مەمی دیك، لە نێوەڕاستی ژوورەکە وەعەرزی کەوت. عومەر بە لەسەرەخۆییەوە لێی چووە پێشێ و هەڵیستاندەوە و پەڕۆیەکی لە گیرفانی هێنایە دەرێ و لە زاری ئاخنی. مەمی دیك هیچ جووڵەیەکی نەکرد و بە پەڕۆیەکەی نێو زارییەوە، لە نێوەڕاستی ژوورەکەدا مایەوە.

عومەر پشوویەکی قووڵی هەڵکێشا و تا هێزی لەبەردا بوو دارێکی لە پشتی مەمی دیك ڕاکێشا. مەمی دیك بەرەو دەم وەعەرزی کەوت. عومەر پەیتا پەیتا سینگی دەردەپەڕاند و پشووی لێ تازە دەکردەوە و بە هەموو هێز و توانای خۆی دارەکەی لێ ڕادەکێشا. تا زیاتری لێ دەدا، تووڕەتر دەبوو و تا تووڕەتر دەبوو، پتری لێ دەدا. ئێستا ئیتر لەسەر یەك لێی ڕادەکێشا. وای لێدەدا دارەکەی نەدەبینرا.

مەمی دیك دەینووزاند. نەیدەتوانی پەڕۆیەکەی زاری بێنێتە دەرێ. دەنگی لە دەنگی بنیادەمێك دەچوو کە خەریکە دەخنکێ.

عومەر دارەکەی دانا و دەستی کرد بە پێلەقە لێدان، بەڵام دڵی بەوەش دانەکەوت و دیسان دارەکەی هەڵگرتەوە، ئەوەندەی لێدا تا مەمی دیك نووزەی لێ بڕا. عومەر ڕاوەستا و گوتی:

ـ مرد، با بمرێ. دەیبەم و فڕێی دەدەمە نێو ئەشکەوتی پەرییانەوە. کەسیش نازانێ.

کە پەڕۆیەکەی لە زاری دەرهێنا، مەمی دیك چاوی هەڵپچڕی و نیگای کز و پڕ لە پرسیاری لە عومەر بڕی و ئەوجار تێگەیشت. گیانی وا دەبرژایەوە کە بە حاڵەحاڵ دەستی کردەوە بە نووزاندن، بەڵام بە هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی هەستێتەوە. عومەر گرتی و خێرا هەڵیستاند و داینیشاند. مەمی دیك خۆی پێ نەگیرا و کەوتەوە سەر عەرزەکە. عومەر ئەوجارەش هەڵیستاندەوە و پشتی بە دیوارەکەوە نا و ئاوا ڕایگرت.

ـ دەی بڵێ بزانم. نوورەکان خەون و خەیاڵ بوون یان ڕاستەقینە؟ لە دەست من ڕزگاریت نایە. تاشباش خەون بوو یان ڕاستی؟

مەمی دیك بە چاوی بەتاڵ و نیوەزیندووەوە سەری دەکرد. هەر دەتگوت سەیریشی ناکا. نیگای لە نیگای کوێران دەچوو.

ـ خەون بوو یان ڕاستەقینە؟

مەمی دیك هیچ نەدەجوولا.

- تووتکە سەگ قسە بکە. خەون بوو یان ڕاستەقینە؟

مەمی دیك وەك مردووان متەقی لێوە نەدەهات.

- هەتیوە، دایکی خۆم گابێ، ناهێڵم بە زیندوویی لەو ماڵە بڕۆیە دەرێ. دەی بڵێ، خەون بوو یان ڕاستەقینە؟

متەق لە دار و بەرد دەهات لە مەمی دیکەوە نەدەهات.

- کوڕە، برالە، پوورزا گیان، تۆ هەر ناتەوێ هیچ قسە بکەی. بڕێك بەر لە ئێستا درۆیەکت بەسەر یەکەوە دەنا و دەتویست ماڵەکەی ئێمە وێران بکەی، لێمان ببوویتە بولبول. ئێستاش دەی قسە بکە دەی پوورزا گیان. تۆ خوداکەت قسە بکە. دەست و لاقت ماچ دەکەم قسە بکە دەنا دەتکوژم. دەتکوژم کەلاکەکەت فڕێ دەدەمە نێو ئەشکەوتی پەرییانەوە. یاڵڵا دەی برا، یاڵڵا پوورزا جوانەکەم. یاڵڵا پاڵەوان. قسە بکە. هەر هەمووی یەك وشەیە و تەواو... دەچی و بە گوندییەکان دەڵێی خەونم دیتبوو، لە خەیاڵمدا بوو و پێموابوو ڕاستییە. ئەو کات تاشباش ئۆغڵو بە گوندییەکان دەڵێ ئەو هەتیوە شێتە خەونی دیتووە. ئەمن لە ماڵەکەی خۆم خەوتبووم و پرخەی خەوم دەهات. ئاوا ئەتۆش بە درۆزن دەرناچی... دەی یاڵڵا دەی. قسە بکە ڕۆڵە. قسە بکە سەگباب. قسە بکە تووتکە سەگ. سەیر کە قەڵافەتت وەك سەگی گڕوێی لێ هاتووە. وەك سەیەکی گڕوێ کە کلکی لەگەڵۆزی نابێ. لە ترسانا هەڵدەلەرزی. یاڵڵا دەی برالە، قسە بکە. کوڕە بەنۆکەرت بم قسە بکە. تەنیا یەك وشە بڵێ و تەواو. خۆ نامری دەی. هەر بەو وشەیەی لە زاری تۆوە دێتە دەرێ، بنەماڵەی گەورە ماڵی کوێخا خدر ڕزگاریی دەبێ. درۆشت نەکردووە، چما مرۆڤ خەون نابینێ؟ هەتیوە درۆزنانییە. هەتیوە فێڵبازە خۆهەڵکێشەکە. ئاخر چۆن شتی وا دەبێ دارستانێك لە نوور بە دوای بنیادەمێکدا بخشێ و لەو بەفر و بارنەدا بە دوای ئەودا بەرەو لووتکەی چیاکان بخوشێ؟

- قسە ناکەی؟ ها؟ ناتەوێ قسە بکەی. ئەمنیش دەتکوژم برالە و پێستت هەڵدەقەنم و کای تێداخنم. لەتوپەتت دەکەم کوڕی باش، پوورزا گیان. ئەتۆ باشم دەناسی. بۆ وێنە چ دەبێ ئەگەر یەك قسە بکەی؟ ئێستا مامە سەفەرت لەو ژوورەی دیکەوە پێت وایە سەبارەت بە من چۆن بیر دەکاتەوە؟ دەڵێ ئەو نەیتوانی تەنانەت مەمی دیکیش وەقسە بێنێ. ئەوەیە ئەمن دەبێ بتنێژنم تۆ ئەوەی کاتێك لە ژوورەکە دەچمە دەرەوە، دەبێ پێی بڵێم نەمتوانی قسەی لە زاری دەرکێشم، بەڵام ئەوە سەریم هێناوە بۆت، فەرموو.

لە ناکاو هەمموو گیانی مەمی دیك کەوتە لەرزین. شەویلکەی هەڵنەدەپچڕا.

- زارت ناکرێتەوە برالە؟ زارت ناکرێتەوە. دەتەوێ چۆرێکت ئاو بدەمێ؟

## ٣١

ساجێکیان لەسەر ئاگردانەکە داناوە. ماڵەکە پڕە لە دووکەڵ. سێ ژن دانیشتوون لەسەر پنە ئەنگوتکەکان پان دەکەنەوە. ئەوی دیکەش بە ڕفێدەوەی دەدا و دەیخاتە سەر ساجەکە، چاویان لەبەر دووکەڵ پڕ بووە لە ئاو. لە بن ساجەکەوە، بڵێسە و دووکەڵ دێنە دەرێ. بۆنی نان و ئاردی سووتاو ماڵەکەی پڕ کردووە. هەر لە دوورەوە بەو بۆنەڕا دەزانی لە ماڵێك نان دەکرێ. ماڵەکە ئەمڕۆ دەڵێی ماڵی بووکێیە. دەست و دەموچاوی ژنەکان هەمووی ئاردا‌وییە.

سەفەر ئەمڕۆ درەنگ لە خەوێ هەستا. لە مێژ بوو ئاوا درەنگ هەڵنەستابوو. دیار بوو دوێ شەوێ هەر نەنووستووە. دەورووبەری چاوەکانی هەڵمسابوون و دەموچاویشی دەتگوت ئەستوور بووە.

هەوا خۆشی کردبۆوە. سەفەر لە ماڵەکەی هاتە دەرێ و دەموچاوی شووشت و لە حاڵێکدا بە خاولییەکەی دەست و دەموچاوی وشك دەکردەوە گەڕایەوە ژوورێ. دووکەڵەکەی ژوورێ چاوی کزاندەوە.

ـ هەی گووی سەگ بە گۆڕی بابتان. کوڕە پیاو نازانێ ڕۆژی نانکردنێ، ڕوو لە کوێ بکا.

بێ ئۆقرە بوو. نەیدەزانی چ بکا و ڕوو لە کوێ بکا. ئەو مەمی دیکە ببووە هۆی ئەوەی هەموو هیوا و ئاواتەکانی بەبادا بڕۆن و شادییەکانی ببنە خەم و خەفەت. ئیتر تاشباش ببووە پیاوچاك و وەلی. تازە مەرگیش نەیدەتوانی لەو پلە و پایەیەی بخا و وەك بڵێسەیەکی پیرۆز هەتا ڕۆژی قیامەتێ هەر دابیسا.

شەپۆلێکی ئێرەیی لە دڵی سەفەر گەڕا و بەخۆی گوت: بازی پادشایەتی ئاوا لەسەر شانی پیاو دەنیشێ:

"لە زۆربەی گوندەکانی تۆرووسدا، چ لە سەردەمی شەڕەکانی سەربەخۆیی خوازیدا و پێشتریش، لە سەردەمی شەڕی گەڵ یۆنانییەکان و لە کاتی گرانی و قاتی و قڕییەکەی هێرشی

کوللەکەشدا، هەر گوندەی یەك دوو وەلی و پیاوچاکی لێ هەلکەوتبوو، بەلاّم تا ئێستا لە گوندی یالاکدا شتی وا نەببوو. ئەگەر لەو سەردەمدا تەنانەت ئەحە شێتیش هەبوایە، بە دلّنیاییەوە دەیانکردە وەلی. بە دلّنیاییەوە وایان دەکرد، بەلاّم ئێستا کەس نازانێ بۆچی "شێتە"یان هەلّنەبژارد و بەو تاشباشەوە نووسان؟ ئەحە شێتۆکەی نیوەرووت بەو ڕوخسارە تاوەسووت و سەرمابردووەیەوە، بەو جەستە تۆکمە و بەهێزەیەوە و بەو چاوە درشت و ڕەش و خەفەتبار و سیحراوییانەیەوە و بەو ڕدێنە لوول لوول و خورمایەیەوە، لە هەموو کەس بۆ کاری ئاوا باشتر بوو. کەس نازانێ ئەو تاشباشە لە کوێوە قوت بۆوە.

"ئەو هەمووە سالّە، لە شەڕ و گرانی و قاتوقڕیدا ئەو گوندە وەلی و پیاوچاکی لێ هەلّنەکەوت. چما ئێستا چ بووە؟ ئەو مەسەلەیەی مەمی دیك ئەوەندەش سانا و ساکار نییە. ئامادە بوو گیانی خۆی دابنێ و بە خۆشحالّییەوە مەرگ قبوولّ بکا، بەلاّم ئامادە نەبوو لە قسەکەی خۆی پاشگەز بێتەوە و خەیانەت لە تاشباش بکا. لە چاوەکانیڕا دیار بوو درۆیان دەکا. تەواو دیار و ڕوون بوو کە بۆخۆی ئەو چیرۆکی دارستانی نوورەی هەلّبەستووەو و دواییش خۆی بڕوای پێ هێناوە. لە پێشدا حەوت تۆپەلّی نوور بە دوای تاشباشەوە بوو، دوایی بوو بە بیست و پێنج تۆپەلّە نوور... و دواتر دارستانێکی نوور... هەموو جارێك کە مەمی دیك چیرۆکەکەی دەگێڕایەوە. ژمارەی تۆپەلّە نوورەکانی زیاتر دەبوون. شوکری دەنگی نووسا و ئیتر وا بە سادەیی مەمی دیك ناتوانێ زار هەلّپچڕێ، ئەگینا خودا بە نەسیبی کەسی نەکا... هەموو ڕۆژێ نوورەکانی پشت سەری ئەو تاشباشە زیاتر و پتر دەبوون و زەوی و ئاسمانی پڕ دەکرد.

"ئەرێ باشە هەر بە ڕاستی مەمی دیك گوتبای درۆم کرد، چ دەقەوما؟ هەر ئەو قسەیە بەس بوو بۆ ئەوەی تاشباش تێدا بچێ. "لەوانەشە مەمی دیك ئامادە بووبێ وا بلّێ، بەلاّم ئێمە لە ڕێگەکەیان نەدەزانی. ئەگەر کەوتبایەتە دەستی سەربازەکەی بنکەی پۆلیس، ئەو زۆر باش دەیزانی چۆن وەزمانی بێنێ. ئەو کات مەمی دیك دەهات و لە نێوەڕاستی ئاوایی هاواری دەکرد و دەیگوت:"درۆم کرد، درۆم کرد".

"ئەی لەو بەختە سەگ تێڕیاوەی من. لەو کارەدا هەرچی هەیە دژی منە. هادیل و گوندی و تەنانەت خزم و کەسەکەی خۆیشم. هەر لە مێروولەی سەر زەوییەوە بگرە هەتا مەل و بالّندەکانی ئاسمان و ماسییەکانی دەریاش. هەر هەموویان دەستیان داوەتە دەستی یەکتری و دەیانەوێ لە بەر پێی تاشباشدا بە چۆکمدا بێنن و ئابڕووم بەرن. کوڕە خۆ بنیادەم ئەقلّی

ئەفلاتوون و تین و هێزی ڕۆستەم و زیرەکییەکەی عیسمەت پاشاشی هەبێن هەر دەرەقەت نایە و دەرەقەتیشی بێ ئاوای بەسەر دێ.

بە ڕاستی ئەو مەمی دیکە گوناحی چ بوو کە ئەو بەلایەی بەسەر هێنابوو؟ باشە ئەو منداڵەی بۆ دابووەوە دەستی ئەو عومەرە شێتە کە ئاوا لە مردنێی بکا؟ ئێستا ئەوە کچەکەی قیرسمایل لە ژوورەکەی خوارەوە برینەکانی بۆ دەسڕییەوە. سەفەر چووە ئەو ژوورەی مەمی دیک لەوێ نوستبوو. کچەکەی قیر سمایل لە ژوور سەری دانیشتبوو و دەسرەیەکی تەڕی لە سەر نێوچاوانی دادەنا. سەفەری پرسیی:

- ژنەکە، هیچ چاوی هەڵێناوە؟

کچەکەی قیر سمایل بە خەمبارییەوە وەڵامی دایەوە:

- چاوەکانی هەلێنا و تەنانەت قسەشی کرد..، بەڵام خەریکە گڕ بگرێ. داوای ئاوی کرد، ئاوم دایێ. نامرێ.

- چ بکەم خەتای خۆی بوو. گووی خۆیەتی با بیشێلێ. ئەگەر مردیش با بمرێ چش.

"ئەو حەقایەتە مەمی دیکیش سازی نەکردبا، یەکێکی دیکە هەڵیدەبەست. خەڵك بە شوێن ئەو ئۆین و حەقایەتانەوەن. حەزیان لێیە حەقایەتی ئاوا هەڵبەستن و دواییش بۆخۆیان بڕوای پێ بکەن و ئەوجار وەك سەرخۆشان بۆ خەڵکی بگێڕنەوە و هەوڵ بدەن خەڵکیش بڕوا بەو بەسەرهاتە بکەن. بڵێین چی. بنیادەم خەیاڵ پڵاوی زۆر. خودا پێستی سەری ئەو خەڵك و کەسوکارە بە نەحلەت بکا.

"ئەو داماوە، بەزەییم پێیدا دێتەوە، بەڵام دەی، دەبوو بیلێ. دەبوو بۆ ڕزگارکردنی گیانی گوندێك و مرۆڤێك ئەویش بڕێك ویژدانی هەبوایە. لەسەر نووکی زمانی بوو. ئەی بۆ نەیگوت؟ ئەگەر گوتبای چ دەبوو؟ چیی لێ کەم دەبۆوە؟ تووتکە سەگە، لێی گەڕێ با بمرێ و هەروەها جەحەندەمیشی لێ پڕ بێ.

"ئەمڕۆ هەوا خۆشە. لەوانەشە ئەندامەکانی ئەنجوومەنی ئاوایی کە چوونەتە شار، بگەڕێنەوە. لەو چەند ڕۆژەدا هەواوبانێکی قوڕ و بێتامی هەبوو. تەنانەت بەپێی خۆتت نەدەدی. هەموو شتێك تەنانەت کەش و هەواکەش دژی من لەگەڵ تاشباش کلکی تێکەئاڵاندبوو. هەر بە ڕاستی نەکا ئەو کابرایە وەلی بێ.

"خۆ ئەگەر هەوا خۆش بوایە، ئەوانەی چوونەتە شاری، ئێستا لە مێژبوو گەڕابوونەوە. ئەوانە چ بنیادەمێکن. تەنانەت دنیاش خرا بێ و نەتوانی دوو قولانج ئەولای خۆت و بەرپێت

ببینی، که دەزانی گیانی نەفەرێك بە هەواڵێکەوە بەستراوەتەوە، بنیادەم دەبێ چیی لە دەستی دێ بیکا و ئەو خەبەرە بگەیێنێ. قەیناکا، مشوورێکیان دەخۆم.

چۆوە ژوورەکەی دیکە. هەر چووبایەتە سەر جێوبانەکەی دەمودەست خەوی لێ دەکەوت. شتێك لە دڵیدا ئازاری دەدا، شتێك کە وردە وردە قورگی دەگوشی. لە شتێکی نادیار و نەبەدی دەترسا. ترسێکی نامۆ وردە وردە ناخی دەتەنییەوە. ژەهرەکەی تێکەڵی خوێنی دەبوو و هەتا ناخی گیانی ڕۆدەچوو.

لە ناکاو وەخۆ هاتەوە. ئاخۆ هەر بە ڕاستی ئاوا لە تاشباش تۆقیبوو؟ شەرمی دەکرد پرسیارێکی ئاوا لە خۆی بکا. ئەگەر ئەوانەی چوونەتە شاری، ئێستا بە خەبەری خۆشەوە گەڕابانەوە، لەوانەبوو بکرێ پێشی تاشباش بگری. کوڕە کەس لەو گوندییانە تێناگا. هیچ دوور نەبوو عادیل بێ و لەگەڵیان ڕووی خۆش بێ و بۆ بەیانی هەموو گوندییەکان گاڵتە و قەشمەری بە تاشباش و چیرۆکەکانی مەمی دیك بکەن. ئەو فکرە برێك ئەهوەنی کردەوە و ئۆخژنێکی هاتێ:

"ئای بۆ ئەو ڕۆژانەی ڕۆیشتن، ئاخ، ئەو شانس و بەختە بۆ کوێ چوو؟"

دیسان لە تاریکایی بێهیواییدا نوقم بۆوە. نە عادیل دەهات و نە گوندییەکانیش پشتیان لە تاشباش دەکرد.

"ئەو ژنانەش زیاد لە هەموو ڕۆژێك ئەمڕۆ نانی دەکەن. کوڕە خۆ پیاو ناتوانێ تاوێك لە ماڵەکەی خۆی دانیشێ. دووکەڵ پیاو شێت دەکا."

وەدەر کەوت و لە بەربەڕۆچکەکە دانیشت. سەری داخست و خەیاڵ هەڵیگرت. بیری لە ئاقیبەتی کارەکەی خۆی دەکردەوە. باشە ئەگەر کەوتبایەتە چنگی تاشباش، ئاخۆ تاشباش بەزەیی پێیدا دەهاتەوە؟ مەحاڵ بوو، بەڵام بڵێی و نەڵێی تاشباش پیاوێکی باشە. بەڵێ، بەڵام ئەگەر فریشتەش بێ، چما دەکرێ کەڵك لەو هێز و دەسەڵاتە وەرنەگرێ کە جوای حەوت ساڵ هەوڵ و تێکۆشان بەدەستی هێناوە؟

لە حاڵێکدا هەر جارەو جۆرێك بیری لە تاشباش دەکردەوە و جارێك بە پیاوێکی باشی دادەنا و جارێکیش بە یەکێکی نارەسەن و بێبەزەیی، لە ناکاو شتێك بە مێشکیدا هات. سەری بەرز کردەوە و سەیری پێش خۆی کرد. بڕوای نەدەکرد. هەستایە سەر پێ. بەلادا هات. خەریك بوو لە خۆشیان پشووی سوار بێ. ئەندامەکانی ئەنجوومەنی ئاوایی کە چووبوونە شاری، لە بەردەمی ڕاوەستابوون. بە ڕوویەکی گەش و هیوادارانەوە پێدەکەنین. سەفەر ئامبازیان بوو و بە هاوار هاواری گوتی:

- پێویست ناکا داوای لێبوردن بکەن. دەزانم بۆچی زۆر ماتڵ بوون. دەی باشە، پێم بڵێن شێرن یان ڕێوی؟

هەناسەبڕکێی بوو.

زەکەریا گوتی: خەبەرەکان خۆشن. زۆریش خۆش.

جا گوتی:

- لە هەموو قەرزەکانی ئەمساڵمان خۆش بوون و تۆ لە گوندەکەدا وەکیلی عادیل ئەفەنیی. لەمەودوا گوندییەکان بۆیان هەیە بچنە شاری و چیی حەزیان لێیە بیکڕن. تەنانەت ئەگەر حەزیان لێ بێ، عادیل قەرزیشیان دەداتێ.

عایل گوتی"ئەو دووکانانە و هەرچی هەمە، ئی سەفەر ئەفەنین و ئەمن خاوەن ماڵ نیم، ئی گوندییەکانی یالاکە. جا وەرە سەیری بکە.

ئەو پرێسکەیەی بە کۆڵییەوە بوو، داینا و کردییەوە و گوتی:

- ئێمە هەرچی ویستمان کڕیومانە.

سەفەر چاوی بڕییە ئەو قۆماش و چیت و پەڕۆیانەی لە پرێسکەکەدا بوون. هەرچی پتر سەیری دەکردن، زیاتر ڕەنگی دەبزرکا. لێوەکانی کەوتنە لەرینەوە و گوتی:

- خوایە هەزار جار شوکر، هەزار و هەزار جار شوکر. هیچ هیوایەکم نەبوو کە ئەو ڕۆژە بە چاو ببینم و دڵم ڕوون بێتەوە.

ئەندامەکانی ئەنجوومەنی ئاوایی کە لە شارییەوە گەڕابوونەوە، وەك ئەو پاڵیان بە دیوارەکەوە دابوو و سەریان خستبووە ناو لەپی دەستیانەوە.

دوای چەند ساتێك سەفەر وەك فیشەکە شێتە دەرپەڕی و چۆوە ژووری و چووە ئەو ژوورەی مەمی دیکی تێدا نوستبوو. بەسەر مەمی دیکدا نوشتایە و بە مێهرەبانییەوە دەستی لە سەر نێوچەوانی دانا و گوتی:

- ڕۆڵە، مەمی دیك گیان، ئەتۆ هیچت نییە. "تا"شت لێ نییە. هەستە چاك بوویەتەوە. لێت دەگەڕێم بڕۆی. ئەگەر ئەو سەگبابە لە ماڵەکەی مندا تۆزێکی ئازار داوی، من داوای لێبووردنت لێ دەکەم. ئەمن نەمزانی. ئەتۆش زۆر لاساریت کرد، بەڵام قەیناکا. جا ئێستا جوان گوێ بدەیە بزانە دەڵێم چی. هەر ئێستا هەستە و بچۆ لە نێو ئاواییدا هەزاران درۆ هەڵبەستە و بڵێ تاشباشم لەسەر لووتکەی چیای تەکەچ و هەموو کێوەکانی تۆرووس دیتووە کە حەفتاهەزار هەتاویشی بە شوێن کەوتبوو. هەمووی ئەوانە بڵێ و دڵنیاش بە ئەو

قسانە پوولێکی سووتاو ناکەن. یالڵا دەی بەخێر هاتی. برۆ و چیت حەز لێیە بیلێ. بە دوو قسان دەتتوانی هەم گوندەکە و هەمیش شارەکەش ڕزگار بکەیت. نامەردیت کرد، بەڵام ئێستا ئیتر کەس ئاتاجی تۆ نییە. بالڵا دەی ملت بشکێنە. برۆ بەغدا نیوەی ڕێگات بێ.

ئاوڕی لە ژنەکەی دایەوە و گوتی:

ـ لێی گەڕێ با جلەکانی لەبەر بکاتەوە و خێرا لێرە بڕوا. پێی بلێ شانسی بوو، ئەگینا ئەگەر ئەو هەواڵەی ئێستا هاتووە نەهاتبا، من نەمدەتوانی لە چنگی عومەر نەجاتی بدەم... بلێ با بچێتەوە لای دایکی.

ئەندامەکانی ئەنجوومەنی ئاوایی هەر وا لە تەنیشت دیوارەکە هەڵترووشکابوون. سەفەر گەڕایەوە لایان و دەستی پێ کرد:

ـ برادەرینە، ئەو مزگێنییەی هێناوتانە، گەورەترین مزگێنییە. هەتا دنیا دنیایە، و هەروەها لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە تا ئێستا مزگێنیی ئاوا بە هیچ ئادەمیزادێك نەدراوە. ئەگەر بە یەکێکی کە لە بن سێدارەیە، بڵێن ئەتۆ بەخشراوی و لێت خۆش بوون و لەدار نادرێی، هێندەی من دڵی خۆش نابێ. خودا عەمرتان درێژ بکا، بەڵام هاوڕێیان، برێك لێتان دڵمەندم. بنیادەم کاتێك هەواڵێکی ئاوای پێیە، چۆن دەبێ هەر ئەو شەوە، بە هەر ڕێیەکدا بێ، نەیگەیێنێتەوە سەفەرەکەی خۆی؟

زەکەریا گوتی:

ـ، بەڵام ئاخر، بەفر ڕێ و بانی گرتبوو. لەو بەفر و بۆرانەدا چاو چاوی نەدەدی. ئەمن سێ جاران کەوتمە ڕێ. دەمویست هەرچی زووتر خەبەر و ڕووداوەکان بگەیێنمەوە سەفەرئاغاکەی خۆم. سێ جاران هەتا قورقوڕۆچکەم لە بەفر هەڵچەقیم. ئاخرین جار چیی وای نەمابوو تێدا بچم، بەڵام نەجاتیان دام. ئەتۆ حەقتە، بەڵام دەبێ لێمان خۆش بی. باڵندەی ئاسمانانیش نەیدەتوانی ئەو مزگێنییەت بۆ بێنێ، ئەویش مزگێنییەکی ئاوا گەورە.

سەفەر:

ـ گرنگ نییە. بە دوای چوواندا مەچن. ئێستا دەێ خێرا و زۆر بەجێ و ڕێ خەڵکی لێ ئاگادار بکەینەوە. پێویستە بە تێر و تەسەلی و زۆر بەباشی پێیان بگوترێ.

زەکەریا گوتی ڕاستە، فەرمایشتەکەت بەجێیە و دەبێ هەر وا بێ.

سەفەر:

ــ زۆر پەلەی بکەن و گوێم لێ بگرن. ئەو کارە میوانداریـیەکی گەورەی پێویستە. گوندییەکان بێت و ببیستنەوە لە خۆشیانا شێت دەبن. هەموو هەوڵەکانی ئاشباش بە فیڕۆ چوو

و ڕیسەکەی لێ بۆوە بە خوری. هەر بە ڕاستی بیستووتانە تاشباش بە ڕاشکاوی ڕایگەیاندووە کە وەلی و پیاوی خودایە؟ جا ئێستا خۆی دەبینێتەوە. پێی دەسەلمێنم و نیشانی دەدەم پیاوچاکبوون یانی چی؟ گوێرەکەیەکم کردووەتە نەزر بۆ ئەو میوانییە. هەر کام لە ئێوەش دەبێ بزنێك دابنێن. ئەوە قوربانیی ئێمەیە لە ڕێگەی خوادا کە ئێمەی لەو بەلا و نەهامەتییە گەورەیە نەجات دا. ئەوجار گوندییەکانی ئێمەش زگێکی باش تێر دەخۆن. جارێ ئێوە هیچ بە گوندییەکان مەڵێن. تەنیا ژنان و خزم و کەسەکان بنێرنە نێو دێ بۆ ئەوەی کارێکی وا بکەن خەڵکەکە تاسەباری بیستنی خەبەرەکانی ئێوە بن. وایان لێ بێ لە چاوەڕوانیدا شێت بن. هەروەها کاتێك ئەمن دەمەوێ سەبارەت بەو مەسەلەیە قسان بکەم، با گوندی هەموو چاو لە زاری من ببڕن. باڵلا دەی ئێستا هەستن بڕۆن و بچنەوە ماڵەکانتان و بزنەکانتان خێرا بنێرنە ئێرە. بۆ سبەی نیوەڕۆ میوانییەکی گەورەمان لە پێشە.

ئەندامەکانی ئەنجوومەنی ئاوەدانی هەستان و چوونەوە ماڵەکانیان. دەیانەویست زۆر زوو ئەوەی کڕیویانە نیشانی ژن و منداڵەکەیان بدەن.

سەفەر بانگی کرد:

- گزیرباش...

گزیر دەمودەست لە بەردەمیدا دەستەونەزەر ڕاوەستا.:

- فەرموو گەورەم.

- خۆ گوێت لە خەبەرەکانی شۆرای ئاوایی بوو؟

- بەڵێ هەموویم بیست.

- کەواتە هەستە وەنێو دێ بکەوە و بڵێ... هۆی.... بڵێ کوێخا سەفەر-مزگێنییەکی زۆر گەورەی بۆ ئێوە پێیە. مزگێنییەکی ئەوتۆ کە لە ژیانتاندا نەتانبیستووە. ئەگەر گوێتان لێی بێ لە خۆشیانا شێت دەبن. هەروەها ئەو مزگێنییەش سبەی بەیانی لە زمانە شیرینەکەی سەفەر ئاغاکەمانەوە دەبیستنەوە. بشڵێ چاوەڕێی ڕۆژبوونەوە بن.

گزیر بە غاردان خۆی گەیاندە نێو دێ. خۆشی بۆ گەیاندنی ئەو هەواڵە بێئۆقرە ببوو. قسەکانی سەفەری بە تام و خوێوە چەندین جار دووپاتە کردەوە. لە جاڕکێشانەکە ماندوو نەدەبوو. ئێوارە داهات. هەوا تاریك بوو. شەو بەسەردا هات. کەڵەشێرەکانی بەیانی خوێندیان. هێشتا گزیر هەر وا بە ماڵاندا دەگەڕا و یەك بە یەك بە تام و خوێوە خەڵکەکەی لێ ئاگادار دەکردەوە. ئەو جۆش و خرۆش و کەفوکوڵەی گزیر گوندییەکانی تەواو کونجکۆڵ کردبوو. ئەو

شەوە بۆ یەکەم جار بەسەرهات و باسی تاشباشیان لە بیر چۆوە و باس باسی ئەوە بوو کە ئـاخۆ مزگێنییەکەی کوێخا سەفەر بڵێی چی بێ.

هێشتا تاو هەڵنەهاتبوو کە هەموو خەڵکی ئاوایی لـە منـداڵی حـەوت سـاڵانەوە تـا پـیری حەفتا ساڵان، لە بەر دەرگای کوێخا کۆ بوونەوە. تەنانەت مەمی دیکیش کە بە دەستی عومەر شڕ و شپڕێو ببوو، لەوێ بوو. خۆی بەسەر پێوە پێ نەدەگیرا. دەستی بە دایکییەوە گرتبوو.

کوێخا هات و سینگی دەرپەڕاند و گوتی: ئحم م م .. لاقـی ڕاستەشـی هێنایـە پێشـەوە و دەستی کردە قسە کردن، لە فەرماندەیەك دەچوو کە دوژمـنی شکاندبێ. زۆر بە تام و بۆن و بـە کەشم و نەشمەوە ئەو خەبەرەی پێ ڕاگەیاندن کە عادیل ئەفەنی نـاردبووی. چـیی زیـاتر قـسەی دەکرد، زیاتر وەجۆش دەهات و چیی پتر وەجۆش دەهات زیـاتری قـسە دەکـرد. عـادیلی کـردە باب و برا و پشت و پەنای خەڵکەکە. بەرەبەری نیوەڕۆ بـوو قـسەکانی ئـاوا بڕییـەوە:"ئـەوەبوو مزگێنییەکەم بۆ ئێوە".

گوتبووی هەر عادیل خۆی پارەی ئەو گوێرەکە و بزنانە دەدا وا لەو مەنجەڵانـەدا دەکـوڵێن. لە بەر کێ؟ دیارە لەبەر برا ئازیزەکەی خۆی سەفەر ئەفەنی.

گوندی لە خۆشیان شاگەشکە ببوون. هەر قسەی کوێخا تەواو بوو هورووژمیان کـردە سـەر مەنجەڵەکان. لە ژیانیاندا میوانیی ئاوایان نەدیتبوو. گوشت و پڵاو بـە پێـی فـیلان. گونـدێکی چی، پێنج گوندیش لێی خواردبایە تەواو نەدەبوو.

سەفەر لە نێو حەشیمەتەکەدا بە شوێن تاشباشدا دەگەڕا، بەڵام دیار نـەبوو. کـە چـاوی بـە تاشباش نەکەوت، زۆر تووڕە بوو. لە بن لێوانەوە مڕاندی:

ـ چاخ و باڵتم چاك شکاند تاشباش؟ ... دیتت چیم لـێ کـردی؟ ئـەو کانیاوەشـم لـێ وشـك کردی، جا ئێستا بڕۆ دیق بکە و بمرە....

# ٣٢

ئـەوە سـێ ڕۆژە لەسـەر یـەك باڵندەیـەكی سـپی لەسـەر گوێـسوانەی ماڵەكـەی تاشـباش هەڵنیشتووە. مەلێكی سپیی دوو هێندەی هەڵۆ، بـەبێ ئـەوەی بجووڵێـت، لـەوێ هەڵنیـشتووە. باڵندەیـەكی لـەو جـۆرە، تـا ئێـستا نـە لـە كێوەكـانی تـۆرووس بینـراوە و نـە لـە دەشـتەكانی چوكووراواش. چاوێكی شینە و یەكیان زێڕین.

هەر خەبەرەكەی عادیل ئەفەنی دێنن، باڵندەكە لە شەققەی باڵێ دەدا دەفڕێ.

ـ چما عادیل هەر عادیلەكەی جاران نییە؟...

ـ ئەوە نەفەسی تاشباشی سەروەرمان بوو گەیشتە شارۆچكە و عادیلی وەك مێو و ڕۆن نەرم كرد...

ـ شەوێكیان سەروەرەكەمان تاشباش ببوو بە كۆترێكی سپی و لە بەر پەنجەرەكەی تاشـباش هەڵنیشتبوو. عادیل پەنجەرە دەكاتەوە و سەیر دەكا ئەوە كۆترێكی سـپیی لـەوێ نیـشتووە كـە چاوەكانی وەك بڵێسەی ئاگرن. كۆترەكە وەزمان دێ و دەڵێ:"كوڕە عادیل، چما تۆ نەتبیستووە ژنەكانی ساكارجا، چۆن یەكێك لە ئاغاكانی ئەوێیان لەتوپەت كرد؟ ئەگەر گیانی خۆتت خـۆش دەوێ، مەچۆرە گوندی یالاك. ئەگەر منداڵەكانتت خۆش دەوێ، ئەمساڵ لە قەرزەكانی خەڵكی یالاك خۆش بە. ئەتۆ لە شاری دانیشتووی و خەڵكی گوندی ڕەش و ڕووتـن. لـە دووكانەكەتـدا هەموو شتێكت بە لێشاوە. خەبەر بنێرە بێن و بكـڕن. ئەمـساڵ پەمۆیـەكی زیـاتر دەچـننەوە. قەرزی هەردوو ساڵەكەت بەیەكەوە دەدەنەوە....

ـ ئەو سەفەرەش زۆر هەڕ و گیڤی هەیە....

ـ هەر هەمووی ئەوانە لە سایەی سەری تاشباشەوە بووە....

ـ لە سایەی سەری

- ئەگەر تاشباشی سەروەرمانە نەدەبوو...

- کۆترە سپییەکە بە چاوی ئاگرینەوە نیگایەکی وا لە عادیل دەکا، کە عادیل لە ترسانا خۆی پیس کردبوو... بە کۆترە سپییەکەی گوتبوو، خەڵکی یالاك بنێرە با بێنە دووکانەکەم. گیانم و ماڵەکەم ئیی وانە... کۆترەکە هەر گوێی لەو قسانە ببوو، بە دڵێکی خۆشەوە لە شەقەی باڵانی دابوو و هاتبۆوە ئاوایی، بەسەر ئاواییەکەدا فڕیبوو و خەبەرە خۆشەکەی بە مزگێنی دابووە خەڵکەکە.

- هەر بۆیەش، دایك و خۆشك و پیاوەکان و بە گشتی هەموو خەڵکی ئاوایی ئەوە سێ شەوە، بە ئارخەیانی لێی دەنوون.

- هەتا سێبەری سەروەرەکەی خۆمان تاشباشمان بەسەر سەرییەوە بێ، هیچ بەڵایەك بەسەر ئەو گوندە نایە.

- عادیلیش نایە...

- پەتا و نەخۆشییش نایە...

- ماریش نایەن....

- وشکەساڵییش نایە...

- گوڵەکان دەپشکوێن و شین دەبنەوە و خاك بە پیت دەبێتەوە.

- ژنەکانی ئاواییش نەزۆك نابن...

- دە منداڵیان بە زگێك دەبێ...

- تازە سەفەر سینگی دەردەپەڕێنێ و دەڵێ، ئەوە منم ئەو چاکەیەم دەرحەق خەڵکی ئاوایی کرد...

- پیاوی سپڵە...

- ئەگەر تاشباش نەدەبوو...

- کابرایە فێڵباز...

- ئاخ ئەگەر تاشباشەکەمان نەدەبوو...

- ئەو سەفەرە پێی وایە لە لووتی فیلەوە بەر بۆتەوە...

- هەر بە ڕاستی بۆوەی نابێ لێی بچیتە پێشێ...

- خۆزگە ئەو عادیلە دەهاتە ئەو ئاواییە، بۆ ئەوەی سزاکەی ببینێ...

- دەیدی کە دنیا بە دەستی کێوەیە و هەزار جار لەو هاتنەی پەژیوانە دەبۆوە و گووی پێ دەخورا.

هەموو ئەو قسانەی لە ئاواییدا دەکران، وەك هەمیشە، دەمودەست دەگەیشتنەوە گوێی سەفەر. سەفەر بە بیستنی ئەو قسانە لە دین دەهری دەبوو. وەك شێتان لە ماڵەکەی خۆیدا هەڵدەسوورا و هەرچی لە زارییەوە دەهاتە دەرێ، بەو خەڵکەی دەگوت.

جارێکیان هاواری کرد:

ـ ئەی هاوار خنکام، چۆڕێ ئاوم دەنێ، فریام کەون. خنکام بابەڕۆ...

رەنگی ڕەش داگەڕابوو...

لە دەرووەش کرێوە بوو. چاو چاوی نەدەدی. سەفەریش کە خەریك بوو لەخۆ دەچوو، بە ناڵینەوە گوتی:"گزیر، گزیر، ئەنجوومەنی ئاواییم بۆ بانگ بکە."

ـ ئەگەر هیممەتی تاشباشی سەروەرمان نەدەبوو و ئەگەر عادیل ترسی ئەوی لەدڵیدا نەدەبوو، دەهات و دەرپێکەشمانی لە پێمان دادەکەند.

ـ چما پێشتریش وای نەکردبوو؟...

ـ تەنانەت دیزەی چێشتەکەشمان...

ـ تەنانەت کەوچکە چێوییەکانیشمان..

ـ تەنانەت ئەو لوێچە ساوارەشمان دەبرد...

ـ لوێچە ئاردەکەشمان...

ـ تەنانەت نێوفەکیشمانی دەبڕی و دەیبرد...

ـ پێشتریش بردبووی...

ساتێك دواتر ئەنجوومەنی ئاوایی گەیشتنێ. بەفر سەرتاپای داپۆشیبوون. سەفەر گوتی:

ـ ئەمن دەڕۆم. ڕاستەوڕێ دەچمە لای ئەو عادیلە. ئاوا دەری ناهێنێ. ئەو گوندییانە شێت و شوورن. لێگەڕێ با بچمە لای عادیل با ئەوان کەراماتی کۆترەکە و تاشباشەکەشیان بەچاوی خۆیان ببینن. کچێ هۆی، ئەو قاپووتەم بۆ بێنن. چاویلکە کڵاوەکەشم بێنن. دەبێ جوان خۆم داپۆشم و وەڕێ کەوم. نابێ کات بە فیڕۆ بدەم.

ژنەکان و ئەندامەکانی ئەنجوومەنی ئاوایی لەبەریدا شل و کوت بوون و ویشتیان نەهێڵن بڕوات، بەڵام سەفەری گوێی پێیان نەبزووت. گوتیان:

ـ کوڕە چما لەو کرێوە و بارنەدا دەکرێ بچیتە شوێنێك؟ کەسیرە دەبی، دەمری...

هەر پێش ئەوەی لە ئاوایی بچیتە دەرەوە دەمری. دیتت مام خەلیل ئەو سەرەی بردی نەیهێنایەوە؟ حوسنی و ڕەجەبیش ڕۆیشتن و نەگەڕانەوە. ئەگەر هەر دەشڕۆی، بڕێك ڕاوەستە با هەوا خۆشی بکاتەوە جا بڕۆ.

سەفەر دەیگوت:"خۆم پێ ڕاناگیرێ. ئاگرێك بەربۆتە ناخم ئارا و قارای لێ بڕیوم. لە داخی سپڵەیی ئەو خەڵکە دەبێ خۆم بگەیێنمە عادیل." وەك تۆفانێك، دەرپەڕییە دەرەوە و لە کڕێوە و بارنەکەدا لە چاوان ون بوو.

ژنەکانی بە دویدا گریان و بانگیان کرد. کچەکەی قیرسمایل وەشوێنی کەوت. خۆی گەیاندێ و خۆی بە عەرزی دادا و باوەشی لە لاقەکانی وەراند. سەفەر گوێی لێ نەبوو. هەستی نەدەکرد و هەر دەڕۆیی و ڕانەدەوەستا:

"لە سایەی سەری تاشباشەوە ها؟ تف، هەی هیچ و پووچینە، تف لە ڕووتان گوندیی بێناموس. کوڕە خۆ دەستت هەتا ئانیشکت بەهەنگوین بکە و بیخە زاریانەوە و بیهێنەوە دەرێ، قەپی لێ دەگرن."

هەر بەو خێراییە گەیشتە شیوە درێژەکە. لە شیوە درێژە دەترسا. هەر ئەوەندەی زەحمەت بوو تا ئەو شیوە ببڕێ. ئەو کاتە بارن و کڕێوەی چی، قیامەتیش بوایە گوێی پێی نەدەبزووت.

بەڵام ئەو شیوە شووم و مەرگبار بوو.

گوێیەکانی زرینگانەوە. دەتگوت سەری بووەتە پوورەی هەنگ. هەوا خەریك بوو ڕوون دەبۆوە کە گەیشتە ئۆیۆك تاش. کڕێوەکە هەر وا توند بوو و دیار بوو وا زوو خۆشی ناکاتەوە. بیری کردەوە:"دەبێ بچمە ئەشکەوتەکەی ئۆیۆك تاشەوە و لەوێ ئاگرێك بکەمەوە و چاوەڕێم بم خۆشی بکاتەوە."

تینی ئەژنۆی نەمابوو. دڕدۆنگ بوو. باشە بەوەندە تینەی لە ئەژنۆیدا مابۆوە، نەیدەتوانی بەبێ پشوودان خۆی بگەیێنێتە شارۆچکە؟، بەڵام دیتی ئاوا بڕوات ناتوانێ و ناگاتێ. بەرەو ئەشکەوتە ڕای کرد. لە پشتەوەی با و بۆران وەك قەمچیی لە گیانی دەدا.

ئەشکەوتەکە پڕ بوو لە شەمشەمەکوێرە. هێشوو هێشوو لە میچەکەوە شۆڕ ببوونەوە. مچوڕکەی پێدا هاتەوە.

ئاگرەکەی ناخی هەر دەهات و کڵپەی دەسەند. بەخۆی گوت:"لێرە ڕامەوەستە سەفەر. هەستە و خۆت بگەیێنە عادیل و دارێك بە ڕۆحی ئەو گوندییە بێناموسانەدا بدە." لە ئەشکەوتەکەدا خۆی پێ نەگیرا و ساتێك دواتر خۆی خستەوە ئامێزی با و بۆرانە شێتەکە.

"یانی ئاوا؟ یانی هەموو زەحمەتەکانی من بەخۆڕایی چوون؟ ئەو عادیلە زۆر ترسنۆکە، ئەگەر کڕێوەکە خەستتر نەبێتەوە، هەر ئەمشەو دەگەمە شاری. باڵندەی سپی؟ دڵە بەردەکەی عادیل؟... باشە دەبینن... ئێستا دەیبینن ئەو دڵە مێهرەبانە چۆن دیسان دەبێتەوە بەرد."

خێرا دەڕوا و جاروبارەش غار دەدا و لە کاتی ڕاکردنێدا هەڵدەخلیسکێ و دەکەوێ و هەڵدەستێتەوە و دیسان دەکەوێتەوە و هەڵدەستێەوە و ڕادەکاتەوە.

بلێسەیەك لە ناخیدا کڵپە دەستێنێ و ژەهری ڕق و قین و تووڕەیی هەر دێ و بەتەوژمتر دەبێ. سەفەر ئەو هێزی تووڕەییە، بۆرانی چی، تەنانەت لافاو و بوومەلەرزەش دەبەزێنێ.

ئێستا کڕێوە و بۆرانەکە بەرەوڕووی دێ و شلّپ لە دەموچاوی دەدا و سەفەر شانی ڕاستەی بەرەو بۆرانەکە گرتووە و دەڕوا.

# ٣٣

مەمی دیك قسەكانی خۆی ئاوا تەواو كرد:

ـ ئەریۆەڵلا ئاوایان لێ كردم.

تاشباش ئۆغڵو گوتی:

ـ جوان و زەریف سەیرم كە. ئەوەی دارستانێك نووری بەدوودا دەهات من بووم؟

مەمی دیكە لە هەموو لاوە لە ڕوخساری ورد بۆوە و دوایی زۆر لێبڕاوانە گوتی:

ـ ئەتۆ بووی.

تاشباش ئۆغڵو گوتی:

ـ كەوابوو گوێ بدەیە شتێك با پێ بڵێم. ئەمن ئەو شەوە هەر لێرە لەو جێگەوبانەدا نووستبووم وا كاكە عەلی پاڵی پێوە داوە. ئەگەر بڵێم خەوم لێكەوت و چل سوارەی غەیبی هاتن و بردیانم، درۆیە دەكەم. چونكە ئەو شەوە هەتا بەیانی خەو نەچووە چاوەكانمەوە. جوان سەیرم بكە، نەكا هەڵەت كردبێ. نەكا یەكێكی دیكەت لەگەڵ من لێ تێك چووبێ. لەوانەشە ئەو شەخسە نوورانییە زۆر لە تۆوە دوور بووبێ و ئەتۆ لەگەڵ من لێت تێك چووبێ.

مەمی دیك گوتی:

ـ كوڕە لە بەر دەمم بوو و كتومت خۆت بووی.

دەستی برد و یەخەی كراسەكەی تاشباشی گرت و گوتی:

ـ هەر ئەو كراسەشت لەبەردا بوو، بەڵام ڕوخسارت خەماوی بوو. لەوانەشە لە سۆنگەی ئەو تیشكە كەسكەوە بووبێ كە لە ڕوخسارتەوە دەباری.

مـەمی دیـك لـە بـەردەم تاشباشـدا وا دەسـتەونەزەر ڕاوەسـتابوو دەتگـوت لـە بـەردەم فەرماندەیەکی گەورەدا یان لە هەنتەشی پیاوچاکێکی خوادا ڕاوەستاوە. سـەری هەڵنـەدەبڕی. جاروبارەش لە گۆشەی چاوەکانییەوە سەیرێکی دەکرد وەك بڵێی لە چیایەکی مەزن بڕوانێ.

"عەلی"یە درێژ کەیفی بەو حاڵەتەی کوڕەکە دەهات. بەخۆی دەگوت:"هەر بە ڕاستی نەکا ئەو مەمەدەی برامان بە ڕاستی وەلی بێ. کوڕێژگەکە بەچاوی خۆی دیتوویەتی، چما بـۆ دەبـێ لەخۆوە درۆیان بکا." و وەك نارازی بێ، سەیرێکی تاشباشی کرد و گوتی:

ـ براله، مەمی دیك بۆ دەبێ درۆیـان بکـا؟ لەوانەشـە یـەکێك لـە چـل سـوارەکەی غـەیبی چووبێتە ڕواڵەتی تۆوە و خۆی پێشان دابێ."

مەمی دیك گوتی:

ـ من خاڵە مەمەدم ڕێك وەك چۆنە ئاوا دی. ڕێی تێناچێ کەسێکی دیکە بووبێ.

بە لەبزێکی گریاناوییەوە، وەك منداڵێکی کەلوپەلی گەمەیان لێ ئەستاندبێ، قسەی دەکرد:

ـ سەفەر پێی گوتم، مەمی دیك ئەگەر بڵێی ئەوەی دیتووتە تاشباش ئۆغلۆ نەبووە، ژنت بۆ دێنم، مەزرات دەدەمێ، خانووت بۆ دروست دەکەم. ئەمنیش گوتم هەر بەو چاوانەی خۆم دیتم. ئەمن ناتوانم درۆیان بکەم. ئەوەی دارستانێك تیشکی بـە دوودا دەهـا، تاشـباش ئۆغلـو خـۆی بوو. ئەوانیش تا بەیانی تێیان هەڵدام و بەو دەردەیان بردم. دیار نازانم چۆن بـوو نەیانکوشتم.

عەلی"یە درێژ بە لەبزێکی لۆمەکەرانەوە بە تاشباشی گوت:

ـ ئەو منداڵە بە چاوی خۆی تۆی دیتووە. ئێستا کە دیتووتی چ بکا؟ درۆ بکا؟

مەمی دیك قسەکەی لێ وەرگرتەوە و بە نارەحەتییەوە گوتی:

ـ بە خودا خاڵە عەلی، بۆخۆی بوو. بۆ درۆ بکـەم؟ مـن خاڵـە تاشباشـم لـە مـەودای یـەك ڕۆژەڕێوە ببینم دەیناسمەوە. ڕێك لە بـەر دەمـم بـوو، بـۆ دەبـێ درۆ بکـەم؟ خەونیـشم نـەدیوە. چەقۆیەکەم لە خۆم دا. ئەوەش برینەکەی.

ئەوە چوارەمین جار بوو برینەکەی دەکردەوە و نیشانی عەلی و تاشباشی دەدایەوە. تاشباش ملی بەلارەوە نا و بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ چ بکەم. لەوانەشە بەبێ ئەوەی خۆم زانیبێتم، چووبێمە ڕیزی پیاوچاکانەوە.

مەمی دیك کە زویربوونەکەی ئەوی دی، خەمبار بوو:

ـ لەوانەشـە، نەبووبێتـە وەلـی. لەوانەشـە هـەر بەوێـدا تێپـەڕیبێی و تۆپەڵـە تیـشکەکان وەشوێنت کەوتبێن و تۆش ئاوڕێکت لە دواوەت نەدابێتـەوە و تیشکەکانیـشت نـەدیتبێ، بـەڵام

ناچارم مەکە درۆیان بکەم ئەمن، بەو چاوانەی خۆم دیتم. بڕوام پێ بکەن، ناچارم مەکەن درۆیان بکەم.
جۆرە پاڕانەوەیەك لە دەنگی مەمی دیکدا بوو. جاری وابوو بیری دەکردەوە:" نەکا ئەوانەش وەك سەفەرم لێ بکەن." خۆ وابوایە مەمی دیك تاقەتی نەدێنا و دەمرد. چۆنە درۆیەك بکا و ڕزگاریی بێ لە دەستیان؟ گوتی:
- ئەگەر ناچارم نەکەن درۆ بکەم باشە. چ قازانجێکی بۆ ئێوە تێدایە ئەگەر ناچارم بکەن درۆیان بکەم؟
تاشباش هەر دەهات و ڕووی گرژتر دەبوو. گوتی:
- مەمی دیك. دەزانی لەوانەیە لەسەر ئەو بەسەرهاتەی تۆ گوندەکە تووشی چ بەڵایەك بێ؟
مەمی دیك گوتی:
- ئەمن دەمرم ئەگەر ئێوەش تێمهەڵدەن. من ناژیم و دەمرم. تۆخودا لێم مەدەن. مەمکوژن. ناچاریشم مەکەن درۆ بکەم. بەو چاوانەی خۆم دیتم.
تاشباش ئۆغلۆ ناخێکی هەڵکێشا و گوتی:
- ئاخ مەمی دیك، ئاخ، منت کردە تۆزی بانان. ماڵوێرانت کردم جا چ درۆ بکەی یان نەیکەی.
مەمی دیك زۆر لەو حاڵەتەی ترسا و کەوتە هەوڵ و تەقەلا و گوتی:
- ئیزنم بدەن با بڕۆم. نەخۆشم. هەموو گیانم کوتراوە و پشتم لە زگم نەرمتر کراوە. دەمەوێ بچمەوە لای دایکم.
بەزەحمەت لە جێی خۆی هەستا و نیگای پڕ لە پاڕانەوەی لەوان بڕی. "عەلی"یە درێژ بە پێکەنینەوە گوتی:
- بڕۆ مەمی دیك، مادام نەخۆشی و دایکشیت چاوەڕێتە بڕۆ کوڕم.
کەوابوو دیار بوو نایانەوێ لێی بدەن. نەیاندەویست بیکوژن. لە حاڵێکدا خۆی دابووە سەر تێلاکەی و هەموو گیانی دەیزریکاند، بە خشکەخشك وەدەر کەوت. دەتگوت هەموو ژان و ئازارەکانی فەرامۆش کردووە. عەلی نێوچاوانی گرژ کرد و گوتی:
- سەیر کە چییان بەسەر ئەو منداڵە هێناوە. ئەی هاوار چییان لێ کردووە؟ ئەو مەسەلەی پیاوچاکییەی تۆ سەفەر شێت دەکا. وا تۆقیوە خەریکە دیق بکا. سەیر بکە چیی لەو منداڵە کردووە.
تاشباش گوتی:

- چووەتە شاری. بۆ ئەوەی داوا لە عادیل بکا لە قەرزی گوندییەکان خۆش نەبێ. چووە بۆ ئەوەی عادیل بە قەرز شت نەداتە دێهاتییەکان. گوندییەکان پێیان وایە ئەمن بوومەتە هۆی نەرمبوونی عادیل. ئەو دێهاتییانەش بە ڕاستی شێتن.

عەلی:

- ئاخر ئەو سەفەرەش بێ ئەقڵە. ئەگەر مەسەلەی پیاوچاکبوونەکەی تۆ شێتی نەکردبایە، چۆن کاری وای دەکرد خۆی تێدابچێ؟ سەفەری کەر و گەمژە، بۆ ئەوەی پێش بە "وەلی"بوونەکەی تۆ بگرێ، خۆی بە تاو و ئاگردا دەکا. کەرە و نازانی کەس پێشی شتی وای پێ ناگیردرێ، تەنانەت خۆیشت. تازە ئەو شتە چووەتە مێشکی گوندییەکانەوە. تەنانەت ئەگەر مەمی دیك گوتباشی ئەوەی گوتوومە درۆ بووە و خۆم هەڵمبەستووە و ئەنگۆ کەر و گەمژەن بڕواتان کرد، دیسانیش کاری نەدەکردە سەر گوندییەکان.

و بە پێکەنینەوە گوتی:

- براله مەمەد، نەکا بە ڕاستی تۆ وەلی و پیاوی خودای بی. ئەگینا گوندیی ئەوەندە لەسەر بنیادەمێك سوور و پێداگر نابن.

تاشباش دڵی داخورپا و بە نەرمییەوە گوتی:

- کوڕە براله ئیتر تۆ قەشمەریم پێ مەکە. بە ڕای من هەموو بەڵایانە فیتی سەفەرن و لەبن سەری ئەو دان.

عەلی تووڕە بوو و گوتی:

- چما تۆ شێت بووی؟ ئەوە ئەقڵت نەماوە؟ کوڕە سەفەر لە ترسانت شێت بووە. دەترسێ تۆ بەو پلەیە بگەیت و بڵێی ئەو بێدینە شیاوی کوشتنە و فتوای سەری بدەی و بە ڕاستی وەها فتوایەکیش دەدەی.

تاشباش گوتی:

- ئەمن زۆر، بەڵام بەسەر دێن. ئەگەر ئەو سەفەرە ترسابێ، چیی لە دەستی بێ دەیکا و هەر چۆنێك بێ بەڵایەکم بەسەر دێنێ.

خەفەتبار بوو، تۆزێك بێدەنگ بوو و چووە فکرەوە و دیسان دەستی پێ کردەوە:

- ئێستا دەزانم، ئێستا دەزانم ئەو چەکدارانەی پەلاماری ماڵەکەمیان دا کێ بوون... ئەو کفن پۆشانە...

عەلی گوتی:

- ئەمنیش زانیم. ئێستا زانیم، هەی گوو بە گۆڕی بابی. لەمەودوا دەبێ ئەوانە بۆ خەوتنێ بێیە ماڵەکەی من. نابێ بەکەسیش بڵێی. تفەنگێکی ماوەرزی پێنج تیریشم لە ماڵەوە هەیە، ئی بابە...

تاشباش ئۆغڵو گوتی:

- چما ڕێگەچارەی دیکەش هەیە، براله گیان عەلی؟

"عەلی"یە درێژ ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

- ئەوە چووەتە شاری بۆ ئەوەی هەموو شتێك تێك بدات و بەم و بەو بڵێ کە تۆ خۆت کردۆتە "مەهدی" و هەوڵ دەدا بتخاتە بەندیخانەوە یان ... خوای نەخواستە...

تاشباش ئۆغڵو بە شڵەژاوییەوە گوتی:

- هەر گوویەکی پێ دەخورێ با بیخوا.

عەلی کە دەتگوت بڕوای بەو مەسەلەیەی تاشباش هێناوە گوتی:

- لەوانەشە تۆ پیاوچاکی خودای بی و ئێمە نەمانزانیوە. دووعایەك بکە بەشکم سەفەر نەگاتە شاری و لە بەفردا ڕەق هەڵێ.

تاشباش پێکەنی:

- تۆ خودا گاڵتەم پێ مەکە عەلی گیان. پیاوی خودا لە کوێ و ئێمەی هیچ و پووچ لە کوێ؟...

عەلی یە درێژ دیسانیش ئاخێکی هەڵکێشایەوە و گوتی:

- کێ چووزانێ؟ بنیادەم خۆیشی نازانێ... لەوانەشە لای خودا پێگەیەکت هەبێ. دڵێکی پاکت هەیە و تا ئێستا خراپەت بۆ کەس نەبووە و حەوت ساڵیشە کێشەت لەگەڵ ئەو پیاوە هەیە. ئەویش لەسەر حەقی گوندییەکان. ئێستاش ئەتۆ دووعایەکی لێ بکە بەشکم وەدی بێ.

تاشباش گوتی:

- براله عەلی دەست هەڵگرە. لانیکەم تۆ قسەی وا مەکە. چما دەکرێ کەسێکی وەك من بە پلەی وا بگا؟ لەو قسانەدا بوون حەسەن وەژوور کەوت و دوای ئەوەی بە ترسەوە سەیرێکی تاشباشی کرد و لیکاوی زاری قووت دایەوە گوتی:

- بابە، ئەمن و ئۆمەخان دەمانەوێ بچین بۆ پووشکە کۆکردنەوە. دایکم ناهێڵێ و پووشکەشمان تەواو بووە.

عەلی پرسی:

- هەوای دەرێ چۆنە؟

حەسەن دیسان بە ترسەوە سەیرێکی تاشباشی کرد و گوتی:

- زۆر خۆشە. تاو و بانە.

- کەوابوو برۆن...

حەسەن سەیرێکی دیکەی تاشباشی کرد و بە غاردان وەدەر کەوت. لە دەرەوە ئۆمەخان بە تەور و پەتەوە چاوەڕێی بوو. پێی گوت:

- دیتم. تاشباشم دیت. بووەتە وەلی. چاوەکانی جۆرێك بوون. لەگەڵ بابم بەرەوڕووی یەکتری دانیشتوون و قسان ناکەن.

وەڕێ کەوتن. بە غاردان بەرەو دارستانەکە چوون. کە لە گوندی چوونە دەرەوە شل بوونەوە. حەسەن گوتی:

- دیارە سەفەر زۆر دەترسێ. تاشباش لەشکرێك جنۆکەی هەیە کە... باوکەڕۆۆۆۆ لەشکرێکی گەورە. هەموویان بەژنیان ئەوەندەیە. تا ئەژنۆی من..، بەڵام زۆر بەقەوەتن. تاشباش گوتوویەتی ئەگەر فەرمان بە جنۆکەکان بدەم، ئەو کێوە هەڵدەگرن و لەسەر ئەوی دیکەی دادەنێن. ئەگەر پێم خۆش بێ، دەڵێم کوێخا سەفەر و عادیل ئەفەنی بەرن و لە لووتکەی چیای تەکەچەوە هەڵیانواسن. ئەتۆ بۆ وا دالغەت لێداوە؟

ئۆمەخان گوتی:

- بیر لەوە دەکەمەوە کە...

و بێدەنگ بوو.

حەسەن بە تووڕەییەوە گوتی:

- بیر لە چی دەکەیەوە. دەی بیڵێ کچەتیوە؟

ئۆمەخان بە ساردییەوە گوتی:

- بیر لەوە دەکەمەوە نەکا ئەوانەی تۆ لە بڵێسەی ئاگرەکەدا دەتبینین، جنۆکە بووبێتن؟

حەسەن خۆی پێدادا و قژی گرت و گوڕاندی:

- چۆن ئەوانە جنۆکەن هەی گلاو؟... بڵێسە بوون، هەر بڵێسە و هیچی تر...

ئۆمەخان هەوڵی دا تیتکی لە چنگی حەسەن دەربێنێ و هاواری کرد:

- بەرم دە، باشە، جنۆکە نەبوو، بڵێسە بوو.

حەسەن گوتی:

ـ دەی باشە، ئاوا. و ئیتر دەستی لە تیتکی کردەوە.

گەیشتنە دارستانەکە. حەسەن دیسان لە جێیەکەی جاران ئاگرەکەی کردەوە. دیسان چاوی بڕیبۆوە بڵێسەکان. ئۆمەخان بەو پەڕی گەشبینییەوە سەیر بڵێسەکانی دەکرد و هیچ کام لەو شکڵانەی بڵێسەکان دروستیان دەکرد، لە چاوی ون نەدەبوو، بەڵام هیچی نەدەدی. ئاخرییەکەی تووڕە بوو و قیژاندی:

ـ نایبینم، نابیبنم ئیتر، چاوەکانم زەق زەق دەکەمەوە و چاو ناترووکێنم دیسانیش هەر هیچ نابینم.

حەسەن لەخۆباییانە گوتی:

ـ ناتوانی بیانبینی. هەموو چاوێك نایانبینێ. ئەگەر جنۆکە بایەن دەتدیتن، چونکە سیحربازی.

ئۆمەخان گوتی:

ـ دایکت سیحربازە.

حەسەن وەڵامی دایەوە:

ـ زۆر باشە، ئەو قسەیەت هەڵگرە. خۆ هەر دایکی من نییە، دایکی تۆشە.

هەستا و بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ ئاوڕ بدەوە کچەتیو. ئەگەر سەیری ئەو شوێنە بکەی کە پێتی دەڵێم دەتکوژم.

ئۆمەخان گوتی:

ـ زۆر خۆت گیف مەدە. دەزانم دەچی و سەیری بن بەردەکە دەکەی. ئیتر کەس لە ئاوایی نەماوە سەیری بن ئەو بەردەی نەکردبێ. دوو ڕەگە گیای لە بندایە و بڕێك خۆڵی ڕەش. هیچی دیکەی لێ نییە.

حەسەن بە ئاماژەی دەست گوتی:

ـ جارێ بڕێك ڕاوەستە. بڕێك ڕاوەستە با بۆت دەرکەوێ. بۆت دەرکەوێ کە لە بن ئەو بەردەوە چ شتێك دێنە دەرێ... شتی چۆن...

ئەوجار لە چێژەوە لێوەکانی خۆی لستنەوە.

بە غاردان چووە تەنیشت بەردەکە. بەرزی کردەوە و سەیری ژێرەوەی کرد و ئەوجار بە ئەسپایی لەسەر جێی خۆی دانایەوە. ئۆمەخان گوتی:

ـ لێگەڕێ با منیش سەیری بکەم. چما من خوشکت نیمە؟

هەر ئەوەندەی حەسەن لەسەخۆ گوتی:" باشە وەرە سەیری بکە"، ئۆمەخان دەرپەڕی و دەستی لە ئەستۆی کرد و هەر دووکیان بەرەو بەردەکە غاریان دا. حەسەن بەردەکەی هەڵگرت و لەولاوەی دانا. دانیشت و وەك بڵێی شتێکی سەیر خەریك بێ بقەومێ، چاویان لە جێی بەردەکە بڕی. دوای ئەوەی ماوەیەك هەر وا سەیریان کرد، حەسەن هەستا و بەردەکەی لەسەر جێی خۆی دانایەوە. دڵیان خۆش بوو.

حەسەن دەستی ئۆمەخانی گرت و گوتی:

ـ هەستە ئۆمەخان، خەریکە ڕۆژ ئاوا دەبێ. با پووشکە و دارەکەمان کۆ بکەینەوە. هەواش خەریکە ساردی دەکا. ڕۆژێکی دیکە دێینەوە و لە بەیانییەوە تا ئێواریێ تێر بە دڵی خۆمان سەیری دەکەین. ئۆمەخان گوتی:

ـ هیچ تێر نەبووم.... بەڵێ... سەیری دەکەین.

***

دیسان گوندەکە شڵەژا بوو. کوێخا بۆچی چووبووە شاری؟ نهێنییەك لە گۆڕێ بوو. سەفەر گوتبووی"گوندییەکانی من، و هەروەها براکانم، عادیل هەواڵی ناردووە ئەمساڵ وەك پێشوو، با هەموو ژنەکانی ئاوایی وەڕێ کەون و بێنە دووکانەکەی من. ئەمساڵ دەبێ هەر پیاوەکان قوماش بکڕن. لەبەردەم دووکانەکەم ژنێك چییە، تەنانەت منداڵێکی پێنج ساڵانیش ببینم، ئەمساڵ گەزە جاوێك چییە نادەم بە خەڵکی گوندی یالاك. دەبێ پیاوەکان بێن، ئەویش نەك هەمووان پێکەوە، بەڵکو دەبێ هەر ڕۆژەی دە کەسیان بێن و ڕۆژێکی دیکە پازدە کەسیان... و هەروەها بێن و کەلوپەلی خۆیان بەرن... عادیل وای دەوێ."

خەڵك دەیانپرسی:"مەبەستی چی بوو".

هەر هەمووان باسی ئەوەیان دەکرد، بەڵام تاقمێکیش خۆیان ڕێك دەخست بچنە شاری. ژنەکان ئەو قسەیەیان لە دڵی گران هاتبوو و نیگەران ببوون. پێیان وابوو نەکا عادیل پیاوەکانیان هەڵخەڵەتێنێ و قوماشی ڕزیو و پواوی کارخانەکانیان بەستۆدا ببڕێ. مرێمۆك ئەگەر توانیبای قسان بکا لەڕێوە دەیگوت:" عادیل، لە ژنەکان دەترسێ، دەترسێ لەتوپەتی بکەن." ئەو عادیل باش دەناسێ. لە ماوەی ئەو تەمەنە درێژەی دا، زۆری ئەزموون لە سەر بنیادەمەکان کۆ کردبۆوە.

تاشباشیش نیگەران بوو. سەفەر ڕۆیشتبوو و ئێستاش گوندی دەیانویست بڕۆن. لەو نێوەدا عادیل دەویست چ بکا؟ شەوێ تا بەیانی بە دڵێکی پاکەوە پاڕایەوە سەفەر وەبن بارستایی بەفرێ بکەوێ و نەگاتە عادیل. ئەو کاتە بڕوای دەکرد مەمی دیک هەر بە ڕاستی ئەوی لە پێش کۆمەڵێک تۆپەڵە نوورەوە دیتووە. گوندییەکان چییان دەگوت؟ ئەوان دەیانگوت، هەتا ئاگرێک نەبێ، دووکەڵێک هەڵناستێ. ئەگەر سەفەر وەبن بەفرێ کەوتبایە، ئەو دڵنیا دەبۆوە کە ئاگرێکی گەورە لە ناخیدا کڵپە دەستێنێ و قەبووڵی دەکرد بووەتە وەلی.

بۆ یەکەمجار بیری کردەوە:"هەر بە ڕاستی وەلی و پیاوچاکان خەڵکێکی چۆنن؟ لەوانەشە هەر کەسانێکی وەک خۆی بن. بڵێی و نەڵێی زۆری نەدەبرد ڕوون دەبۆوە پیاوی خودایە یان نا؟"

## ٣٤

ئەگەرچی تاشباش بڕیاری دابوو شەوانە لە ماڵەکەی عەلی بنوێ، بەڵام دوایی پاشگەز بۆوە. خۆی تووشی کێشەیەکی گەورە ببوو و ڕێگەی دەربازبوونی نەبوو. وا باشتر بوو عەلییش تێوە نەدا. ئەگەر سەفەریش ویستی، با بێ و بیکوژێ. لێگەڕێ با بێ، تا بزانین چۆن دەتوانێ بیکوژێ؟

تۆزە ئاسەوارێك چییە لەو تووڕەییە ئاگرینە و لەو هەموو تف و نەحلەتەی تاشباش نەمابۆوە. ئێستا وەك دەروێشێك خۆی دابووە دەست قەزا و قەدەرەوە. لە دوورەوە گوێی لە هەموو ئەو دەنگۆ و قسە هەڵبەستراوانە دەبوو کە لەسەر ئەو بوون و پێیان پێدەکەنی.

کاتێ مەمی دیك حەقایەتەکەی حەوت تۆپەڵە نوورەکەی بە ئاوایی وەرکردبوو، تاشباش پێکەنیبوو و گوتبووی:

"لە پێشدا حەوت تۆپەڵە نوورِیان وەدوو خستم. دوایی ئەو حەوت تۆپەڵە نوورە بوو بە دارستانێك لە نوور. لە چیای تەکەچەوە بەرەو ئاسمان هەڵکشام. جارێ ئەوە لە سایەی سەری مەمی دیکەوە، بە ئاسماناندا دەفڕم. خۆ ئەگەر بەوەندەم لەکۆڵ ببنەوە خراپ نییە، بەڵام با جارێ بزانین چ حەقایەتی دیکەشمان بۆ هەڵدەبەستن.

ئیتر لە ماڵەکەی خۆی وەدەر نەدەکەوت و جگە لە عەلی و مرێمۆك نەیدەهێشت کەس دەرگای ماڵی لێ بکاتەوە. ڕاستە ئەو کارەی ئەو گوندییەکانی تینووتر و تاسەبارتر دەکرد، بەڵام چاری نەبوو، چونکە تۆقیبوو تۆمەتی بانگەشەی مەهدیبوون و دەوڵەت و شێتخانە. ئەو شتەی لە هەموو شتێك پتر ئازاری دەدا ئەوە بوو کە خەڵك زۆر سەیر و سەمەرە سەیریان دەکرد:" خەڵك بە ترسەوە و لە بنەوە سەیریان دەکرد... تەنانەت ژن و منداڵەکەی خۆیشی وایان سەیر دەکرد....

تاشباش ئۆغلۆ نوقمی هەست و خەیالاتی ئالۆز بوو. جاری وابوو بۆخۆشی نەیدەزانی چیی بەسەر هاتووە. ساتێك دواتـر وەخـۆ دەهاتـەوە و گاڵتـەی بـەخۆی و بـە گوندییـەکان دەهـات و بەخۆی دەگوت:"ئەو گوندییانە زۆر شێت و سەیرن. هەی ماڵتان بەقوڕ بگیرێ، ئاخۆ من چی و پیاوچاکبوون چی؟ ئەمن لە کوێ و هەڵفڕین بە ئاسماناندا لە کوێ"

منداڵە پاشەبەرەکەی خۆی زۆر خۆش دەویست. لە باوەشی دەکرد و دەستی بەسـەر و قـژی دا دێنا. دەویست منداڵەکەی لە باوەش بکا و ماچی بکا، هەر دەستی بۆ دەبرد، منداڵەکە بە گریانەوە ڕای دەکرد و خۆی دەخستە باوەشی دایکییەوە.

برێك دوای ئەوە وەخۆ هاتەوە و سەیرێکی دەوروبـەری خـۆی کـرد. ژنەکـەی و منداڵـەکانی دیکەی برێك لەولاترییـەوە ڕاوەسـتابوون و بـە چـاوی بەمۆڵـەق وەسـتاو و دەستەوسـتانی و بـە ڕێزێکی تایبەتییەوە لێیان دەڕوانی. ئەوە زۆر کاری تێ کرد... ئیتر تاك و تەریك کەوتبۆوە.

بە تووڕەییەوە گوڕاندی:

ـ ئەوە شێت بوون؟ هەی شێتینە. ئێوەش ئەو درۆیانەتان چـووەتە مێـشکەوە؟ باشـە ئـەمن هەر لەو ماڵە چوومەتە دەرەوە؟ ئەویش لەو قیامەت و بـەفر و بۆرانـەدا، بـە نیـوەی شـەوێ چ کارێکم هەیە لە لووتکەی چیای تەکەچ؟ بۆ وا چاوتان تێوەبڕیوم؟ ئەمڕۆ نەك هەر زستان، کوڕە بنیادەم لە هاوینێشدا بچێتە سەر چیای تەکەچ دەیبەستێ و لە سەرمان دەمرێ. ئەو گوندییانە تەواو لە کەللەی داون. چما ئێوەش شێت بوون؟ جوان و زەریف سەیرم بکەن، ئەمنیش وەك ئەو خەڵکـەم، نـە نـوور لـە قـوونم دایـە و نـە دارسـتانیش. ئـەو مـەمی دیکـە شـێتە. خـەیالات هەڵیگرتووە. تێگەیشتن؟

تەریق ببۆوە ئەوەندەی گوڕاندبوو، بەڵام فایدەی چی؟ چەندی کەیفی هێنابای هەر گوڕاندبای و شیڕاندبای، کەی لە گوێی نەدەگرت. دوای ئەو هەمووە گوڕاندن و تووڕەبوونە، هێـور بـۆوە و دەستی کردەوە بە قەشمەری بە خەلکەکە و دەیگوت:

ـ بەڵێ، بوومەتە وەلی. ئەویش چ پیاوچاکێك؟ هەر بەیانی دەچم و چیای تەکـەچ لـە جێـی خۆی هەڵدەگرم و دەیبەم لە نێوەڕاستی چوکووراوای دادەنێم. ئەوە دەشـیبینن. بـەیانی خـەڵکی چوکووراوا هەڵدەستن و سەیر دەکەن، کێوێکی گەورە لە بەر چاویان قوت بووەتەوە. پێیان سەیر دەبێ و جا لە خۆیان دەپرسـن باشـە ئـەوە کـێ ئـەو چـیایەی هێنـاوە و لێـرەی دانـاوە؟ ئینجـا چوکووراوا دەبێتە قیامەتێك هەر مەپرسـن. هـەموو خـەڵکی شـار و گونـدان دێـن بـۆ سـەیری چیاکە. دواییش کە شەو دادێتەوە، چیاکە لەسەر دەسـتی چـەپەم دادەنـێم و دەیهێنمـەوە سـەر

جێیەکەی خۆی. هەر وەها چوکووراوابیەکانی سەیر دەکەن ئەو چیایەی بەیانی هاتبوو شەوێ هەڵفڕیوە و ڕۆیشتووە. ئەوەشیان زۆر پێ سەیر دەبێ. ئەمنیش بە کەس ناڵێم کێ ئەو چیایەی بردووە و هێناویێتییەوە."

زۆری کەیف بەو حەقایەتە هات کە دروستی کردبوو و کاتێك دەیگێڕایەوە وەخت بوو لە پێکەنینان بمرێ، بەڵام نەیدەزانی ژنەکەی ئەو پێکەنینانەی ئەویشی جۆرێکی دیکە لێك داوەتەوە.

تاشباش تۆغلو بیستییەوە کە ئەوەی بە گاڵتە لە ماڵەوە دەیلێ و پێدەکەنێ، دەمودەست بەنێودێ وەردەبێ و خەڵکەکە بە ڕاستی وەردەگرن. زۆر ترسا و لە تووڕەییان شێت بوو و گوتی:

هەی گوندییە کەر و گەوجەکان، چیی پێتان خۆشە بیکەن، بەڵام ناتوانن من بکەنە وەلی و پیاوچاك و وەك کول مورتەزا تووشی شێتخانەم بکەن یان وەك ئەحە شێتۆکە تاوارەی کێو و بیابانانم بکەن. دەمرم، بەڵام بە بلوێری ئێوە هەڵناپەڕم.

***

"تاشباشی سەروەرمان فەرموویەتی: هەموو بەیانیان چیای تەکەچ لەسەر دەستم دادەنێم و..."

گەورەمان تاشباش فەرموویەتی... ئەمن بە ئاوی چۆم دەڵێم ڕاوەستە ئەی ڕووباری پیرۆز و ڕووبارەکە ڕادەوەستێ... تەنانەت دڵۆپەیەکیشی نابزوێ. ئەگەر بشڵێم وشك بە، وشك دەبێ. دەڵێم بچۆ لە عەرزەوە، بە عەرزەکەدا دەچێتە خوارێ و ئاسەواری لێ نامێنێ و دەبێتە بیابانێکی قاقڕ."

"گەورەمان تاشباش فەرموویەتی، ئەمساڵ قەرار بوو مار بەسەر ئەو ئاواییەدا ببارێ. گوتم، ڕاوەستە و نەباری ئەو مەخلووقی پیرۆز، ئیتر نەباری. قەرار بوو ژنەکان نەزۆك بکەونەوە و ئەستێور بن، گوتم: ئەی خوای گەورە لێیان خۆش بە لە تاوانیان، و خوا لێیان خۆش بوو."

" گەورەمان تاشباش بە عادیل ئەفەنیی گوتووە، نەیەتە ئاوایی. و گوتووشییەتی، ئەگەر بیهەوێ بێت، هەر لە ڕێیە ڕەق هەڵدێ. گەورەمان تاشباش فەرموویەتی سڵاوی من بگەیێننە عادیل و پێی بڵێن نەیەتە گوندەکەی ئێمە و گاڵتە بە گیانی خۆی نەکا."

کاتێ بنیادەم گلۆڵەی دەکەوێتە لێژی، دەست بۆ هەرشتێك بەرێ، پێچەوانەکەی لێ شین دەبێتەوە. هەرچی لە ماڵەکەی خۆیدا بە گاڵتەوە دەیگوت، بەیانی بە هەزار شاخ و باڵەوە لەسەر زار و زمانان بوو... بە ژنەکەی دەگوت:

ـ کچێ وا مەکە. بە نۆکەرت بم وا مەکە. چما پێم نەکوتی ئەو گوندییانە شێت بوون. ئەی ئەتۆ بۆ؟ ئەوانە ئاخری بەو درۆ و دەلەسانەیان سەری من دەخۆن و تووشی گۆوەندێکم دەکەم و ئاخرییەکەی وەك کول مورتەزاکەی گوندی یۆنجالیك تووشی شێتخانەم دەکەن... کچێ دەسیتم بە داوێنت، لانیکەم ئەتۆ ئاگرەکە خۆش مەکە. وەڵاهی من نە وەلیم و نە تەڕەماش.

ژنەکەی بەبێ ئەوەی قسەیەك بکا، لەچکەکەی هەڵگرت و هێنایە پێش سەری و گوتی:

ـ ئەی ئەو برینەی من چییە. هەر دەستت وێی کەوت چاك بۆوە. ئەوەش درۆیە؟

تاشباش بەو قسەیەی دیسان وەك شیر هەڵچۆوە و هۆشی لەسەر خۆی نەما و هاواری کرد:

ـ کچێ ژنەتیوە شێتە، ئەمن سەری تۆم چاك کردەوە یان مرێمۆك؟ کۆنە ماکەری ماڵوێران، ئێستا منت لێ بووەتە وەلی و پیاوی خودا؟ ها؟

ژنە گوتی:

ـ سەرم...

تاشباش گوڕاندی:/

ـ کچێ ئەو سەرەت بە بڕین بچێ.

و پاڵێکی پێوە نا.

ئەو ژنەی خۆی، لە هەموو کەس پتر ئاگرەکەی خۆش دەکرد. دەبوو پێش هەموو کەس پێشی ئەو بگرێ. تووڕەییەکەی نیشتەوە و خەیاڵ هەڵیگرت و ڕێگەچارەیەکی دۆزییەوە و بە لەسەرخۆییەوە گوتی:

ـ ئەمن وەلیم، پێویست ناکا خەلکەکەش بزانن، بەڵام خۆیشم پێم وایە بوومەتە وەلی... وا نییە ژنەکە؟...

ژنەکەی بە خۆشییەوە گوتی:

ـ چۆن وا نییە؟ لە سەر سەرت گەڕێم، مەمەدەکەی خۆم. ئەتۆ ئەو پیاوچاکەی وا چوویتەتە ئاسمانی حەوتەمین. گوندییەکان دەڵێن وەلی و پیاوچاکەکان بەخۆیان نازانن بوونەتە وەلی.

تاشباش گوتی:

ـ مادام وایە، گوێ بدەیە بزانە دەڵێم چی. لە مەودوا جگە لە عەلیی برام و نەنە مرێمۆك نابێ بێلی کەس بێتە ئەو ماڵە و هاموشۆ بکا. تێگەیشتی؟

ژنەکەی گوتی:

ـ بەڵێ، بەڵام ئاخر ناکرێ بە دەروجیران بڵێم مەیەن.

تاشباش گوتی:
ـ لە دەرەوەی ماڵەوە و لە نێو دێ، نابێ باسی من بکەی.
ـ ئاخۆ دەپرسن. کاتێ پرسیار دەکەن...
ـ ئەوە پێت دەڵێم ژنەکە. ئەگەر باسی من بکەی بە چاك یان بە خراپ، بڵێی باشە یان خراپە، خەوتووە یان بەخەبەرە، ڕۆیشت یان هاتەوە، دڵنیابە ئەمن غەززەبت لێ دەگرم و ئیفلیجت دەکەم چاوەکانیشت کوێر دەکەم. لەو دنیاش دەتنێرمە جەحەندەمێ.
ژنەکەی ترسا. چیی نەمابوو خۆی بەسەر پێڵاوەکانیدا هەڵکێشێ. گوتی:
ـ وام لێ مەکە مەمەدەکەی خۆم، گەورە و سەروەرمان، وستەم لێوە نایە.
تاشباش کە لە خۆشی ئەو ڕێگە چارەیەی خۆی وەخت بوو بفڕێ، لە دڵی خۆیدا گوتی: "کوڕە پیاوچاکییش کەڵکی خۆی هەیە ها؟" دەیزانی ئیتر ژنە زاری ناکاتەوە و لە هیچ کوێ باسی ناکاتەوە.
دوای ئەوەی تاشباش ڕاشکاوانە باسی وەلی بوونەکەی خۆی بۆ ژنەکەی کرد، ئیتر ژنەکەی تەواو گۆڕدرا. هە. ناوەکەشی دەبیست، چەقوچۆی دەهاتێ.
تاشباش وردەوردە بێهیوا دەبوو و هیچ ڕێگەیەکی دەربازبوونی نەدەدۆزییەوە. تاقە کەسێك نەیدەویست ببێتە وەلی، سەفەر بوو. بەخۆی دەگوت: چۆنە لەگەڵ سەفەر ڕێك کەوم. ئاخۆ لەگەڵ ئەو شتێکیان لە دەست دەهات؟ نە بەخوای کەس باشاری ئەو گوندییە شێتانەی نەدەکرد...

***

ئەگەر ئەو دنیا هیچ و پووچ و بێ بەقایە بەسەرماندا خراپ نابێ، ئەی گەورە و سەروەرەکەی ئێمە ئاغا تاشباش کە چووی و لەگەڵ چل سوارەی غەیبی هەستاوی و دانیشتووی، و ئەگەر هەر لەسەر جێی خۆیەتی، دیسان هەر لە سایەی سەری تۆوەیە.
ئەدی، لەبەر ئەوە کە ئەو دنیایە سەروبن نابێ، لەبەر تاشباشە مەزنەکەی خۆمانە کە ئێستا بووەتە پیر و پیاوچاك."

***

سێ شەو و ڕۆژە ئاگرێك لەبەر دەرگای ماڵەکەی دایسێ. ئاگرێکی پیرۆزە بە تیشکی زێڕینەوە. ئێمە کوێر بووین و نەماندەدی. دەڵێن هەر یەکەم ڕۆژ، لەو ڕۆژەوە کە تاشباشی

سەروەر و پیرۆزمان، لە دایك بوو، لە بەر دەرگای ماڵە پیرۆزەکەیان ئاگرێك ئایساوە کە هەرگیز نەکوژاوەتەوە و کوژانەوەی نەبووە. ئەو ئاگرە کێ کردوویەتەوە؟ ئەو چل سوارەی غەیبییە بە مێزەری کەسك و عەبای سپییەوە... کاتێك ئەو ئاگرانە داییسان، لەو دەشتە پان و بەرینەوە، لە پاناوکەکەی ئەو دەشتەوە... بەرەو ماڵەکەی ئەو.... کێ دەهاتن؟.... هەموو شەوێ لە دەشتەکەوە... لە بەفرەکانی دەشتەکەوە، لە بەهاری دەشتەکەوە، لە نێو گوڵەکانی دەشتەکەوە، کێ دەهاتە دەرێ؟ ... هەزاران و هەزار کچی سپی پۆشی وەك گوڵی بادام... و تانجێکی ئەستێرەنیشانیان لە گوڵ لەسەر سەر بوو... دەهاتنە بەردەرگای تاشباشی سەروەرمان و لە دەوری ئەو ئاگرە پیرۆزە هەتا کەرەی بەیانی باڵیان دەگرت و سەمایان دەکرد. لە کاتی سەمای کچەکاندا، هەزاران کوڕی تازە پێگەیشتووی وەك گوڵە پشکووتووەکانی درای بادام، دەهاتن.... کچە سەماکەرەکانیان دەخستە نێوان خۆیانەوە."

"ئەو گوڵانەی نوقمی نوور بوون و هەموو شەوێ لە پێدەشتەکەوە دەخوشین و دەهاتن، ئەوە کێ بوون؟..."

"ئەوانەی وا چل ئاگریان دەکردەوە و هەتا بەیانی بە دەوریدا دەخولانەوە، کێ بوون؟...."

***

شەوێکیان، تاشباشی سەروەرمان، ئارەزووی بەهەشتی کردبوو. هەر ئەوەندەی ئەو خەیاڵەی هاتبووە کەللەی، سێ کچی دەست لێنەدراو، بە هەڵفڕین دەرکەوتن، کچەکان دەستیان گرت و گوتیان:"چاوت لێك نێ." و بڕێك دواتر گوتیان:"چاو هەڵێنە." تاشباشی سەروەرمان بە ژنەکەی خۆی گوتبوو، کە چاوم هەڵدێنم چ ببینم، ئەوە دیمەنێکم لەبەر چاوە، دڵم نەدەهات قەت بەجێی بێڵم."

"بەهەشت شەوانەشی وەك ڕۆژ وایە. هەموو جێیەکی نوقمی نوورە. شیر و هەنگوین بە دەشت و پێدەشتیدا دەڕوا. بەرزتر لە وڵاتی کەنعان. جۆگەیەکی پێدا دێ، کە شەربەتی پێدا دێتە خوارێ. مرۆڤ هەر لێی بخوا، مەست دەبێ. لك و پۆی دارەکان بەردەوام بەریان گرتووە و لەوێ هەمیشە بەهارە و زستان بەخۆوە نابینێ. تاشباشی سەروەرمان گوتبووی، نەمدەویست لەوێ بێمە دەرێ. کچە باڵدارەکانی بانگ کردبوو و گوتبووی:"زوو بمبەنەوە گوندەکەی خۆم." چون دەیزانی تۆزێکی دیکە لەوێ دا بێ، ئیتر قەت ناتوانێ لەوێ دابڕێ. بە کچە باڵدارەکانی گوتبوو:"خێرا بمبەنەوە گوندەکەی خۆم، چون لەوێ نەبم، ماریان بەسەردا دەبارێ و گوندییەکانم تووشی نەهامەتی دەبن و لێیان دەقەومێ. خێرا بمبەنەوە. وەختایەکی گوندییەکانی من ئاوا چارەڕەش و لێقەوماو بن، چ

سوودێکی هەیە ئەمن لە بەهەشتێدا بمێنمەوە و خۆم نەجات بدەم... ئەو تاشباشە مەزنەمان ئەو پیاوەیە کە لە بەر خاتری ئێمە وازی لە بەهەشت هێناوە و گەڕاوەتەوە..."

***

"تاشباشی مەزنمان یەکەم شەو وەڕێ دەکەوێ و نیوەی شەوێ دەگاتە کابەتوڵڵا و نێوچاوانی لە گۆڕی پێغەمبەرە نازدارەکەمان دەخشێنێ. بەرە بەری بەیانی دەگەڕێتەوە."

"دەست و پێ و هەموو گیانی سەروەرەکەمان کەسك ببوو. وەك شینکەی بەهاران. کێ ئەو ڕەنگە کەسکەی دەبینێ؟ ئەوانەی دڵێکی پاك و بێگەردیان هەیە و وەك مندالّ پاکن. ئەو بنیادەمانەی وەك مندالّ بێ تاوانن."

***

ئەو شەوەی پیرە دارگوێزەکە نوقمی نوور بوو، هەر ئەو دارە گوێزەی ساری قیز لە قازداغییەوە هێنابووی و لێرەی چەقاندبوو. ئەو شەوە ئەوەندە تاریك بوو، چاو چاوی نەدەدی. بەفرێکی نەرم و نیان دەباری. لە لای ڕۆژئاواوە دەنگی قەڵشینی شتێك بەرز بۆوە. دەنگێك وەك چیایەکیان لە نێوەڕاستەوە لەت کردبێ. خەڵك بە بیستنی ئەو دەنگە لە ماڵەکانیان ڕایانکردە دەرەوە، سەیر دەکەن دارێکی نوقمی نوور، لە تاریکیدا درز دەبات و دەخوشێ و دێتە پێشەوە. دارەکە خوشی و هاتە پێشەوە و لەسەر بانی ماڵی تاشباشی سەروەرمان ڕاوەستا و لەوێوە وەك دەروێشێك بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە. لەگەڵ ئەو دارەدا گوندییەکان و چل سوارەی غەیبی و کچەکانی پێدەشتیش ئەڵڵا ئەڵڵایان دەگوت و دەخولانەوە و هەڵدەفڕین و دووعایان دەکرد."

"تاشباشی سەروەر و مەزنمان، بە بیستنی ئەو دەنگانە لە ماڵەکەی هاتە دەرێ و سەیری کرد، ئەوە دارێکی گەورە بە لك و پۆپ و ڕەگ و ڕیشەی نوورانییەوە وەك دەروێشێك لە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە. هەرای کرد:"هۆی داری پیرۆز...." و کەوتە سوژدە و کڕنۆشی برد."

"هیچ قسەیەکی دیکەی لە زاری نەدەهاتە دەرێ، تەنیا دەیگوتەوە:"ئەی دارە پیرۆزکە، ئەی داری ساری قیزی دایکمان...."

" کە ئەو کڕنۆشی برد، دارەکە هاتە خوارێ و لە بەردەم تاشباشی سەروەرماندا کڕنۆشی برد و ئەوجار بەرەو لووتکەی چیای تەکەچ خوشییەوە."

***

"ئەو ڕۆژەی تاشباشی مەزنمان ئارەزووی هەنگوینی کرد، لە چاوترووکانێکا، سەیری کرد پوورەیەك هەنگوین لە بەردەمی دانراوە. تاشباشی مەزنمان دەستی لەو هەنگوینە نەدا کە ئەو هەمووە ئارەزووی دەکرد و گوتی:"ئەی هەنگوینەکە، کاتێك گوندییەکانم برسین و لە ژیانیاندا دەمیان لە هەنگوین نەداوە، ئەمن ناتوانم دەمت لێ بدەم."

***

"تاشباشی مەزنمان، هیچی ناخوا. چون پێویستیی بە خواردنێ نییە. هەموو ڕۆژێ دەنکە خورمایەکی لە بەغداوە بۆ دێ و خواردنی ڕۆژانەی تاشباشی مەزنمان هەر ئەو دەنکە خورمایەیە."

***

ئەی تاشباشی من کە چوویە ڕیزی چل سوارەی غەیبییەوە. لەسەر سەرت گەڕێم. هانام بۆ هێناوی. مەزنێ من، پادشاکەی من، ئاغاکەی من. ئەگەر ئەو گوندە بوومەلەرزەی لێ نادا، ئەگەر گیا وگژ لەو گوندەدا دەڕوێن و گوڵان دەپشکوێن و کێڵگەکان بەر دەگرن و ئاوەکان دەخوشن و بەهار دێ... هەمووی لە سایەی سەری تۆوەیە."

***

کێ چووەتە سەر لووتکەی چیاکانی "چل کانی"؟ تاجی سەرمان تاشباش. کێ ئەسپە سپییەکەی کوێرئۆغلوی کە ئەمرە، دۆزییەوە و بە سواری ئەو لە نێو هەزار و یەك کانیدا سەرچاوەکەی ئاوی ژیانی ناسیوەتەوە؟... کێ لەو ئاوەی خواردووەتەوە و سێ شەو و ڕۆژان لەسەر لووتکەکەی چیای تەکەچ لە هۆش خۆی چووە؟... تاجی سەرمان تاشباش. کێ دوای وەهۆش هاتنەوە، هەورێك لەسەر سەری سووڕاوەتەوە و پێی ناوەتە هەر شوێنێك وڵات شین بووەتەوەو گوڵان پشکووتوون و لەگەڵ هەر هەنگاوێکیدا نوور لە خاك بەرز بۆتەوە؟ کێ لە چیای چل کانییەوە هاتووەتە خوارێ و گەیشتووەتە ئەشکەوتەکەی چل سوارەی غەیبی و چل سوارەی پیرۆز و ئەمر بە عەبا سەوزەکەی بەریانەوە هاتوونەتە پێشوازیی و کڕنۆشیان بۆی

بردووه؟ و ئەوە کێ بوو پیری چل سوارە لەبەری هەستاوە و گوتوویەتی:"بەخێر هاتی، شوێنی من جێی تۆیە. فەرموو وەرە جێی من دانیشە." و جێیەکەی خۆی داوەتە وی؟ تاشباشی سەروەرمان.

"ئەوە کێیە پەرییەکان لە چیای تەکەچ کۆشکێکی بلوور و شووشەبەندیان بۆ ساز کردووە و پێیان گوتووە:"فەرموو گەورەی ئێمە، وەرە و لێرە بمێنەوە. ئەی سەروەری چل سوارەی غەیبی و پیاوچاکان." دەتەوێ کێ بێ؟ سەروەرمان تاشباش."

"ئەو نازیزەمان، کە گاڵتەی بە هەموو ئەو قسانە دێ و دەڵێ: ئەو خەڵکە کەرە، ئاخرییەکەی، بە دەردی ئەحە شێت و مورتەزام دەبەن، ئەو وەلییەی ئێمە کە ئەوەندە خاکەڕایە، کێیە؟ سەروەرەکەمان تاشباشە کە کۆڵەکەی نێوان عەرز و ئاسمانە."

## ٣٥

نەنە فاتمۆك دەیگوت:

ـ یاخوا لەسەر سەرت گەڕێم کاکە تاشباشی خۆم. کوڕە ئەتۆ خوا بۆ ئێمەی ناردووی. ئەتۆ دەرمانی دەرد و هیوای لێقەوماوانی. لاساری مەکە لەسەر تەپڵی سەرت گەڕێم. لاساری مەکە پیاوی خودا. لاساری مەکە پادشاکەی من. کاکی خۆم. خودا ئەتۆی کردووەتە هیوای هیوابڕاوان و شیفای نەخۆشان. ئەتۆ خۆشت باش دەزانی تاشباش گیان، ئەو کچۆڵەیەم حەوت ساڵە کەوتووە و هەڵنەستاوەتەوە. هیچ ئیمامزادە و فالگرە و شێخ و مشایخێك چاریان نەکردووە. تەنانەت دکتۆرەکەی چوکووراواش دیتی و هیچی پێ نەکرا. تاشباش مەزنی من، ڕاست ئەو کاتەی دەستم لە هەموو جێیەك شوشتبوو، خوا ئەتۆی نارد. خودا بەزەیی بەو کچۆڵە لێقەوماوەمدا هاتەوە کە حەوت ساڵە لەسەر گازەرای پشت کەوتووە. ئەتۆش ئەوە لاساری دەکەیت و نایەی ئەو کچەم نەجات بدەی. بەڵان ئەتۆ ئەمری خوای بەجێ ناهێنی. زۆر باشە. مەیکە، بەڵام ئەو خوا گەورەی لەو سەرەوە تۆی ناردووە، سەیر دەکا و دەبینێ خراپەمان لەگەڵ دەکەی. ئەگەر تۆ ئەو کچەم بۆ چاك نەکەیەوە، خودا ڕووت لێ وەردەگێڕێ و شۆککەش داغ قۆردوو دەکاتە وەلی. لاساری مەکە تاشباشەکەی خۆم. تۆ یارەببی ئەو فاتمۆکەت بە قوربانی گەنە موویەکت بێ. ئەو دەستەت کە لە لۆکە و گوڵ نەرم و ناسکترە، بەسەری دا بێنە، بەشکم ئەو کچە داماوەش بە مرادی دڵی خۆی بگا و ناهومێد نەبێ. ئەگەر دەستێك بەسەری دا بێنی، چیت لێ کەم دەبێتەوە؟ دەی یالڵا دەی تاشباشەکەم. ئەو چاکەیەمان لەگەڵ بکە. سەرت هەڵێنە و سەیرێکی ئاسمان بکە، دەبینی خوای گەورە لەوێوە دەبینێ. دەرگاکە بکەرەوە و وەرە دەرێ. ئەو کچە چاوەڕوانی تۆیە و دەڵێ، تاشباشی ئێمە دەرگاکەی بکاتەوە و دەستێك بەسەری مندا بێنێ و لەو ئازارە نەجاتم بدا.

" لە بەیانییەوە لەسەر ئەو بەفرە دانیشتووم. لاقەکانم سڕ و کەسیرە بوونە. کچۆڵە نەخۆشەکەشم وا کەسیرە دەبێ و دەمرێ. ڕۆژ لە نیوەڕۆ لایداوە و ئێستا تا ئێستا ڕۆ ژاوا دەبێ. تۆ خودا تاقە یەك جاری دیکە وەرە و دەرگاکە بکەرەوە. لاساری مەکە، خۆ هیچت لێ کەم نابێتەوە."

فاتمۆکێ، هەر لە بەیانییەوە کچەکەی بە کۆڵی خۆی دادا بوو و هاتبووە بەر دەرگاکەی ماڵی تاشباش. تاشباش لە دوورەوە دیتبووی و دەرگاکەی پێوە دابوو. دەیزانی فاتمۆك چیی دەوێ. کچەکەی لە مێژ بوو نەخۆش بوو و چاك نەدەبۆوە. فاتمۆکێ کە بیستبوویەوە تاشباش بووەتە پیاوچاك و وەلی گوتبووی:" خوا بەزەیی بە کچەکەی مندا هاتووە و دەرمانی دەردەکەی ئەوی بەو تاشباشەدا ناردووە." یەکێك لەو کەسانەی بەسەرهاتەکانی تاشباشی هەڵدەبەست و شاخ و کلکی وێدەخستن و لك و پۆی پێوە دەنان و بڵاوی دەکردنەوە، فاتمۆك بوو. بە چوار دەستان بە تاشباشەوە نووسابوو و لێی نەدەبۆوە.

ئەو تاشباشە وەلییەش، لاساریی دەکرد و نەیدەویست دەستێك بەسەری کچەدا بێنێ و تەنانەت ئامادە نەبوو لە ماڵەکەشی بێتە دەرێ و تاقە قسەیەکیشیان لەگەڵ بکات:

ـ ڕەنگە لەبەر ئەوە بێ ئەمن دەستکورت و هەژارم ها؟ ئەگەر دەوڵەمەندێك هاتبایە، بە غاردان نەدەهاتیتە پێشوازیی و نەك هەر دەستت بەسەریدا دەکێشا بەڵکو نەخۆشەکەشیت لە باوەش نەدەکرد؟ ئەتۆ پیاوێکی پیرۆزی. دا بلێ بزانم، ئاخۆ لای خودا هەژار و دەوڵەمەند فەرقیان هەیە؟ تازە، چونکە دەوڵەمەندەکان گوناحیان پترە، لە جەحەندەمیشا دەسووتێن. سامانەکەیان بۆیالن دەبێتە ئاوردووی جەحەندەمەکەیان. هەر کەسە و بە قەدرایی سامانەکەی خۆی دەسووتێ. هەژارەکان یەك ڕێ دەبەنە بەهەشتێ. ئەتۆ چ پیاوچاکێکی کە ئەوە نازانی تاشباش گیان.

"ئەتۆ دەستێك بەسەری ئەو کچەد بێنە، ئەمساڵ لە چوکووراوا چیی لۆکەی ڕنیمانەوە بۆ تۆ. ئەگەر دەتەوێ تاقە مانگاکەشمان (فندق)، ئەویش پێشکەشت بێ و وەرە دەست لەو لاسارییەت هەڵگرە."

کاتێ ژنە ئەو قسانەی دەکرد، تاشباش ئۆغلو لە ماڵەوە خەریکبوو شێت دەبوو، بۆ ئەوەی نەگورێنێ، بە زۆر و زۆرداری پێشی خۆی دەگرت. جاری وابوو مێشکی گەرمدا دەهات و وەك ئاگر هەڵدەبوو و جاری واش بوو، ڕەنگی بە ڕوخسارییەوە نەدەما و دەست و پێی دەلەرزین.

تاشباش ئۆغلو باش دەیزانی ئەگەر یەك جار دەستێك بەسەر ئەو کچەدا بێنێ، تا مردن دەستی لێ هەڵناگرن، بەڵام ژنەکە لەسەر بەفرەکە دانیشتبوو و جێویانی کچەکەی لە تەنیشت دیوارەکەوە ڕاخستبوو و نەیدەویست لە جێی خۆی ببزوێ و یەك پشوو دەپاڕایەوە:

ـ تاشباشی من، به قەرەواشت بم، وەلییەکەمان. ئەی پیاوچاکەکەی خودا، ئەی ئەو کەسەی ئەتۆ یەکێکی لە سەحابەکانی پێغەمبەرە گەورەکەمان، تۆخودا دەرگەکە بکەرەوە. ئەگەر دەرگا نەکەیەوە لێرە نابزووم. هەم ئەمنیش و هەمیش ئەو کچە نەخۆشەم لێر لە بن ئەو دەرگایەت کەسیرە دەبین و دەمرین. خوێنمان دەکەوێتە ئەستۆت. دەرگاکە بکەرەوە تۆ خودا..."

ئاخرییەکەی فاتمۆك دەستی کرد بە کوتانی دەرگاکە.

تاشباش ئیتر خۆی پێ نەگیرا. نەیتوانی بەسەر تووڕەییەکەیدا زاڵ بێ. بە پەلە دەرگاکەی کردەوە و دەرپەڕییە دەرەوە. دەیویست پیلی فاتمۆك بگرێ و بیخاتە نێوەڕاستی بەفرەکەوە، بەڵام کە دیتی ئەو دوو بنیادەمە داماو و لێقەوماو لەسەر بەفرەکەن، تووڕەییەکەی خواردەوە و ڕێك لەو کاتەدا بوو کە فاتمۆك خۆی خستبووە سەر پێڵاوەکانی و ماچی دەکردن.

تاشباش گوتی: ئەی هاوار، خوشکە فاتی، وەڵڵا بیللا، ئەمن وەلی نیمە. دەستم لێ هەڵگرن.

فاتمۆکێ گوتی:

ـ بە قوربانی ئەو دەنگە خۆشەت بم. خوایە شوکرت کە گوێم لەو دەنگە خۆشەت بوو... وەلیش نەبی، دەستی موبارەکت بەسەری ئەو کچەدا بێنە...

تاشباش گوتی:

ـ چ بکەم بۆ ئەوەی بڕوا بکەن... باشە چ بکەم؟... ئەمن وەلی نیم. ئەمن کابرایەکی زۆر گوناحبار و هیچ و پووچم کە بە چوار کتێبان کوشتنم واجبە. هەر وەك سەفەر دەڵێ، ئەمن چوومەتە زگ حەیوان و ئاژەڵان. دزیم کردووە، دەستدرێژیم کردووەتە سەر کچان، دەی پیاوی ئاوا دەبێتە پیاوچاك؟"

فاتمۆك گوڕاندی:

ـ درۆیە، درۆیە و لە جێی خۆی هەستا: هەموو ئەو قسانە درۆ و بوختانن. ئەتۆ وەك نووری خوای پاکی. هیچ پەڵەیەك بەتۆوە نانووسێ. یاخوا لە دەورت گەڕێم. تۆخودا دەستێك بەسەری ئەو کچەدا بێنە. کەیفی خۆتە، هەر شتێك دەبی ببە، بەڵام ئەمن هەر ئەوەندەم لێت دەوێ دەستێك بەسەر ئەو کچەدا بێنی. هەرچییەکت بوێ دەتدەمێ. حەز دەکەی حەوت کەڵەبابت بۆ دەکوژمەوە.

تاشباش کە زانیی لە کۆڵی نابێتەوە، ڕای کردەوە نێو ماڵێ و دەرگاکەی داخستەوە. فاتمۆکێ کە زانیی ئاوا بە ئاسانی لە کیسی چووە، تووڕە بوو و بە مستەکۆڵە بەربووە دەرگاکە و دەیگوڕاند:

ـ هەی بە زیاد نەبێ چ پیاوچاکێکی. خودا بتباتەوە. هەی کافری بێدین. بەرازی کافر. ئەمن نازانم خودا بۆچی هیچ و پووچێکی وەك تۆ دەکاتە وەلی ئەو بەڵایانەمان بەسەر بێنی.

لە ناکاو وەخۆی هاتەوە. بنیادەم ئاوا پیاوچاکان دەدوێنێ؟ و ئاوا جنێوبارانیان دەکا؟ وەلی و پیاوچاکان دەبێ نازیان بکێشی. دەبێ لەگەڵیان لەسەرخۆ بی.

ترسا. نەکا ئێستا زمانی گۆڵەی لێ بێ وەك دار لە زاریدا وشك بێ. دەستی کردە گریان:

ـ کوڕە یاخوا لەسەرت گەڕێم. بمبوورە تاشباش گیان. تۆ خودا تاشباشەکەی من لێم خۆش بە. هەڵەم کرد. ئەوەی نەدەبوو بیڵێم گوتم، بەڵام ئەتۆ تووڕەت کردم. دەستت بەسەری کچەکەمدا نەهێنا. بمبوورە. بەری پێیانت ماچ دەکەم. بمبوورە... ئەگەر تۆ لێم خۆش نەبی، خۆم دەکووژم.

سەری بە دەرگاکەوە نابوو و دەیقیژاند و هاواری دەکرد و بە کوڵ دەگریا.

ژنەکانی ئاوایی و منداڵك و پیاوەکان هاتبوونە بەردەگاکەی ماڵی تاشباش بزانن چ باسە. بێدەنگییەك بەسەر کۆڵانەکەدا کشا: نیو سەعاتێك دەبوو. هەڵکەکە هەروا ڕاوەستابوون و سەیریان دەکرد. هیچ کەس تەنانەت هەنگاوێکیش لە ماڵەکەی تاشباش نەدەچووە پێشێ. نە قسەیان دەکرد و نە دەشجووڵان. کەس متەقی لێوە نەدەهات. هێندێکیان هەڵترووشکابوون و هێندێکی دیکەیان هەر بە پێوە بوون. فاتمۆکێ کە هاتبۆوە سەر خۆ، گوڕاندی:

ـ بێت و دەست بەسەر ئەو کچەدا نەهێنی و لە منیش خۆش نەبی، هەتا دەمرم، لەو بەر دەرگایەت نابزووم. وەرە سەیر کە کاکە تاشباش گیان، سەیری ئاسمان بکە. ئەوە کرێوە دەکا. کرێوە... ئەمشەو ئەمن و ئەو کچە ئەگەر لێرە بمێنینەوە، ڕەق هەڵدێین و دەمرین و ئەتۆ لای خودا دەبیتە پیاوکوژ.

یەك پشوو قسەی دەکرد. تاشباش ئۆغلۆش بە هیوای ئەوەی بڕوای پێ بکا:" لە نێو ماڵەکەیەوە دەیگوت: کچێ پوور فاتم دەستم لێ هەڵگرە، وەڵڵا بیللا درۆیە. ئەو چاوانەم کوێر بن ئەگەر من پیاوچاك بم. ئەوانە لە خۆیانەوە قسان دەکەن، وەرە و دەست لە بەرۆکم بەردە. ئەمن دەزانم هیچ سوودێکی نییە.

ـ ئەگەر ڕاست دەکەی دەستێك بەسەری کچەکەمدا بێنە.

مشتومڕەکەی نێوان تاشباش و فاتمۆکێ هەر وا بەردەوام بوو. ئاخرییەکەی تاشباش قایل بوو. ژنە لاسار بوو. دەستی هەڵنەدەگرت. شەوێ لەوێ دەمانەوە و خۆی و کچەکەشی ڕەق هەڵدەهاتن. هەستی بە بەرپرسیارەتی کرد. هەر بە ڕاستی لە سۆنگەی ئەوەوە تێدا دەچوون.

جگە لەوەش شتێك لە ناخیدا هەبوو، نەیدەوێرا لە دڵی خۆشیدا بیری لێ بکاتەوە. هەر بە ڕاستی لەوانەبوو دەستی ئەو کچەکە شیفا بدات؟

وای لێ هاتبوو کوڵی گریانی هەستابوو. لە ڕادەبەدەر خۆی بە تەنیا و داماو دەدی... ناچار چوو و دەرگاکەی کردەوە. بەسەر کچەدا نووشتایەوە و دەستێکی بەسەریدا هێنا. ماوەیەك هەر وا مایەوە و دەستی بەسەر و قژی کچەدا هێنا. چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك و لە دڵی خۆیدا گوتی:" خوایە گیان، کەیفی خۆتە من هەر شتێك بم، ئەتۆ خۆت شیفای ئەو کچە بدەیت و چاك بێتەوە."

فاتمۆکە کە دیتبووی لێوەکانی تاشباش دەجووڵێن، خۆی خستە سەر پێیەکانی و گوتی:

ـ بە قوربانی ئەو کەسەی بم تۆی ناردووە، کاکە تاشباش. ئەتۆ خودا ناردووتی، خودا بەزەیی بە کچەکەمدا هاتووە...

لە سەر پێیەکانی هەستایەوە و بە دەستیدا نووسا. تاشباش خۆی لە دەستی ڕاپسکاند و خۆی خستەوە ماڵەکەی و چلمێردەی[1] خستەوە پشت دەرگاکەی. دەتگوت بارێکی قورسی لەسەر ئەستۆی داڕنیوە.

ئێستا کچە چاك بوایەتەوە یان نا، نەخۆش هرووژمیان دەبردە سەر ماڵەکەی. دەبوو چ بکا؟ چۆن پێشیان پێ بگرێ؟

فاتمۆکێ لە خۆشیان وەخت بوو بفڕێ. کچەکەی بە کۆڵیدا دا و ڕاخەرەکانی خستە بن هەنگڵی و بۆ دواجار دەرگای ماڵەکەی تاشباشی ماچ کرد و لەوێ دوور کەوتەوە. هەر لەگەڵ ئەوەی فاتمۆك لەوێ دوور کەوتەوە، تاشباش دەرپەڕییە دەرەوە و خەڵکەکە هێشتا بڵاوەیان نەکردبوو. چووە نێو خەڵکەکەوە و پێی گوتن:

ـ ڕاوەستن. مەڕۆن. دوو قسەم پێتانە.

خەڵکەکە وەك سەیری بوونەوەرێکی سەیر و سەمەرە بکەن، بە سەرسووڕماوییەوە لە جێی خۆیان وشك بوون و چاویان تێوەبڕی. تاشباش لە بن بارستایی ئەو نیگایانەدا دڕدۆنگ بوو. زمانی کەوتە پتە پت و شەلاڵی ئارەقە بوو. ماوەیەك بەبێ ئەوەی بتوانێ بڕیارێك بدا، ئەوسەر و ئەمسەری کرد و ئەوجار بەسەر خۆیدا زاڵ بوو و گوتی:

---

[1] چلمێردە: ئەو دارەی دەیخەنە پشت دەرگا.

ـ خەڵکینە، بە خودا من وەلی نیم. ئەو قسانەی لەسەر من و بنەماڵەکەم دەکرێ و هەڵیدەبەستن، هەر هەمووی درۆن. سەیری من بکەن. ئەمنیش یەکێکی وەك خۆتانم و بەندەیەکی گوناحباری خودام. لەوەتەی هەم سەرم بە فەرزی خودایدا نەداوە. بە دزییەوە ڕۆژووەکانم خواردووە. چوومەتە زگ حەیوان و ئاژەڵان. لە چوکووراوا تەنانەت لە مام خەلیلیش پتر لۆکەم دزیوە. ئارەق و شەرابم خواردووەتەوە و دەستدرێژیم کردووەتە سەر نامووسی خەڵکی. بە کورتی هەر گوویەکی پێم خوراوە خواردوومە و چیی گوناحە لێی نەپرینگاومەتەوە و کردوومە. وەڵلاهی مام خەلیل بە مام خەلیلییەکەی خۆی ببێتە وەلی من نابم. دەستم لێ هەڵگرن و لە کۆڵم بنەوە. بڕۆن وەلی و پیاوچاکێکی دیکە پەیدا بکەن کە بە ڕاستی پیرۆز بێ و بەکارتان بێ. پیاوێکی ئاواشتان لە ئاواییدا هەیە. ئەوەتا ئۆککەش داغ قۆردو. پێنج فەرزەی خودا سەری بچێ نوێژی ناچێ و لە بری مانگێك شەش مانگ ڕۆژوو دەگرێ. بەندەی باش و پاکی خودایە.

کێ دەڵێ ئەمن وەلیم و بە حەوت تۆپەڵە نوورەوە هەڵفڕیوم؟

پێکەنی:

"جوان و زەریف سەیرم بکەن. کوا تۆپەڵەی نوور؟ جوان سەیرم بکەن... تۆپەڵە نوور کوا؟ دەستم لێ هەڵگرن. لە کۆڵم بنەوە. ئەو کارە ئاقیبەتێکی خێری نابێ. ئەنگۆ منتان خۆش دەوێ. ئەو خراپەیەم لەگەڵ مەکەن. ئەگەر ئاوا بڕوا، یان تووشی بەندیخانەم دەکەن یان شێتخانە و بە سێدارەم دەدەن. باشە بەزەییتان پێمدا نایەتەوە؟"

بێ پسانەوە قسەی دەکرد. چیی زیاتر قسەی دەکرد، زمانی پتر دەپژا و پتر خەڵکی لێ کۆ دەبوونەوە. کەس لە ماڵەوەدا نەمابوو و هەر هەموویان هاتبوون و لە دەوری کۆ ببوونەوە. تاشباش بە هەموو هێزی خۆیەوە هەوڵی دەدا قایلیان بکا. چەندی پێی کرا خۆی سووك و ڕیسوا دەکرد، و لە نێو قسەکانیدا بەردەوام دەیگوتەوە"تۆ خوا بنیادەمی ئاوا شیاوی ئەوەیە بکرێتە وەلی؟"

چاوەڕێ بوو گوندییەکانی لە دووی بدەن و بڵێن ڕاست دەکەی، پیاوی وەك تۆ بۆ پیاوچاکی ناشێ."، بەڵام کەس متەقی لێوە نەهات.

هەتا ڕۆژئاوا بوو هەر قسەی کرد. کە قسەی تەواو بوون، دڵی خۆش بوو. جا ئێستا ئەگەر گوندی دەتوانن با بێن و بیکەنە وەلی و بە پیاوچاکی بزانن.

بە نێو حەشیمەتەکەدا تێپەڕی و بەرەو ماڵەکەی ڕۆیشت. گوندییەکان وشك ببوون و بە ڕقەوە سەیریان دەکرد. تاشباش خۆی نەیزانیبوو.

ئەو دنیا نەخشینەی چەند مانگێك بوو لە سایەی تاشباشدا بۆخۆیان دروست کردبوو، خەریك بوو کاول دەبوو. ئەو دنیا پڕ لە سیحر و هیوا و جوانییە... تەنانەت دوای ئەوەی تاشباش چۆوە نێو ماڵەکەی و دەرگاکەشی پێوە دایەوە، خەڵکەکە هەر لەجێی خۆیان نەبزووتن. تەنانەت قسەیان لەگەڵ یەکتریش نەکرد. بایەکی ساردی سەهۆڵێن لە لای دەشتەکەوە هەڵیکردبوو. ئەوان کە نەیاندەزانی دەبێ چ بکەن و چ لە تاشباش بکەن، واقیان وڕ مابوو. جگە لە گڤەی سەهۆڵینی بایەکە، کە سات بە سات بە تەوژمتر دەبوو، سریوەی هیچ شتێك نەدەهات.

ئەگەر دەنگی پڕ لە جۆش و خرشی پیرەژنەکە بەرز نەبووبایەتەوە و بە فریایان نەهاتبا، لەوانەبوو هەتا بەیانی هەر ئاوا لە بەردەگاکەی تابشا بێ جووڵە ڕاوەستابایەن. ژنە دەیگوت:

ـ چما ئێوە شێت بوون، کام پیاوچاك و وەلی تا ئێستا دانیان بە پیاوچاکبوونی خۆیاندا ناوە؟ ئەوانە هەموویان وەلی بوون و حاشاشی لێ دەکەن. ئەوانە خەڵکێکی خاکەڕان.

ئەو قسانە وەك ڕووناکاییەك دڕی بە تاریکییەکەی دەروونیان دا:

ـ کێ دیتوویەتی پیاوچاکێك بڵێ ئەمن وەلیم.

ـ بە خوای ئێمەش کەرین.

ـ کوڕە خۆ خەریك بوو بڕوا بە قسەکانی تاشباش بکەین.

ـ چیی وای نەمابوو ڕووڕەشی دەرگای خوای بین.

ئەوانەی لە دڵی خۆیاندا جنێو و قسەی سووکیان بە تاشباش دابوو، وێکڕا گوتیان:

ـ تۆبە.... تۆبە... هەزار جار تۆبە... لە گوناحانمان خۆش بە. خۆت بە سەهووت بردین و تووشت کردین... ئەی کاکە تاشباش، سەروەری ئێمە.

ـ ئەتۆ بە سەهووت بردین...

ـ دیسان وێکڕا گوتیانەوە:

ـ نیوەی گوناحمان بە ئەستۆی تۆ.

# ٣٦

ئیتر ئاسوودە ببوو. هیچ پێی وا نەبوو ئاوا سووك و ئاسان ئەو گێچەڵەی لە كۆڵ بێتەوە ئاخر كاكە، دەبێ ئاگرێك لە گۆڕێ بێ، ئینجا دووكەڵێكی لێ هەستێ. خۆ بچووكترین شوێنەوار و هێمای وەلیبوونی پێوە بوایە، خەڵك كوا ئاوا سووك و ئاسان لەكۆڵی دەبوونەوە. ئەو هەمووە باسی خۆی كردبوو، ئەو هەمووە خۆی داوێن پیس و گەمار كردبوو، كەچی گوندییەكی بێناموس نەبوو بێ و بڵێ"كاكە تاشباش گیان، ئەتۆ لە خۆڕایی بوختان بە خۆت دەكەی، ئەگینا شتی وا لە تۆ ناوەشێتەوە. ئێمە لە منداڵییەوە دەتناسین و دەزانین هیچ پەڵەیەكی ئاوا بە تۆوە نانووسێ."

بەبێ ئەوەی سریوەیان لێوە بێ، گوێیان دابوویە و دەسبەجێش دەستیان لە كۆڵ كردبۆوە. لەوانەشە تا ئێستا یەكێكیان دۆزیبێتەوە... نەشاندۆزیبێتەوە دیارە لە مەرقەدەكەی "باوە باران" پەرجۆیەك دەبینن.

مەرقەدەكەی باوە باران دوور دوور لە نێو دەشت و چیاكانی تۆرووسدا، لەسەر گردۆڵكە قسڵێك بوو. ئەو ساڵانەی باران نەدەباری و وشكە ساڵ دەبوو، گوندییەكانی دەشتێ، دەچوونە ئەوێ و كەڵەشێرێكیان دەكردە قوربانی و نوێژەبارانەیان دەكرد. باوە باران، تەنیا كەڵەشێریشی بۆ قوربانی قەبووڵ دەكرد و هەر شتێكی دیكەیان قوربانی كردبا، بە پێچەوانەی داواكەی ئەوان دەجووڵایەوە. باوە باران گەلێك پەرجۆ و ئەفسانەی هەبوون و ئەو بۆ خۆی خدرێكی دیكە بوو. سروشت لە بن ڕكێف و دەسەڵاتی ئەودا بوو. ئەو بەفری دەنارد و تۆفانی هەڵدەستاند و باو و باران بە ویستی ئەو خۆشی دەكردەوە. ئاوەكان ئەو هەڵیدەستاندن و دەیكردنە لافاو و هەروەها هەموو بەرەكەتەكانی دەشت بە دەستی ئەو بوو. كە وشكەساڵیی دەبوو، گوندییەكان چیی جنێو و قسەی تاڵ بوو بۆ باوە بارانیان دەنارد. هەزاران گوندیی برسی لەسەر گۆڕەكەی كۆ

دەبوونەوە و بە گریان و لالآنەوە تف و نەحلەتیان دەکرد. ئەدی ئەو ساڵەکە بۆچی دەستوداوێنی باوە باران نەببوون و بە تاشباشیان دەسنیشان کردبوو؟

ئێستا کێیان پێ خۆشە با هەڵیبژێرن. یا ئوککەش داغ قۆردو یان باوە باران... چیی حەز لێیە با بیکەن، تاشباش ئەوە لە کۆڵ خۆی کردبوونەوە.

کورە خۆ گوندی زۆر بێ بەزەن. دەبینی یەکێك هەتا ئەو ساتەش لە لایان وەلی و پیر و پیاوچاکە، هەر ئەوەندەی زانییان ئیتر قازانجی بۆیان نییە، لەو ئاسمانەوە شلپ بە عەرزەکەی دا دەدەن و دەیکەنە پەڕۆ گوو. خۆ تازە بەزەییان بە فرمێسکیشیدا نایەتەوە. باشە یانی چی، پیاو یەکێك بە وەلی و پیاوی خودا بزانێ، و دارستانێك لە نووری وەدوو بخا و بیباتە ئاسمانان و دوایی بە دوو قسان لە بیر خۆی بەرێتەوە؟ دەی با ئەو دوو قسەیە وەلییەکە خۆیشی کردبێ....

تاشباش لەگەڵ ئەوەشدا کە لەو حەوت ساڵ ململانێیەیدا لەگەڵ کوێخا، هەر ئەو گوندییانە پشتیان لە عەرزی دابوو، هەرگیز ئەوەندەیان لێ تووڕە نەبوو. گوتبووی:"ئەمن چوومەتە زگ ژنی خەڵکی". چما گوندییەکان نەیاندەزانی ئەو لە ژیانیدا کاری وای نەکردووە؟ گوتبووی:" دزیم کردووە و شەرابم خواردووەتەوە و کەرم و ئاژەڵم گاوە." چما گوندییەکان نەیاندەزانی ئەو بە تووتووش* تخوون کاری وا نەکەوتووە؟ کورە هەر سەگبابێك نەهات بڵێ:"بوختان بەخۆت مەکە، ئێمە ئەتۆ باش دەناسین."

بەڵام هەرچی بوو، بوو. خۆ ئەو لە کۆڵ خۆی کردبوونەوە... ئەگەر یەکێك گوتبای وا نییە، ئیتر خۆ گوندی لێی نەدەبوونەوە. باشتر کە هیچ کەس متەقی لێوە نەهات. خۆ مرێمۆك قسەی پێ کرابایە، هەر دەیگوت. بێدەنگ نەدەبوو. گوتنی چی، هەر دەیکردە هەڵلا و قیامەتێك هەر مەپرسە. چ باشتر کە هەر قسە ناکا... باشتر... بە خێر ڕابرد... ئیتر بەڵای ئاوای تووش نابێتەوە. لە خەم خەلسابوو...

ژوورەوە تاریك بوو. پووشکە و ئاوردووەکەی نێو کوانووەکەش وا نەبوو بڵێسەی بەرز بێ. وردە وردە دەسووتان و تەواو دەبوون. گوندییەکانی داوێنی تۆرووس تێروپڕتر بوون. لانیکەم کوانووەکانیان داری وای تێدا بوو گڕ بگرێ. تەلاشی دار کاژیشیان هەبوو بۆ دەستەچیلە. خەڵکی دەشتێ ئاوردوویان نەبوو. لە ئاورگە و کوانووەکانیاندا لە بری دار و ئاوردوو، دەوە و

---

* بە تووتوو: بە هیچ شێوەیەك. هێمن دەفەرموێ: بە تووتووش تووشی مەکتەب کوا دەهاتم من کە زانیبام....

تەپاڵە و کەمرەیان دەسووتاند. خۆ کەمرە و تەپاڵەش ئاوری نییە. لە گوندەکانی ئەو دەشتەدا، هەر شەو بەسەردا دەهات، تاریکییەکی خەست خەست باڵی بەسەر وڵاتدا دەکێشا. نێو ماڵەکان بە قەد یەك تاریك بوو... هیچ ڕووناکاییەك دڕی بەو تاریکاییە نەدەدا. شاعیر واتەنی:

"تاریکاییەکی هەزاران ساڵە... دایگرتبوو شەو و ژینی ئەو ماڵە."

خۆ بڵێسە و ئاگری تەڵاشە کاژیش ڕووناکاییەکی وای نییە. ڕووناکاییەکەی هێندە نابا. ئەگەر تەڵاشێکی کەم بسووتێنی، ڕووناکاییەکی وای نییە، و ئەگەر زۆریشی پێوە بنێی، دووکەڵ دەکا. بە کورتی بۆ ڕووناکایی نییە. هەر لە ماڵەکەی کوێخا سەفەر شۆڵەچرایەك (چرایەکی نەفتی) هەیە.

تاشباش کە لە تاریکی ماندوو ببوو گوتی:

- ژنەکە یەك دوو تەڵاش داگیرسێنە. لانیکەم با دەموچاوی یەکتری ببینین. نیمانە؟

ژنەکە بەبێ ئەوەی متەقی لێوە بێ، هەستا. دوو تەڵاشی داگیرساند. ئاواش یەکتریان نەدی. تاشباش لە دڵی خۆیدا گوتی:"ئەو دارەی هەموو شەوێ لە سەر سەربانەکەمان دەخوشێ و دەخولێتەوە، خۆزگە سەت خۆزگە لە کولانکەی دووکەڵکێشەکەوە هاتبایەتە ژووری و من و منداڵەکانم لانیکەم توانیبامان یەکتری ببینین." بەخۆی پێکەنی و گوتی" داری نوورانی، ئەگەر بێش لە سەر ماڵەکەمان ڕادەوەستێ، خۆ نایەتە ژووری..."

گوتی:

- باشە ژنەکە، شوکرانەبژێر بە، ئەو وەلی و پیاوچاکییەم لە کۆڵ خۆم کردەوە. وەڵڵاهی قسەی وام بەو گوندییانە گوت، لە بەر چاویان خۆم کردە پەڕۆیەکی گواوی و ئیتر زانییان پیاوی وا لێی ناوەشێتەوە وەلی و پیاوچاك بێ و دەستیان لە کۆڵ کردمەوە. دیارە جارێ لە کۆڵم بوونەتەوە، بەڵام لەو دارە نوورانییە دەترسم. ئەگەر ئەمشەو دیسان بێتەوە و لە سەر ماڵەکەم بسووڕێتەوە و گوندی ببینن، ڕەنج بە خەسار دەبم و گوندی دیسان دەستم لە ئێخەی ناکەنەوە. ئەو کاتە ئەمن بۆخۆم دەزانم دەبێ چییان لێ بکەم. نا، نا، کوڕە چیی دەبێ با ببێ چش. ئیتر گوندی بە پیاوی پیرۆزم نازانن.

ژنەکەشی وەك گوندییەکانی بیر دەکردەوە. وا بە سەرسووڕماوییەوە سەیری کرد وەك بوونەوەرێکی نامۆ و سەیر و سەمەرە لە لێرەوارەکانی تۆرووسەوە هاتبێ و لە تەنیشتییەوە دانیشتبێ. تاشباش ڕوانینە سەیر و سەمەرەکانی ژنەکەی هەست پێ کرد، بەڵام نەیدەزانی بۆ ئاوا بە بە سەرسووڕماوییەوە سەیری دەکا. بە پێکەنینەوە گوتیك

ـ باش بوو. ژنەکە، ڕزگارم بوو لە شێتخانە و زیندان نەجاتم بوو. ئەوە عادیلیش کەوتووەتە چاکەکاری. لە جێی ئەوەی بێت و گوندییەکان ڕووت بکا، قەرزیشیان دەداتێ. ئەمسالّ جا بلّێ چی نەکرا؟ سەفەریش ئەو سەرەی بردی نەیهێنایەوە. ئەو ڕۆیشتنەی سەفەرم هیچ بە کەیفێ نەبوو. پێم وایە خەریکە گێچەلّێك بۆ ئەو گوندییانە دەنێتەوە.

تووڕە بوو و گوڕاندی:

ـ کچێ ژنەکە بۆ قسە ناکەی؟ چما لالّ بووی؟ گۆلّەت لە زمانی هاتووە؟

ژنەکەی سەری بەردایەوە. منداڵەکانیش وەکو دایکیان سەیری تاشباشیان دەکرد. تاشباش هیوایەکی تێکەلّ بە ترسی لە نیگایاندا دەدی. هەر بە ڕاستی لە مەودوا گوندییەکان وەك جاری جارانیان سەیر دەکردەوە؟

تاشباش وردەوردە هەستی دەکرد ئەمجارەش خەریکە کارەکە خراپتر دەبێتەوە. ئەو کارە سنوری نەبوو. ئیتر گوندی نەیاندەتوانی بە چاوی جارانی سەیر بکەنەوە و بە پیاوێکی باش و ئاسایی بزانن. یان تاجی پیرۆزی لەسەر دەنێن یان لە سەگ کەمتری دادەنێن. هەر چەند چرکە لەوە پێش دیتبووی کاتێ بەجێی دەهێشتن، چۆن هەر چوار دەوری بە ڕق و قین تەنرابوو و دیتبووی کە چۆن لێی بێزار بوون. ئەو بێزارییەی لە ناخییەوە هەست پێ کردبوو.

جا ئێستا چ دەبوو؟ دیارە بەیانی کە دەچووە نێو دێ، هیچ کەس سەیری نەدەکرد و هەموو جنێویان پێی دەدا و سووکایەتییان پێ دەکرد. هەرگیز لێی خۆش نەدەبوون و وەك یەکێکی خەلّکی خەلّەتاندبێ و درۆی لەگەلّ خەلّك کردبێ، ئاوایان سەیر دەکرد. بە چاوی کەسێك کە هەموو هیواکانی بەبادا دابێتن و جوانترین ئارەزووەکانی لێ کوشتبێتن. وەك قاتلّی منداڵەکانیان سەیریان دەکرد. ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ڕقیان لێی دەبوو. ئاخری ڕۆژێك شوانەکان تەرمەکەیان لە نێو شیو و دۆلّێکدا دەدۆزییەوە کە بە بەردێك مێشکی پژاوە و دەیانگوت ئەوە جن و پەری سەریان بە بەردی پان کردووەتەوە.

دوای ئەوە تەنیا یەك ڕێگەی نەجاتی هەبوو: ئەویش ئەوە بوو کە گوندییەکان هیچ ڕێزێکی بۆ دانەنێن و گاڵتە و قەشمەریی پێ بکەن..، بەلاّم تاشباش دەیزانی هیچ کەسێك قەشمەریی پێ ناکا، بەلاّم خۆزگە هەر وا بە وەلی و پیاوچاکیان زانیبایە. زۆر زۆر پەژیوان بوویەوە لەو قسانەی کردبوونی. بەخۆی دەگوت:"ئاخر پیاوی گەمژە، پیاو ڕۆژێکیش پادشا بێ، هەر پادشایەتییە. ئێستا کە گوندییەکان تۆیان کردبووە وەلی، بۆچی لە خۆڕایی پێشت پێ گرتن؟ پیاوی کەر، ئەتۆ بۆخۆت لە کوێ دەزانی وەلی و پیاوچاکیت یان نیت؟ بۆچی گوتت نیم؟ جا ئێستا گوندی گووت بە زاری

دەبەستن و نەك هەر لەو گوندە بەڵكو لەو دنیایەشدا نایەڵن بژییێ. پیاوی کەر، جارێك لە ژیانتدا بازی بەخت و شانس لە سەر شانت نیشتەوە، ئەویش چ بازێك... بازێك کە لەسەر شانی پادشای ئینگلیزیش نانیشێتەوە. ئەگەر بە گوندییەکانت گوتبایە چیای تۆرووس لە جێی خۆی هەڵکەنن و بیبەنە چوکووراوا، دەمودەست بە قسەیان دەکردی. بە دەستی خۆت، بەو زمانە بە بڕین چووی خۆت، هەموو شتێکت تێك دا. هەی تاشباشی کەری گەمژە...

ماندوو ببوو هێندەی هەموو ڕۆژێ لەگەڵ خۆی و گوندییەکان بەشەڕ بێ. گوتی:" هەیهوووو... کوڕە وازی لێ بێنە، چیی دەبێ با ببێ. با هەر بەیانی بیچن و بمبەن لە دارم بدەن."

بەو خەیاڵە، نێوچاوانە گرژەکەی کرایەوە. مچوڕکێکی شیرن بە هەموو گیانیدا گەڕا. سەیرێکی دەوروپشتی خۆی کرد. دیتی منداڵەکانی خەوتوون. بۆ یەکەم جار هەستی کرد دەنگەدەنگێك لە دەرەوەڕا دێ:"چما هێشتا ئەو خەڵکە بڵاوەیان نەکردووەە؟ دەی با نەیکەن. تووتکە سەگینە. سەگی برسی."

چوو دەرگاکەی داخست و چلمێردەی هاویشتە پشتی. کەفوکوڵ و شەهوەتێکی خۆش وردە وردە لە گیانی گەڕا. لە مێژبوو بەهۆی ئەو کێشە دەروونییەوە ئەوەی هەر لەبیر نەمابوو. کتوپڕ سەیری کرد ژنەکەی زۆر جوانە..، بەڵام ژنەکەشی هەر بە ڕاستی زۆر جوان بوو. چاوەکانی گەورە و قووڵ و ڕەش بوو،.

ژنەکەی لە پشتەوە لە ئامێز گرت. ژنەکە پەلەقاژەی کرد لە دەستی ڕزگاری بێ و دەرپەڕی و چووە قوژبنی ژوورەکە. تاشباش چووە لای ژنەکەی. ژنەکە لەو قوژبنەدا کروشمەی کردبوو و هەڵدەلەرزی. خۆ جاری جاران کە تاشباش باوەشی پێدا دەکرد، ژنەکە بە ئەشقێکەوە کە هەتا ناخی ئێسقانەکانی ڕۆدەچوو، خۆی دەدا بە دەستییەوە.

تاشباش دەیزانی مەسەلەکە چییە، بەڵام جگە لەوەی پەیتا پەیتا بڵێ:"کچێ چما تۆ شێتی... کچێ ئەوە شێت بووی؟" هیچ دیکەی پێ نەدەکرا.

ئەو حاڵەتەی ژنەکەی هەم تووڕەی کرد و هەمیش پێی خۆش بوو. لە ناکاو دایە پێکەنین و گوتی:

ـ کچێ، خۆ پێغەمبەرەکانیش سەرجێیی ژنەکانی خۆیان دەکرد. هەموو وەلی و پیاوچاکەکان و تەنانەت خدری زیندووش ژنیان هەبوو.

دیسان ویستی ژنەکەی لە ئامێز بگرێ. ژنەکەی دیسان چوست و چالاك لە بن دەستی دەرپەڕی و بەرەو دەرگاکە ڕای کرد. ـ کچێ ئەوە شێت بووی؟... کچێ ئەوە شێتی تۆ؟

ئەوە چ بەڵایەك بوو بەسەری هاتبوو؟ ژنەکەشی لەگەڵی ئەدەخەوت و منداڵەکانیشی لێی دەسڵەمینەوە. دەیگوت:"کچێ ژنەکە، بە خودایەتیی خودا، من نە وەلیم و نە شتێ دیکەش، کچێ کوێر نەبێ، چما تۆ شێت بووی؟"

هەر نووکی پەنجەی وە ژنەکە دەکەوت، ژنە وەك مێژۆکە دەلەرزیی. هەتا بەیانی نەنووستن. تاشباش تا بەیانی قسەی بۆ کرد، بەڵام ژنەکەی نەدەچوو لە گوێیەوە کە ئەو وەلی نەبێ. بە چەند قسە هەموو خەڵکی گوندێکی ئاوا گەورەی قانع کردبوو، بەڵام چیی دەکرد ئەو ژنە خودا غەزەب لێگرتووەی پێ قایل نەدەبوو.

کە بەیان ئەنگووت و ڕۆژ بۆوە و ڕووناکایی لە دەلاقەکەوە هاتە ژوورەوە، تاشباش ددانەکانی چیڕ کردنەوە و بەخۆی گوت: ئاخ، خۆ ئەگەر وەلی بوایەم، ئەو کات پێم دەگوتی. دەمودەست وشکم دەکردی. زمانتم لە زارتدا وەك دار وشك دەکرد. دەمکردییە پیرەژنێکی حەفتا ساڵانە... خۆ هیچ یەك لەوانەشم نەکردبایە، لانیکەم برێك ئەقڵم دەخستە ئەو مێشکە بۆشەتەوە. مخابن وەلی نیم. هیچ دەسەڵاتێکم نییە و بە چاك و خراپ چیم پێ ناکرێ."

لە ماڵەکەی چووە دەرێ، بەڵام خێرا گەڕایەوە. ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو. ژنەکەی کە لەو ڕەنگ هەڵبزرکانەی تۆقیبوو، پرسی:

- چییە؟ چ بووە؟...

تاشباش بە ناڵینەوە گوتی:

- نەخۆش...

ژنەکەی لە ماڵێ چووە دەرێ. لە دەرەوە، لە تەنیشت دیواری ماڵەکەیانەوە، چەند نەخۆشێکیان بە جێویانەوە هێنابوو و لەسەر بەفرەکەیان دانابوون. کرێوەیە دەکرد، لە خوارەوە، لە نێو گوندەکەشەوە ژن و پیاوەکان هەر کەسە و نەخۆشێك بە کۆڵەوە و بەرەو ئەوێ دەهاتن. ژنەکەی بە خۆشحاڵییەوە چۆوە ژوورێ، لە خۆشیان ڕووخساری گەش گەش ببۆوە، چاوی لە مێردەکەی بڕی و چاوەڕێ ما. تاشباش چاوی بڕیبووە ئاگردانە دامرکاوەکە. ماوەیەك دواتر وەخۆ هاتەوە و گوتی:

- پێیان بڵێ ئەو نەخۆشانە بێننە ژوورەوە. دیسانیش نەمتوانی خۆم ڕزگار بکەم. وا دیسارە دیسان...

ژنەکە دەرگای لە نەخۆشان کردەوە. زۆری پێ نەچوو، ماڵەکەی پڕ بوو لە خەڵکێکی سیپاڵ شڕی بۆگەن، کە هەر کامە سێ چوار ساڵێك دەبوو لە پێ کەوتبوون و هیوایەکیان بە ژیان

نەمابوو. خۆ ئەگەر نەفەس و نزای تاشباش کاری نەکردبایە و چاری نەکردبان، ئیتر دەبوو دەستیان لێ بشۆن. تاشباش دەستەکانی هەڵبڕین و لە ناخی دڵییەوە داوای لە خودا کرد و بۆ چاکبوونەوە و ڕزگاربوونی ئەو لێقەوماوانە پاڕایەوە. چووە ژوور سەری هەموو نەخۆشەکان و فووی لە دەموچاوی یەك بە یەکیان کرد.

کاتێك ئەو دووعاکەی دەکرد و فووی لێ دەکرد، نەخۆشەکان چاویان هەڵدێنا و بە هیوا و سوپاس و پێزانینەوە سەیریان دەکرد. تاشباش تاڵ تاڵ دەستی بە مووی سەریاندا دێنا. خزم و کەسی نەخۆشەکان سەرقەڵەمانەشیان هێنابوو. تاشباش هیچ سەرقەڵەمانەیەکی وەرنەگرت و گوتی:

ـ ئەوانەی لەمەودوا دێنە لای من، لە سەرە پەنجەیەك خوێ پتر، هیچ شتێکی دیکە نەهێنن. ئەگینا خودای گەورە دووعام لێ وەرناگرێ. سەرە پەنجەیەك خوێ، نیوەی کلکەوانەیەکە.

## ٣٧

مرێمۆك لەو باو بۆڕانەدا کە لە دەشتەکەوە هەڵیکردبوو، بە نێو دێدا غاری دەدا و لەچکە سپییەکەی بە دەم بایەکەوە دەشەکایەوە. گوندییەکان دەیانزانی بەو کەرەی بەیانییە بۆچی و بۆ کوێ دەچێ. ژنان و کچان و ئەو بووکانەی چاویان لە غاردانەکەی ئەو بوو، وەشوێنی کەوتن.

هەر هێندەی چاوترووکانێك، هەموو ژنەکان، لە گۆڕەپانی گوندەکە کۆ بوونەوە. مرێمۆك لە مەیدانەکەدا ڕاوەستا، سەیرێکی ئەو ژنانەی کرد وا لە دەوری کۆ ببوونەوە. لە هەموو جووڵە و هەڵسوکەوتەکانییەوە دیار بوو زۆر تووڕەیە. داهاتەوە و بەردێکی پڕ بە چنگی هەڵگرت. ژنەکانی دیکەش داهاتنەوە و بەردیان هەڵگرت. ژنە گەنجەکان هەر کامەیان کۆشێك بەردیان کۆ کردەوە. مرێمۆك بەرەو ماڵەکەی سەفەر کەوتە ڕێ. ژنەکانی دیکەش هەروا. کەس متەقی لێوە نەدەهات. وەك گۆمێکی مەند و بێ شەپۆل وا بوون.

مرێمۆك تیژ ڕۆیشت و پەلاماری دەرگاکەی سەفەری دا. ژنەکانیش بە دوویدا گەیشتنێ. دەرگاکە نەکرایەوە. سەفەر کە دیتبوونی ئاوا بە تووڕەییەوە دێن، چلمێردەی خستبووە پشت دەرگاکەی و کۆلکەدارێکی گەورەشی لە پشتییەوە دانابوو. ماوەیەکی زۆر پاڵیان بە دەرگاکەوە نا، بەڵام نەکرایەوە. سەیریان کرد هەرچی دەکەن و دەکرێنن، ناتوانن بیکەنەوە. کشانەوە دەستیان کرد بە بەردەباران. بەرد وەك بارانە بەسەر ماڵەکەی سەفەردا دەباری. سەفەر لە ژوورەوە پێنج تیرێك بە دەستەوە چاوەڕێ بوو. خەریك بوو زراوی بچێ. پێنج تیرەکە هەر پێنج فیشەکی هەبوو. خۆ وای دانێین توانیبای لە پتر لە پێنج کەسیش بکوژێ، خۆ کوشتباشی، ئەی ئەو ژنانەی دیکە، کە وەك کوللە و مێروو هرووژمیان هێنابوو، ئەو و هەموو ژنەکانی و منداڵەکانیان تەرت و تونا دەکرد. ساتێك بیری کردەوە چەند فیشەکێك بە هەواوە بنێ. دوایی پاشگەز بۆوە. دیسانی بە مێشکیدا هات، چەند کەسێکیان لێ بکوژێ و ڕا بکا. لەوەش پەشیمان بۆوە. بیری کردەوە بێت و دڵۆپە

خوێنێك بكەوێتە سەر ئەو گورگانە، ئەوان تەنانەت یەكتریش لەتوپار دەكەن... ژنان بێت و چاویان بە خوێن بكەوتایە، دەبوونە گورگی دڕندە و خاكی ماڵەكەی كوێخایان بە توورەكە دەكێشا. باشترین ڕێ ئەوە بوو كە بە تفەنگەكەیەوە، چاوەڕێ بێ بزانێ چیی لێ دێتەوە. دەیزانی ڕێگەی دەربازبوونی نییە، بەڵام هەر دەبوو تا دوایین سات هیوادار بێ.

لایەكی دەرگاكە شكابوو و لەوێوە بەردەكان دەگەیشتنە بن ئاگردانەكە. یەكێك لە بەردەكان وەقاچی كچەكەی قیرسمایل كەوت. قاچی ژنەكە ئەستوور بوو و ئەوەندە ژانی كرد، یەك بەخۆی هاواری دەكرد و تووك و نەفرینی لێیان دەكرد.

رۆژێك دوای ئەوەی كوێخا گەیشتە شاری، دە پانزە كەس لە گوندییەكان بۆ كڕینی شتومەك چووبوونە دووكانەكەی عادیل ئەفەنی. زۆر كەیفخۆش بوون. چونكە لەو ساتانەدا كە چاوەڕێی بەڵایەك بوون، خودا لە سایەی سەری تاشباشەوە نیعمەتێكی ئاوای پێ بەخشیبوون.

بە ڕوویەكی گەشەوە لە دووكانەكە وەژوور كەوتن. ڕەزا بەگی برازای عادیل ئەفەنی بە سەرسووڕماوییەوە سەیری كردن و پرسی:

ـ چما ئێوە خەڵكی یالاك نین؟... دەی باشە، ئەی بۆچی هاتوون؟ هاتوون قەرزەكانتان بدەنەوە؟

گوندییەكان كەوتنە پتەپت..

ـ ئاخر عادیل ئەفەنی هەواڵی ناردبوو كە...

ـ ڕاوەستن شتێكتان پێ بڵێم، برادەرینە، هەر بەهاری بەسەردا بێ و كێوان شین ببنەوە، عادیل ئەفەنی دێتە گوندەكەتان و هەرچی هەتانە، تەنانەت نێوفەكی ژنەكانیشتان دەبڕێ و دەیبا. وا باشترە خۆتانی پێشان نەدەن.

ڕەزا ئەفەنی ئەوجار گوندییەكانی بردە قوژبنی دووكانەكەوە و بۆی لەبنی كوولەكەی دان.

كوێخا دەیزانی چیی بەسەر دێ، بەڵام هیچ پێی وا نەبوو ئاوا زوو مەسەلەكە بگاتەوە گوێی هەمووان و نەیدەزانی ئاوا سووك و سانا هەموو گوناحەكان دەخەنە ئەستۆی ئەو. ژنەكان هەر خەبەرەكەیان پێ گەیشتەوە... لە پێشدا بڕێكیان بەلاوە سەیر بوو و دوایی هەر ئەوەندە بوو مرێمۆك هاتە مەیدانەكەی ئاوایی، هەر هەموو وەڕێ كەوتن... سەفەر بەخۆی دەگوت: "ڕێگەی دەربازبوون نییە. وەك گورگی برسی هرووژم دێنن. ئەمنیش هەتا ئەو پێنج تیرە پەنجا كەسیان لێ نەكوژم، خۆمیان بە دەستەوە نادەم. لێیان گەڕێ با بێنە پێش. ئەگەر دەیانەوێ بێنە پێشێ، دیارە هەر دێشنە پێشێ."

لەو جەنگەیەدا، ژنەکان، لە بەردەرگاکەی سەفەر، کۆمایەك بەردیان خڕ کردبۆوە هێندەی بەژنی بنیادەمێك. هێشتا دەستیان لە بەردی ئەو کۆمایە نەدەدا و ئەو بەردەی بە ماڵەکەی سەفەریان دادەدا، ئەو بەردانە بوون کە لەو دەوروبەرانە هەڵیاندەگرتنەوە.

بەردبارانی ماڵەکە هەتا نیوەڕۆ هەر نەبڕایەوە. دەرگای ماڵەکە لەتوپەت بوو و کرایەوە. کە دەرگاکە کرایەوە، سەفەر تەواو غیرەتی نایە بەر خۆی و بە پێنج تیرەکەیەوە لە ماڵەکەی هاتە دەرەوە و خۆی خستە پشت دیوارەکەی شانی چەپی و لوولەی پێنج تیرەکەی بەرەو ژنەکان ڕاگرت. بەبێ جووڵە لە پشت دیوارەکەوە لە پەنای چەکەکەیەوە، ڕاکشابوو.

ژنەکان کە دیتیان سەفەر دەستی لە گیانی خۆی شوشتووە و ئامادەیە، بەرد لە چنگاندا، بێ جووڵە ڕاوەستان و چاویان بڕییە سەفەر و چاوەڕێ بوون چووکەترین جووڵەی لێوە بێ. سەفەریش باش تێگەیشتبوو. وەك بەردێك لە جێی خۆی چەقیبوو و هەر جووڵەی نەدەکرد. وەك مردووان، تەنانەت چاویشی نەدەترووکاند.

عەسر داهات، نە ژنەکان جووڵەیەکیان پێوە دیار بوو و نە سەفەریش. بێت و سەفەر بەحاڵ جووڵابایە، هەموو شتێك تەواو دەبوو، بەڵام مەسەلەی گیان لە گۆڕێ بوو و کەس نەیدەوێرا پەل ببزێوێ.

سەفەر چاوەڕێی خۆرئاوابوون بوو و دڵی وەك باڵی چۆلەکە فرەی دەهات. مێشکی باشی کار دەکرد و بیری لە هەموو شتێك کردبۆوە بە وردەکارەکانییەوە. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "ئیشەڵڵا کەس نابزوێ. هەتا ئێواری ئیشەڵڵا هیچ ناقەومێ..."

ئێستا ژیانی ئەو بە موویەك بەند بوو. تەنانەت ئەگەر پۆلە باڵندەیەکیش بە جریوە و جووکە بە ئاسماندا تێپەڕن و ژنەکان سەر هەڵبڕن و ئەوان ببینن، بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە تفەنگەکەی دەستی، ئامبازی دەبن و لەتوپەتی دەکەن. هەورەتریشقەیەك، بۆرانێك و تەنانەت وەڕینی سەگێك، دەیتوانی وەزعەکە تێك بدات."

سەفەر، زاروتۆقیو، پەیتاپەیتا دەپاڕایەوە کەس نەبزوێ.

ئەگەر گەنجێك لە جێی سەفەر بوایە، بە تفەنگەکەی دەستی دەخوری و تەقەی لە ژنەکان دەکرد و پێی وادەبوو ئەو ژنانە بە یەك دوو تەقە ڕادەکەن، بەڵام سەفەر دەیزانی ڕێك بە پێچەوانەوە دەقەومێ. ئەگەر یەك یان تەنانەت دە کەسیشیان بنگێوێ و بشمرن، ئەوانی دیکە لەبری ئەوەی ڕا بکەن، لەوانە بوو هرووژمی بکەنە سەری. ئەو باشی خوێندبۆوە. لەوانەشە بە فیشەکێك ڕایان کردبایە، بەڵام زۆربەیان پەلاماریان دەدا. کەمتر بینرابوو کە لەو وەختە پڕ لە ڕق و قینانەدا، حەشیمەت لە گوللە بپرینگێتەوە و ڕا بکا.

لە دواوەی، لە نێو ماڵەکەوە پشیلەیەك دەمیاواند. باش بوو ژنەکان ئەوەندەی لێ نزیك نەبوون گوێیان لە دەنگی پشیلەکە بێ. سەفەر بەو دەنگە شێت دەبوو، بەڵام نەیدەتوانی تەنانەت بەسەر ژنەکانی خۆیشیدا بگۆڕێنێ و بڵێ ئەو پشیلەیە بێدەنگ بکەن.

پۆلی ژنان لە بەرامبەریدا دەتگوت دوخی شمشێرن. ژمارەیان هەر دەهات و زیادتر دەبوو و وێدەچوو هەنگاوەکانیشیان خۆشتر بکەن.

بێت و کەڵەشێرێك خوێندبای یان سەگێك وەڕیبایە، یان پیاوێك لەماڵەکەی وەدەر کەوتبایە و دەنگی دابان، کار لە کارێ دەترازا.

باشەی ئەی پیاوەکان چییان بەسەر هاتبوو؟ چووبوونە کوێ؟ ژنەکانیان لەو بەردابوو و خۆیان خزیبوونە ماڵەکانیانەوە؟ دەیزانی هیچ پیاوێك ناوێرێ بێ و قسەیەك لەگەڵ ئەو ژنانە بکا. لەوە خاترجەم بوو. تەنیا لە شتێك دەترسا. ئەویش ئەوە بوو کە لە ناکاو ئەحە شێتۆکە پەیدا بێ. تەنانەت هاتنی ئەویش دەیتوانی ژنەکان باروورژێنێ.

سەفەر خەریك بوو مێشکی دەتەقی. سەیرێکی خۆرەکەی دەکرد و دەیڕوانییەوە ژنەکان کە وردە وردە لە بەر چاوەکانی هەر دەهاتن و گەورەتر دەبوونەوە و وەك دێوەزمەیان لێ دەهات. ژنەکان وردە وردە خەریك بوو لە سەرمان کەسیرە دەبوون. دەتگوت ئەو ژنانە هەر لێرە لە بەردەم ماڵەکەی ئەو وەك ڕەوەزەکای چیای تەکەچ دەبنە تەختە سەهۆڵ و دەچەقن.

خۆر ئاوا دەبوو. سەفەر لە بێئۆقرەییان جینگڵی دەدا و دەیگوت: دەی یاڵڵا برالە، هەتاوە جوانەکەی من، دەی ئاوا بە، ئاوابە دەی".

لەو سەرما و زەمهەریرەدا، سەرتاپای شەڵاڵی ئارەقە بوو. خۆ لە دەستی هاتبایە، ئەو خۆری دەمی زەردەپەڕەی دەگرت و هەتا ئەودیوی چیای تەکەچ ڕایدەکێشا.

لە خۆی دەپرسی، باشە ئەو مرێمۆکە هەر وا لە پێش ژنەکانەوە وەك بەردێك دەچەقێ و سەیری ئاوابوونی خۆر دەکا؟ ئاخۆ هەتا ڕەق هەڵدێ هەر لەوێ دەمێنێتەوە؟ مرێمۆك بێ و نەبێ پێش خۆرئاوابوون شتێکی هەر دەکرد. ئەو لە هیچ شتێك نەدەترسا. لێی گەڕێ با نەترسێ. کۆنە ماکەر. یەکەم فیشەك لە تەختی نێوچاوانی ئەو دەدەم.

مرێمۆك دەیزانی یەکەم فیشەك لەو دەدرێ، بۆیە نەیدەتوانی ببزوێ و لە دڵی خۆیدا گوتی:"خوایە گیان، خوا گەورەکەی خۆم. برێکم غیرەت بدەیە. بمدەیە با پەلاماری بدەم، ئەگەر دەمودەست بشمئەنگێوێ."

دەیزانی ئەگەر بتوانێ پەلاماری بدا، سەفەر ئەگەر چەند ژنێکیش بکوژێ، دیسانیش خاکی ماڵەکەی بە تووڕەکە دەکێشن. لەوانەشە ئەو کاتەی ئەوان هرووژم دەبەن، سەفەر لە ترسان هەر نەتوانێ پەنجە بە پەلەپیتکەشدا بێنێ و تەنانەت تەقەیەکیش بکات.

ژنەکانی گوندی ئاق کیسراك، پەلاماری ئەو ئاغایەیان دا و دەستدرێژیی کردبووە سەریان. ئاغا پێنج تیرەکەی ڕاکێشابوو و لە خەندەکێکدا خۆی مەلاس دابوو. ژنەکان نەترسابوون و چووبوونە پێشەوە. ئاغاکە بەبێ ئەوەی تەقەیەکیش بکا، تفەنگەکەی فڕێ دابوو و بە هاوار هاوار خۆی خستبووە خەندەکەکەوە. ژنەکان گەیشتبوونە سەری و ونجڕ ونجڕیان کردبوو.

سەفەر خەریك بوو پشووی سوار دەبوو. خۆر گەیشتبووە سەر لووتکەکەی تەکەچ و لەوێ نیشتبوو و هەر دەتگوت نایەوێ ئاوا بێ. هەر لەوێ چەقی و تیرێژە سوورەکانی بە بەفرەکاندا پژاند. ژنەکان دیسان گەورەتر بوونەوە. ئەو ژنە بۆچی ئەوەندەی ڕق لەوبوو؟ ئەو ژنە هیچی لە چاوی ون نەدەبوو. هەزار چاوی هەبوو. لە ناکاو دیتی خۆرەکە لە ئاوابوونە. تەنیا پەڵەیەکی تەسکی سووری لێ مابۆوە. سەفەر بەخۆی گوت:"وا ئاوا دەبێ، ئاوا دەبێ..." ئەگەر ئەو مرێمۆکەش نەبوایە یانی ئەو ژنانە هەر دەهاتن؟ نا، نەدەهاتن. تەنانەت حەیوانەکانیش پێشەنگێکیان دەوێ. بە تایبەتی بنیادەم هەر دەبێ سەرکردەیەکی هەبێ. ئەو مرێمۆکە دڕندەیە، ئەو مرێمۆکە خوێنخۆرە... وا خەریکە ئاوا دەبێ... ئاوا دەبێ... ئاوا بوو."

حەشیمەتی ژنان لە بوومەلێڵەکەدا مانەوە. سەفەر بەسەر خۆیدا زاڵ نەبوایە، ئەگەر نەیزانیبایە چەندە خەتەرە، دەردەپەڕی و چەقەنەی لێ دەدا و سەمای دەکرد. بۆ ساتێك پشووی بڕا. ترسا. ئەوە لە خۆ دەچوو؟ پشووی بڕگەبڕگە و خێرا خێرا. وردە وردە بەخۆ هاتەوە.

ژنەکان بە تاریکاییەکەدا ڕۆدەچوون. ڕاستە ئەویان نەدەدی، بەڵام دەیانزانی هەر لەوێیە و باشیش دەیانزانی، هەتا نەجووڵاوە و بڵاوەیان نەکردووە، مەترسییەکە هەر لەجێی خۆیەتی.

حەشیمەتی ژنەکان تەواو تێکەڵی تاریکییەکە بوون. ئەوجار کۆمەڵێك دەنگی سەبر و ماندوو بیستران و لە تاریکاییەکەدا جموجۆڵ بەدی کرا. ئەوجار دەنگی کۆمەڵێك لاقی ڕووت کە بەسەر بەفرەکەدا دەخشکان، بیسترا. برێك دواتر، لەوێ لە مەیدانەکەی پێش ماڵەکەی کوێخا، کەسی لێ نەمابۆوە.

سەفەر گوتی:" خوایە گیان، هەزار و هەزار جار شوکرانەبژێرم." و هەستا. دەست و لاقەکانی سڕ ببوون." ئەو بەڵایەت لە کۆڵ کردمەوە. نەزر بێ، لە سەر مەرقەدەکەی باوە باران، پێنج کەڵەشێری پۆپەلاریت بۆ دەکەمە قوربانی."

چاوەکانی برێك قیچتر کردن و سەیرێکی ئەو پاناوکەی کرد وا ژنەکان بەجێیان هێشتبوو. چۆلەکوژی لێ نەمابوو. کەوابوو هەمووان ڕۆیبوون. تارماییەك لە تاریکاییەکەدا دەجوولا، بەلام ئەوە هیچ لە قەلافەتی بنیادەم نەدەچوو. لە سێبەرە لەرزۆك و باریکەکە ورد بۆوە، بەلام لەو تاریکاییەدا چیی بۆ نەچۆوە سەر یەك. لە دلی خۆیدا گوتی:"کوڕە خۆ هێندەی سەیرم کرد چاوم ماندوو بوون. ئاخۆ ژنێکە بەتەنێ؟ ... دەی با ببێ. چیی پێ دەکرێ. ئێمە لە تۆفانەکە پەڕیینەوە."

مرێمۆك هەر لە جێی خۆی نەبزووتبوو. خۆی دابووە سەر تێلاکەی و تەنانەت ئاگای لە بلاوەکردنی ژنەکانیش نەبوو. ئەو تێشکان و بەزینە هەمووی خەتای ئەو بوو. ئەگەر تۆزێکی دیکە غیرەتی هەبوایە، و توانیبای دەست لە گیانی بشوات، ئێستا ئەو سەفەرە شوێنەواریشی لێ نەمابۆوە.

سەفەر حەزی دەکرد، هەر ئێستا بچێتە سەر مەرقەدەکەی باوەباران و قوربانییەکەی بکا. دەیویست هەر ئێستا و بەو شەوە ساردە و بەو باو بۆرانە بڕوات..، بەلام دەیزانی ئەوە کاری نەکردەیە. وەخت بوو بفڕێ.

ئەو شکستە، شکستیی یەکجارەکیی ژنەکان بوو. سەفەر دەیزانی هەرگیز حەشیمەتێکی ئاوا پەلاماری نادەنەوە. ئەگەر تاکە کەسێك ببەزێ، دەتوانێ گەلێ جاری دیکەش هەر تێهەلچێتەوە و دەست پێ بکاتەوە، بەلام کاتێ کۆمەلێك تێك دەشکێ، ئەستەمە بتوانێ ئاوا کۆ ببێتەوە و یەك بگرێتەوە.

## ٣٨

سەفەر هەرچۆنێکی بێ، توانیبووی خۆی لە چنگی ئەو بەڵایە ڕزگار بکات. کەرێتیی کردبوو. ئەویش چ کەرێتییەك. ئەوجار لێی ڕوون ببۆوە کە تاشباش ئی وەی نییە قەرەی لە قەرەی بدەی. کوڕە خۆ ئەو تاشباشە داماوەش خۆی زۆر لەبەر گوندییەکان پاڕابووەوە و گوتبووی ئەمن لەگەڵ حەیوان و ئاژەڵیماڵی و کێوی جووت بوومە، ورچ و گورگم گاوە. دەستم لە بەرۆکی بەردەن. و گوتبووشی کوڕە پیاوچاکی لە من ناوەشێتەوە. چیی لە دەستی هاتبوو و چەندی زمانی گەڕابوو، خۆی سووك و چرووك کردبوو، بەڵام کاکە خۆ ئەو گوندییانە نەچووبووە گوێیانەوە و لە کۆڵی نەببوونەوە. سەفەر بەخۆی دەگوت: "دیارە ئەوەش هەر لە بن سەری خۆی دایە... تاشباش بەو کارانە دەیەوێ خۆی گران بکا... دەیەوێ بڵێ ئەمن ئەگەر پیاوێکی ئاوا چەپەڵیش بم، دیسان هەر لە سەر تەختی پیاوچاکی دادەنیشم. خەریکە جێی خۆی قایم دەکا..."

سەفەر هەر لەو کاتەدا بیری لەو بەڵایە دەکردەوە کە بەسەر گوندییەکانی هێنابوو. عادیل لە قەرزەکەی خۆی خۆش ببوو و تەنانەت هاتبووە سەر ئەوەی کە قەرزیش بە گوندییەکان بدات. بۆ لە خۆڕایی چووە شاری و هەموو شتێکی تێك دایەوە؟ چما گوندی ئەوەیان لەبیر دەچۆوە؟ ڕق و تووڕەیی ئەو کار قۆڕەی پێ کردبوو... کارەکەی زۆر قۆڕ بوو...

جگە لەوەش لای عادیل خۆی چەندە سووك کردبوو. خۆ ڕاستە زار بە ماچی قوون، پیس نابێ، بەڵام... دیسانیش کارەکەی بێ جێ بوو. گوتبووی:

ـ پێڵاوانت ماچ دەکەم عادیل ئەفەنی... وای دانێ کوڕتم کوشتووە و خۆم خستووەتە ماڵەکەتەوە و پەنام بۆ هێناوی، عادیل ئەفەنی، ها بمکوژە. ئەوەندەم خۆش دەوێی ئەگەر بشمکوژی، خوێنەکەم هەر بەرەو لای خۆت شۆلاوگە دەبەستێ، عادیل ئەفەنی. لە قەرزی ئەو

گوندییانە خۆش مەبە. ئیتر ئەمسالْ قەرزیان مەدەیە. جگە لەوەش وەرە گوندەکە و ڕووتیان بکەوە و تەنانەت دەرپێی ژنەکانیشان داکەنە و بیبە. کوڕە بە نۆکەرت بم، عادیل ئەفەنی.
عادیل کە ئەو قسانەی بیستبوو زۆری پێ سەیر ببوو و گوتبووی باشە بۆچی؟
ـ کوڕە ئەوەی نە بە تۆ دەڵێم و نە بەهیچ کەسێکی دیکەش. ئەگەر ئەو داوایەم جێبەجێ ناکەی، هەر وا باشترە هەر ئەلێرە بمکوژی. ئەگەر قسەکەم وەرنەگری، سەرم لە لاشیپانەی ئەو دەرگایە دادەنێم و خوێنەکەم دەڕژێنمە نێو ماڵەکەی تۆوە. نە بەتۆش دەڵێم بۆچی و نە بەهیچ کەسی دیکەش.
ڕۆژێکی تەواو، هەر لە بەیانییەوە هەتا شەوێ لەبەر عادیل پاڕابۆوە. لاقەکانی ماچ کردبوو و لە بەردەمیدا فرمێسکی هەڵوەراندبوو، بەڵام نەیتوانیبوو عادیل لە بڕیارەکی خۆی پاشگەز بکاتەوە. عادیل دەیگوت:
ـ من قسەی خۆم ناخۆمەوە.
سەفەریش بیری کربۆوە کە ئەو بنیادەمە، ئەو عادیلە گورگە، ڕێی تێ ناچێ ئاوا بە سووك و سانایی لە گوندییە لێقەوماو و دەستەوستان و بەستەزمانانە بترسێ. دیارە شتێك لە گۆڕێیە. ئەوە لە پیاوەتیی خۆیەوە نییە لەسەر قسەکەی خۆی سوورە. لە ترسێکی بێسنوورەوەیە. دەبێ لەو ترسە ڕزگاری بکەم. عادیل ئەو ترسە بەری بدات، مل بۆ هەموو داوایەك ڕادەکێشێت. و هەولی دا بە هەر بارێك بووە، ئەو ترسەی لە دلی بڕەوێنێتەوە. دیارە بە فێڵ و فەرتەنە. دەبوو کارێکی وا بکا عادیل نەزانێ کە ئەو تێگەیشتووە لەوەی ترسی گوندییانی لە دلی دایە، ئەگینا دەکەوتە سەر پشت و لاساریی دەکرد و لە قسەی خۆی پاشگەز نەدەبۆوە. گوتی:
ـ کوڕە ئەو گوندییانە پوولێکی ڕەش ناکەن. لەسەر ئەو عەرزە لەوانەی بێ مێشکتر و گەمژەتر لێ نییە. نە دەزانن دۆستایەتی چییە و نە ڕاستگۆیی. نان دەخۆن و نانیدێنێ دەدڕن. گوندی، لەسەر شتی زۆر هیچەکە و پووچەکە، لەسەر قۆلانجە زەوییەکی ڕەقێن و بێ بەرهەم، سەری باوکی خۆیان دەبڕن و ژن و منداڵیان بۆ دوو دینار دەفرۆشن. هەر ئەو خەڵکە بێ دین و بێ ئیمانەن سووکایەتی بە پێغەمبەرە مەزنەکەمان دەکەن و تاشباش دێنن لە جێی ئەوی دادەنێن. گوندیی ترسنۆك و کەر و هیچ و پووچن... خوێنیان حەڵاڵە... دەزانی براکەم، عادیل ئەفەنی، گوندی وەك کەروێشك ترسنۆکن. کە یەك دەگرن و کۆ دەبنەوە، لە گاڕان و مێگەل بێ دەنگترن. ئەو خەڵکە کەر و گەمژەیە، هەر ئەوەندەی چاویان بە کابرایەکی شاری بکەوێ، وەك هەژدیهایان دیتبێ، کونە مشکیان لێ دەبێتە قەیسەری. ئەو گوندییان هەر ئەو بوونەوەرە چەپەڵ و بێ قیمەتانەن، لەوەتەی

هەن، هەر دامانپلۆسیون و پارووی زاریانمان ڕفاندووە. لەسەر ئەو زەوییە هیچ بوونەوەرێك پەیدا نابێ هێندەی ئەو گوندییانە ترسنۆك و بێ دەمار بێ. لە مار، لە مێروو، لە دارستان، لە خاك، لە بەفر، لە تۆفان، لە خێو و جنۆکە و پەری و لە تاریکی و ئەستێرە و هەورەتریشقە و ئاگر و ئاویش دەترسن. تەنانەت لە مەل و باڵندانیش دەترسن، چ بگا بە بنیادەمی شاری... ئەتۆ ئەو هەمووە ساڵە تاقیت کردوونەتەوە و ئەو گوندییانە لە من باشتر دەناسی."

زۆری لێ ڕست و زۆری باسی سووك و چرووکبوون و ترسنۆکیی گوندییەکان کرد و نموونەی زۆر لێ هێنانەوە و گوتی: بنیادەمی ترسنۆك، هەموو خراپەیەکی پێ دەکرێ. هیچ شتێك هێندەی ترس بنیادەم سووك ناکا و خەڵکی گوندییش لە هەرچی بنیادەمە ترسنۆکترن.

عادیل کە دەیبیست گوندی ئەوەندە ترسنۆکن، بۆیەش زەرپیان بۆ کەس نییە، ڕوومەتی گەش گەش ببۆوە.

ــ ئەی ژنەکانیان.... ژنەکانیان هەزار هێندەی پیاوەکانیان ترسنۆکن. بەچاوی خۆم دیتوومە، هەر هەورەتریشقەیەك بەسەر بۆ ئەوەی زۆربەی هەرە زۆری ژنەکانیان ئەژنۆیان بنووشتێتەوە و وەعەرزی بکەون. ژنی گوندی، هەر تۆزێك قاووقیژیان هەیە و ئەوەشیان ئەو کەسانەی تۆقاندووە کە نایانناسن.

لە ناکاو سەفەر بە مێشکیدا هات کە کێ بووەتە هۆی ئەوەی عادیل ئاوا بخلیسکێتە نێو ئەو جەحەندەمی ترسەوە. لێی پرسی:

ـ ئەرێ هەر بەڕاست عادیل ئەفەنی، ئەو مام خەلیلەی گوندەکەی ئێمە دەناسی؟ خۆ لەو سەروبەندانەدا ڕێی نەکەوتووەتە ئێرە، ها؟

عادیل سەری بەردایەوە و وەڵامی پرسیارەکەی نەدایەوە. ئەو زانیبووی سەفەر بۆچی ئەو پرسیارەی لێ دەکا.

باشە هەر بە ڕاستی مام خەلیل هابووە لای عادیل؟ سەفەر ئەوجار دڵنیا ببوو کە هاتووە.

عادیل کە ترسەکەی تەواو ڕەویبۆوە، هەستا و ئاخرییەکەی گوتی:

ـ براله سەفەر، نی من و ئەو گوندییانە بمێنێ. نەك هەر فلسێکیان بە قەرز نادەمێ، تەنانەت ڕێیان نادەم بێنە ئەو دووکانەشەوە. بەهارێش دێم و دەرپێی بەری ژنەکانیان دادەکەن و دەیبەم. چما هەقی خۆم نییە؟ دەیستێنمەوە... ئەوە بە کەیفی بەسەفەر بوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت:" دەی باشە، جا تاشباش کە دڵی عادیل ئەفەنیی نەرم کردبوو، ئێستا دەیبینێ دڵە نەرمەکەی عادیل یانی چی....

سەفەر چاوەڕێ بوو عادیل دەسبەجێ بێ و گوندییەکان ڕووت بکاتەوە، بەڵام عادیل مەحاڵ بوو لەو هەوا سارد و وەیشوومەیەدا وەدەر بکەوێ.

"دەی باشە، لێی گەڕێ با بەهار دابێ، گرنگ ئەوەیە ئەو بێ، با بەهارێ بێ."

وا شاگەشکە ببوو کە هیچ بیری لەوە نەکردبۆوە ئەگەر بێت بە گوێی گوندییەکان بگاتەوە، چیی بەسەر دێنن. لەوانەیە بە مێشکیشیدا هاتبێ، بەڵام گوێی نەدابێتێ، کوڕە جا گوندی چییان لە دەست دێ؟...

سەفەر لە گوندییەکان نەدەترسا. گوندییەکان بەلای ئەوەوە وەك مێگەلێك وا بوون کە توانای قسەکردنیان هەبوو. دەتتوانی بە دوو قسان کوێت حەز لێ بێ، بیانبەیتە ئەوێ. جا سەفەر لێرەدا بەسەهوو چووبوو. چیی وای نەمابوو ژنەکانی ئاوەدانی لە چاوترووکانێکا ئەنجن ئەنجنی بکەن. باشە چۆن لەو داوە کەوتبوو؟ بنیادەم نابێ ئەسپی کەفوکوڵەکانی دەروونی هەڵبگرێ. هەموو کارێك دەبێ بخرێتە تای تەرازووی ئەقڵەوە.

لەو خەتەرە و لەو مەرگەی بۆسەی بۆ دانابوو، بە سلامەتی نەجاتی ببوو. ئیتر بۆی گرنگ نەبوو تاشباش دەبێتە وەلی یان نا، دەبێتە پیاوچاك یان دەبێتە پێغەمبەر. وەك گوتوویانە مار بە زمانی خۆش لە کونێ دێتە دەرێ. گوندییەکانیش زۆر کەیفیان بە زمان و لەبزی خۆش دێ. بیری لەو دەکردەوە کە هەر ئەوەندە بەسە دوو جاران لەبەر تاشباش دابێتەوە و ڕێزی بگرێ و بڵێ ئەتۆ وەلیی هەموو وەلییەکانی و بەو جۆرە وەك مێو نەرمی بکا. خۆ دوژمنی بەخوێن تینووشی بێ هەر لێی خۆش دەبێ.

دەی باشە، ئێستا دەبوو چۆن پێش بەو تووڕەییەی گوندییەکان بگرێ و دایمرکێنێتەوە؟ جارێ مەسەلەکە هەر ئەوە بوو. چ دەبوو جارێکی دیکە بچێتەوە لای عادیل ئەفەنی و لەبەری بپاڕێتەوە.. لەبەریشی نەپاڕێتەوە، ترسی وەبەر بنێ... خۆ بێت و بە ترسە ترس و هەناسەبڕکێ خۆی گەیاندبایێ و گوتبای گوندیی هەموو شێت بوون و لەوانەیە هەموویان بکوژن و گوتباشی کە چ بەڵایەکیان بەسەر هێناوە، عادیل بە ترسانا لەخۆی دەڕیا و دەیگوت:"هەرچی لە دووکانەکانمدا هەمە بۆ ئێوە. هەڵیگرن و ببەن." بە دڵنیاییەوە وای دەگوت. وا لە گوندییەکان تۆقیبوو، جا بە تایبەتی ئەگەر باسی ژنان کرابایە، ئەویش ئەو ژنانەی وا کۆ دەبنەوە و پەلامار دێنن، ئیتر کاری تەواو دەبوو."هەر دەشبوو بترسێ. چۆن هەر وەك گورگی هار هورووژمیان هێنابوو؟"

سەفەر هێشتا لە ترسانا دەلەرزی:"نەکا بگەڕێنەوە، ئەگەر بگەڕێنەوە، ئەوجارە دیارە ئیتر لە مەرگ ناترسێن. نە بە تۆپ و نە بە جێتەکانی عیسمەت پاشاش، ناگەڕێنەوە."

له دووره‌وه سێ جه‌نده‌رمه ده‌رکه‌وتن. دیار بوو به‌ره‌و ماڵه‌که‌ی ئه‌و ده‌هاتن. سه‌فه‌ر له ترسانا مووی لێ بوونه نه‌شته‌ر. چیی نه‌مابوو ئه‌ژنۆی بنووشتێته‌وه. ده‌ستی به لاشیپانه‌ی ده‌رگاکه گرت. ئه‌وه هه‌ر گووی خۆی بوو ده‌یشێلا. چونکه ئێره‌یی به تاشباش ده‌برد. له به‌ر ئه‌وه‌ی گوندییه‌کان ئه‌ویان به‌پیاوچاك ده‌زانی، وه‌خت بوو له داخان شێت بێ و هه‌موو ئه‌و به‌ڵایانه‌ش له گۆڕی هه‌ژدیهای به‌خیلی و ئێره‌ییه‌وه هه‌ڵدابیسان.

جه‌نده‌رمه‌کان نزیك ده‌بوونه‌وه. ئێستا ئه‌وان تاشباشیان ده‌گرت و ده‌یانبرد و دوای بردنه‌که‌ی سه‌فه‌ر له‌گه‌ڵ ژنانی گوند و ئه‌و مرێمۆکه تووك لێکراوه به‌تەنێ ده‌مایه‌وه. دیاره ئه‌وانیش ڕۆژێك ده‌رفه‌تیان لێ دێنا و پاکانه‌یان له‌گه‌ڵ ده‌کرد. ئه‌گه‌ر مرێمۆك سه‌رده‌سته‌یان نه‌بوایه، دیسان ده‌کرا ڕێی ده‌ربازبوونێك بدۆزێته‌وه، به‌ڵام مرێمۆك به‌زینی نه‌بوو، وازی نه‌دێنا. ئه‌و هه‌میشه چاوه‌ڕوان ده‌بوو و له کاتی گونجاودا، ژه‌هری خۆی ده‌ڕشت و وه‌ك مار پێوه‌ی ده‌دا.

باشه بۆ ڕانه‌وه‌ستابوو؟ چووبووه بنکه‌ی پۆلیس بۆ لای مولازم شوکری، سه‌رۆکی بنکه‌که و هه‌موو کاره‌کانی تاشباش و ئه‌و چیرۆکانه‌ی بۆیان هه‌ڵبه‌ستبوو، بۆی له‌بنی کووله‌که دابوو. مولازم له داخان وه‌ك شێتانی لێ هاتبوو:

ـ سه‌ده‌ی ئه‌تۆم و وه‌لی و پیاوچاك؟ چاخی گه‌ردووناسین و بانگه‌شه‌ی مه‌هده‌وییه‌ت؟ ئه‌مه‌ن ئێسك و پرووسکی ئه‌و مه‌هده‌وییه‌ته ورد ده‌که‌م و که‌لاکه‌که‌ی ده‌خه‌مه به‌ر ده‌می سه‌گان...

مولازم له تووڕه‌یان وه‌خت بوو بگریێ...

ـ هه‌ر ئێستا جه‌نده‌رمه‌ی ده‌نێرم و ده‌یهێنمه ئێره. هه‌ر ئێستا... هه‌ر ئێستا... هه‌ر کۆمه‌ڵێك درۆزن و زه‌رووی وه‌ك تاشباشن ناهێڵن ئێمه پێش که‌وین. ناهێڵم نانی زیندووان بخوا. له تورکیایه‌کی شۆڕشگێڕدا بانگه‌شه‌ی وه‌لییایه‌تی ده‌که‌ن، ها؟ ... ئه‌دا و ئه‌تواری سه‌رده‌می عوسمانلییه‌کان؟...

تووڕه‌ییه‌که‌ی مولازم سه‌فه‌ری تۆقاندبوو.

ئه‌و ژه‌نده‌رمانه، دیاره هه‌ر ئه‌وانه بوون که هاتبوون تاشباش به‌رن. ئه‌وان تاشباشیان قۆڵبه‌ست ده‌کرد و ده‌یانبرد و له بنکه‌ی پۆلیسه‌که، سێ شه‌و و ڕۆژان، تا پێنج شه‌و و ڕۆژان تێیان هه‌ڵده‌دا.

ئه‌و وه‌لییایه‌تییه‌ی تاشباش به‌ڵا نه‌مابوو به‌سه‌ر سه‌فه‌ری بێنێ.

گوندییه‌کان له‌سه‌ر عادیل ئه‌فه‌نی ئاوا له‌گه‌ڵی ببوونه دوژمن. له‌و به‌ڵایه ڕزگاری ببوو. دوای ئه‌وه‌ش باشاری هه‌موو چه‌شنه گیر و گرفت و ته‌نگانه‌یه‌کی له‌و چه‌شنه‌ی ده‌کرد، به‌ڵام ئاخۆ مه‌می

دیك كە ئـەو ئەشـكەنجەیەی دیتبـوو، لـەبیری دەچـۆوە؟ تۆڵـەی ئـەو گولەپیاوانـە ترسـناكە. ئێستا تاشباشیشی هاتبووە سەری. ئەگەر تاشباش لە بنكەی پۆلیسەكە تێی هەڵدرابایە و پێی نەمردبایـە، لێی دەبووە ئیزرایلێكی دیكە. تاشباش كە تووڕە دەبوو، كەس باشاری نەدەكرد.

ـ سڵاو، كوێخا.

ـ سڵاو لە ئێوەش. بەڕێز جۆمالی...

ـ وەك دەڵێن لەو گوندەی ئێوەدا پیاوێـك خـۆی بـە پێغەمبـەر دانـاوە و ڕاپۆرتەكەشـی تـۆ داوتە. ئێمە هاتووین بیبەین. كەوابوو، تاشباشەكەی ئێمە، بووەتە وەلی؟ خۆ ئەو پیاوێكی ژیر بوو. هیچ پێم وا نەبوو ئاوا تێك چووبێ. بیستوومە لە گوندییەكانی دەوروبـەرەوە نەخۆشـی بـۆ دێنن و هەر ئەوەندەی تاشباش دەستیان بەسەریدا دێنێ، چاك دەبنەوە... ها؟...

سەفەر:

ـ جارێ فەرموون دابنیشن...

ـ نا، نا، ئێستا كاتی دانیشتنێ نییە. جەنابی مولازم چاوەڕێی ئـەو كابرایەیـە وا خـۆی بـە پێغەمبەر دەزانێ.

سەفەر دەست و لاقی تێكەڵ هاتبوون و خەریك بوو دەستەكانی لێك دەخشاندن و دەیگوت:

ـ جەنابی جۆماڵی، ناكرێ ئێستا تاشباش نەبەی؟

بە نابەدڵییەوە ئەو قسەیەی كرد. چـونكە هـەموو ئـاوات و ئـارەزووی ئـەوە بـوو، تـا زووە تاشباش بەرن... و نەدەبوو پێشیان پێ بگرێ.

ـ دوێ شەوێ تاشباش لە ماڵەكەی هاتە دەرێ و بە تێر و تەسەلی بە گوندییەكانی گوت كە ئەو وەلی نییە و وەك ئێمەومانان بەندەیەكی خوایە و گوتیشی ئەوان بە سەهوو چوون.

ئەو قسانەی لە خۆڕایی لە زارییەوە دەرپەڕیبوون. جۆماڵی گوتی:

ـ چما تۆ شێت بووی؟ هەم دەچیتە لای مولازیم ڕاپۆرتی لێ دەدەی و ئێستاش ئـەو قسانە دەكەی؟ مولازم فەرمانی دەركـردووە، هـەر چـۆنێك بـووە دەبـێ لەگـەڵ خۆمـا بیبـەم. مـولازم گوتوویەتی ئەگەر گوندییەكانیش بەربەرەكانێیان كرد و نەیانهێشت، زوو ئاگادارم بكەوە بـا بـە تاقمێك سەربازەوە بێم.

سەفەر كە سەیری كرد شەپكە توندە، بای دایەوە. زانیی هەر چییەك بكـات و هـەر شـتێك بڵێ، خۆڕاییە و ئەوان تاشباش هەر دەبەن و هیچ شتێك نـاتوانێ پێـشیان پـێ بگـرێ. مـولازم فەرمانی لێبڕاوانەی دەركردبوو.

بە دەنگی بەرز گوڕاندی:

ـ نەخێر، نەخێر، بەڕێز جۆماڵی، ئەمن کوێخای ئەو گوندەم. ئەتۆ ناتوانی بەزۆری لە چنگی منی دەربێنی. ئەو خێر و بەرەکەتی ئەو ئاوەدانییەیە...

جۆماڵی پێکەنی و گوتی:

ـ تێگەیشتم کوێخا، لە ئاین و ئۆینت گەیشتم. دوای ڕۆیشتنەکەی تاشباش، ئەتۆ نیگەرانی گیانی خۆتی و دەترسی گوندییەکان هەر بە زیندوویی قووتت بدەن. ئەو کارە بە بیست و پێنج لیرە چاك دەبێ، ئەگینا گوندییەکانت لێ دەنگ دەدەم و پێیان دەڵێم ئەوە کوێخا خەبەری لە تاشباش داوە. جا ئێستاش بێنە دەی بیست و پێنج لیرەکەم بدەیە.

سەفەر بە غاردان چۆوە ژووریٚ و گەڕایەوە. دراوەکانی توند لە قولی گرتبوو. گوتی:

ـ هانیٚ ئۆنباشی. وەك شیری دایکت حەڵاڵت بیٚ.

ئۆنباشی گوتی:

ـ جا ئێستا هەر بنەڕێنە کوێخا. چەندی دەنگت بڕ دەکا هاوار بکە.

سەفەر بە سرتەیەك بە ئۆنباشیی گوت:

ـ با بچین بەرەو ماڵەکەی تاشباش، لەویٚ هاوار دەکەم و دەیکەمە قیامەت. دەگریم و دەلاڵێمەوە و خۆم بە عەرزی دادەدەم. تکات لیٚ دەکەم، کاتێك دەمەویٚ پێشت پیٚ بگرم، یەك دوو قوونە تفەنگم لە نێو شانی بدە... ئەمن وای دەنوێنم بووراومەتەوە، بەڵام تۆ گویٚ مەدەریٚ.

ئۆنباشی گوتی:

ـ بەخوای هەوایەکی ساردی هەیە... زۆرم سەرمایە، کوێخا.

سەفەر گوتی:

ـ عەمرت درێژ بیٚ ئۆنباشی. هەر بەخاتری ئەو نان و نمەکەی ئەو هەموو ساڵە پێکەوە خواردوومانە، خوا تەمەن درێژت بکا. جا بەرەو ماڵی تاشباش وەڕیٚ کەوتن. سەفەر هاواری دەکرد:

ـ ناتوانن بیبەن. ئەو گوندییانە و هەروەها ئەمنیش. تاشباشەکەمان لەکیس خۆمان نادەین. دەکریٚ گیانمان لیٚ بستێنن، بەڵام تاشباش نا. ئێوە پێتان وایە ئەمن و هەروەها ئەو گوندییانەش مردووین؟

ئەگەر گوندییەکان بەربەرەکانێیان کردبایە و بڕیاریان دابایە نەهێڵن تاشباش بەرن،، کوێخا حازر بوو سەد لیرەش بداتە ئۆنباشی. خۆزگە مولازم بە دەستەیەك سەربازەوە دەهات و هەموو گوندییەکانی دەگرت و دەیخستنە بەندیخانەوە.

بە سرتەیەك بە ئۆنباشیی گوت:

ـ ئەگەر گوندی بەرەنگارتان بوونەوە، سەد و پەنجا لیرەت دەدەمێ.

ئۆنباشی پێکەنی:

ـ ئەتۆ ناچاریان دەکەی.

گوندی لەبەر دەرگای ماڵەکانیانەوە ڕاوەستابوون. کە گەیشتنە بەر دەرگاکەی ماڵی تاشباشیش، تووشی حەشیمەتێکی زۆر بوون. ئۆنباشی بە تووڕەییەوە گوڕاندی:

ـ بڵاوەی بکەن، سەگی سەگبابینە...

و ئەوجار گوتی:

ـ مەمەد تاشباشی کوڕی مەمەد، لە پۆلیسخانە بانگ کراوی. وەرە دەرێ.

سەفەر دەسبەجێ خۆی گەیاندە پێشەوە و هەرای کرد:

ـ مەیە دەرێ، براڵە تاشباشی برام. ئەو کابرایە بڕیاری گرتنی تۆ و هاتنە ژوورەوەی نییە. مەیە دەرێ. ئەو ناتوانێ قۆڵبەست بکا.

گوندییەکان بە غاردان هەتا بەر دەرگاکەی تاشباش دەهاتن و لەوێ بێدەنگ و کڕ ڕادەوەستان. مرێمۆك خۆی دابووە سەر تێلاکەی و لە پێش کۆمەڵێك ژنەوە ڕاوەستابوو. تاشباش کە باشترین جلوبەرگی جێژنانەی خۆی لەبەر کردبوو و خۆی ڕازاندبۆوە، هاتە دەرێ. تیزە بزەیەکی تەوساویی لەسەر لێوان بوو. گوتی:

ـ فەرموو، ئۆنباشی.

ـ مولازم داوای کردووی.

ـ دەی باشە با بڕۆین.

سەفەر هاواری کرد:

ـ ناکرێ، ناکرێ نا. ناتوانن گیانی ئەو گوندە بگرن. ناتوانی دەست لە تاشباش بدەی. ئەگەر دەستی لێ بدەیت، دەستەکانت وشك دەبن. بێت و سووکایەتیی پێ بکەی، زمانت ڕەق دەبێ. ئەتۆ هیچ ئیزنی یاساییت نییە. بۆت نییە تاشباشی ئێمە بەری، ناتوانی لێمانی بستێنی. ئەگەر گوندەکەمان تا ئێستا کاول نەبووە و هەر لە سەری جێی خۆیەتی، لە سایەی ڕێز و گەورەیی ئەوەوەیە. ئەگەر لە بوومەلەرزە و پەتا و پەلاماری ماران پارێزراوە، هەر لە سایەی سەری ئەوەوەیە.

ئەوجا شانی تاشباشی گرت و گوتی:

ـ ئەمن ئەوتان نادەمێ. ئەگەر دەتوانی، وەرە لێمی بستێنە. دەی وەرە.

تاشباش شانی ڕاپسکاند و خۆی لە چنگی هێنا دەرەوە. تاشباش لە پێشەوە و پۆلیسەکا[ن] بە دوایدا کەوتنە ڕێ.

سەفەر گەڕایەوە لای گوندییەکان و هەرای کرد:

ـ چما ئێوە خوێنتان لە دەماریدا نییە؟ چما ئێوە بنیادەم نین؟ وەرنە سەیر، وا ب[ە] بەرچاومانەوە سۆمای چاوەکانمان دەبەن. ئەدی بۆ ڕاوەستاون، بۆ؟ بۆچی ناجووڵێن؟

هەموو گوندییەکان، بە ژن و منداڵەوە، بە پیر و لاوەوە، لەوێ بوون. کەس متەقی لێوە نەهات.

ـ باشە بۆ وا ڕەق هەڵاتوون و ڕاماون؟ خەریکن دەیبەن. وا گیانمان، ئاغاکەمان دەبەن.

رایکرد و پێشی تاشباشی گرت و هاواری کرد:

ـ مەڕۆ، مەڕۆ، پادشاکەی ئێمە، ڕاوەستە. مەڕۆ، ئاغاکەمان. ئەتۆ دەبێ بەسەر تەرمی[ی] مندا بڕۆی. کەس ناتوانێ بەلکێشت بکاتە پۆلیسخانە.

لەو جەنگەیەدا کە ئۆنباشی لێی نزیك ببووەوە، بە هەموو هێزی خۆی قوونە تفەنگێکی ل[ە] نێوشانی سەفەر کوتا. سەفەر هاوارێکی لێوە هەستا و وەعەرزی کەوت و لەسەر بەفرەک[ە] تلایەوە. ئۆنباشی وای لێ ڕاکێشابوو، سەفەر نەك بە قەستی، هەر بە ڕاستی خۆی وێك دێنا دەتلایەوە. خەڵکەکە هەر سەیریشیان نەکرد و بە تەنیشتیدا تێپەڕین. سەفەر هەستایەوە بەلادا دەهات. وردە وردە کەوتە شوێن پۆلیسەکان. دەیگوت:

ـ چما ئێوە دین و ئیمانتان نییە؟

و ڕووی کردە گوندییەکان و بانگی کردن:

ـ ئەوە کوا غیرەتەکەتان؟ باشە بۆچی لەسەر وەلییەکەمان ناکەنەوە؟

دەستی بە نێوشانییەوە گرتبوو و ددانەکانی لەچیرەوە دەبردن. دری بە حەشیمەتەکە دا دیسان پەلاماری ژەندەرمەکانی دا:

ـ دەبێ بەسەر تەرمی مندا بڕۆن...

ئیتر ئەمجارەیان ئۆنباشی کە خۆی پیاوێکی بەتین و گوڕ بوو، هەرچی هێزی هەیبوو خستیی[ە] شان و باهۆی و تفەنگەکەی هەڵێنایەوە و بەهەموو هێزی خۆی دایهێنایە. سەفەر هاوارێکی ل[ە] بەرز بۆوە و کەوتە سەر عەرزەکە:

ـ ئەی هاوار کوشتیانم، کۆشتیانم، خەڵکینە فریام کەون...

ئۆنباشی بە پێکەنینەوە گوتی:

- سەفەر، ئیتر ئەمجارەیان دەتکوژم...

و ددانەکانی گڕ کردنەوە و لە بن لێوانەوە گوتی:

- هەی گەواد...

هەر بە ڕاستی بڕیاری دابوو، ئەگەر جارێکی دیکە سەفەر بێتە پێشی، وای تێسرەوێنێ، یان ئیفلیج بێ، یا پێی بمرێ.

سەفەر نەیدەتوانی هەستێتەوە. هەر بە ڕاستی نەیدەتوانی. بە خشکەخشك دەڕۆیی. گوندییەکان بەزەییان پێیدا دەهاتەوە و بە لایدا دەڕۆیشتن و سەیریان دەکرد و کەوتبوونە دوای ژەندەرمەکان.

سەفەر بە پاڕانەوە دەیگوت:

- وەرن، هەڵمستێننەوە. هەڵمستێنن...

لەو نێوەدا چاوی بە عومەر کەوت:

- عومەر کوڕم، ئەتۆش وەك ئەو گوندییانە کافر بووی؟ وەرە هەڵمستێنەوە. و جا بڕۆ فریای تاشباشە وەلییەکەمان بکەوە و لە چنگ پۆلیسانی دەربێنەوە.

عومەر هاتە پێشەوە و بەبێ ئەوەی قسەیەك بکا، هەڵیستاندەوە و هەر لەوێ بەجێی هێشت و ڕۆیی. عومەر دەیزانی درۆیان دەکا، بەڵام نەیدەزانی چیی لە بن سەریدایە.

دیسان سەفەر دەنگی لێ بەرز بۆوە:

- مەهێڵن، مەهێڵن بیبەن. مەهێڵن وەلییەکەمان بەرن. بێت و بڕوا گوندەکەمان کاول دەبێ. تێدا دەچێ...

یەك دوو جاران ویستی پەلامار بدات، بەڵام ترسا: کوڕە ئەو جۆمالی ئۆنباشییەش بنیادەمێکی سەیرە، هەر بەزەیی نییە. هەر بڵێ لێم دە دەیەوێ بتکوژێ."

بە دەوریاندا خولایەوە، بەڵام هەر نەیدەتوانی لێیان بچێتە پێشێ. لە ئۆنباشی تۆقیبوو. هیوای بە گوندییەکانیش نەمابوو. بیری دەکردەوە کە بردنی تاشباش سەهلە، هەر لەوێ درێژی بکەن و سەریشی ببڕن، کەس متەقی لێوە نایە، مێشێکیشیان لێ میوان نییە.

ئەویش چووە نێو ئەو حەشیمەتە بێدەنگ و کپەوە کە بە شوێن ژەندەرمەکانەوە دەڕۆیشتن.

تاشباش لە پێش هەموانەوە، گەردنی بەرز کردبۆوە و دەڕۆیشت. ئەگەرچی بڕێك ڕەنگی بزرکابوو، بەڵام وا پێدەچوو گوێی لێ نەبێ. دەتگوت دەڵێ:" چ دەکرێ و دەسەڵات چییە.

چارەنووس وا بوو." بێ ترس و بێباکانە دەڕۆیی. کە گەیشتنە دەرەوەی ئاوایی، سەفەر هاوارێکی دیکەی کرد و پەلاماری ژەندەرمەکانی دا، بەڵام نیگایەکی وا پڕ لە پاڕانەوەی لە ئۆنباشی کرد، وەك بڵێی پێی دەڵێ:"توندم لێ مەدە، هێواشم لێ بدە". جۆمالی، بە خەیاڵی ئەوەی ئەوە داویین زەبرە، هەموو هێزی خۆی دایە شان و باهۆی و تفەنگەکەی داهێنایە. قرچەی شکانی ئێسقانی هات. سەفەر گوتی: وەی باوکە ڕۆژۆ مردم و لە هۆش چوو.

گوندییەکان ئەمجارە گەیشتنێ و لەسەر بەفرەکە هەڵیانستاندەوە. کە چاوی هەڵێنا، گوندی بە ژوور سەرییەوە ڕاوەستابوون. ژەندەرمەکان دوور کەوتبوونەوە. نالاندی:

- ڕۆیشتن؟ بردیان؟

دەرپەڕی. خۆی پێ نەدەگیرا. بە دوای ژەندەرمەکاندا هەرای کرد:

- ئەوە بە قسەی منتان نەکرد و بردتان. نەکا ئازاری بدەن. نەکا سووکایەتیی پێ بکەن. نەکا تاڵە موویەکی لەسەری کەم بێتەوە.... بەخوای ژنەکانتان بێوەژن دەکەونەوە. منداڵەکانتان بە مردوویی لە دایك دەبن. بوومەلەرزە ئەم هەرێمی تۆرووسە کاول دەکا.کۆماری تورکیا بەڵای لێ دەبارێ. کۆماری تورکیا تووشی شەڕ و پەلامار و قاتی و قڕی دەبێتەوە. جا ئەگەر پیاون پەنجەی بۆ بەرن دەی... دوایی نەڵێن کوێخا سەفەر پێی نەگوتین... ها... تاشباش گیان... ئاغاکەی ئێمە... ڕووگەش و لێوبەبزەکە، بگەڕێوە، خەم مەخۆ، کەس ناتوانێ دەستت لێ بەرز بکاتەوە.

دەنگی کزتر بۆوە. نالاندی و لە بن لێوانەوە گوتی:

- بەخێر چی...

و لەسەر بەفرەکان تلایەوە. ئەوجارە ئیتر سەفەر خۆی بووراندبۆوە. گوندی دەست و لاقیان گرت و لەسەر بەفرەکە هەڵیانستاندەوە و بەبێ ئەوەی متقەیان لێوە بێ، بردیانەوە ماڵەکەی خۆی.

تەنیا مەمی دیك، دوور لە حەشیمەتەکەوە بە شەلەشەل دەڕۆییشت و کە سەفەری ئاوا دەدی، ددانی لێ گڕ دەکردەوە و مڕە مڕی تووڕەییەکەی لە نێوان ددانەکانییەوە دەهاتە دەرێ.

- سەفەری دوو ڕووی هەزار ڕووی و دووهەزار ڕوو... درۆزنی دایك قەحپە... هەی نەنك و ژن و منداڵ و ئەژداد و ورد و درشتی بنەماڵەکەت ب....

یەك پشوو جنێوی دەدا و دڵی فێنك دەبۆوە.

## ٣٩

سەفەر وەنێو ئاوایی کەوتبوو و بە تووڕەییەوە دەیگرماند. جنێوی بە گوندییەکان دەدا و تووکی لێ دەکردن. دەیگوت:

ـ بردیان! لە گوندێکی بەو گەورەییەدا گرتیان و بردیان. هەر سێ ژەندەرمە بوون هاتن و ڕۆژە ڕووناکەکەیان گرتین و بردیان. سۆمای چاوەکانمان، بەرەکەتی دەغڵ و دان و بارانی مزراکانمان و شیری مانگاکان و هەنگوینی پوورە هەنگەکانمان و میوەی دارەکان و سەوزایی دارستانەکانمان، زاو و زێی ژنەکانمان و بەندە باشەکەی خودایان گرت و بردیان... ئەویش بە ڕۆژی ڕووناك و بە بەرچاوی خۆمانەوە، هەر من بووم بەرۆکمم دادڕی و هەر منیان کوشت.

قۆڵە هەڵبەستراوەکەی خۆی نیشان دەدا. بە دوایین زەبری قۆنداغە تفەنگەکەی ئۆنباشی لەجێ چوبوو و ئاشقەکەچەڵە بۆی خستبۆوە جێ و هەڵیبەستبۆوە. ئەوەندە دێشا لە بەر ژان و ئازار ئاوی بە چاویدا دەهاتە خوارێ. دەیگوت:

ـ هەتا نێو جەرگ و هەناوم پێوەی دەزیرێنێ. ژانەکەی سەری دڵمی پێوە دێشێ. ئەگەر ئەنگۆ لەگەڵم هاودەنگ بوایەن، ئەو ئۆنباشییە نەیدەتوانی تاشباشەکەی ئێمە بەرێ و بیخاتە شێتخانەوە... نەیدەتوانی ئەوەندەی لێ بدا گۆشتی بە لەشییەوە نەمێنێ. نەیدەتوانی گیانی شیرینمان بەرێ و لە زیندانی توند بکا. ئەگەر ئەنگۆ پیاو بوایەن، بنیادەم بوایەن... هەی گوندییە بێناموسەکان...

پاش ئەو جنێوەی "هەی گوندییە بێناموسەکان"، ئەوجار ئەو نەفرەتە بەناوبانگەکەی تاشباش ئۆغلو دەهات. هەر ئەوەی وا گوتبووی:"ژنەکانتان نەزۆك دەبن. باران لەو گوندە نابارێ." سەفەر دەگەیشتە هەر کەس ئەو نەفرەتەی دووپاتە دەکردەوە و چاوەڕێ بوو دیسان خەڵکی ئاوایی بە بیستنەوەی ئەو نەفرەتە بورووژێنەوە و ئەو لەسەر تەختە بەتاڵەکەی تاشباش دابنێن، بەڵام گوندییەکان هەر گوێشیان نەدەدایێ.

لە ناخی دڵییەوە، دەنگەکەی خۆی بە خۆشترین شێوە دەردێنا و نەفرەتەکەی دووپاتە دەکردەوە، بەڵام دەیزانی ئەو گوندییە بێ چاو و ڕوویانە، لەو گوێیەیان دەیبیستن و لەوی دیکەیان دەیدەنەوە دەرێ و هەرچیی بیکا خۆڕاییە.

هەر بە ڕاستی ئەو گوندییانە چ شتێکیان لەو تاشباشەدا بینیبوو کە ئاوا پێوەی نووسابوون و دەستیان لێی بەرنەدەدا؟ نەفرەتەکانی بوو؟ خۆ ئەو لە تاشباش باشتری نەفرەت لێیان دەکرد. دووعاکانی بوو؟ خۆ ئەو دەیتوانی دووعای باشتریش بکا.

"ئاخ ئەگەر جارێکی دیکە ئەو تاشباشە ببینمەوە. دەکەومە سەر پێیانی و هەتا ئاخری عومرم دەبمە عەبد و نۆکەری. هەروەها...."

هەر هەموو گوندەکە ببووە یەك زار و ئەو زارەش ببووە تەڵەی تەقیو. بچووکترین دەنگێك لەو ئاوەدانییەوە نەدەهات. تەنانەت بچووکترین جووڵەیەکیش نەدەبینرا. ژیانی ئاوەدانییەکە ڕاوەستابوو و هەر دەتگوت گیانیت کێشاوە. جیا لە گڤەی با و کڕێوە و ئەو بۆرانەی لە دەشتەکەوە هەڵیکردبوو و خۆی بە کەلێن و قوژبنی خانووەکاندا دەکرد، دەنگ و سریوەی هیچ شتێکی دیکە نەدەهات. هەر وەك بارنی هێمن و لەسەرخۆی بەفرەکە لە بێدەنگیدا، کە دەنگێکی وەك دەنگی باڵی جڕوجانەوەران دەبیسترا. تەنانەت سەگەکانیش نەدەوڕین. کەڵەشێرەکانیش نەیاندەخوێند.

"دنیا لەوەتەی هەیە، وەها ماتەمێکی بەخۆیەوە نەبینیوە... هاوارە لەمن، هەی بە گۆڕی ئەژدادی ئەنگۆی دێهاتی.... هەر لەبەر ئەو تاشباشە سەگبابە کە هەر هەموو گیانی پوولێکی سووتاو ناهێنێ، ئەو تاشباشە شێت و شوورە... ئەوە چ شەمۆتە و ماتەمێکە. ئەوە چییە ها؟...

حەزی دەکرد بچێتە نێوەڕاستی گوندەکە و لە بەیانییەوە تا شەوێ چەندی پشووی لەبەر دایە هاوار بکا. یەك دوو جاران تاقیی کردەوە... چووە نێو گوند و لەوانەیە بۆ هەزارەمین دار ئەو نەفرەتە بەناوبانگەی تاشباشی گوتەوە. گوتی و گوتی و هەر وشەیەکی لە ناخی دڵییەوە هێنایە دەرەوە، بەڵام زیندەوەرێك نەهات گوێی بداتێ. سەفەر هەرچیی توانیی لەخۆی نووسا و بابی خۆی گا، بەڵام کەس گوێشی پێی نەبزووت. ئاخرییەکەی لە کەللەی دا و چیی جنێو بوو دای بە دایك و خوشکی گوندییەکان، بەڵام زۆر ترسا و لە حاڵێکدا هەر ئاوڕی دەدایەوە، بە ترسە ترس بەرەو ماڵەکەی خۆی تێی تەقاند. دەرگای ماڵەکەی گاڵە دا و تفەنگەکەی بە دەستەوە گرت و چاوەڕێ ما. پێی وابوو هەر ئێستا نا ئێستا پەلاماری دەدەن. مرێمۆك بەو تووڕەییە تۆفانییەوە لە پێشیانەوە دەێ و دەرگاکە لە ڕێسمە دەبەن و ئەوجارە ئیتر ناهێڵن نانی

زیندووان بخوات. چیی چاوەڕێ بوو کەس نەهات. بەخۆی گوت:" ئەو گوندییانە "تۆراون" و لە حوکمەت و لە عیسمەت پاشا و لە مستەفا کەماڵ و لە کێو و دەشت، لە ئۆنباشی جۆمالّی و لە هەرێمی تۆرووس و لە خواو پێغەمبەر، لە ئاسمان و دەریا و لە خاك و مێروولە و لە کوێخا سەفەر تۆراون. ئەو گوندییانە وا تۆراون، لە تۆرانەکەی مریەوك قەباحەتتر و خەراپتر. ئیتر ئاشت نابنەوە.

سەفەریش چۆوە قاوغی خۆی و گوتی:"چیی لە دەستتان دێ بیکەن و هەروەها ئەمن کارم بە کاری ئەو گوندییە تۆراوانەوە نییە. بڕۆن و لە هەموو دنیا بتۆرێن. ئەوەندە بتۆرێن هەتا گیانتان دەردەچێ. هەی سەگبابینە."

ئەو حاڵە چۆن دەبڕایەوە؟ کەی بزەیان دەخزایەوە سەر لێوەکانیان؟ پێی وابوو لە گوندەکەدا حەقایەت و دەنگۆیەکی زۆر هەیە، بەڵام ترسا تەنانەت بیریشیان لێ بکاتەوە:

"ئاشباشیان بردووە و خستوویانەتە شێتخانەوە. لەوێ بە هەزاران شێتی لێ بووە. عەرزی ئاغای خۆم بکەم، لە ناکاو سەیریان کردووە و دیتوویانە بینای شێتخانەکە لە چاوان ون بووە و شێتەکان لە نێوەڕاستی بیابانێکا ماونەتەوە. کە ئاشباشیان هێناوەتە دەرێ، بیناکە دیسان هاتووەتەوە سەر جێیەکەی خۆی..."

بەڵام ئیتر گوندییەکان گوێیان بەو جۆرە حەقایەتانەش نەدەدا. ئەگەر ڕۆژەکانی ڕابردوو بوایە، ئەوان زۆر بە حەژمەتەوە گوێیان بۆ ئەو حەقایەتانە ڕادەگرت و وازیان لێ نەدێنا.

ئەو گوندییانە کەنگێ لەو خەوی مەرگە بەخەبەر دەهاتن؟... سەفەر تازە تێدەگەیشت کە لەم دنیایەدا هیچ شتێك لە تووڕەیی بنیادەمەکان سامناکتر نییە. ئەو گوندە وەك گۆڕستانێکی کڕ و کپ و بێ سنوور.

ڕۆژێکیان سەر لە بەیانی سەفەر بە دەنگی هەڵڵا و قریوە لە خەو ڕاپەڕی. دەنگی ژن و پیاو و سەگ و کەڵەشێر تێکەڵ ببوو. ئەو دەنگە تێکەڵ پێکەڵانە، زەوی و ئاسمان و تەنانەت دەشت و دەری تەنیبۆوە و پڕی کردبوو. بە پەلەپەل لە جێوبانەکەی دەرپەڕییە دەرەوە. هێشتا ڕۆژ نەبېۆوە. بەلای ڕۆژهەڵاتدا تیشکی دابووە لێواری گەواڵە هەورەکان و ڕوونی کربۆوە. بایەکی سارد لە دەشتەکەوە دەهات.

- چ بووە؟ چ باسە؟

چ قەومابوو؟ بۆخۆشی دەیزانی چ بووە. جا چونکە دەیزانی، لە دڵەکوتە و خێرا، بەرەو ماڵەکەی ئاشباش ڕای دەکرد. کە گەیشتە بەر دەرگاکەی ماڵی ئاشباش، تووشی

حەشیمەتێکی ڕووگەش و لێو بە پێکەنین و دڵخۆش بوو. دەرگای ماڵی تاشباش لەسەر پشت بوو. دری بە حەشیمەتەکە دا و وەژوور کەوت. تاباش ئۆغلو لە دەم کوانووەکە دانیشتبوو و چاوی بڕیبووە بڵێسەی ئاگرەکە. سەفەر دەمودەست خۆی بەعەرزەکەدا دا و باوەشی بە لاقەکانی تاشباشدا کرد:

ـ بەخێر هاتییەوە ئاغاکەی ئێمە، وەلییەکەی خۆمان، ئازیزەکەمان، بەخێر هاتییەوە، خێر و بەرەکەتت هێنا، ئەی پەیکی پێغەمبەری خوا، بەخێر هاتییەوە ئەی گوڵوکی دارەکانمان، سەوزایی دارستان و خوڕە و هاژەی ئاوەکانمان...

تاشباش ئۆغلو لە سەر خۆ سەرێکی هەڵبڕی و بە نەفرەت و بێزارییەوە لێی ڕوانی و هەر وا بە لەسەرخۆییشەوە ڕووی لێ وەرگێڕا و چاوی بڕییەوە ئاگرەکە.

گوندییەکان کە لە دەگاکەوە دەچوونە دەرێ، بە دڵێکی خۆش گوتیان:

ـ هەر ڕووشی نەدایێ. نەیدواند.

ئەو دوو کورتە قسەیە، بە دەنگی شادی و قریوە قریو، زار بە زاری ڕۆیشت و دووپاتە بۆوە.

سەفەر دیسان گوتی:

ـ ئەی تاشباشی مەزن و گەورەی ئێمە، خۆ ئەو ئۆنباشییە گیانی نازەنینتی ئازا نەدا؟ ئەو گەمارانە خۆ دەستیان لە جەستەی لە گوڵ ناسکتر و نەرم و نیانترت نەدا؟ ئەمن لە ترسانا خەریك بوو زراوم بچێ کە نەکا مەزن و سۆمای چاوەکانمان ئازار بدەن. خوایە گیان شوکر، زۆر شوکر، ئەتۆ ڕۆیشتی و گەڕایتەوە، ئەو گوندە مردبوو، ماتەمبار بوو، مەزنی ئێمە، ئەتۆ هاتیتەوە و گیانت بە بەر ئەو گوندەدا کردەوە، وەك خوێن بە دەمارەکانی ئەو گوندەدا گەڕای و هەروەها ئێمەشت بووژاندەوە.

هەر دەیگوت و دەیڕێست، بەڵام تاشباش وەك بەرد، بێ جووڵە بوو و تەنانەت ئاوڕێکیشی لێی نەدایەوە کە سەیرێکی بکا. سەفەر حەزی لێ بوو تاشباش تەنیا لەبزی دەلەبزی بگەڕێ. هەر قسەیەکی لەگەڵ کردبایە بەسی بوو، باری کەوتووی لە گوندەکەدا ڕاست دەکردەوە، بەڵام تاشباش دابوویە باری لاساری و ئەو تاقە قسەیەشی لە زاری نەدەهاتە دەرێ. ئاخرییەکەی بە دەنگێکی کز، کە هەر تاشباش گوێی لێ دەبوو گوتی:

ـ، بەڵام، تاشباشە خۆشەویستەکەی ئێمە، کاتێ ژەندەرمەکان تۆیان دەبرد، هەر من بووم گریام و لالامەوە و خۆم بە ئاو و ئاگردا کرد. کەچی ئەو گوندییانەی ئەتۆ بە خۆمانەیان دەزانی، هەر مێشێکیشیان میوان نەبوو. ژەندەرمە بە قۆناغە تفەنگ وایان لێ دام، ئەوەتا

دەبینی باسکم لەجێ چووە. بە قوربانت بم، هەر یەك قسە، قسەیەکم لەگەڵ بکە با ببینە دۆست و برادەری یەکتری و لای ئەو گوندییانە حەیام مەبە... ئەمن دۆستی تۆم و لەمەودواش هەر خزمەتکاری تۆ دەبم، لێم خۆش بە، لە هەموو ئەو خراپانەم خۆش بە کە لێیان ئاگاداری، ئیتر تۆبە، دەبمە پیاوێکی باش و بە ئیمان و دۆستی گوندییەکان و جگە لە گوندی بیر لە هیچ شتێکی دیکە ناکەمەوە. یاڵڵا دەی ڕووم تێکە و دوو قسەم لەگەڵ بکە. با لە نێو ئەو گوندییانەدا سووك و ڕیسوا نەبم. مەردی خودای بە، بۆچی ئاوا وەك بەرد چەقیوی و جووڵەت نایە. چما تۆ دڵت نییە؟ مەزنی ئێمە، چما لەبری دڵ، سندانی ئاسنیان لە سینگتدا داناوە؟ گەورە و سەروەری ئێمە؟... ئێستا دەتەوێ قسان بکەی یان نا؟ ئەگەر هیچ نەڵێی...

گوندییەکان هاتبوونە پێشتر و دەیانویست بزانن بە سرتە چ بە تاشباش دەڵێ؟، بەڵام سەفەر زۆر بە ئەسپایی قسەی دەکرد:

ـ بمدوێنە. ئەگینا بۆ خۆت خراپە. کوڕە پێت دەڵێم خراپ دەبینی. خراپی لێ هەڵدەگرییەوە ها. ئەگەر وەلی سەهلە، ببیتە یەکێك لە پێغەمبەرەکانیش، ناهێڵم نانی زیندووان بخۆی. مـن دەستم لە گیانم بەرداوە. دەی قسەیەك بکە. ئەگەر نەیکەی، هەرچیت دیتووە لە چاوی خۆتـت دیوە، تاشباش، تاشباش ئۆغلو، باش بزانە دوای ئەوە خودا یان بەتۆی دەدا یان بە مـن....

باوەشی کە بەتوندی بە لاقی تاشباشدا کردبوو، لە ناکاو بەریدا و هەستا:

ـ ئەمن سەفەرم پێ دەڵێن، ئەگەر پێشانم نەدای...

بە سەری شۆڕەوە، دری بە خەڵکەکە دا و گورج لە ماڵەکەی دەرپەڕییە دەرەوە.

چ ئەو کاتەی قسەی دەکرد و چ ئەو دەمەش کە تیژ دەرپەڕییە دەرەوە، تاشباش تەنانەت جارێکیش چییە چاوی لە ئاگرەکە نەترووکاند و سەیری نەکرد و هەر نەشجووڵا.

گوندییەکان کە لە دەرەوە کۆ ببوونەوە، گۆتیان ئۆخەی... ئۆخەی حەساینەوە.

ـ چوو کەوتە سەر دەست و پێیانی، بەڵام تاشباش هەر ئاوڕیشی لێ نەدایەوە.

ـ مەزن و گەورەی ئێمە تاشباش....

سەفەر دەیزانی لە پشتەملی چیی پێ دەڵێن، هەر وەك هەمووی بە گوێی خۆی بیستبێ. بە دەم سمێڵ جوینەوە، چۆوە ماڵەوە و تفەنگەکەی لە دیوارەکە لێ کردەوە و فیشەکی لەبەر نـا... چەند هەنگاوێك بەرەو دەرگاکە چوو و لە لاشیپانەی دەرگاکەدا چەقی. تاشباش ئەو ڕۆژە بەو هەڵسوکەوتەی خۆی فەرمانی مەرگی ئەوی دەرکردبوو. دوای ئەو وەزعـە، چۆن لـە نێـو ئەو خەڵکەدا سەری هەڵدەهات و دەیتوانی سەیری چاویان بکا؟ ئاخۆ ئەوە هەر ئەو بەڵایە نەبوو کە تاشباش دەیویست بەسەری بێنێ؟

سەفەر بەخۆی دەگوت:"گیان لە بەرامبەر گیاندا. دەبێ ئەو کەسە بکوژمەوە کە منی کوشتووە..، بەڵام کەنگر و ماست بە وەختی خۆی....ئەوی بە توورەییەوە هەستێ، بە پەشیمانییەوە دادەنیشێتەوە. هەموو کارێك دەبێ بەجێ و ڕێ بکرێ. سەیر کە، حوکمەت هیچ شتێك بە گۆترە ناکا. تەنانەت حوکمەتیش....

تفەنگەکەی بردەوە و لە سەر جێیەکەی خۆی داینایەوە...

***

مولازم لە پێشدا، بە توورەییەکی شێتانەوە ڕووەو تاشباش چووبوو و گوتبووی:

ـ دەی، وەك دەڵێن گوتووتە من مەهدیی زەمانم؟ ئەویش لە چاخی ئەتۆم و گەڕان بە گەردووندا. هەی مەندەبووری هیچ و پووچ." و ئەوجار گوڕاندبووی:

ـ بنیادەم ئەوە دەچنە سەر گۆی مانگ. ئەوە کەرامەت و پەرجۆ نییە. زانستە ئەو دەباتە ئەوێ. ئەتۆش هەی ورچی زەبەلاح، خەریکی لێرە قسەی پڕو پووچ و ئەفسانە هەڵدەبەستی و خەڵك هەڵدەفریوێنی و دەتەوێ خەڵکی خوای تووشی چارەڕەشی و نەگبەتی و هەژاری بکەی و تا هەتایە لەو دنیای نەزانینەدا بێننەوە و ئەتۆ کەرامەت و پەرجۆیان بۆ دەنوێنی و جادوویان بۆ دەکەی... ئەمن هەر لەبەر ئەو سەدەی بیستەمە ئەنجن ئەنجنت دەکەم. قوورومساغ، ئەو خەڵکە هێشتا لە چاخی بەردیندا دەژین. ژیانی ئەوانە هیچ جیاوازییەکی نییە لە ژیانی دە هەزار ساڵ لەوە پێش، پەنجا هەزار ساڵ لەوە پێش... لەو نێوەشدا ئەتۆ دێی و بە فێڵ و دەهۆیان لە هۆزە ئەفریقییەکانیان پتر بەرەو دواوە دەگێڕیتەوە؟ باشە بەزەییت بەو میللەتەدا نایەتەوە؟ بۆچی ئەو زوڵمەیان لێ دەکەی؟ هەر هەمووی بۆ چەند پوولی ڕەش و چرووك؟ بۆ چەند قرۆش... باشە بەو ملە ئەستوورەتەوە بۆچی کار ناکەی؟...

ئەو قسانە تاشباشیان لە دین دەهری کردبوو. هەستابوو و گوڕاندبووی:

ـ کوڕە مولازم، جەنابی مولازم. ئەو بوختانانەم پێ مەکە. ئاخر خۆ بنیادەم بەر لەوەی پرسیاری لێ بکەن لە داری نادەن. ئەتۆ لە پێشدا پرسیارم لێ بکە، دوایی ئەگەر ویستت لە دارم بدە یان سەرم ببڕە. ئەگەر ویستیشت گوللە بارانم بکە. خوێنم وەك شیری دایکت حەڵاڵت بێ، بەڵام لێم گەڕێ با قسەی خۆم بکەم و بڵێم ئەو مەسەلەی مەهدیبوونەی من چییە با جوان و زەریف تێ بگەی.

ئەو قسانە تۆزێك ڕقەکەی مولازمیان دامرکاندبۆوە و پرسیبووی:

- یانی ئەتۆ دەڵێی کوێخا سەفەر درۆیان دەکا؟... دەی باشە بۆم بگێڕەوە بزانم چ باسە؟، بەڵام ڕاستییەکەی بڵێ.

تاشباش دانیشتبوو و بۆی لە بنی کوولەکە دا، بەبێ ئەوەی یەك شتیشی بەجێ بێڵێ.

مولازم بە قسەکانی ئەو گۆڕابوو و نەرمتر ببۆوە و ئاخرییەکەی بەزەیی پێیدا هاتبۆوە و لێی پرسیبوو:

- باشە ئەمن چ یارمەتییەکم لە دەست دێ، براکەم محەمەد؟... ئەتۆ چۆن لەو بەڵایە نەجاتت دەبێ؟... کارەکەت بە بارێکی خراپدا کەوتووە برالە.

تاشباش ملی بەلارەوە نابوو و گوتبووی:

- ڕزگاربوونی من... ڕزگاربوونی من؟

مولازم وەڵامی دابۆوە:

- سەیر کە محەمەد، ئەمن پیاوی یاسام و ئەتۆش پیاوێکی ژێر دیاری. ئەتۆیان لەو بەڵایە وەرداوە و لەو گێژەنەیان خستووی. بۆخۆت دەبێ ڕێی ڕزگاربوونی خۆت بدۆزیتەوە. لەو کارەدا کەس جگە لە خۆت ناتوانێ دەستت بگرێ. بەو وەزعەوە کە پێش هاتووە، ڕێگەت دەکەوێتە شوێنی خراپ. ئەمن ناتوانم هیچ ڕێگە چارەیەکت نیشان بدەم، بەڵام ئەگەر جارێکی دیکە لێرە بتبینمەوە و ببیستمەوە بچووکترین سەرقەڵەمانە و دیاریت لە خەڵکەکە وەرگرتووە، دەتاهارم و ورد و پردت دەکەم و بەڵایەکت بەسەر دێنم با بە دەواری شڕی نەکردبێ. چاوی خۆت خورد بکەوە.

تاشباش ماندو و شەکەت و بێتاقەت لەوێ هاتبووە دەرێ. خوایە چۆن بەرۆکی خۆی لەو بەڵایە ڕزگار بکا؟

نوقمی ئەو بیر و خەیاڵانە گەیشتبۆوە ئاوایی، بەڵام لە ناکاو دەبینێ، بەردەرگای ماڵەکەی قیامەتێکە هەر مەپرسە. باشە ئەو خەڵکە کەنگێ و چۆن زانیبوویان ئەو دەگەڕێتەوە کە ئاوا خێرا کۆ ببوونەوە؟ هەر چاوی بە خەڵکەکە کەوت، ساتێك بە مێشکی دا هات، پشت لە گوند و ژن و منداڵەکەشی بکات و ڕا بکا، بەڵام خۆیشی دەیزانی ناتوانێ کاری وا بکا. دەیتوانی واز لەو گوندە بێنێ... لە ژن و منداڵەکەشی...، بەڵام نەیدەتوانی واز لە شتێك بێنێ... لە شتێك... لە شتێك... ئەو شتەی کە بۆخۆشی نەیدەتوانی بیڵێ.

بەرەو لای حەشیمەتەکە چوو و خۆی دایە دەست خۆشەویستییەکەی ئەوان. دەکەوتنە سەر دەست و پێیانی و شان و دەستیان ماچ دەکرد:

ـ مولازم هەر تاشباشە مەزنەکەمانی دیتبوو، خۆی بەسەر پێڵاوەکانیدا کێشا بوو و گوتبووی:" لێم خۆش بە تاشباش ئەفەنی. ئەمن لەسەر تۆ بەسەهوو چووم". لەو کاتەدا تۆپەڵە تیشکێك لە نێوچاوانی تاشباشی مەزنمانەوە دەردەچێ و لە پەنجەرەکەوە دەڕواتە دەرێ. بڕێك دواتر بووەتە سێ تۆپەڵە تیشك و گەڕاوەتەوە سەر نێوچاوانی. مولازم چاوی بە مۆڵەق وەستاون و گوتوویەتی: ئەی تاشباش ئۆغلو، ئەتۆ وەلی و هیوای ڕۆژگار و سەردەمی ئێمەی. زۆر باشە، ئێستا بگەڕێوە گوندەکەی خۆت. بەخێر چی. بڕۆ و هیوا بە مرۆڤەکان ببەخشەوە. چاکیان بکەوە و بەرەکەت بە زەوییەکان بدەوە". بەڵێ، مولازم بنیادەمێکی پاك و حەڵاڵ زادەیە.

تاشباش لەبەر خۆیەوە بیری لەوە دەکردەوە کە ئەگەر ئەو حەقایەتی سێ تۆپەڵە تیشکە بە گوێی مولازم بگاتەوە و بڵێ هێشتا نەگەیوەتەوە ئاوایی دەستی پێ کردووەتەوە... خوایە گیان چ بکەم؟ باشە ئەو خەڵکە بۆچی لە کۆڵم نابنەوە؟

سەیری کرد بێ سوودە. هەر دوو تای دەرگاکەی کردەوە و چوو لە تەنیشت کوانووەکە دانیشت و چاوی بڕییە ئاگرەکە. ڕێك لەو کاتەدابوو کە سەفەر هات و خۆی بەسەر دەست و پێیدا خست.

کە شەو داهات، خەڵکەکە بڵاوەیان کرد و نۆرەی نەخۆشان هات. تاشباش هێنانییە ماڵەوە و بە ڕوویەکی گەش و بە دڵۆڤانییەوە بەخێرهاتنی کردن و خولقی کردن. دەستی یەك بە یەکیانی گرت و دەستی لەسەر نێوچاوانیان دانا و ئەو جار ڕووەو قیبلە وەرسووڕایەوە و چۆکی دادا و لە ناخی دڵییەوە بۆ هەموو نەخۆشەکان پاڕایەوە. دەیگوت:

ـ ئەی خوای گەورە و مەزنی من، ئەوانە لەبەر خاتری تۆ هاتوونەتە لای من. ئەگەرچی لە هەنتەشی تۆدا ئەمن هەر هیچ نیم و لە بەر دەرگاکەت لە سەگێکیش کەمترم، بەڵام چونکە ئەوانە هیوایان بە منە، خۆت شیفایان بدە.

و لە جێی خۆی هەستا و فووی لە سەروچاوی یەك بە یەکیان کرد.

❊❊❊

لە گوندەکانی دیکەوە و لە گوندەکانی نێو چیاکانی تۆرووسەوە و لە گوندە دوورەکانی دەشتێوە و لە زۆر زۆر دووتریشەوە نەخۆش بە ڕەوە ڕوویان کردبووە ماڵە پیرۆزەکەی تاشباش. نەخۆش دەهاتن و دەرمانی دەردی خۆیانیان وەردەگرت و دەگەڕانەوە: نەخۆشی جۆراوجۆر: فێدار، نەخۆشی ڕۆماتیزم و ڕەبۆ و دەمار و پەککەوتە و مالاریا و دەردەباریکە و سوورەکوان و

دەست لێوەشێنراو و گـۆج و ئیفلیج و شـێت و شـوور دەهـاتن. تاشـباش ئۆغڵو لـە دووعـا و پاڕانەوە و فووڵێکردن ماندوو دەبوو. چونکە بە شـەو نەخۆشـەکانی دەدی و هـەتا بـەیانی هـەر بەخەبەر دەبوو و نەدەنوست، بە ڕۆژ هەتا ئێواریٚ دەخەوت. هەر بۆیەش کـەس نەیـدەدی. هـەر نەخۆشەی هێندەی نووکـە پەنجەیـەك خـوێی لـیٚ وەرگـرتن و لەسـەر یـەك کـۆ بـووەوە و ببـووە تەمبارێك. بە تایبەتی خەڵکەکەی یالاك تەواو خوویان پێوە گرتبوو. هەر کەس لـووتی ڕاسـابا (خوێنی بەر بووبا)، یان ددانی ژانی کردبا، چـاوی پـەڕیبا یـان مـانگـا و گوێدرێـژی ون بووبـا، دەمودەست خۆی دەگەیاندە ماڵەکەی تاشباش.

"لە گوندەکانی ئەولای تۆرووسەوە کچێکی عازەبیان هێنابووە لای تاشباش. کچێکی جوان قژ درێژی چاوڕەش بوو، بەڵام حەوت ساڵ بـوو بـە جێوبـان کـەوتبوو. لاقـەکانی وەك دار وشـك هەڵاتبوون و نەیدەتوانی لـە جێـی خـۆی ببـزویٚ. تاشباشـەکەمان دەسـتێکی بـە لاقـی کـچەدا کێشابوو، بەڵام هیچ کـاری نـەکردبوو. ئـەوجار دووعایـەکی خوێنـدبوو و لەبـەر خـوای گـەورە پاڕابۆوە، دیسان هەر وا وشك و ڕەق مابۆوە. دوای ئەوە چوبووە سەر چیای تەکەچ و سیٚ شەو و ڕۆژان لەویٚ دووعای کردبـوو، کـە دەگەڕێتـەوە دەبـینیٚ ئـەوە کـچە هـەر وەك خۆیـەتی. زۆری بەزەیی بە کچەکەدا دێتـەوە... کـچێکی ئـاوا جـوان... تاشباشـەکەمان خـۆی پـیٚ نـاگیردریٚ، دادێتەوە و نێوچاوانە نوورانی و پیرۆزەکەی کە جگە لە خودا لە بەرامبەر کەسدا داینەدەنا سەر عەرزی، دەنێتە سەر لاقەکانی کچە و لە ناکاو کچە لە جێی خۆی هەڵدەستیٚ و بـە پێـی خـۆی دەگەڕێتەوە ئاواییەکەیان."

❊❊❊

"حەمە عەلییە لالە، شوانێکی گوندی چوکوورجەی نێوەڕاستی دەشتـەکەی چـوکووراوایە. تەمەنی بیست ساڵ دەبیٚ. شەوێکی بە بەکرێوە و بارن، گەلە گورگ لە ڕانەکەی دابوو و پـەز و مەڕیان لیٚ زگ دڕیبوو و خواردبوویان. ئـەویش بـۆ ڕزگـارکردنی مێگەلەکـەی، هـەر بەگۆچـان وەرگەڕابوو۪ە گورگەکان. بەیانی خەڵك بە بێهۆشی لەسـەر بەفرەکـە دەیبیننـەوە و کـە وەهـۆش خۆی دێتەوە، لیٚـی دەپرسـن، چـیی بەسـەر هـاتووە، مەمـەد عـەلی نـەیتوانیبوو قـسان بکـا. هێنابوویانە لای تاشباش و تاشباش لە زاری تفیبوو. مەمەد عەلی ئەوجار وەك برێشکەی بخوا قسەی کردبوو...

❊❊❊

کەماڵە بەڵەك، کە حەوت ساڵی ڕەبەق نۆبەتیٚ و سیٚبەڕۆی بوو، هەموو ساڵیٚ نەخۆشینەکەی سەری هەڵدەدایەوە. ڕۆژیٚك دەیگرت و ڕۆژیٚك بەری دەدا. ئەو داماوە هەر بۆیە نەیدەتوانی لە چوکوور لۆکە بڕنیٚتەوە. تاشباش چنگە لۆکەیەکی لە ڕۆنی زەیتوونیٚ وەردا و ئاگری دا و لە بەر لووتی ڕایگرت. لەو ڕۆژەوە نۆبەتیٚیەکەی بەری داوە و سەری هەڵنەداوەتەوە...

"مچە زاڵم، تەمەنی حەفتا ساڵە. ڕیٚك حەفتا ساڵ. لە سی و پیٚنج ساڵییەوە، هەر دووك چاوی کویٚر بووە و موقرایی داوە. هاتە لای تاشباشەکەی ئیٚمە و گەڵای دار بی و باڵی شەمشەمەکویٚرەی بۆ تیٚکەڵ کرد و دووعایەکی لەسەر خویٚند و ئاگری دا. هەر ئەوەندەی دووکەڵەکەی گەیشتە چاوی مچە زاڵم، دەمودەست بینایی تیٚ گەڕایەوە..."

***

زنجیرەیەك لەو حەقایەتانە بە هەموو وڵاتدا بڵاو ببوونەوە. ئەو حەقایەتانە لە هەموو گوند و دیٚهاتەکانی تۆرووسدا و دەشت و تەنانەت شارۆچکەکەشدا، زار بە زار دەگەڕان. تەنانەت لە شارییشەوە، نەخۆشی بیٚدەرمانیان دیٚنایە لای تاشباش. هەموو کەسیٚك جگە لە پیاوانی دەوڵەت، ئاگاداری ئەو مەسەلەیەی تاشباش بوون و باسیان دەکرد. بۆ ویٚنە ژنەکەی مولازم ئاگای لە هەموو ئەو مەسەلانە بوو، بەڵام مولازم ئاگای لیٚ نەبوو. تاشباش خۆیشی هەتا بە چاوی خۆی ئەو نەخۆشانەی نەدیبوو کە بە دەستی وی چاك دەبنەوە، بڕوای بە "وەلی"بوونەکەی خۆی نەکردبوو. ئەو کچە ئیفلیجەی کە دیت دوای حەوتووەك چاك بۆوە ولە خۆشیانا بە کوڵ گریا. ئەو لاڵانەی وەزمان هاتن و ئەو کەڕانەی گویٚیان چاك بۆوە و بیستیی و دیتی کە چۆن ئەوانە لە ناخی دڵەوە دەیانناڵاند، هەر دەستی ئەویان دەگەیشتیٚ، هیٚور دەبوونەوە، هەر هەمووی ئەو شتانەی دیت و دیتی کە هەر هەمووی ئەوانە بە دەست پیٚداکیٚشان و فوولیٚکردنیٚك چاك دەبنەوە...

وەلی نەبوو. بنیادەمیٚك بوو هەر وەك بنیادەمەکانی دیکە، بەڵام ئیتر... ئەی ئەو ڕووداوانە چ بوون؟ هەر ئەوەش بوو کە ئۆقرەی لە تاشباش ئۆغڵو بڕیبوو و بەردەوام میٚشکی تیٚك دابوو.

هەر بە ڕاستی ئەو هەمووە بنیادەمە، ئەوانەی تۆپەڵەی تیشکیان دیتبوو و ئەو دار و ڕیٚگە و مارانە و ئەو نەخۆشیانەی چاك ببوونەوە، هەر هەموویان درۆیان دەکرد؟، بەڵام لیٚی سوور بوو کە لەو شەوە سارد و وەیشوومەیەدا، بە دارستانیٚکی تیشکەوە نەچووەتە سەر چیای

تەکەچ. ئەگەر چووبایە، بێ ئەملا و ئەولا دەیبەست و دەمرد، چونکە ئەوێ لە هاوینیشدا ناکرێ ساتێکی لێ بێنیتەوە. چون بنیادەم دەمودەست دەبێتە یەك پارچە سەهۆڵ. جگە لەوانەش، بنیادەم چۆن خۆی نازانێ چووەتە شوێنێك یان نەچووە؟ یان ئەو دار گوێزە پیرۆزەی کە هەموو شەوان، نوقمی نوور دەبێ و دێتە سەر ماڵەکەی تاشباش؟ ئەو دارە نوورانییە، نەك یەك کەس، بەڵکو هەموو خەڵکەکە بەسەر ماڵەکەی ئەوەوە دیتبوویان. جا ئێستا با بڵێین یەك دووانێکیان درۆیان کردبێ، چما دەکرێ هەموو خەڵکی گوندێکی گەورە بەپانەوە درۆیان بکەن؟ تازە وای دانێین کە هەموو ئەو گوندییانەش درۆیان کردبێ، ئەی خەڵکی گوندەکانی دیکە کە ئەو دارەیان بینیوە کە چۆناوچۆن لە لووتکەی تۆرووسەوە دەخوشێ و دێتە پێشێ، ئەوانیش هەر دەرۆ دەکەن؟ ئەو کارە حیکمەتێکی تێدا بوو. نهێنییەکی یەزدانی بوو، بەڵام چ نهێنییەك؟

چۆن دەکرێ یەکێك وەلی بێ و خۆی ئاگای لێ نەبێ، لەوانەشە نەدەبوو ئاگای لێ بێ، بەڵام ئەی پێغەمبەرەکان ئاگایان لە پێغەمبەربوونی خۆیان و حەزرەتی خدر ئاگای لە خدربوونەکەی خۆی نەبوو؟ دەڵێن وەلی و پیاوچاکەکان نامرن؟ دەبێ ڕاوەستین و ببینین....

## ٤٠

گوندی تەواو بێ تامیان کردبوو. تۆ بڵێی دڵی مولازم خەبەری دابێ؟ لەوانەشە هەر بۆیە بەری دابێ. ئەڵام ئەگەر لە کەلێنێکەوە ئاگای لەو وەزعەی ئێستا بوایە و ئەو نەخۆش چاکبوونەوەیە و هامۆشۆی ئەو سەدان کەسەی بیستبایەتەوە کە ڕۆژانە سەردانی تاشباش دەکەن، چیی دەگوت؟ دەبوو چ بڵێ؟ ئێسك و پرووسکی دەهاڕی و دەیخستە بەندیخانەوە و دوای ئەوەش دەینارده شێتخانە.

نەك هەر ئەوە، مەترسییەکی دیکەش سەری هەڵدابوو. چیی وای نەمابوو ماڵەکەشی بڕووخێ. بەر ماڵەکەی ڕۆچووبوو. هەرکەس دەهاتە ماڵەکەی ناچار بوو بەسەریدا باز بدا. خۆ ئاوا چووبایە پێشەوە، ئیتر کەس نەیدەتوانی بچێتە ماڵەکەی. دیار نەبوو کێ ئەو دەنگۆیەی زار بە زار بڵاو کردبۆوە کە ئەگەر لوێچێ گڵی بەر دەرگای تاشباش هەڵگرن و بە مەزرا و کێڵگەیانی وەربکەن، بەروبووی مەزراکەیان دە، بەڵکو بیست ئەوەندە دەبێ. لە دەشتەوە، دەستە دەستە خەڵك دەهاتن و هەر کەسە و مستێکی خاکی بەر دەرگای ماڵەکەی ئەو هەڵدەگرت و دەگەڕانەوە. خەڵکی یالاك، لە بری یەك دوو لوێچ، چەند لوێچیان لەو خاکەی بەر دەرگاکەی ئەو بە مەزرا و زەویوزارەکانیان وەرکردبوو.

ئاخۆ تا ئێستا، کەس لەو دنیایەدا دیتوویەتی وەلی و پیاوچاکێك ئاخری و ئاقیبەتێکی بەخێر و خۆشیی هەبووبێ؟ یان لە سێدارە دەدرێ، یان بە زیندوویی کەوڵ دەکرێ. تاشباشیش بەوەی دەزانی، بەڵام نەیدەتوانی وازی لێ بێنێ و بڕوات. دەیانگوت چاوەڕوانی بەهارێیە و بیانووەکەشی ئەوە بوو، بەڵام بەو جۆرەی خەڵك ڕوویان تێی کردبوو و ئەوەندەی بە پیرۆزیان دەزانی، ئەو چێژی لێ وەردەگرت و کەیفی دەکرد.

ئەوجار کاتێك کە گوێی لێ دەبوو دەیانگوت:

- ئەی تاشباشە مەزنەکەی ئێمە، کە تۆ ڕیزی چل سوارەی غەیبی دای، ئەگەر ئەو دنیا هیچ و پووچە ئێستاش هەر لە سەر جێی خۆی ماوەتەوە، لە سایەی سەری تۆوەیە. بەڵێ هەر وایە. هەتا ئەتۆ هەی ئەو دنیایە خرا نابێ. ئەو دنیایەی کە هیم و بناغەکەی ڕزیو و پواوە... ئەی تاشباشەکەی ئێمە، کە تۆ لە ڕیزی ئەولیا و پیاوچاکانی...

هەر شاگەشکە دەبوو هێندەی پێ خۆش بوو.

ئێستا گوندییەکان دەیانپەرست و چۆن ناوی پێغەمبەرەکانیان دێنا، ئاواش ناوی ئەویان دێنا. تاشباش جاروبار خەیاڵ دەیبردەوە، هەستی دەکرد لەشی سووك بووە و خۆشی و شادییەکی منداڵانە هاتۆتە دڵییەوە و وەك باڵندەیەك باڵی دەگرت و دەفڕی.

هەر ئەوەندەی بەس بوو پەنجەی ببزێوێ بۆ ئەوەی گوندییەکان کوێخا سەفەر لەتوکوت بکەن. نەك هەر خەڵکی یالاك، بەڵکو هەرچی خەڵکی گوندەکانی تۆرووس و دەشتێن... ئەگەر ئێستا بە گوندییەکانی گوتبا کۆ ببنەوە و بچنە سەر شاری و عادیل بکوژن، بەبێ ئەوەی قسەی لە قسەیدا بکەنەوە، دەمودەست لەسەر چاویان دادەنا. ئێستا چیی کەیفی هێنابای، دەیتوانی بە گوندییەکانی بکا. تەنانەت دەیتوانی دژی دەوڵەت ڕایانپەڕێنێ و گوندییەکان ئەگەرچی دەشیانزانی گیانیان تێداچێ، دیسانیش بە دڵنیاییەوە هەر ڕادەپەڕین.

ئەمڕۆ نا سبەی، ناوبانگی دەگەیشتە شار و گوندەکانی دیکەش و هەموو گوندەکانی دیکەی ناوچەی تۆرووس و چوکوراواش دەنگی دەدایەوە وبە هەر چوار قوڕنەی جیهاندا بڵاو دەبۆوە و ناوبانگەکەی لە حەڵەبەوە دەچووە شام و لە ئەدەنەوە دەگەیشتە ئیستامبۆل.

ئەو خەیاڵانە شاگەشکەیان دەکرد. لەو کات و ساتانەدا هەودای خەیاڵەکانی لێ درێژ دەبوونەوە. جاری وابوو خەیاڵ دەیڕفاند و هەر بە تەواو مانا خۆی لێ دەبووە وەلی و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "باشە چۆن دەکرێ ئەو هەمووە خەڵکە درۆیان بکەن؟ باشە بۆ دەبێ درۆ بکەن؟ کێ زۆریی لێ کردوون؟ دیارە شتێکیان دیتووە و بیستووە. ئەگەر ئاگرێك لە گۆڕێ نەبێ، کوا دووکەڵ هەڵدەستێ؟" ئەو قسەیەی بە دڵ بوو و بەردەوام دەیگوتەوە: "ئەگەر ئاگرێك لە گۆڕێ نەبێ، کوا دووکەڵ هەڵدەستێ؟ هەڵناستێ... دووکەڵ هەڵناستێ."

شەو و ڕۆژ نوور بەسەر ماڵەکەیدا دەباری. ئەو دارە پیرۆزەی دەهاتە سەر ماڵەکەی و لە دەوری ماڵەکەی دەگەڕا، جگە لە خۆی هەموو کەس دیتبووی. ژن و منداڵەکەشی دیتبوویان. وای دانێین هەموو خەڵکەکە دەرۆیان کردبێ، تۆ بڵێی ژن و منداڵەکەشی درۆ بکەن؟

دەبوو شەوێکیان خۆیشی لە دەرێ ڕاوەستێ و ئەو نووربارانەی سەر ماڵەکەی ببینێ. دەبوو چاوەڕێ بێ و ببینێ کە ئاخۆ نوورێك هەیە یان نا؟ ئەگەر هەیە ئەوە تەواو. ئەگەر نیشە، ئەوکات... چارێکی خۆی بکا. ئەدی ئەو نەخۆشانەی بە دەستی ئەو چاك دەبوونەوە؟ ئەو مەسەلەی نوورە زۆر گرنگە. ئەگەر هەبێ، ئیتر نابێ ترسی لەکەس بێ.

نوورەکە هەبوو. هیچ گومانێك لەوەدا نەبوو، بەڵام دەبوو چاوەڕوان بێ و بیبینێ. ئەرێ وا باشتر نەبوو؟ دەی خۆ دنیا خراپ نابێ پیاو بچێ ئەو نوورە ببینێ کە بەسەر ماڵەکەیدا دەڕژێ. بڕوای کردبوو کە نوورێك هەیە، بەڵام دەیویست بە چاوی خۆی بیبینێ کە ئاخۆ زۆر درەوشاوەیە؟ دەبوو چاوەڕوان بێ و بیبینێ. ئەگینا مەحاڵ بوو هەر نەبێ.

جاری وابوو دڵی ئیمانی دێنا بەوەیکە وەلییە و دەیویست بچێتە گۆڕەپانی گوندەکە و گوندییەکان کۆ بکاتەوە و سەبارەت بە دنیا و ژیان و ئەشق و خاك و ڕووناکایی قسەیان بۆ بکا. کە ئەو فکر و خەیاڵە دایدەگرت، بە زۆری بە سەر خۆیدا زاڵ دەبوو و بۆ ئەوەی لە ماڵێ دەرنەپەڕێتە دەرەوە و نەچێتە نێوەڕاستی گوندەکە و قسەی پڕ لە جۆش و خرۆش بۆ خەڵکەکە نەکا، ئەوەندەی دان بەخۆیدا دەگرت کە هەموو گیانی ژانی دەکرد. کە هەژانەکەی ناخی دادەمرکایەوە، شەلاڵی ئارەقە دەبوو. وەك کەسێك وابوو تێهەڵدانێکی خەستی خواردبێ و پشتیان لە زگی نەرمتر کردبێ. لەسەر عەرزەکە تخێڵ دەبوو و ئەوجار وردە وردە گیانی نەرم دەبۆوە. دوای هێوربوونەوە، شەپۆلێکی خۆشی گیانی دەتەنییەوە. ئەو شادییە ئەوەندە نەشەبەخش و شێتانە بوو کە ئەو لە ژیانیدا شتی وا خۆشی نەدیبوو.

پێی وابوو ئەگەر دەست بەرێ، دەستی دەگاتە سەر لووتکەی چیای تەکەچ. ئەو لووتکە پڕ لە بەفرە... و پێی وابوو ئەگەر بەیانیان دەست بۆ خۆرەتاو بەرێ و پێی بڵێ:" ئەی هەتاوی پرشنگدار، هەر لێرە ڕاوەستە و ئەمڕۆ تیرێژی زێڕینت بە دنیادا مەپرژێنە، هەتاوەکە لەسەر جێی خۆی ڕادەوەستا و کازیوە، هەر وا بەخۆشی و تاریك و ڕوون و تەماوی و پڕ لە بۆنی خاك و بەرامەی شەونم دەمایەوە و ئەگەر بیەوێ تەنانەت تا ڕۆژی پەسلانێش* هەر وا ڕایدەگرێ.

ئەگەر لەو زستانە پڕ لە بەفر و بۆرانەدا بچێتە دارستانەکە و بڵێ:"ئەی دارستان، چرۆ دەرکە و گەڵا بکەوە". دارستانەکە لە چاوترووکانێکا لە گەڵای کەسکا نوقم دەبێ.... و ئەگەر بڵێ:"ئەی هەتاو گەرم بەوە." هەموو وڵات دەبێتە ڕۆژێکی بەهاری و پڕ دەبێ لە گوڵ و گوڵووك.

---

* ڕۆژە پەسلان: ڕۆژی قیامەت

ئەگەر بچێتە ئەو دەشتە بە بەفر داپۆشراوە و دەست لەسەر بەفرەکە دابنێ و چاوەکانی لێك بنێ و بڵێ:"ئەی بەفرەکان بتوێنەوە و خاکی دەشتێ هەموو پڕ بێ لـە گـوڵ و گوڵـووك، هـەتاو پڕشنگی خۆی باوێ و باڵندەکان لە شەقەی باڵ بدەن و بفڕن." تـا چـاو دەکاتـەوە، سـەیر دەکـا چیی گوتووە وەدی هاتووە.

لە ناکاو وەخۆ هاتەوە. لە بن لێوانەوە گوتی:"خەریکە شـێت دەبم." هەناسـە بڕکێـی بـوو. وەك شتێك بەری قوڕگی گرتبێ. ئەوجار هاتەوە سەرخۆ.

دیسان تا ئێوارە دەهات، ماڵی پڕ دەبوو لە نەخۆش. ئاخێکی هەڵکێشا. ئاخێك لـە نـاخی دڵەوە و تاوێك بەخۆی پێکەنی.

تەنانەت خواردن و خەویشی لەبیر چوبۆوە. ژن و منداڵەکەی چاوێکیان کردبووە چوار چاو و سەیری ئەو حاڵەتە شێتانەیەی ئەویان دەکرد و ورد ورد چـاویان بـە سـەرییەوە بـوو. وردە وردە ترس و ڕێز و حورمەتیان بۆی پتر دەبوو.

ژنەکەی لای کەس باسی ئەو شتانەی نەدەکرد. تاشـباش داوای لـێ کردبـوو لای خەڵکەکـە هیچ باس نەکا و ژنەکەش کە نەیدەتوانی ئەو شتانە بگێڕێتەوە کە دەیدیتن، وەخت بوو بتـەقێ. ئاخ، خۆزگە تاشباش ئیزنی دابایە هەموو ئەو شتانە بگێڕێتەوە.

حەزی لێ بوو گوێ نەداتە قسەی تاشباش و هەموو شتێك بۆ خەڵکی بگێڕێتەوە، بـەڵام دەترسـا بەڵایەك بەسەر خۆی و منداڵەکانی بێ و تاشباش غەززەبیان لێ بگرێ و تووکیان لێ بکا.

## ٤١

تاشباش ئۆغلۆ لە دڵی خۆیدا دەیگوت:"ئەمشەو، ئەمشەو، ڕوونی دەکەمەوە. ئەگەر وەلی بم، ئەوە هیچ، بێت و نەبم، ئەو کات دەبێ مشوورێك لە خۆم بخۆم. ئەگینا ئەو گوندییانە ئەو ڕۆژەیان لە بیر دەچێتەوە، کە پێڵاویان ماچ دەکردم، ئەوجار دەمکەن بە پەندی عالەمێ. نازناوی "مەمەد وەلی"ـم لێ دەنێن و تا مردن گاڵتەم پێ دەکەن. خۆ من نە شێتم و نە ئەوەندەش گەوج و کەرم بێڵم ببمە گەپجاڕی خەڵکی..."

بەبێ ئۆقرەیی چاوەڕوانی شەوێ بوو، پەیتا پەیتا دەچووە دەرێ و دەهاتەوە ژوورێ. هەستی بە قورسایی نیگای ئەو خەڵکە دەکرد. هەر دەجووڵایەوە، هەر کارێکی دەیکرد، تەنانەت بچووکترین جووڵەی ئەویان لەبەر چاو بوو و بە جۆرێك لێکیان دەدایەوە. هەر بۆیە تاشباش ئۆغلۆ دەست و پێی بەسترابوو و هیچی پێ نەدەکرا. بە ڕۆژ لەماڵی وەدەر نەدەکەوت و جگە لە عەلییە درێژ کەسی نەدەدواند. نەیدەتوانی وەك جاری جاران پریسکەی دڵی بۆ عەلییش بکاتەوە. تەنانەت عەلییش کە دەچووە لای، دەتگوت لە شتێکی پیرۆز، لە پیاوچاکێك یان لە ئیمامزادەیەك دەچێتە پێشێ. هەر بەوە یەکجار شێت دەبوو کە دەیدی عەلییش ئاوای لێ هاتووە، بەڵام دەسەڵاتی نەبوو.

جاری وابوو بیری دەکردەوە و خۆی ئەوەندە بە چارەڕەش و بێکەس و لێقەوماو دەدی و هەستی دەکرد هەموو دنیا دوژمنێتی، ئیتر حەزی دەکرد دابنیشێ و وەك منداڵان چڵمی هەڵلووشێ و بگریێ. خۆی وەك شێرێکی دەستوپێ بەستراو دەدی کە بێ دەسەڵات لە قەفەزێکدا کەوتووە. ئەگەرچی هیچی لە دەست نەدەهات، بەڵام دیسانیش خەڵکی هەر لێی دەترسان.

جاری واش بوو لە ناکاو لەو خۆ بە لێقەوماو و بێکەس زانینە دەهاتە دەرێ و هێزێکی لەبنە نەهاتووی لە خۆیدا شك دەبرد. دەتگوت هەموو شتێکی لە دەست دێ. دەیتوانی وەك

حەزرەتی سلێمان فەرمان بەسەر باڵندە و دەعبای کێو و ئاوی ڕووبار و جۆباران و گژەبا و دارستان و ئەو گیایانەدا کە دەڕوێن و ئەو گوڵانەی کە دەپشکوێن و ئەو دانەوێڵەیەی دەڕوێ، لێ بدات. هەر هەموو خەڵك و تەنانەت کوێخا سەفەریش کە هیچ بروایەکی پێی نەبوو، لە بەر پێی دەبوونە لوێچێ خۆڵ و خاك. ئەگەر ویستبای و برێك ئەقڵی خستبایەتە کار، دەیتوانی هەموو چوکووراوا و ناوچەی تۆرووس و هەر هەموو دەشتەکە بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و چیی پێی خۆش بێ بەو خەلکەی کردبا. خەلکەکە ئیمانیان پێی هەبوو. دیارە شتێکیان دیتبوو و شتێکیان لێ دەزانی وا ئیمانیان پێ هێنابوو. لە خۆڕا شتی وا هەر نابێ و ناکرێ...

جاری واش بوو لە خۆی دەترسا. ئەی ئەگەر بە ڕاستی وەلی بێ؟ هەر بە ڕاستی مرۆڤ بەو پلەیە دەگا؟ کێ چووزانێ. لەوانەشە هەر کەسە و بە جۆرێك پێ بگا. بەو دواییانە خەونی دەدی. ئەوانە خەونی دنیایەکی دوور و نەناسراو بوون. دارستان و باڵندە و گیایەکانی جۆرێکی دیکە بوون. دارەکانی بە جۆرێکی دیکە هەڵیان دەدا. گوڵەکان زۆر سەیر و سەمەرە دەپشکووتن. خەونەکانی و دنیای ئەو خەونانە هەر هەمووی نوور بوون. لە نێو درەختەکانەوە، لە قەدی دارەکانەوە و لە لك و پۆپەکانیانەوە، نوور لووزەوی بەستبوو و خاکی ئەو دنیایانەش هەر تیشك و نووری لێ هەڵدەستا و وەك کفارە (ئافوورە) بەرەو ئاسمان هەڵدەستا. تاشباش ئۆغلو دوای بەخەبەرهاتنێش ماوەیەك هەر لە نێو خەونەکەی ئەو دنیایانەدا دەژیا.

لەو کاتەوە ببوە وەلی، لەو ماڵەدا، زۆری گوێ لە دەنگی کەڵەشێر دەبوو. لە بەر دەرکی ماڵەکەی ئەو هەموو ڕۆژێ بیست تا سی کەڵەشێر دەکوژرایەوە و سەرە بڕاوەکەیان بە دیواری ماڵەکەیەوە هەڵدەواسی. دیوارەکە بە سەری ڕەنگاوڕەنگی کەڵەشێر و پۆپە سوورە گەورە و بچووکەکانیان داپۆشرابوو. دیوارەکە دەتگوت بەڕەیەکە و سەری کەڵەبابت لێ کێشاوەتەوە.

ئەو گوندییە سەگبابانە، کاتێ کەڵەشێرەکەیان سەر دەبڕی، سەرەکەیان بە دیوارەکەوە هەڵدەواسی و هەر لەوێ دادەنیشتن بۆخۆیان گۆشتەکەیان دەبرژاند و دەیانخوارد، یان دەیانبردەوە ماڵێ. جا ئەوە کوێی قوربانیکردن بوو؟ قوربانی ئەوەیە هەر لەوێ بەجێی بێڵی و بڕۆی یان بە سەر هەژارانیدا بەش بکەی. پێویست بوو ئەوەیان پێ بڵێ، ئەگینا قوربانییەکەیان قەبووڵ نەدەبوو، بەڵام ئەوانەی قوربانییەکەیان دەکرد، خۆیان هەژار بوون و هی وابوو هەر لەو کەڵەبابە پتر هیچی نەبوو. تاشباش ئۆغلو تووڕە بوو و لەبەر خۆیەوە گرماندی:"دەی باشە، ئەگەر هەر وایە، با قوربانی نەکەن. با فێڵ لە خودای نەکەن. ئەوە دوو ڕووییە. گۆشتی قوربانی حەڵاڵی خاوەنەکەی نییە. دەبێ تێیان بگەیێنم." کە ئەو بیرەی بە مێشکیدا هات، دڵی توند بوو، بەڵام

بەسەر خۆیدا زاڵ بوو. هەموو ڕۆژێ بە دەیان کەڵەباب لە دەوری ماڵەکەی دەکوژرایەوە، ئەگەر هەواکەی ساو و ساماڵ بوایە، ئەوە لە کادێنە بەتاڵەکەی ڕووبەڕوودا دەیانبرژاندن و دەیانخواردن و منداڵەکانی ئەو هەموو ڕۆژێ هەر دەمو لیچی خۆیان دەلستەوە و بە چاوی برسییەوە سەیری ئەو کەڵەشێرە برژاوانەیان دەکرد و لیکاویان بە زاریدا دەهاتە خوارێ. ئەوەش بێ ئینسافی بوو. ئەگەر باوکیان بووەتە وەلی، ئەو منداڵانە تاوانیان چییە؟...

ئەمشەو دەبوو خۆی یەکلایی بکاتەوە... ئەو کاتە... ئەوکات دەیزانی دەبێ چ بکا. ئەگەر دڵنیا بوایە لەوەی وەلی و پیاوچاکە، ئەو دەم دوو قسەی لەگەڵ ئەو خەڵکە دەکرد کە لە بەر چاوی منداڵەکانی ئەودا بە تام و چێژەوە کەڵەشێرەکانیان دەخوارد... دوو قسەی لەگەڵ ئەو خەڵکە بێ چاو و ڕووە دەکرد کە پێیان وابوو فێڵ لە خودای دەکەن. ئەوان ئیتر بۆیان نەبوو دەست لە گۆشتی ئەو کەڵەبابانە بدەن کە دەیانکەنە قوربانی.

هەوا ساماڵ بوو. ئاسمان تەنانەت پەڵە هەورێکیشی پێوە نەبووە. لە دوورەوە لە لووتکەی چیای تەکەچەوە، گرمەیەك هات. سەری بەرز کردەوە. سێ فڕۆکەی جێت، شان بە شانی یەکتری، دەڕۆیشتن و لە پشتەوەیانەوە سێ هێڵی سپیی ڕوون بەجێ دەما. تاوێك دواتر لە چاوان ون بوون. ڕێچکە سپیەکان ماوەیەك لە ئاسمانەکەدا جووڵان و مانەوە.

تاشباش ئۆغڵو بزەیەکی هاتێ و بەخۆی گوت:" هەر بە ڕاستی عەلییە دەرێژەکەمان ئەوانەی دی؟ زۆری کەیف بەوانە دێ. لە تاریفیان تێر نابێ."

عەسر داهات. سەرەدای کاروانی ئەو نەخۆشانەی لە دێهاتە دوورەکانەوە بە گوێدرێژ یان بە کۆڵ یان بە قەرەوێڵە دەیانهێنان، دەرکەوت. خەڵکی گوندی دوو سێ کادێنی دەوروبەری ماڵی تاشباشیان بۆ ئەو نەخۆشانە بەتاڵ کردبوو کە لە گوندەکانی دیکەوە دەهاتن، بۆ ئەوەی نەبنە سەرباری ماڵی تاشباش ئۆغڵو. "دەروێش سولون"یش لە گۆشەی یەکێك لەو کۆخانەدا، دەسبەجێ دووکانێکی دانابوو. پیاوێکی زیرەك و بە مشوور بوو. بۆ ئەوەی کارەکەی پوخت بێ، پێشتر چوویووە شاری و کشمیش و نوقڵ و هەڵوا و وردە و پردەی دیکەی کڕیبوو و هێنابووی. کاروبارەکەی ڕێك کەوتبوو. هەر ئاوا چوویا پێشەوە، "دەروێش سولون" بە دوو ساڵان دووکانێکی گەورەی لە شاری دەکردەوە. لەو ڕۆژەوە کە دووکانەکەی کردبۆوە، هەموو ڕۆژێ بەیانی پەرجۆ و کەراماتێکی نوێی تاشباشی بۆ خەڵکەکە دەگێڕایەوە. هەر کەس لە گوندەکانی دیکەوە هاتبایە، جا چ شتی کڕیبایە یان نەیکڕیبا، بەبێ ئەوەی بێڵێ ماندوویەکی بحەسێتەوە، گەلێك حەقایەتی لەسەر کەرامات و پەرجۆکانی تاشباش دەگێڕایەوە و ناو و نیشانی ئەو نەخۆشانەی هەڵدەدا کە ئەو دەرمانی کردبوون.

دووکانەکەی دەروێش سولون لە گۆشەی کادێنێکەوە، ببووە مەکۆیەك بۆ بڵاوکردنەوەی کەراماتەکانی تاشباش بە دەوروبەردا.

تاشباش بەخۆی دەگوت:

"هەرچی دەیڵێن با بیڵێن. هەر سیحر و کەرامات و پەرجۆیەکی کەیفیان دێنێ با هەڵیبەستن. ئەمشەو ڕوون دەبێتەوە و لایەکی بە لایەکیدا دەکەوێ. ئەمشەو ئەگەر خۆم دڵنیا بم، نیشانیان دەدەم وەلی و مەلی یانی چی...."

دڵی خۆی زۆر بەو شەوە خۆش کردبوو. ئەوە شەوی چارەنووس بوو. تاشباش دەیتوانی ئەمشەو بۆ هەمیشە لەسەر تەختی وەلیایەتی دابنیشێ. شەو داهات و نەخۆش یەك لە دوای یەك و دووان دووان هاتنە ژووری:

تاشباش ئۆغڵو ئیتر شێوازی دەرمانکردنەکەی بەربڵاوتر کردبۆوە. دەروێش سولونی ڕاسپاردبوو مۆمی بۆ بێنێ و ئەویش هێنابووی. مۆمی دادەگیرساند. سێ جار بە دەوری سەری نەخۆشەکەیدا دەخولاندەوە و دوای ئەوە بڕێکی لۆکە بە مۆمەکە ئاگر دەدا و لە پێش لووتی نەخۆشەکەی ڕادەگرت. دوایی بە نەخۆشەکەی دەگوت فوو لە مۆمەکە بکات.

زۆر شێوازی دیکەی دەرمانکردنی هەبوو. بۆ هەر نەخۆشێك عیلاجێکی داهێنابوو. پەنگر و پشکۆی دەخستە ئاوەوە و لەو ماوەیەدا کە پشکۆیەکە لە ئاگرەکەدا چزە چزی بوو، ئەو مۆمێك بە دەستەوەن سەیری چاوی نەخۆشەکەی دەکرد و بەبێ چاوترووکاندن لێی ورد دەبۆوە.

هێندێکیانی ناچار دەکرد لە بەر دەرگاوە هەتا بەر ئاگردانەکە بە گاگۆلکێ و لەسەر چۆکان بڕۆن و هێندێکیانی بە هەنگڵەشەلە بە دەوری ژوورەکەدا دەخولاندەوە. شەمشەمەی کوێرەی مردووی لە بەر لووتی هێندێکیان ڕادەگرت بۆ ئەوەی بۆنی پێوە بکەن و لەتە ئێسقانێکی کە دەیگوت ئەوە شاخە مارە، بە بەر لووتی هێندێکیانەوەی دەنا. ئەو شتانە مرێمۆك پێی دابوو و تێیگەیاندبوو کە:"ئەوانە عیلاجی هەموو دەردێکی بێ دەرمانن و بێت و بکەونە دەستی پیاوێکی شیاو، مردوو زیندوو دەکەنەوە." مرێمۆك متەقی نەهاتبوو و بۆ ئەوەی ئەو شتانە بە تاشباش بڵێ، لەوانەیە پتر لە سەعاتێکی کات بۆ تەرخان کردبوو.

ئەگەر تاشباش ئۆغڵو پێی گوتبایە:"مرێمۆك قسان بکە، سوێندەکەتم پووچەڵ کردەوە، دەی قوفڵەکەی زمانت بکەوە." مرێمۆك دەسبەجێ وەقسە دەهاتەوە، بەڵام تاشباش سەعاتێك دانی بە جەرگی خۆیدا گرتبوو و داوای لێ نەکردبوو قسە بکا. دیارە ئەوەش هۆیەکی هەبوو.

شەوگار شەق ببوو، بەڵام هێشتا نەخۆش هەر دەهاتن و نەدەبڕایەوە. ڕۆژ و مانگ تێپەڕین و نەخۆش هەر زیاتر دەبوون و چاوەڕوان دەکرا دیسان پتریش بن، چونکە لە دێهاتە دوورەکانەوە هەر کەس دەیبیستەوە، هەڵدەستا و ملی ڕێیەی دەگرت و دەهات.

خۆ هەر نەخۆش نەبوو، ئەوجار خەفەتباریش دەستیان کردبوو بە هاتن. جاریٚ زۆر نەبوون، بەڵام خۆ پێیان کرابایەوە ئیتر کەس نەیدەتوانی پێشیان بگریٚ. دنیا دنیای لێقەوماوان و دەردەداران بوو. کەس نەبوو خەم و خەفەتێکی نەبیٚ... هەر ئەوەندە بزانن یەکێك هەیە گوێیان لیٚ ڕادەگریٚ، ئیتر کەس باشاریان ناکا. هەر هەموو وەك چۆن مەڕ دانگەڕێزە* دەکا، ئاوا ڕیز دەبن و دێن: ئەوی سووکایەتییەکی پیٚ کراوە، ئەوەی بە مرادی خۆی نەگەیشتووە و گراوییەکی لیٚ دابڕاوە، برسی و داماوان، ئەو وەرزێرانەی زەویوزاریان بیٚ حاسڵاتە، ئەوانەی زەویوزاریان بووەتە ڕەقێن و بەیار، پیاوکوژ و دز، هەر هەموویان ڕوویان تیٚ دەکرد.

تاشباش ئۆغڵو زۆر لە مێژ بوو خەوی شەوانەی لەبیر چووبۆوە. ئەو شەوە نەخشەی کارەکەی خۆی داڕشتبوو. دەیوسیت، تۆزێك دوای خوێندنی کەڵەبابەکانی بەیانی، بچێتە ماڵەکەی عەلی"یە درێژ و کەپەنك و چەکمە درێژەکانی لیٚ وەرگریٚ و بڕێك لەولاترەوە لە کاولاشەکۆنێکدا خۆی مات بکا و سەیری ماڵەکەی خۆی بکا.

زۆری خۆ پیٚ نەگیرا. هەر کەڵەبابەکان خوێندیان، بیانووەکی دیتەوە و لە ماڵیٚ وەدەر کەوت. لە دەرەوە کزەی سەرماکە وەك شیر بە دەموچاویدا هات. لەو کزە و سەرما و زەمهەریرەدا، کەس بە کەپنەکیشەوە نەیدەتوانی سەعاتێك لە دەریٚ ڕاوەستیٚ. بەشکم ئەوەی دەیویست دەسبەجیٚ دیتبایەی و ئیتر پێویست بەوە نەبوایە زۆر لە سەرماکەدا چاوەڕیٚ بمێنێتەوە. ئەگینا دەیتوانی ئاگرێکیش بۆ خۆی بکاتەوە. دەیکردەوە، بەڵام لەوانەبوو بیبینن. گوتی:

ـ عەلی، ئەو کەپەنەك و چەکمانەتم بدەیە. یەك دوو لقە شقارتەش.

عەلی نەیپرسی دەچێتە کویٚ و نەشیگوت لەو سەرمایەدا کە تف هەڵاویی دەیبەستیٚ، ناکریٚ وەدەر بکەوی. نەشیگوت:"دەتبەستیٚ و دەمری." چوو و کەپەنەك و چەکمەکانی هێنا. بارانییەکەشی وەبیر هاتەوە و ئەویشی هێنا و داییٚ و تەنانەت نەیگوت:"بەخێریش بچی."

---

*دانگەڕێزە: کاتیٚ مەڕ مۆڵ دراوە، لە نەکاو مەڕەکان هەڵدەستن و بە شوێن یەکتریدا ڕیز دەبن و دەڕۆن. ڕیزبوونی مەڕ

حەسەن وەخەبەر هاتبوو. کۆمەڵێك میوانیان هەبوو کە لە گوندە دوورەکانەوە هاتبوون دەستەوداوێنی تاشباش بن. حەسەن دەمودەست شقارتەکەی لە گیرفانی دەرێنا و دایە تاشباش. تاشباش سەیری کرد ئەوە قوتووەکە پڕە و نویٚ نوێیە. دەستێکی بەسەری حەسەندا هێنا و پرسیی:

ـ ئەوە دەدەی بە من؟

شاگەشکە ببوو.

حەسەن بە دەنگێکی کز و لەرزۆك و تیژەوە گوتی:

ـ بەڵێ، بۆ تۆ.

تاشباش بارانییەکەی بەسەرخۆیدا دا و چەکمەکانی لە پێ کردن و کەپەنەکەی بەسەر شانیدا دا و وەدەر کەوت.

کە ڕۆیشت عەلی گوتی:

ـ بەخوای دەچێتە شوێنێك. خوا بکا سەرمای نەبێ.

مریٚمۆك چاوێکی ئەوەندە ماناداری لێ کرد دەتگوت پێی دەڵێ:"ئەوە دەڵێی چی؟ چما ئەو سەرمای دەبێ؟" بە دەست لە پشتی عەلیی ڕاکێشا.

حەسەن گوتی:

ـ بابە، ئەوانە نە سەرمایان دەبێ و نە دەشسوتێن. نە لافاو دەیانبا و نە هەورەتریشقە لێیان دەدا. هیچ شتێك کاریان تێناکا. تەنانەت ماریش پێوەیان نادا.

مریٚمۆك حەسەنی لە ئامێز گرت و ماچی کرد.

تاشباش چوو و لە کاولاشێکدا لەسەر بەردێك هەڵترووشکا و چاوی بڕییە سەربانی ماڵەکەی خۆی. لە ترسی ئەوەی نەکا نوورەکە نەبینێ، هەر چاویشی نەدەترووکاند. بە دڵەڕاوکێ و دڵەکوتەیەکی سەیرەوە، چاوەڕێی نووربارین بوو. ها ئێستا دەباری ها تاوێکی دی. جگە لەوەش بە ئاواتەوە بوو ئەو دارە پیرۆزە نوورانییە ببینێ کە بەسەر ماڵەکەیەوە دەشنایەوە... باشە وەختایەکی هەر هەمووان دیتبوویان، هەموو خەڵکی ئاوەدانی دیتبوویان، باشە ئەو بۆ نەیبینیٚ؟

ماوەیەك هەروا ڕاوەستا. چاوەکانی لە سەرمان پڕ بوون لە ئاو. چاوی ترووکاند. ئەوجار دەسرۆکەیەکی دەرێنا و ئەو فرمێسکەی سڕییەوە وا کەوتبووە سەر ڕوومەتی. فرمێسکەکانی سەر ڕوومەتی چیی وایان نەمابوو ببنە سەهۆڵ. هەر لە ئێستاوە ئەو بەشەی سمێڵی وا کەوتبووە بن لووتی، بەستبووی.

"دەی، کوا ئەو تیشکە؟ ئەو نوورەی هەموو شەوێ هەتا بەیانی بەسەر ماڵەکەمدا دەبارێ کوا؟ ئەو دارە پیرۆزە نوورانییەی لە تاریکاییدا دێتە سەر ماڵەکەم و دەسووڕێتەوە و تیشك دەپژێنێ کوا؟ دەیانگوت لە نووربارانەکەیدا بە سەر ماڵەوەدا، لە ئاسمانەوە دەنگی باڵندەیەك دێ. دەنگێکی ناسك و وەك فیکە، کە بە زەحمەت دەبیسرێ. کە دارە پیرۆزەکە بەسەر ماڵەوە دەسووڕێتەوە، خولانەوەکەی، دەنگێکی لێوە هەڵدەستێ وەك خشەخشی خوشینی مار.

دەست و پێی کەسیرە بوون و خەریك بوو بیبەستێ. چاوی لە ماڵەکەی هەڵنەدەگرت. لە ناکاو دیتی چەند سێبەر و تارماییەك لە بەردەم ماڵەکەیەوە بە پاچ و پێمەڕە خەریکی عەرز کۆڵینن. گوتی:"تف، هەی نەحلەتی خواتان لێ بێ. گەووادینە"؟ بەر دەرگاکەی ماڵی تاشباش وەك چاڵ قووڵ ببوو. ئەو ئاشە لە میزتن بێ، دیواری پێشەوەی ماڵەکەم دەڕووخێ و ئاخری ڕۆژێك ماڵەکەشم بەسەردا تێك دەقرمێ. ئەو کات ئەو وەلیایەتیە سەری خۆم و منداڵەکانم دەخوات. هەی نەحلەتی خواتان لێ بێ. یارەبی خوایە، ئەتۆ خۆت لەو بەڵایە ڕزگارم بکەی. ئەگەر ئەمشەو ئەو تیشکە نەبینم... دوای ئەوە، ئەگەر من وەلیایەتیم قەبووڵ کرد، شیری دایکمم لێ حەرام بێ..."

لە دوورەوە دەیڕوانی و خەریك بوو دڵی بتۆقێ. خاکی بەر دەرگاکەیان بە توورەکە دەکێشا.

"ئاخ، هەی نەحلەتی خواتان لێ بێ... ئاخر مستێك خاك و توورەکەیەك چ فەرقێکی هەیە... بیبەن هەی سەگی سەگبابینە. چەندی پێتان خۆشە بەرن. وەلی بم یان نەبم، لێم سوورە ئەو زەویوزارە مردووە بێ حاسڵاتەی ئێوە، نەك خاکی وەلی و پیاوچاکان، خاکی خودای و پێغەمبەریشی پێوەکەن، هەر هیچی لێ شین نابێتەوە و نابووژێتەوە. هەی گەوجینە، چیی وای نەماوە ماڵەکەم بڕووخێنن.

تووڕە بوو. تا پتر سەرمای دەبوو، تووڕەتر دەبوو و تا پتر چاوی بە هەڵکەندنی بەر دەرگای ماڵەکەی دەکەوت، زیاتر هەڵدەچوو و لە دین دەهری دەبوو. دەیتوانی پێش بە هەر چەشنە ڕووداوێك بگرێ، بەڵام چۆن دەکرا پێش بەو کارە تێکدەرییە بگرێ؟

ئەوەندە تووڕە بوو، گریان ئەوکی گرت. هەستایە سەر پێ و گوتی:

"ئێستا پێتان دەڵێم." بۆ ئەوەی نەزانن لە کوێ خۆی دەشارێتەوە، بە پشتەوەی ماڵەوەدا سووڕایەوە. لە ناکاو لە پشت سەریانەوە شین بۆوە. خەڵکەکە بە دیتنی ئەو، پێیان بە عەرزییەوە ڕەق بوو. دوای تاوێك خۆیان بەسەر لاق و پێڵاوەکانیدا کێشا.

تاشباش ئۆغڵو چەندی لە توانای قوڕگیدا بوو گۆڕاندی:

ـ هەستن. دەمەوێ شتێکتان پێ بڵێم.
دەسبەجێ هەستانەوە. یازدە کەس بوون. تاشباش دەستی بە نێوچاوانی یەك بە یەکیاندا هێنا و فەرمانی دا:
ـ ئەو گڵە لە جێی خۆی بکەنەوە. ئەوە گڵی خێر و بەرەکەت نییە. من زۆر گەڕام و گڵی متفەڕکی تایبەتیم بۆ ئێوە دۆزیوەتەوە. بڕۆن و لەوێ هەڵگرن و بیبەن بە زەویوزارەکەتانیدا بکەن، بەڵام ئەویش تەنیا دەبێ لە ڕۆژی جێژنی حەزرەتی خدردا گڵی لێ هەڵگرن. ئەگەر لەو ڕۆژەدا گڵی ئەوێ بەرن و بە زەوی و زارەکەتانیدا بکەن، بە مەرجێك پیاوی چاك بن و دڵ و دەروونتان ساف بێ، زەوییەکەتان هەر دانەوێڵەیەکی لەبری دوو دەنك، دە دەنکی لێ دەکەوێتەوە. یاڵڵا دەی لێرە بڕۆن.
تاشباش ئۆغڵو گەڕایەوە و لە تاریکاییەکەدا ون بوو.
تاوێك دواتر گەڕایەوە کاولاشەکە. لە سەر جێیەکەی پێشووی دانیشتەوە. ئەوجار ئیتر کەس لە بەر دەرگاکەی نەبوو. دیسان چاوی بڕییەوە سەربانەکەی. ئەوجار ئیتر دەبوو نوورەکە بباریێ و دارە پیرۆزەکەش دەرکەوێ. لەوانەشە ئێستا لە چیای تەکەچەوە کەوتبێتە ڕێ و بە خشکە بێتە پێشەوە. هەستا و سەیرێکی لای لووتکەی چیای تەکەچی کرد. هیچ دیار نەبوو...
چەقوچۆی هاتێ. دەستەکانی ببوونە سەهۆڵ. پەنجەکانی جووڵاند. برێك دواتر، پەنجە سڕبووەکانی بووژانەوە.
"چۆنە ئاگرێك بکەمەوە؟ نە تیشك دیارە و نە هیچ شتێك." لە یەك دوو ڕۆژ لەوە پێشەوە دیاریی کردبوو لە کوێ پووشکە و ئاوردوو بێنێ. چوو و باوەشێك پووشکەی هێنا و هاتەوە کاولاشەکە و چەند چلێکی لێ ئاگر دا. پووشکەکە دەمودەست نەیگرت.
تاشباش ناچار بوو، تاوێك هەر فووی لێ بکا. ئاخرییەکەی گڕی گرت و تاشباش خستییە نێو ڕقەکانییەوە و دانیشت. چاوی لەسەر ماڵێ هەڵنەدەگرت.
"نەخێر، نە نوور دیارە و نە هیچ شتێك. هەی درۆزنانە. دەیانگوت تەنیا پیاوی چاك و دڵپاك ئەو تیشکە دەبینن. دەی باشە، چما وەلی، پیاوچاك نییە؟ ئەی چۆن دەبێ تیشکێك کە بەسەر ماڵەکەی خۆیدا دەبارێ نەبینێ؟"
"دارە پیرۆزەکە لە دوورەوە دێ. مەودایەکی زۆرە، بەڵام ئەی نوورەکە... دەڵێن ئەو نوورەش لەودیو ئەو کێوانەوە دەردەکەوێ. دەی باشە، ئەو کێوانەش خۆ زۆر لێرەوە دوورن....

شوێن نییە ئەو تیشکەی نەگاتێ. تەنانەت دەچێتە تەرکی بنی ئاوە قووڵ و بێ بنەکانیشەوە. لە زەمانی سەربازیدا ئاوێکی بینیبوو ئاوی مرادیان پێ دەگوت. بە نێو کۆمەڵە بەردێکی سوور و وشکی وەك "مس"دا دەهاتە دەرێ و چڵە گیایەك چییە لێی شین نەدەبووەوە. قووڵ و کەسك، لە بن بەردە سوورەکانەوە دەهاتە دەرێ. لە دوورەوە وەك شریتە هەرێزێك دەچوو و کە ئاوەکەی وێ دەکەوت، دەبریسکایەوە.

"لێرەوارەکان، مەککە، مەدینە... هەموو ئەوانە، ئەو شوێنانەن کە ئێمە هەموو شەوێ دەچین... ئەوەندە بەسە لە تەنیشت ئەو ئاگرەش ببینن، جا وەرە بەیانی خوا بزانێ ئەفسانە و حەقایەتی چۆن هەڵدەبەستن، دیارە... دەسبەجێ سەد هەزار کچی سەربەمۆر، بە جلوبەرگی سپییەوە دێننە پاڵمان و دەڵێن تاشباش نوقمی نوور، لە باوەشی ئەو کچانەدا بوو..."

"ئۆنباشییەك بوو. تەنانەت لە کوێخا سەفەریش خراپتر... لە داخان تێی هەڵدەدا. دەیگوت:"ئەگەر لەو بنکەیەدا سەربازێك نەبێ من تێی هەڵدەم، دڵم دەتۆقێ. هەر بە دوو ڕۆژ جارێك لە هەمووانی هەڵدەدا."

"بەخوای ئەو نەنە مرێمۆکە ژنێکی سەیرە. ئەو دەمەی داوای کەپەنەکەکەم دەکرد، چۆنی سەیر کردم."

"ئاو مراد کە بەسەر بەردە مسییەکاندا شۆڵاوگەی بەستبوو و دەڕۆیشت، جاری وابوو بەردە سوورەکانیشی کەسك دەکرد. ڕەنگە مسییەکەی بەردەکان، بەو تیشکەی لە ئاوە کەسکەکەوە دەدرەوشایەوە، کەسك دەچۆوە."

گوێی لە خشە خشێکی وەك خوشینی مار بوو و دەنگی باڵندەیەکیش... ئەی کوا نوورەکە؟ دارەکە کوا؟ خۆی گورج کرد و دڵیشی تۆزێك خۆش بوو. دیارە ئەوەی چاوەڕوەڕێی بوو، دەیدی. دڵی کەوتە کوتەکوت. لە بێ ئۆقرەیی پشووی سوار ببوو. بە دڵەکوتەوە چاوەڕێ ما... هیچ نوورێکی نەدی.

بەخۆی گوت:"لەوانەیە خەتای چاوەکانی من بێ، ئەگینا چۆن دەبێ گوێم لە دەنگەکە بێ، بەڵام خۆی نەبینم."

خشەخشێکی بەردەوام و دەنگی پچڕ پچڕی باڵندەیەکی گوێ لێ دەبوو. ورد بووەوە و دەیویست بزانێ ئاخر ئەو دەنگانە لە کوێوە دێن. لە لای دەشتێوە دەهاتن. سەیری لای ئەوێی کرد. هیچ نوورێکی نەدیز ڕووی لە هەر لایەك دەکرد، لە ئاسمان و لە زەوییە پڕ لە بەفرەکە و لە ماڵەکان و لە سەر شاری و لە ئەشکەوتی پەرییانەوە دەنگی خشەخشەکە دەهات... خش... خش... خش... سەیرە، ئەی کوا نوورەکە؟

تەنیا پزیسکێکیش لە ئاگرەکەی بەردەمی نەمابۆوە. تەنانەت توانای هەڵلەرزینیشی نەبوو. ساتێك هەموو ماسوولکەکانی لەبەر یەك کشانەوە. خەوێکی خەست بەسەریدا زاڵ بوو. بێت و چاوەکانی لێك نابوایە، هەر لەو کاولاشەدا دەبووە سەهۆڵ و دەمرد و بەیانی گوندییەکان جەستە بێ گیانەکەیان دەدۆزییەوە و دەیانگوت، چل سوارەی غەیبی قوڕگیان گوشیوە و خنکاندوویانە.

بلێی و نەلێی بەبێ ئەوەی چاو لە سەربانی ماڵەکەی بترووکێنێ، بەسپایی هەستایە سەر پێ. ئەژنۆی قرچەی لێوە هات. بەرەو ماڵێ کەوتە رێ. دەنگی خشەخشەکە هەر لە گوێیدا بوو، بەڵام نوورەکە هیچ سۆراغێکی نەبوو.

بەخۆی گوت:"نهێنییەکی تێدایە. شتێك هەیە. ئەگینا ئەو خشەخشە چییە؟ لەوانەیە نوورەکان ترسابێتن. لەوانەی کە دەرەوەی ماڵەوەیان دەکوڵێ ڕەوینەوە و دەرنەکەوتنەوە."

گەیشتەوە ماڵێ. بەر دەرگای ماڵەکەی وەك چاڵی لێ هاتبوو. نەیدەتوانی دابێتەوە و لە دەرگاکە بدا. دەکەوتە چاڵەکەوە. بەخۆی گوت، دەبێ بەیانی ئەو چاڵە پڕ بکەمەوە...

هەرای کرد:

ژنەکە دەرگام لێ بکەوە.

رێك لەو کاتەدا دەرگاکە کرایەوە. بەسەر چاڵەکەدا بازێکی دا و چۆوە ژوورێ. بە غاردان خۆی گەیاندە ئاگردانەکە. چیی وای نەمابوو بەکەوێتە نێو کوانووەکەوە. بە سەر ئاگرەکەدا نووشتایەوە. وەك مێژۆکە دەلەرزی.

ژنەکەی لە دڵی خۆیدا گوتی:

وەڵڵاهی سەیرە، یانی وەلییەکان ئەوەندەشیان سەرما دەبێ؟"

ئەوجار:

"تۆبە، خوایە، تۆبە."

# ٤٢

ئەم شەو نە وەك دوێنێ ئەو سارد بوو نە کزە سەرماکەی دوێنێشی هەبوو. هەورەکان گەواڵە هەورە ڕەشەکان ئاسمانیان داپۆشیبوو و لە دەشتەوە بۆرانێکی توند هەڵیکردبوو و چیی نەمابوو دارەکان لە ڕەگەوە هەڵکێشێ. لە وەها شەوێکدا، هیچ گورگ و ڕێو و کەمتیارێك نەیدەوێرا سەر لە لانی دەربێنێ. ئەو تاریکییە وەك دیوارێکی بەردین و وەك پۆڵایەکی سەخت و نەشکێن وا بوو. دەتگوت هەرچی شەوی ئەنگوستەچاوی لە سەرەتای خیلقەتەوە هەیە تا ئێستا، چڕ کراونەتەوە و بەو شەوە دراون. تاشباش ئۆغلو دەیگوت:"دوێ شەوێ، سامال بوو، هەر بۆیەش نەمتوانی نوورەکان ببینم. ئەمشەو مسۆگەرە. نوورەکان دێنە بەر چاوم. جا دوای ئەوە دەبێ ئەو خەڵکی تۆرووسە بزانن وەلی یانی چی."

ئاگریشی پێ نەدەکرایەوە، چون پێی وا بوو نوورەکە لە ئاگر ترساوە و ڕەویوەتەوە.

سێ سەعات بوو چاوی لەسەر بانی ماڵەکەی نەترووکاندبوو و هەر چاوەڕێ بوو. لە ناکاو دەنگی خشە خش و دەنگی باڵندەیەکی بیست. لە خۆشیان خۆی پێ نەگیرا و هەستا. تۆف و بۆرانە توورەکە، وا خۆی پێدادا، چیی نەمابوو بە عەرزیدا بکەوێ. ئێستا نا تاوێکی دی لەوانە بوو نوورەکە دەرکەوێ.

تاوێك پرشنگێکی کورت و باریك بە بەر چاویدا تێپەڕی و تاریکی باڵی بەسەر هەموو شتێکدا کێشایەوە.

تاشباش گوتی:"نوور، نوور،..." و دڵی خۆش بوو"نوور، ها؟". کەوابوو ئەو قسانەی گوندییەکان ڕاست بوون... کەوابوو ئەو وەلی بوو؟

ئەو ئاگرە پیرۆزەی لە ناخیدا داییسا، گەورەتر و هەراوتر بۆوە. ئێستا ئیتر متمانەی بەخۆی بوو... سەرخۆش بوو. نووری سەر ماڵەکەی خۆی دیتبوو... گوێیەکانی دەزرینگانەوە و سەری

لە گێژەوە دەهات:"خش ش ش ش،..." ئاو مراد، کەسک کەسک لووزەوی بەستبوو. وەك مارێکی کەسك. گەرما قوولەی دەکرد. ماری ڕەش ڕەش بوون بەسەر بەردە مسییەکاندا دەخوشین. دەخوشین و خوشینەکەیان نەدەبڕایەوە. سێبەرەکەی دەکەوتە سەر ئاوە کەسکەکە. ئاوەکە بەرەو خوار دەچوو و سێبەری هەورەکان بەرەو ژوور.

"خش.... خش ش ش."

وەخۆ هاتەوە. تاوێك دیتبووی. ڕێك وەك ئەوە وابوو کە پیاو زللەیەکی توندی وێکەوێ ئاگری لە چاوی دەرپەڕێ.

بەخۆی گوت:"ئەوە حەل نییە. ئەگەر جارێکی دیکە، یان تۆزێك زیاتر بیبینم، ڕاستە و وایە، ئەو کات دەردەکەوێ وەلیم.

لەسەر جێیەکەی دانیشتەوە. سەرماکەی وەك شیر کەپەنەك و بارانی و چەکمە لبادییەکانی دەبڕی و دەچووە نێو ئێسقانەکانی. هێندەی نەمابوو لە سەرمان بیبەستێ و لەخۆ بچێ، بەلام دیسان وازی نەهێنا و نەچۆوە. وردە وردە خەویش دەیبردەوە و چیی زیاتر خەو دایدەگرت، گوێیەکانی پتر دەزرینگانەوە و سەری لە گێژەوە دەهات.

دەنگی کوندێك هات. تاشباش لەو دەنگە ترسا و لەرزی. بە دڵیدا هات کە بەلایەکی بەسەر دێ. لە ناکاو فەرماندەی پۆلیسخانەکەی وەبیر هاتەوە. بەڵێنی پێ دابوو دەست لەو کارانە هەڵگرێ، بەلام ماڵەکەی هەر پڕ دەبوو لە نەخۆش و فێدار و بەتاڵ دەبۆوە و پڕ دەبۆوە. بێت و ئەمجارەیان کەوتبایەتەوە دەست مولازم، قسەی تێدا نەبوو پشتی لە زگی نەرمتر دەکرد. بنیادەمێکی تووڕە و تۆسن بوو. هەر بە ڕاستی دەیگوت چی؟ دەیگوت:"باشە، لە چاخی ئەتۆمدا ئەو کارانە؟" ئەو پیاوە هەقی بوو. زۆر زۆریش هەقی بوو:"ئێستا لەو چاخی ئەتۆم و فلان و فیسارەدا، ئەوە خەڵك دەچنە ئاسمانان، ئەتۆ لێرە دانیشتبووی و چاوەڕێی دیتنی نووری، بەلام چما هەر ئەو کارانەش پەرجۆ نین؟"

"ئەو دەنگی کوندە بێفەڕ و بەدشوومە. زۆریش بێفەڕە. ئەمن هەرچی بە مولازم بڵێم بێ تاوانم و چارم نەبوو، ئەوان هرووژمیان هێنایە ماڵەکەم، گوێم ناداتێ. هیچ گوێ ناداتێ و سێ شەو و ڕۆژان بە قەستی کوشتنێ لێم دەدا. دوای ئەوەش دەمخاتە زیندانەوە و لە پاشان بەرێی شێتخانەم دەکا."

ئاخ، ئەگەر بە چاوی خۆی و بە جوانی ئەو نوورەی دیتبایە و سەیری خوشینی پیرە گوێزە پیرزەکەی کردبا کە بەسەر ماڵەکەیدا دەخوشێ، ئەوکات ئیتر مولازم و حوکمەت و دنیا، هەر

هەمووی بە پووشێك. ئەو كات مولازم ئەنجن ئەنجنیشی كردبایە، دیسان هەر گوێی لێ نەبوو... دوای ئەوە ئیتر لەم دنیایەدا هەر بەڵایەكی بنیادەمەكان بەسەریان هێنابایە، هەر گۆشت و پێست و جەستەی دەگرتەوە و نەیدەتوانی زیانێك بە وەلیایەتییەكەی بگەیێنێ و ئەویش خۆ یەكەم وەلییەك نەدەبوو كە خەڵكی لەم دنیایەدا ئازاریان دابێ. چما عیسا، ئەو پێغەمبەرە گەورەیەی خودایان نەبردە سەر چیای ئاگری و لەوێ چوار پەلیان بە بزمار لە داری ئابنووس نەدابوو؟ لەوێ چوارمێخەیان كێشابوو و لەو سەرمایەی ئاگرییشدا بەجێیان هێشتبوو و عیسا پێغەمبەرەكەی خودا، بە دەست و پێی چوارمێخەكێشراوەوە لە سەرمان ڕەقهەڵاتبوو..، بەڵام دەنگی لێوە نەهاتبوو و لەبەر كەس نەپاڕابۆوە.

"ئاخ، ئاخ، ئەگەر بەو دوو چاوەی خۆم و بە جوانی ئەو نوورە ببینم، ئەو كات دەزانم چی دەكەم..."

لەرز و چەقوچۆیەكی توند هەموو گیانی داگرت. خەریك بوو بەلادا بێ. تەنانەت تارماییەكیشی لە ماڵەكەی نەدەدی. هەموو شتێك نوقمی تاریكییەكە ببوو، بەڵام تاشباش شوێنی ماڵەكەی دێنایەوە پێش چاوی و چاوێكی كردبووە چوار چاو و چاوەڕێی نوورەكە بوو.

"هیس س س س س... خش ش ش ش ش ...." دەنگی خشەخشەكە وەك ڕۆیشتنی دەنگی ئاو و دەنگی باڵندەكەشی لە گوێیدا بوو. هەتا دەنگەكە نەبڕابۆوە، تاشباش لە هیچ نەدەترسا. ئەو دەنگە هیوابەخش بوو. لەوە زیاتر چیی دەویست؟ چما نوورەكەشی نەدیبوو؟"

نا، نا، دەبوو بە جوانی ببینێ.

هەتا كازیوەی دا، هەر چاوەڕێ بوو. نیوە سڕ و نیوە بێهۆش بوو، بەڵام هەر وا سێ سەت هەنگاوێك لە ماڵەكەیەوە دوور بوو. تاو كەوتبوو كە توانیی بە خشكە خشك بگاتەوە ماڵەكەی خۆی. دەستەكانی ڕچێببوون و سەرما بردبوونی.

هەواڵیان دایە مرێمۆك و گوتیان تاشباش سەرما بردوویەتی. مرێمۆك بە غاردان هات و مەڵحەمی لەسەر دەستەكانی دانا، ئەگینا پەنجەكانی هەڵدەوەرین.

مرێمۆك بەخۆی گوت:"خۆ پیاوچاكان نامرن، بەڵام كەسیرە دەبن و دەیانبەستێ؟.... دەبنە سەهۆڵ و ئاتاجی دەستی مرێمۆك دەبن؟"

دڕدۆنگ و دوودڵ بوو و تاشباش ئەوەی لە چاوەكانیدا دیتبوو. لە دڵی خۆیدا گوتی:"ئەمشەویش چاوەڕێ دەبم. ئەگەر بە ڕوونی نەمدیت، واز لە وەلیایەتی دێنم و سەری خۆم هەڵدەگرم و دەڕۆم، بەڵام بێت و نوورەكە ببینم، مرێمۆك، ئەو كات دوو قسەشم بەتۆیە."

# ٤٣

تاشباش له کەلاوەکەدا نێوچاوانی لە سەر عەرزەکە دانابوو و دەیگوت:"خوایە، ئەو نوورەم نیشان بدە، بە گەورەیی خۆتم لەگەڵ بکە، هاتوومە دەرگەت و دەپاڕێمەوە... سووك و ڕیسوای لای ئەو خەڵکەم مەکە. خوای گەورە، هەموو شتێك لە بەر دەستی تۆ دایە. نیشانی بدە. ئەو نوورەی نیشانی هەمووانت داوە، نیشانی منیشی بدە. ئەگەر ئەمن وەلیی تۆم و ئەگەر بەندەیەکی باشی تۆم، نیشانی بدە. ئەگینا، ئەمن خەریکم ئەو ڕەش و ڕووتانە دەخەڵەتێنم و لاڕێیان دەکەن. ئەو ماڵانەی خوارەوە پڕن لە نەخۆش و فێدار و دەردەدار و هاتوون و شیفا و چارەسەریان دەوێ. ئەی خوای گەورە، گەورەیی خۆت بنوێنە. ئەی خوایە تۆی لە سەرووی هەمووانەوە، ئەی بەدیهێنەری ئاسمان و زەوی، ئەگەر ئەو تاشباشەت کردووەتە وەلیی خۆت، ئەو نوورەی نیشان بدە با بڕوا بکات و کەرامات و گەورەیی تۆ بە هەموو دنیا ڕابگەیێنێ.

"ئەگەر تۆ ئەو نوورەم نیشان نەدەی، ئەمن ئیتر ناتوانم باسی ئەو چاکە و کەراماتانە بکەم کە تۆ لە دڵمت ناون. وەلییایەتییەکەمم پێ قەبووڵ ناکرێ و وازی لێ دێنم."

رووی کردە قیبلە و نوێژی دابەست. دوای ئەوەی دوو ڕەکات نوێژی کرد، هەستا و دەستەکانی ڕووەو ئاسمان هەڵبڕی و پاڕایەوە:"ئەی خوای گەورە ئەو نوورەتم نیشان بدە، با لە دڵەوە ئیمان بێنم."

ماوەیەکی زۆر پاڕایەوە. بەفر و بۆرانەکە وا بە تەوژم هەڵی کردبوو، چیی نەمابوو بیخنکێنێ. وەك قەمچی لە سەروچاوی دەدا، بەڵام ئەمشەو باشی خۆ داپێچابوو. مرێمۆك دەستە سەرمابردووەکانی، بە پشتوێن و بن کراسە کۆن و گۆرەویی بەن، بۆ داپێچابوو.

دوای پاڕانەوەکەی میزی هات. شانی ڕاستەی بە دیوارەکەوە نا و میزی کرد. میزەکەی گەیشتە عەرز و نەگەیشتێ بەستی و بوو بە سەهۆڵ.

دەشتەکە دەیگرماند، گرمەی وەك دەنگی تۆپ دەهات.

"ئەمشەو یان لێرە کەسیرە دەبم و دەبمە سەهۆڵ و دەمرم یان ئەو نوورە دەبینم. ئەی خوایە گیان، ئەو نوورەم نیشان بدە. خۆ نیشانمی نەدەی، بۆ خۆت دەزانی."

گوێی لە دەنگی خشەخشێکی کز بوو. دڵی داخورپا. کاتی بوو. لە تاریکاییەکەدا هەر چاوێکی کردە چوار چاو، بەڵام نوورێك لە گۆڕێ نەبوو.

بە تەنێ بوو. بە دەشتە ڕاستاییەی چوکووراوادا دەڕۆییشت. هەر چوار دەوری کێڵگەی گەنم بوو. گوڵە گەنم پڕ و بە بەر بوون. شنەبایەکی بەهاری هەڵی کردبوو. لە بن پڕشنگی خۆرەکەدا، کوللەی ڕەنگاو ڕەنگ، گەورە و بچووك هەڵدەفڕین. لە ناکاو سەیری کرد کوللە وەك هەوری ڕەش بەری ئاسمانیان داپۆشی. گوندییەك لە دەم ڕێیەکەوە چۆکی دادابوو و دەستەکانی ڕووە و ئاسمان هەڵبڕیبوو و دەپاڕایەوە. دەیگوت:"خوایە گیان، بۆ خاتری خوایەتییەکەی خۆت، مەهێڵە ئەو کوللەیە لە کێڵگەکەی من نەدا. ئەمن هەر ئەوەندەم هەیە پێی بژیێم."

دوو ڕۆژ دواتر هەر بەو ڕێیەدا دەگەڕایەوە. هێشتا گەواڵە هەوری کوللەی هەر لێ بوو. تاقە گوڵە گەنمێك چییە بەو گەنمەجارەوە نەمابوو. لە چەقی جارەگەنمەکە، کە دەتگوت لە بنی بنەوە تاشیویانە، کابرایەك لە سەر دەم بە عەرزیدا کەوتبوو. کاتێ کوللە لە کێڵگەیەك دەدا، ئاوای لێ دەکا. تەنانەت گەڵایەکی شینی بۆ دەرمانیش پێوە ناهێڵێ.

لە ڕێگەکە لای دا و چووە لای ئەو کابرایەی لە نێوەڕاستی جارەکەدا خەوتبوو. داهاتەوە و سەیرێکی ڕوخسارە تۆزاوی و خۆڵاوییەکەی کرد. ڕوخساری کابرا تەڕ و قوڕاوی بوو. خاوەن مەزراکەی ناسییەوە. خودا کوللەکانی خۆی ناردبووە مەزراکەی ئەو کە تاقە سەرچاوەی بژێوی بوو و زەویوزارەکەی لێ ئاوا لێ کردبوو. بەهێمنی لە کابرا دوور کەوتەوە.

لە خاکی چوکووراوادا ماری باریك و بەرزی ڕەش و خۆڵەمێشی و زەر و سوجەی سوور هەیە. پێیان دەڵێن "تیرمار"... زۆر سەیر بوو. هەتا ئەو دەم کەس تیرماری نەدیبوو. بۆ یەکەم جار لە بن دارە هەنجیرێك دیتی. کانییەك بە بن هەنجیرەکەدا دەڕۆیشت. دەوروبەری کانییەکە، بەردەڵێنێکی تیژ بوو. بزن لەسەر بەردەڵێنەکە مۆڵیان* خواردبوو.لە ناکاو شووڵێکی درێژی زێڕینی بەرچاو کەوت کە لە بن بەردێکەوە کەوتبوو. پێی وابوو لە زێڕ یان کانزایەکی گرانبایی دروست کراوە. چوو بۆ لای و داهاتەوە و دەستی بۆ برد. ڕێك لەو کاتەدا

---

* مۆڵ خواردن: نووستنی گاران و مێگەل. مۆڵگە: شوێنی نووستنی مێگەل و گاران.

کە دەیویست هەڵیگرێ، شوولکە وەك تیرێك ویزەی هات و بەرەو ئاسمان چوو. پانزە تا بیست مەترێك هەستا و لە نێوەڕاستی بەردەکان کەوتەوە و لە چاوان ون بوو. ئەوە چ بوو؟ گیانی هەبوو و لە مار دەچوو، بەڵام ئەی ئەو ڕەنگ و درەوشانەوە و شووش و باریکییەی چ بوو؟ نزیکەی مەتر و نیوێك درێژ بوو و هێندەی تیرێکیش باریك بوو. ئەوەی دیتبووی بۆ گوندییەکانی گێڕایەوە. گوندی گوتیان:

ـ سەر ئەو کانییە ماری زۆرە. پێیان دەڵێن تیر مار.

کەوابوو ئەوە تیرمار بوو؟ هەر بۆیە گوندی لەو کانییە نزیك نەدەبوونەوە و ئاوەکەشیان نەدەخواردەوە. ئەو کانییەش شەخس (وەلی) بوو. کانییەکە بە بن کۆمەڵێك ڕەوەزی گەورەدا دەهات کە تۆزێکی خۆڵ چییە لێ نەبوو و گیای لێ شین نەدەبوو. لە ڕاستیدا ڕەوەز و بەردەڵان نەبوو. چاخێکی بەردین بوو کە لە نێوەڕاستی چوکووراوا قوت ببۆوە.

ئەوانەی نۆبەتێ دەگرن، ئەگەر نانێك کون بکەن و بەملیانی دا بکەن و ئەوەندە لە ئاوی ئەو کانییە بەخۆیاندا بکەن هەتا نانەکە دەتوێتەوە، نۆبەتێیەکەیان دەبڕێتەوە. ئاوی ئەو کانییە دەرمانی دەرد و نەخۆشی و باداری و هەزاران دەردی دیکەیە. ئەوەی شەوێ بە ڕووتی لەسەر ئەو بەردانە بنوێ، هیچ نەخۆشییەك ناگرێ.

ئەو کانییە ئەوەندەی کەرامات هەیە کە لە ژمار نایەن. ئاوەکەی لە ئەشکەوتێکەوە دێ. زستان و هاوین، بە شەو و ڕۆژ، تاو و ساو بێ یان هەور و هەڵا، ئەو پرشنگ و نوورەی لە ئەشکەوتەکەدا کۆ بووەتەوە، کەم نابێتەوە، لە بەردەکانی دەدا و دەبریسکێتەوە.

دیسان گوێی لە خشەخشەکە بۆوە. هەستا. ئەو با توندەی دەهات، ڕایوەشاند و کەپەنەکەکەی کردەوە. تاشباش کەپەنەکەکەی کێشایەوە و دایخستەوە و توند گرتی.

دەنگی "پەپوو سێمانە"شی بیست. تاشباش دڵەخورپە دایگرت. ماوەیەك بە پێوە چاوەڕێ بوو.

داری چاکی، لە سەر چیای تەکەچەوە دەخوشی و دەهات؟ خۆزگە پێشتر ئاگادار بکرێتەوە و ئەو دارە ببینێ کە لە دوورەوە دەخوشێ و دێ... چاوەڕێ بوو... چاوەڕێ بوو... هەموو گیانی ببووە چاوەڕوانی.

ئەو نوورە بەسەرماڵەکەی ئەودا دەباری. وەك بارانە بەغوڕەمەکانی چوکووراوا. دارە گوێزەکە، ڕووناك دەبۆوە و دەهات و وا لەسەر ماڵەکەی لەنگەری دەگرت، وەك بڵێی ئیتر لەوێ نابزوێ.

حەزرەتی پێغەمبەر پێی لە هەر شوێنێك دانابایە، جێی پێیەکانی گیای لێ شین دەبۆوە و گوڵی ڕەنگا و ڕەنگی لێ دەپشکووتن. هەمیشە هەورێکی سپی سێبەری لێ دەکرد. لەسەر سەری بگەڕێم، دەیویست بچێتە هەر جێیەك، بە بن ئەو سێبەرەدا دەچوو.

پیاوچاك زۆر هاتوونەتە ئەو دنیایە و زۆریشیان گەیشتوونەتە پلەی وەلیبایەتی... وەلییەکان خۆ لە ئاسمانەوە نایەن.... ئەوانیش لە دایك دەبن.

دەی باشە، چ دەبوو؟ هەتا ئێستا خۆ خراپەی بۆ کەس نەبووە و جگە لە سەفەر دڵی کەسی نەیەشاندووە و چاکەی لەگەڵ هەمووان کردووە و ئەوە چەند ساڵیش بوو لەسەر مافی ئەوان شەڕی لەگەڵ سەفەر دەکرد. پیاوێکی ئاوا باش کە نایەوێ دڵی مێرووەك بڕەنجێنێ، و قەت لە ڕێی خوای لا نەداوە، باشە بۆ نەگاتە پلەی وەلیبایەتی؟ جگە لەوەش، چما ئەو هەمووە گوندییە درۆیان دەکرد؟ ژنەکەی ئیتر لەگەڵی نەدەنوست و سەرجێیی نەدەکرد. باشە ژنەکەی شێت بوو؟ چما ئەویش حەزی لێ نەبوو؟ هەموو خەڵك کەراماتەکانی ئەویان دیبوو و هەموو ڕۆژێش دەیاندی. ئەی بۆچی زیاد لە هەمووان، ئەو وەلیبایەتییەکەی خۆی قەبووڵ نەبوو؟ لە بەر ئەوەی، یەکەم بەڵێنی بە مولازم دابوو. دووەم ئەوەی کە لە ئاقیبەتی کارەکە دەترسا. وەلیبایەتی شتێکی باش بوو. نەسیبی هەموو کەسێك نەدەبوو، بەڵام ئاقیبەتەکەی مەترسیدار بوو. هەر وەلییەکی ئەو دەیناسی و ناوی بیستبوو، سەری چووبووە پای سێدارە یان کەوتبووە زیندانەوە. تەنانەت بە ناوی ئەوەی لە دین لایان داوە، کەوڵیان کردبوون.

بەخۆی گوت:"ئەگەر من وەلی بم، نە کەوڵم دەکەن و کام لە پێستی دەئاخنن و نە دەخرێمە بەندیخانەشەوە. گوندییەکان ناهێڵن... ئەمن داوایان لێ دەکەم ڕێی دادپەروەری و یەکسانی بگرنە بەر. دەستڕۆیشتوو و دەوڵەمەندان یارمەتیی دەستکورت و هەژاران بکەن. کەس زوڵم لەویتر نەکا. کەس کەس ڕووت نەکا. هەق بە هەقدار بگا."

بەڵام ما هەموو وەلییەکان هەر ئەوەیان نەویستبوو؟ ... سەریشیان هەر لەو پێناوەدا دانابوو... ئەگەر نەیانویستبایە لە دەوڵەمەندانی بستێننەوە و بیدەنە هەژاران، کێ کای لە پێستیان دەئاخنی؟ کێ سەر و دڵی دەگرتن؟

هیچ کەس پێی نەدەگوتن پشتی چاوتان برۆیە، بەڵام ئیتر هەژارەکانیش مەرحەبای وەلییەکانیان نەدەکرد. ئەوە هەژارەکانن وەلی دەکەنە وەلی. هەژارەکان دەرمانی دەرد و نەخۆشییەکانیان، کەمایەسییە جەستەییەکانیان و نەداری و هەژارییەکانیان لە وەلییەکان دەوێ. دەیانەوێ ئەو پێشی زوڵم و ناهەقی و پیاوکوژی و شەڕ بگرێ. هەر بۆیەشە، لە دەوری

وەلی کۆ دەبنەوە. ئەگەر وەلییەکەش ئەوەی ئەوان لێیـان دەوێ، نـەیکا، داوێـنی بـەر دەدەن و ئەگەر بیشیکا، ئەوە سەری بە فەرتەرات دەچێ. دەوڵەت کەیفی بەو کارانە نایە.

بەخۆی گوت: "ئەوە دەترسی، تاشباش؟ خەریکە دەترسی ها کوڕی بـاش؟ دەشترسـی و لـەو ئەنگوستەچاوەشدا دێتە دەرێ هەتا نووربارانی سەر ماڵەکـەت ببـینی. ئـەتۆ بوویەتـە وەلـی، کوڕی باش، وەلیی خوای. ئەتۆ قەدر و قیمەتی ئەو بەهەشتە نازانی کە پێتیان بەخشیوە. هـەم لەم دنیایە و هەمیش لەو دنیا... لێگەڕێ با سەرت بڕوا، کەوڵت بکەن. دەی جا چـییە؟ ئـەوە چارەنووسی هەموو وەلییەکە. لە جوابی ەوەدا خەڵکی هەتا قیامەت لە دڵیاندا هەڵتدەگرن (تا هەتایە لە دڵی خەڵکدا بەزیندوویی دەمێنیتەوە). مەرقـەدت بـۆ سـاز دەکـەن و هـەموو ڕۆژێ دێنە زیارەتت. مەترسە، تاشباش، وەلییەکان نەمر دەبن و لە مەرگ ناترسن. مولازمیش چیی لە دەستی دێ با بیکا.... ئاخ، خۆزگە بەڵێنت نەدەدایێ...."

بەڵام سەبارەت بە نوورەکـە... نورەکـەی دیتبـوو. بـە سـەر ماڵەکەیـەوە درەوشـانەوەیەکی بچووکی دیتبوو. دڕدۆنگ لە نێوان وەلییایەتی و گوندییەکی پێپەتیدا، نەیدەتوانی بڕیار بدا و ساغ بێتەوە. چۆن بوو لە مرێمۆك بپرسێ؟، بەڵام چۆنی لێ پرسیبایە؟ بۆ وێنە دەیپرسی: "ئەنـە مرێمۆك، تۆ پێت وایە ئەمن وەلیم؟" ئاخۆ مرێمۆك پێکەنینی بەوەها پرسیارێك نەدەهات؟

بە دەنگێکی کە خۆی گوێی لێ بێ گوتی: "ئەمن ئەو قسانەم بە گوێدا ناچن. ئەگـەر خـودا ئەمنی کردبێتە وەلی و ناردبێتمی بۆ یارمەتیی بەندەکانی خۆی، با نوورەکەشم نیشان بدا. خۆ لە سەرما ڕەقیش هەڵێم، هەتا ڕۆژ دەبێتەوە هـەر چـاوەڕێی ئـەو نـوورە دەبم. ئەگـەر نیـشانمی نەدا، ئەمنیش دەست دەکێشمەوە لە وەلییایەتییەکـەم و سـەری خـۆم هەڵدەگرم و دەڕۆم. ئـەو سا، ئەگەر خەڵکی ئەو تۆرووسە بەپانەوە، ورد و درشت بێن و لەبەرم بپاڕێنەوە و شـاخ و بـاڵم وێخەن و سەد هەزار کچی شەقڵ نەشکاوم لە پێشی وەسەما بخەن، هـەر قـەبووڵ ناکـەم. هـەر ئەوەندەم دەوێ جارێکی ئەو نووره ببینم، خۆ دوای ئەوە با کەوڵم کەن و کام لە پێستی بـاخنن، با هەموو ڕۆژێ پارچە گۆشتێکم لـێ بکەنـەوە و بیخەنـە پـێش سـەگان. هـۆ ئەگـەر نـەیبینم، مەحاڵە قەبووڵی بکەم. خۆم ناخـەوە ئـەو گێـچەڵ و ژانەسـەرەوە. ڕا دەکـەم و دەڕۆم. کەسـیش ناتوانێ بمدۆزێتەوە. هیچ کەس... ئەمن تاشباشە لاسارەکەم پێ دەڵێن....

گوندەکانی ئانتەب زۆر لەوێوە دوور بوون. موسـلیم چـاوەش کـوڕێکی چـاك بـوو. خـەڵکی گوندی قزڵ کیسە بوو. زەمانی سـەربازی تـەختی خەوتنەکـەیان بـە پـاڵ یەکـەوە بـوو. ببوونـە هاوڕێی گیانی بە گیانیی یـەکتری. پێکـەوە فێـری خوێنـدەواری و نووسـین ببـوون. ئـەو ڕۆژەی

وشەیەکیان پێ دەنووسرا، لە خۆشیان شاگەشکە دەبوون. هەر دووگیان چوبوونە خولی چاوەشی و پێکەوە پلەی چاوەشییان لە قۆڵیان دابوو. دوایی هەر دووکیانیان دابووە یەکەیەك. ڕۆژێکیش هەر پێکەوە بە سەرەنێزەکەیان پەنجەی خۆیان بریندار کردبوو و خوێنەکەیان خواردبۆوە و ببوونە برای هاوخوێنی یەکتری."

ئەگەر چووبایەتە لای موسلیم چاوەش لە ئانتەب، کێ دەیتوانی بیدۆزێتەوە؟ لە سەر کەوشەنی سووریا بوو. ئەگەر حەزیشیان لێ بوایە دەیانتوانی قاچاخچێتی بکەن. موسلیم پێش ئەوەی بچێتە سەربازی قاچاخچی ببوو. زۆر جاران سوێند و قورئانی خواردبوو کە بێت و بگەڕێمەوە دیسان دەبمەوە قاچاخچی. کێ چووزانێ. لەوانەشە هەر گەیشتبێتەوە مالێ دەستی پێ کردبێتەوە.

جارێکی دیکەش بارانییە خورییەکەی بە جوانی لە سەر و چاوییەوە پێچایەوە. بۆرانەکە توندتری کردبوو و لە پێدەشتەکەوە ڕێك بەرەو ئەو هەڵیکردبوو و ئەگەر تاشباش پیاوێکی ئاوا بەخۆوە نەبوایە، بە دڵنیاییەوە هەتا شاری ڕایدەدا.

هێشتا زۆری مابوو ڕۆژ بێتەوە. چما دەبوو لەو سەرمایەدا هەتا تاوهەڵاتن ڕاوەستێ؟ تیشك و نوور بە جێی خۆی. ئەگەر ئەمشەو نەیبەستێ و نەمرێ، دیارە وەلییە و خێو و جنۆکە و پەری دەوریان گرتووە و لە زریان و بۆران پاراستوویانە.

لە دوورەوە گوێی لە خشەخشێك بوو کە دەتگوت کەوتووەتە پێش گژەبایەکەوە:"خش شش ش شش ش ش.."

تاشباش پێی وابوو ڕووناکاییەکەش بە شوێنی ئەودا دێ و دڵی خۆش بوو. خشە خشەکە وردە وردە نزیکتر دەبۆوە و چەندی نزیکتر دەبۆوە، بەهێزتر دەبوو. تاشباش ترسا: نەکا هەژدیها گەورەکەی پێدەشت بێ کە دێ؟ هەر ئەو حەزیا گەورەیەی زێرەڤانی قەڵای ئەرجییسە؟

لە کەلاوەکە دەرپەڕییە دەرەوە و ڕووە و ماڵەوە ڕۆیشتەوە. سێ چوار جارا بە دەوری ماڵەکەیدا خولایەوە. دەنگی خشەخشەکە هەر دەهات و نزیکتر دەبۆوە و توندتریش دەبوو. چوو و لە بەر دەرگاکە ڕاوەستا. هێشتا ئەو چاڵەی پڕ نەکردبۆوە کە لە بەر دەرگاکەوە هەڵکەنرابوو. وەبیری هاتەوە. ئەگەر ویستبایەی باز بداتە ماڵەوە، دەبوو وریابێ لاقی تێك نەئاڵێ و نەکەوێتە ئەو قوولکەیەوە.

ماوەیەك چاوەڕوان مایەوە. دەنگی خشەخشەکە دەهات، بەڵام هیچ ڕووناکاییەك دیار نەبوو. بەخۆی گوت:"ئەی باوکەڕۆ، لە کیسم چو. کوڕە خۆ لێرەوە لەو خوارەوە نوور نابینرێ."

بە غاردان بەرەو کەلاوەکە ڕۆیشتەوە و چاوی بڕییەوە تاریکاییەکەی سەر ماڵەکەی. دەنگی خشەخشەکە دەتگوت تاوێك كپ بووە. گوتی:

ـ تف، نوورەکەم لە کیس چوو. کەس نازانێ کەنگێ دێتەوە.

سەرما و بەفر و بۆرانەکە هەر دەهات و بە تەوژمتر دەبوو. ئەو کەپەنەکەی بەخۆیدا دابوو، لە ناکاو ناسك ببۆوە. دەلەرزی. دەست و پێی وردە وردە سڕ دەبوون و دەیبەست. ئیتر خۆی پێ نەدەگیرا. سەرماکەی وەك شیر دەیبڕی و بە ناخی سییەکانیدا ڕۆدەچوو. خۆزگە ئەمشەویش ئاگری کردبایەوە، بەڵام ئاگر لەو بۆرانەدا نەدائیسا. ئاییسابایەش، گەرمی نەدەکردەوە....

گوێی لە خشەخشێکی کز بوو. خەریك بوو دەهات. دڵی خۆش بوو. لە ناکاو نەما.

"کوڕە ئەو نوورەش بە قوڕێدا بچێ. ئەگەر دێ، با بێ و ئەجاتم بدا. چییە ئەو ئاین و ئۆپنەی دەریدێنێ؟...

کتوپڕ هیوایەکی نەما. بەسپایی گوتی:

"ئەگەر من وەلی بوایەم و ئەوەندە لە بەر خودا پاڕابامەوە، نوور سەهلە، خۆر و مانگ و ئەستێرەکانیشی دەنارد. کوڕە با بڕۆم و لە جێویانە گەرمەکەمدا لێی بنووم. ئەمن کەی وەلی بوومە؟ چما وەلی ئاوا کەسیرە دەبن؟ چما سەرما ئاوا بەچۆکیاندا دێنێ؟" شەقەی ددانی دەهات. چیی لە سەر یەکتریی دادەگرتن، شەویلکەی ڕانەدەوەستا و ددانی وێك دەکەوتن:"چما وەلی ئاوا هەڵدەلەرزن؟"

خۆی جوان لە کەپەنەکەکە وەرپێچا و پاڵی بەدیواری کەلاوەکەوە دا. مردباش و بشیبەستبایە، تا نوورەکەی نەدەبیا، هەتا تاوهەڵاتنێ لێرە دەمایەوە:"ئەحلەتی خوای لەو کەسەی لێرە دوور کەوێتەوە."

شەقەی ددانی و لەرزینەکەی گیانی وردە وردە کەمتر دەبۆوە. گیانی خەریك بوو بێهێز و سڕ دەبوو. خەوێکی شیرین وەك هەڵمێکی گەرم بە گیانیدا دەگەڕا و ناخی دادەگرت.

هێندێ شتی هاتنە بەر چاوی. ڕیزە لەك لەکێکی جوان بەری ئاسمانیان داپۆشیوە. ئاسمان، ئاسمانەکەی چوکووراوایە. لەك لەکەکان شینایی ئاسمانەکەیان داپۆشیوە و شاردوویانەتەوە، ئەوان بە نێو کێوێکی نووردا، کێوێکی هێندەی چیای تۆرووس، هەڵدەفڕن بەو لاق و باڵە قاوەییانەیانەوە...

دیسان گوێی لە خشەخشێك بۆوە. تاشباش گیانێکی وەبەر هاتەوە. بڕێك چاوی بڕییەوە سەر ماڵەکەی و کە هیچی نەبیین، دیسان نوقمی خەیاڵە ڕوونە پڕ لە لەك لەکەکەی بۆوە.

ئێستا لەو کێوە نوورەدا، لەو ئاسمانەی هێندەی کێوی تۆرووس بوو، دورنا و قورینگەکان دەهاتنە ژوورەوە و لەك لەکەکان دەچوونە دەرەوە. فڕۆکەکان دەهاتنە دەرەوە. زەویوزارەکانی لۆکە، دەهاتنە دەرێ. فڕۆکە دەچوونە ژوورەوە و کێڵگەی پەمۆ دەهاتنە دەرەوە. ساتێك دارستانە سنۆبەرەکەی تۆرووس چووە نێو ئەو کێوی نوورووەوە. دوای ئەوە نووور و دارستان و لەك لەك و هەرچی هەبوو، هەمووی نەما و تاشباش بە تاریکاییەکەدا ڕۆچوو.

تاوێك لە نێو تاریکاییەکەدا مایەوە. گیانی هەر دەهات و شلتر دەبۆوە. بەخۆی گوت:

"با هەستم بچم و لە جێویانە گەرمەکەمدا بنووم. کوڕە ئەو نووورە هەر نایە".

بەڵام نەیتوانی هەستێ.

"خش ش ش ش ش ش "دەنگەکان هەر دەهات و بەرزتر دەبوونەوە.

نزیك بوو ڕۆژ بێتەوە. تاشباش بە بیستنی خشە خشێکی بەرز، چاوەکانی کردەوە. لە ناکاو لە سەر ماڵەکەی و بەلای ڕۆژهەڵاتدا درەوشانەوەی تۆپەڵەیەك تیشکی بینی.

ئاخری نوورەکەشی دیتبوو. ئیتر چیی دەویست؟ هەرچی هەوڵی دا نەیتوانی هەستێ. خەو بەسەریدا زاڵ بوو. تۆپەڵە نوورێکی گەورە لەسەر پێڵووەکانی بوو. خەوی لێکەوت.

بڕێك دواتر، گوێی لە دەنگێکی وەك دەنگی ژنەکەی بوو. ئاخۆ خەونی دەدی؟ دیسان هەوڵی دا، بەڵام نەیتوانی هیچ بە ژنەکەی بڵێ. لە هۆش خۆی چوو. کە چاوی هەڵێنا نیوەڕۆ بووە و لە تەنیشت کوانووەکە بوو. مرێمۆك و عەلییە درێژ و حەسەن و نۆمەخان و منداڵەکانی خۆی و ژنەکەی لە تەنیشتییەوە بوون.

عەلی گوتی:

ـ بڕێك درەنگتر ڕۆژ ببایەتەوە، ڕەق هەڵدەهاتی و دەمردی. ئەگەر ڕۆژ نەدەبۆوە و براژنم لەو کەلاوەیەدا بەسەرتدا نەدەکەوت، لە دەست چووبووی...

کە گەیشتمێ، سەیرم کرد پشووت لێ بڕاوە، ترسام. دایکم لە بەیانییەوە تا ئێستا بە ژوور سەرتەوە یە و دەرمانت دەکا...

تاشباش بە ڕەزامەندییەوە بزەیەکی هاتێ...

## ٤٤

مولازم گوتی:

- کوڕ کوێخا سەفەر، ئەمن باش دەزانم ئەتۆ دوژمنایەتیت لەگەڵ ئەو کابرایە هەیە. بۆیە بڕوا بە یەك قسەشت ناکەم. ئەەتۆ ئەوەندەت ئەو کابرایە ناخۆش دەوێ، لە دەستت بێ، هەر ئە لێرە و بە بەر چاوی منەوە، بە ددان قوڕگی هەڵدەبڕی و دەیکوژی، بەڵام ئەوە دیسانیش پێت دەڵێمەوە، لەوانەیە قسەکانت تۆزێکیشیان ڕاستی پێوە بێ. بۆیە سێ کەس لە ژەندەرمە متمانەپێکراوەکانی خۆم لە جلی مەدەنیدا بە ناوی نەخۆش دەنێرمە ماڵەکەی. ئەو پیاوە بەڵێنی پێ دابووم دەست لەو بەزمی وەلییایەتییە هەڵگرێ. پیاوێکی باش دیار بوو... کابرایەکی ژیریشە... ئەمن چەند کەسێك لەو وەلییانەم دیتووە. هیچ کامێکیان ئاوا نەبوون. هەر چۆنێك بێ، ئەگەر قسەکانت ڕاست دەرچن، ئەمن ئەو کابرایە ئەوەندە دوور دەخەمەوە بە خەوینیش ڕێگەی نەکەوێتەوە خاکی تۆرووس. لە پێشدا ئێسك و پرووسکی دەهاڕم و پشتی لە زگی نەرمتر دەکەم، دوای ئەوەش دەیخەمە بەندیخانەوە و دوایش..، بەڵام کوڕە کوێخا، بێت و درۆت هەڵبەستبێ، ئیتر ئەوەنییە بۆخۆت دەیزانی. دوو ئەوەندەی دەمەوێ بەسەر ئەوی بێنم بەتۆی دەکەم..."

کوێخا زۆر بە دڵنیاییەوە گوتی:

- ڕازیم جەنابی مولازم شوکری بەگ. ئەگەر ئەوەی گوتم، ژەندەرمەکانت گوتیان وا نییە و موویەکی کەم بوو، هەر سزایەکی بۆمی دیاری بکەی، بە گیان و دڵ قەبووڵی دەکەم."

سەفەر نەدەبوو ئەوەی لەگەڵ تاشباش کردبا، بەڵام نەشیدەتوانی ڕقەکەی خۆی بخواتەوە. تەنانەت خۆی بەسەر لاق و پێڵاویشیدا کێشابوو، کەچی تاشباش لەبزی دەلەبزی نەگەڕابوو و سەفەریش نەیدەتوانی لەوەی خۆش بێ. ئێستا ئیتر دەستی لە هەموو شتێك شوشتبوو و بڕیاری

دابوو هەرچی دەبێ با ببێ، بەڵام ئەو گەمەیە تا کۆتاییەکەی بەرێ. خۆ هیچ ڕەنگێك لە سەرووی ڕەشەوە نییە. خۆ لە مەرگ بەولاوەتر نییە. ئیتر ڕێگەی گەڕانەوەی نەمابوو. هەی قوڕ بە سەر ئەوەی دەیدۆڕێنێ.

سەرەڕای هەموو ئەو قسانەش سەفەر دەترسا. ترسێکی کە کەوتبووە دڵییەوە، وەك مۆرکە لە ناخەوە دەیخوارد. ئاخۆ گوندییەکانی نەیاندەزانییەوە کە ئەو خەبەری داوە؟ باشە ئەگەر زانیبایانەوە، ئاخۆ بە سەرکردایەتیی مرێمۆك هرووژمیان بۆ نەدەبرد؟ کوڕە ئەو تاشباشەش بۆخۆی کابرایەکی ساویلکە نەبوو. کە چەقۆی دەگەیشتە ئیسقانی، زۆر سامناك بوو. کە خوێن دەخزییە مێشکییەوە و مێشکی گەرم دادەهات، لە هیچ نەدەپرینگایەوە، تەنانەت لەوانەبوو پیاویش بکوژێ. تازە خۆ ئەگەر تاشباش ئۆغڵو وەلیی خواش بێ، لەگەڵ چل سوارەی غەیبیدا بێ و نەمر بووبێ چی؟... ئیتر باسی سەر بوو. ئەو کاتە سەفەر نە لەم دنیایە نەجاتی دەبوو نە لە قیامەتیش... لەم دنیایەدا مەرگ چاوەڕێ بوو و لەوێ دنیاش، لە بەر ئەوەی سووکایەتیی بە پیاوچاك و خۆشەویست و وەلیی خوا کردبوو، سەت خۆزگە بە مەرگەکەی ئەم دنیایەی...

سەفەر ئەگەر بە چاوەکانی خۆی نەیدیبایە، بڕوای نەدەکرد، بەڵام ئەو پێنج نەخۆشە لە دەست و پێ کەوتووەی دیتبوو کە هەر دەستی تاشباشیان گەیبووێ، قیت ببوونەوە و هەستابوونە سەر پێ. ئەدی مەمی دیك؟ هێندەی تێهەڵدرابوو لە مردنێ گەڕایەوە و لە قسەی خۆی هەڵنەگەڕایەوە. ئەگەر درۆ بوو، ئەی بۆچی حازر نەبوو بڵێ وا نییە؟ تەنانەت عومەریش سوێند و قورئانی دەخوارد دەیگوت، بە چاوی خۆی تۆپەڵە نوورەکا و داری چاکیی لە سەر ماڵەکەی تاشباش دیتووە. مووسا قوڵەش کە یەکێك لەدۆستەکانی خۆی و دوژمنی تاشباش بوو، هەر چەندە نەیدەگوت شتێکی دیتووە، بەڵام بەبێ ڕێزییەوە ناوی تاشباشی نەدێنا. هەر ژنەکانی خۆشی ڕازی نەبوون ئەو لە لایان خراپەی تاشباش بڵێ. باشە یانی ئەو هەمووە شتە تۆزێکیان ڕاستی پێوە نەبوو؟...

لە بن لێوانەوە گوتی: "ئاخ، تاشباش، ئەگەر ئەتۆ لە بری ئەوەی دوژمنم بی، دۆستم بوایەی، بە یارمەتیی تۆ لەو هەرێمی تۆرووسەدا داوای پادشایەتیم دەکرد. کوڕە هەڵی وا لە ژیاندا تاقە جارێك بۆ پیاو هەڵدەکەوێ."

دوای ئەوە مەحاڵ بوو سووك و سانا لەگەڵ تاشباش ئۆغڵو ئاشت بێتەوە. لاقەکانی ماچ کردبوو و لە بەردەمیا خۆی بە عەرزدا دبوو، بەڵام ئەو هەر ئاوڕێکیشی لێ نەدابۆوە.

ئەگەر تاشباش هەر بە ڕاستی وەلی بێ، پێش ئەوەی مولازم شوکری دەست بە تێهەڵدانی بکا، عەززەبی لێ دەگرێ، دواییش لەو ژەندەرمانەی دەیبەن، جا دوای هەمووان نۆرەی ئەو دێ، تا ئەو دەمیش خودا کەریمە. ڕێگەیەك هەر دەدۆزرێتەوە.

دوو ڕۆژ بوو لە شارەوە گەڕابۆوە و ژەندەرمەکان شەوێ لە جلوبەرگی دڕاوی گوندییاندا وەك نەخۆش هاتبوونە ماڵەکەی تاشباش و ئەویش دووعای بۆیان کردبوو. تاشباش خۆی نەخۆش بوو و بەجێ و بان کەوتبوو، بەڵام دیسانیش دەستی بە سەری ژەندەرمەکاندا هێنابوو و بۆیان پاڕابۆوە. ژەندەرمەکانیش بە ماڵە چۆڵەکاندا و لەگەڵ ئەو گوندییانە هاتبوون کە لە دەوروبەرەوە هاتبوون و شەویان لەوێ ڕۆژ کردبۆوە و هەموو پەرجۆ و کەراماتەکانی تاشباشیان بینیبوو.

ئیتر لە مەودوا سەفەر خەوی لێ نەدەکەوت. هەتا ڕۆژ دەبووەوە، بە دەم خەیاڵی ڕەش و ناخۆشەوە لە جێویانەکەیدا دەتلایەوە و دەیناڵاند. سەیری هەر لایەکی دەکرد، لێی قەومابوو و ڕێگەی نەجاتی نەبوو.

جاری وابوو لە پەژیوانییەکی توندا دەتلایەوە. بۆچی هەر لە یەکەم ڕۆژەکاندا تاشباشی نەکوشتبوو؟ خۆ ئەو دەم هێشتا نەببووە وەلی و لای خوداش ئەوەندە تاوانبار نەدەبوو. ئەو چووزانێ دوایی تاشباش دەبێتە وەلی؟ ئەویش وەك ئێمەمانان بەندەی خوایە و تازە بەندەیەکی تاوانباریشە. کێ ئەقڵی دەیبڕی و کێ دەیزانی ئەو دەبێتە پیاوچاك و وەلی و نەخۆشان چارەسە دەکا و خێر و بەرەکەت بە سەر زەویدا دەبارێنێ و ئاوی ڕووبار دەوەستێنێ و نوور بەسەر ماڵیدا دەبارێ؟

هەی لەو بەدبەختییە، دیسان شانسەکەی ئەو جۆماڵی دەهاتەوە بۆ بردنی تاشباش. ئەمجارەشیان ئەگەر پەنجا لیرەی دابایە بە ئۆنباشی، لێی ئاشکرا نەدەکرد کە ئەو خەبەری داوە. جگە لەوەش، دیسان لە سەر تاشباش تێهەڵدانێکی خەستی دەخوارد. دیارە سەفەر جوان تێی دەگەیاند کە ئەمجارە بە قەستی کوشتنێی لێ نەدا. هەر کارە و ڕێگەی خۆی، بەڵام جۆماڵی زۆر بە ڕقەوە دەیوەشاند. دەتگوت هەلی بۆ هەڵکەوتووە. کورە تاخر بنیادەمێکیان گوتووە، دۆستایەتییەك، پیاو بە توندی ڕادەسێ، بەڵام کە دایدێنێتێ، وای لێ دەدا ئێشی پێ نەگا. ئەوانە دۆست نین، بنیادەم نین. بێ دایك و بابن.

تازە ڕووناکی کردبۆوە کە جۆماڵی پەیدا بوو. دوو ژەندەرمەشی بە دواوە بوون. دەیگوت:

- پەنجا لیرەی تۆم ناوێ. پەنجا لیرە بۆ ئەو هەمووە کارە هەر هیچ نییە. سەد و پەنجا لیرەی تەواوم دەوێ. دەزانم ئەو سەد و پەنجا لیرەیە گیانت ڕزگار دەکا. قرۆشێکی کەم بێ نامەوێ. کەیفی خۆتە.

سەفەر دەیگوت:

- وا مەکە، ئۆنباشی دەغیلت بم. پێ مەچەقێنە. ئێمە ئەو هەمووە نان و نمەکی یەکتریمان کردووە.

- تاقە قرۆشێکی کەم بێ نامەوێ. باشە بۆ ناتەوێ سەد و پەنجا لیرە بدەی؟ چما ئەمن گیانت ڕزگار ناکەم؟ چما شووشەی تەمەنت لە دەستی مندا نییە؟ چما ئەو گوندییانە دوای ئەوەی تاشباشمان برد، لەتوپەتت ناکەن؟

- کوڕە خۆ هەمبایە دەمدایەی. سەد و پەنجا لیرەم نییە.

- درۆ مەکە، کوێخا.

- وەڵڵا بیللا نیمە، لە سەر مەیتی ئەو ژن و منداڵەم دانیشم نیمە.

- کەیفی خۆتە. نیتە، با نەتبێ. بە من چی.

- بە سەد لیرە نابێ؟

جۆماڵی تووڕە بوو و گوڕاندی:

- کوڕە پیاوی چاک، ئەمن خەریکە گیانت ڕزگار دەکەم. ئەتۆ پەنجا لیرە نادەی؟ پەنجا لیرە بۆ گیانی خۆت؟ گیانی ئاوا هەرزان لە کوێ هەبووە؟

سەفەر قۆڵی ئۆنباشیی گرت و گوتی:

- لەسەرخۆ... بە نۆکەرت بم لەسەر خۆ... مەگوڕێنە.

- کەوابوو خێرا سەد لیرەکە دەربێنە دەی. چما هەقی خۆم نییە؟ هاوارکردن سەهلە، دەیکەمە قیامەت و هەڵڵا... بە تایبەتی ئەمجارەیان قەول وایە لێشت نەدەم. بەڵکو تێلاکە بە توندی ڕاوەشێنم و سەبرێك بیهێنمە خوارێ. پێت وایە ئەو کارە شارەزایی ناوێ؟...

سەفەر سەیری کرد هیچ چاری نییە، چۆوە ماڵێ و بە چەپکێك پارەوە گەڕایەوە. سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و بە سپایی پارەکەی خستە نێو گیرفانی جۆماڵییەوە و گوتی:

- پەنجا لیرەشم لە ژنەکەم بۆ قەرز کردی. تۆ خوداکەت ئۆنباشی، وەك جارێ دی مەمهاڕە، سەبر لێم دە.، بەڵام ئەوەندە زیرەکانە لێم بدە هەمووان پێیان وابێ بە قەستی کوشتنێم لێ دەدەی.

ئۆنباشی پێکەنی. ئەو تاشباشە دیارە بێ و نەبێ وەلییە و یەکێکە لە چل سوارە نەمرەکە. ئەوەتا قازانجی بۆ هەموو بەندەکانی خودا هەبوو. ئەویش شتێکی پێ گەیشت. گوتی:

- سوپاس سەفەر ئەفەنی. زۆرت ماندوو نەکردم. ئێستا وەپێش کەوە و سەیر بکە، گوندی دیسان لە بەر دەرگای تاشباش کۆ بوونەتەوە. هەر هەموو لەوێن... باشە بۆ؟

سەفەر گوتی:
ـ مەترسە. مەتەقیشیان نایە. تاشباش ئەمری پیّ کردوون.
جۆمالّی:
ـ ناکریّ درەنگتر بچین؟...
ـ قاوەیەکی بخۆوە...
جۆمالّی پاشگەز بۆوە:
ـ تاشباش ماوەیەکە لە مالیّ خۆی ئامادە کردووە و چاوەڕێی ئێمەیە. تەنیا نازانم ئەو گوندییانە چییان دەویّ؟...
سەفەر گوتی:
ـ هیچ مەترسە ئۆنباشی. گوتم تاشباش ئیزنیان نادا. ئەگەر ئەو ئیزنی دابوایەن، ئێستا لە مێژ بوو ئەمنیش و ئەنگۆشیان لەتوپەت کردبوو.
ئۆنباشی بەرەو مالّەکەی تاشباش بەڕێوە بوو، بەلاّم بە ترسەوە هەنگاوی دەنا. بەر لەوەی بگەنە مالّی تاشباش، تاشباش لە مالّەکەی هاتبووە دەریّ و بەپیریانەوە هات. تاقەتی بە پێوە ڕاوەستانی نەبوو. هەر بیستبووی ئۆنباشی هاتووە، دەسبەجیّ لە جێویانەکەی هاتبووە دەریّ و شمەکە تازەکانی لەبەر کردبوو و چاوەڕێی هاتنی ئۆنباشی ببوو.
وشکە سەرمایەکی تیژی هەبوو. هەواکەی خەریك بوو تێك دەچووەوە. گەوالّە هەورەکان لە سەر لووتکەی چیاکەی تەکەچ کۆ دەبوونەوە.
تاشباش تیزەبزەیەکی هاتیّ و دەستی برد و گوتی:
ـ فەرموو ئۆنباشی.
ئۆنباشی دەستی گوشی و گوتی:
ـ باشە... تاشباش ئەفەنی، دیسان هاتووین بتبەین. جەنابی مولازم ئەمجارەیان زۆرت لیّ تووڕەیە. یەك پشوو دەلّیّ:"ئەو وەلییەی بەلّێن دەشکێنیّ." و لەوە پتر قسە ناکا. ئەمجارەیان ئەستەمە لە دەستی ڕزگاریت بیّ. وەریّ بکەوە."
ئۆنباشی کەلەپچەکەی لە ژەندەرمەکە وەرگرت و لە مەچەکی تاشباشی دا. لەو کاتەدا بوو زەنازەنایەك لە حەشیمەتەکەوە هەستا. مرێمۆك بە تێلاّکەیەوە هاتە پێشەوە و لە پێش خەلّکەکەوە ڕاوەستا.
تاشباش بە سرتەیەك بە ئۆنباشیی گوت:

ـ ئۆنباشی ئەو کەلەپچەیە دەربێنە. ئەوانە هار بوون، ئەمنیش باشاریان ناکەم و ناتوانم پێشیان بگرم. خێرا... خێرا..

ئۆنباشی سوور هەڵگەڕا و دەسبەجێ کەلەپچەکەی دەرهێنا. تاشباش ماوەیەك چاوی بەسەر حەشیمەتەکەدا گێڕا. ئەوجار خۆی دەستی برد بۆ ئەوەی کەلەپچەکەی لە مەچەکی بدەن، بەڵام دیسانەوە جەشیمەتەکە گرماندی. ئۆنباشی کەلەپچەکەی دابوو ئەو ژەندەرمەی لە پشتییەوە بوو و سەبرێك دەستی تاشباشی گێڕایەوە.

تاشباش وەپێشیان کەوتبوو. ڕەنگی بە ڕوویەوە نەمابوو. تیسکێ لە کاکۆڵی لە بن پێچ و کڵاوەکەیەوە کەوتبووە سەر نێوچاوانی. چاوە درشتەکانی خەفەتیان لێ دەباری. چاوی بڕیبووە پێش خۆی.

ئەوان دەڕۆیشتن و ئەوانەی لە گوندە دوورەکانەوە هاتبوون، بە غاردان نەخۆشەکانیان دێنایە پێش تاشباش و لە بەری دەپاڕانەوە کە هەر یەك قسەی لەزاری بێتە دەرێ و دووعایەکیان بەسەردا بخوێنێ. لەگەڵ گەیشتنی هەر نەخۆشێك، تاشباش ڕادەوەستا. بە بەزەییەوە دەستێکی بەسەری نەخۆشەکەدا دێنا. دوای ئەوە تاوێك دەستی لە سەر تەوێڵی نەخۆشەکە ڕادەگرت و دووعای دەکرد و وەڕێ دەکەوتەوە. دەتگوت تۆزی مردووانت بە سەرودەموچاویدا کردووە.

حەشیمەتەکە وەك جاری پێشوو، مرێمۆك لە پێشیانەوە، کپ و بێ دەنگ وەشوێنیان کەوتبوون. کە لە گۆڕەپانەکەی ئاوەدانی تێپەڕین، تاشباش سەری هەڵێنا و ئاوڕی دایەوە و لە نێو خەڵکەکەدا بە شوێن یەکێکدا گەڕا. دەتگوت نەیدۆزیوەتەوە، بۆیە دیسان دەموچاوی تێك نایەوە و خەمبارتر بوو. سەری بەردایەوە و کەوتە ڕێ.

بەڵام ئاوا خۆی پێ نەدەگیرا. جار و بارە هەر ئاوڕی دەدایەوە و دەگەڕا، چونکە نەیدەدۆزییەوە، ڕوخساری وردە وردە خەمبارتر دەبوو.

کە لە ئاوەدانی چوونە دەرێ، ڕوخساری گەش بووەوە. نزیك بوو ڕاوەستێ و پێبکەنێ. کوێخا سەفەری دیتبوو. سەفەر بە غاردان و بە هاوار هاوار بەرەو حەشیمەتەکە دەهات. هات و هات و خۆی هەڵاویشت و خۆی هاویشتە بەر پێیانی تاشباش و دەستی کرد بە ماچکردنی لاق و ئەژنۆکانی. تاشباش ڕاوەستابوو و بە تەوسەوە سەیری ئەو ئۆین و ئەدایەی دەکرد.

سەفەر هەم لاقەکانی ماچ دەکرد و هەمیش دەگریا:

ـ تاشباشەکەی خۆم، ئاغای من، پادشای من، ئەمجارەیان، دەبێ بەسەر تەرمی مندا بتبەن. تۆیان نادەمێ. ئۆنباشی گوتی: کاکی خۆم، ئەو سەفەرەت، گەڕانەوەی نییە. مولازم بۆ ئەوەی

بزانیٚ چ دەکەی، سیٚ ژەندەرمەی لە جلوبەرگی گوندییاندا وەك نەخۆش ناردبووە ئاوەدانی بۆ لای تۆ. ئەتۆش دووعات بۆ کردوون و فووت بەسەردا کردوون. پیٚت وابووە ئەوانەش هەر لەو خەڵکە گوندییانەن. کورە ئەوە چارەڕەشییە، چارەڕەشی، چما پیاو بۆ ژەندەرمەش دەپاڕیٚتەوە؟..."

تاشباش بەوەی نەزانیبوو. خۆ زانیباشی گویٚی لیٚ نەبوو. هەر ئیٚستا لەبەر ئاوەکانی ئۆنباشی دووعای بۆ چەند کەسان کردبوو. ئیتر لە چنگی مولازم ڕزگار نەدەبوو. مولازم هەر چاخی ئەتۆمی دەزانی و هیچی دیکە. خۆ لە چنگی ئەویش نەجاتی بوایە، چۆن دەیتوانی سەیری چاوی ژنەکەی بکاتەوە؟ ئاخر بەڵیٚنی دابوو و شکاندبووشی. جگە لەوەش، خۆی بە سەر پیٚیانەوە ڕانەدەگرت. کە ئەو قسانەی لە زمانی ژەندەرمەکانەوە بیست، هەر تەواو تیٚك چوو. چیی نەمابوو وە عەرزی بکەویٚ و لە سەر بەفرەکە لیٚی تخیٚلٚ بیٚ. بۆخۆی زۆر لەو مەسەلەیە دەترسا، چونکە وای لیٚ هاتبایە، ژەندەرمەکان لیٚیان دەقەوما. حەشیمەتەکە لە چاوترووکانیٚکدا، دەیانهاڕین. جا ئەوجار وەرە ئەو کەرە لەو قوڕەی بیٚنەوە دەریٚ. ئەو خەتەرەی هیٚنایە پیٚش چاوی خۆی. لاقی لە چنگی سەفەر ڕاپسکاند و ڕۆیشت.

سەفەر دەستی هەڵنەدەگرت. داد و هاواریٚکی وەڕیٚ خستبوو و دەپاڕایەوە. جۆماڵی زۆر لەو کارانەی تووڕە بوو و لە داخانی هیٚڵنجی دەهاتیٚ. یەك بەخۆی لیٚی ڕاسا. لە دڵی خۆیدا گوتی یا ئەڵڵا و قۆنداغی تفەنگی داهیٚنایە و لە نیٚوقەدی کویٚخای ڕاکیٚشا و لە بن لیٚوانەوە وەك تف بکاتەوە گوتی:

- هەقی خۆی بوو ئەو گەوواداە. لیٚی گەڕیٚ با پشتی بشکیٚ و چەند مانگان لە جیٚ بکەویٚ...."

سەفەر کەوتە سەر عەرزی... وەك مریشکی سەرهەڵقەنراو پەلەقاژەی بوو. یەك دوو کەس لە گوندییەکان چوون و هەڵیانئەستاندەوە. خەریك بوو بەلادا دەهات، بەلاّم دیسان بە لارەلار خۆی کەوتەوە شویٚنیان:

- وەی باوکەڕۆ کوشتیانم، سەروەری ئیٚمە، مەڕۆ، ڕا بکە، مولازم شوکری دەتکوژیٚ. دەتنیٚریٚتە شیٚتخانە. خەڵکینە، وەرن سەروەرەکەمان لە چنگ ئەوانە دەربیٚنن. ڕزگاری بکەن..."

دیسان خەریك بوو خۆی بەسەر لاپی تاشباشدا بداتەوە، بەلاّم نیٚوقەدی وا دیٚشا، دەترسا پشتی شکابیٚ و لە ترسان ئیتر نەیدەویٚرا لیٚیان نزیك بیٚتەوە.

"ئۆنباشی... ئۆنباشی جۆماڵی، قەول و قەرارمان چ بوو؟ پیاو ئـەو هـەمووە ساڵە نـان و نمەکی یەکتری بکا و ئەو هەمووە پار... چما دڵی دێ؟ ئەتۆ دین و ئیمانت هەیە؟... بمکوژە... بمکوژە..."

خەڵکەکە بەو قسەیە ڕاچڵەکین. سەفەر ئەمجارەیان یەخـەی خـۆی دادڕی خـۆی خستە پـێش ژەندەرمەکانەوە و پێشی گرتن:

"ناتوانن بیبەن. ئەمن ئیزن نادەم. ئەگەر ئەو بڕوات، ئـەو گونـدە وێـران دەبـێ. زەوی زار دەکاتەوە و ئەو گوندە هەڵدەلووشێ. "وەبا" دێ و هەمووان دەکوژێ."

بە هەر دوو ددەستان بەرۆکی گرتبوو و سینگە ئاوەڵاکـەی بردبـووە پێشەوە و لـە بـەر دەم جۆماڵیدا ڕاوەستابوو. جۆماڵی چاوەکانی لێك نا. لە دڵی خۆیدا دیسان ناوی خودای لێ هێنا و قوونە تفەنگێکی لە سینگی سەفەر کوتا و چوار شـەقاو لـەولاترەوە بـە عـەرزی دادا. سـەفەر کەوتە سەر تەنیشتی ڕاستەی و دەستی کرد بە ناڵە و نووزانەوە.

لە لایەکەوە بە دەم ئازارەوە دەتلایەوە و لە لایەکیـشەوە بـە وردی چـاوی بەسـەر جوولـە و هەڵسوکەوتی گوندییەکانەوە بوو. گوندی خەریك بوو لاگیری دەبوون و چیی نەمابوو پـەلاماری ژەندەرمەکان بدەن. هەر ئەوەنـدەیان بـەس بـوو غیرەتێـك وەبـەر خۆیـان بنـێن، بـەلام خـۆ ئـەو جۆماڵییە دایك سەگەش حەیاتی لێ بڕیبوو.

تاشباشیش تێگەیبوو. هەستی پێ کردبوو و بیری لێ دەکردەوە. ئەگەر بێت و لە ناکاو ئـەو حەشیمەتە بتەقێتەوە، بە کەس نەدەگەڕانەوە.

سەفەر کە پەیتا پەیتا دەینالاند و دەیویست هەرچۆنێك بووە ئـەو دەرفەتـە لـەکیس خـۆی نەدا. قەت هەلی وای بۆ هەڵنەدەکەوتـەوە. ددانـەکانی چـیڕکردنەوە و جـارێکی دیکـەش خـۆی بەسەر پێڵاوی تاشباشـدا کێشایەوە. ئـیتر خـەریك بـوو لـە ئـاوایی دەچـوونە دەرێ. جۆمـاڵی تفەنگی لێ ڕاست کردەوە. تاشباش بە دەسـت ئامـاژەی بـۆ کـرد دەسـت ڕاگـرێ. پـاڵێکی بـە سـەفەرەوە نـا. ڕووی کـردە حەشـیمەتەکەوە و ئامـاژەی کـرد کـە لـە دەوری کـۆ ببنـەوە. ئـەو حەشیمەتەی چیی نەمابوو بتەقێتەوە، بە قسەیان کرد و وەك دیوارێك دەورەیان گرت. تاشباش سەفەری هەڵگرت و بردی پێنج شەش هەنگاو لـەولاتری خۆیـەوە داینـا... ئـەوجار ڕاوەسـتا و چاوی بەسەر یەك بە یەکی گوندییەکاندا گێڕا. سەری داخست و تاوێك بیری کـردەوە و ئـەوجار سەری هەڵێنا و بە دەنگێکی خەفەتبارانەوە گوتی:

ـ گەردنم ئازاد بکەن. ئەنگۆ زۆر چاکەتان لەگەڵ کردووم. منتان کردە وەلی و پیاوچاك، خۆشتان ویستم. خوداش شادی و خۆشیتان بەسەردا ببارێنێ و خۆشتانی بوێ. ئەمن ئەوا دەڕۆم. یان دەگەڕێمەوە یان ئەو سەرەی دەیبەم نایهێنمەوە... لەوانەشە ئیتر نەتانبینمەوە."

ئەو خەمەی بە ڕوخسارییەوە دیار بوو، دەتگوت هەموو گیانی داگرتووە و ناخی بەتەواوەتی تەنیوەتەوە. ئەگەر بەسەر خۆیدا زاڵ نەبوایە، لەوانەبوو دەست بکاتە گریان. خەڵکەکەش هەر وا بوون. ئەوانیش گریان لە ئەوکیاندا مابۆوە. تاشباش کە سەری داخستبوو، تاوێك وا مایەوە. ئەوجاری سەری هەڵێنا. ئیتر خەم و خەفەتەکەی بە ڕوخسارییەوە نەمابوو. وەك بەردێك سەخت ببوو.

ـ لەوانەیە ئیتر نەتانبینمەوە...

ئەو قسەیەی سێ جاران پاتە کردەوە. ئەوجار دەنگی پتر هەڵێنا و گوتی:

"جا ئێستا کە لێرە دەڕۆم و بەجێتان دێڵم، داوایەکم لێتان هەیە. تکاتان لێ دەکەم ئەو داوایەم جێبەجێ بکەن. ئەگەر نەیکەن، چیی بەڵایە بەسەرتان دێ و بۆ هەمیشە تووشی عەزابی دۆزەخێ دەبن."

ماوەیەك لە سەر یەك قسەی کرد. ئەو بەڵایانەی دەژماردن کە لێیان دەباری. گوتی: ژنەکانتان نەزۆك و ئەستێور دەبن. زەویوزارتان بێ بەر دەبێ. هەرچی بە مێشکیدا هات بۆی گوتن. دیسان وەك ئەو ڕۆژانەی کە لە گوندییەکان تووڕە دەبوو، وەکوڵ هاتبوو. هەمووان تووکی گیانیشیان کردبووە گوێچکە و گوێیان بۆ ڕاگرتبوو:

"تکاکەم ئەوەیە، کابرایەك لێرە لەگەڵتانە، کابرایەکی سەگ و سەگباب و هیچ و پوچ کە بە چوار کتێبان کوشتنی واجبە و خوێنی حەڵاڵە. لە سۆنگەی سیحرڕییەکانی ئەوەوەیە کە ئێستا ئەمن دەچمە پۆلیسخانە."

هەر هەمووان سەیری سەفەریان کرد:

"تکاکەم ئەوەیە، ئەو بنیادەمە، ئەگەرچی بە چوار مەزەب و کتێبان خوێنی حەڵاڵە، نابێ بیکوژن. ئەو کافری بێدینی درۆزنی هەزار ڕووە کێیە؟ کوێخا سەفەر ئەفەنییەکەی خۆمانە کە لێرە ڕاوەستاوە."

زەنازەنایەکی تووڕەییانە لە خەڵکەکەوە بەرز بۆوە.

"تکاکەی من ئەوەیە، هەتا دەمرێ، هیچ کەسی ئەو ئاوەدانییە، تەنانەت سەگ و پشیلە و مێرووولەکانی ئاواییش، نابێ بیدوێنن و لەبزیان دەلەبزی بگەڕێ. ژنەکان و منداڵەکان و خزم و

کەسی دوور و نزیکیشتان، نابێ یەك قسەشی لەگەڵ بکەن. بە خەڵکی گوندەکانی دیکەش ڕابگەیێنن. خەڵکی شاریشی لێ ئاگادار بکەنەوە. بە هەموو مەخلووقاتی سەر ئەو عەرزە بڵێن چیم گوتووە. هەر کەس بیدوێنێ، وەك ئەو بەر نەحلەت دەکەوێ. ئەگەر هات و یەکێك قسەی لەگەڵ کرد، ئەویش وەك خۆی (سەفەر)، مەدوێنن. ئەوجار ئەو کابرا نەحلەتییە نابێ تا مردن چاوی بە کوێخایەتیی ئەو گوندە بکەوێتەوە. نابێ قەبووڵی بکەن ئەو کوێخاتان بێ. ئەگەر دەوڵەت و حیزب و میزبیش هاتن و کردیانەوە کوێخا، ئەنگۆ قەبووڵی مەکەن. تکاکەم هەر ئەوە بوو. خوا ڕاوەستاوتان بکا و بێ وەی بن. گەردنم ئازاد بکەن... لەوانەیە بگەڕێمەوە یان هەرگیز نەگەڕێمەوە."

کەوتە پێش ژەندەرمەکان و بە هەنگاوی گورج، خێرا کەوتە ڕێ.

سەفەر لە سەر جێی خۆی وشك هەڵاتبوو. ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو. چاوەکانی وەك چاوی شێتان لە ژێلڵا هاتبوون.

تاشباش دوای ئەوەی مەودایەکیان لێ دوور کەوتبووەوە، ئاوڕی دایەوە و گوتی:

ـ گەردنم ئازاد بکەن.

هەمووان یەکدەنگ هاواریان کرد:

ـ ئازاد بێ.

هەتا تاشباش و ژەندەرمەکان لە چاوان ون بوون، لەوێ ڕاوەستان و سەیریان کردن. دوای ئەوە گەڕانەوە ئاوایی.

سەفەر هەر لەوێ بێ جووڵە مابووەوە. دەتگوت گیانیان کێشاوە.

لەو خەڵکەی دەگەڕانەوە ئاوایی، تاقە یەك نەفەریش سەیرێکیان نەکرد. هەر وەك ئەوانەی لە تاعوون ڕادەکەن، ئاوا لێی دوور دەکەوتنەوە.

# ٤٥

بایەکی گەرم وەك شەپۆلێکی تیژ، هات و تێپەڕی. ئاسمان بەرەبەر تاریکدا دەهات. ئۆنباشی جۆمالێ بەسێرەی چاوان سەیری تاشباشی دەکرد. کابرایەکی زیرەك و بەهۆی گوش بوو ئەو تاشباشە، بەڵام چۆن و بۆچی کرابووە وەلی؟ خۆ مەلا و خوێندەواریش نەبوو. دیارە هەموو بنیادەم و بوونەوەرێك شتێکی لە پیرۆزایەتی تێ دایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا...

جۆمالێ لە کاکەییەکانی سیواس بوو. کابرایەکی سمێڵ بابڕی خوێندەواری تاڵی و سوێریی ڕۆژگار چەشتوو. دەیزانی لە سەر ئەو گۆی زەوییە، پێگەی هیچ بوونەوەرێك ناگاتە ئینسان. خودا ئینسانی لە سەر شێوەی خۆی خولقاندووە. بنیادەم دوای خودا، خولقێنەری زەوی و ئاسمانە. خودای گەورە وەك تیشکێك دەردەکەوێ و ئەو نوورەش لە بنیادەمە پوختە و کامڵەکاندا هەیە و هیچ دوور نییە ڕۆژێك لە ڕۆژان لە باشترین بنیادەمەکاندا دەرکەوێ. بۆیە، کاکەییەکان سوژدەیان بۆ بنیادەم و نوور دەبرد.

تاشباش ئۆغڵوش ئەوەی دەزانی. لەوانەش بوو ئەو نوورە یەزدانییە لەویشدا هەبێ. لەوانەشە خەڵك ئەو تیشکەیان دیتبێ. بە دڵنیاییەوە دیتبوویان. ئەگینا خەڵك لە خۆڕایی ئاوا لە دەوری یەکێك خڕ نابنەوە.

تاشباش وەلی بێ یان نەێ، دەیزانی لە ناخی دڵیدا شتێکی پیرۆز و دەست پێڕانەگەیشتوو هەیە کە مان و نەمانی ئەو دنیایە بەوەوە بەستراوەتەوە و ئەگەر ئەوە نەبێ دنیاش نابێ. بەڵام نەیدەتوانی زۆر لەو هەستەی خۆی نزیك بێتەوە، دەچووە پێشەوە و دەگەڕایەوە دواوە. لە نهێنییە پیرۆزەکەی خۆی نزیك دەبۆوە و خۆی تەواو دەبردە سەرەوە و لە ناکاو لەو حاڵەتە دەهاتەوە دەرێ و هەموو شتێکی بزر دەکرد... لەو ساتانەدا کە دەگەیشتە سنووری پیرۆزایەتییەکەی خۆی، شەپۆلێکی بەختەوەری وەك تیشك و پڕشنگ لە ناخییەوە هەڵدەستا.

لەو ساتانەدا، مولازم شوکری و شێتخانە و زیندان، لە بەر چاوی ئەو پووشێکیش نەبوون، بەڵام بەڵێنی بە مولازم دابوو. چۆن لە ڕووی هەڵدەهات سەیری چاوی بکاتەوە؟ بەڵێنەکەی خۆی نەبردبووە سەر. بنیادەم وەلی بێ یان نەبێ، مرۆڤە و مرۆڤیش دەبێ لە سەر بەڵێن و ئادی خۆی بێ. هەم لە پێش ژەندرەمەکانەوە دەڕۆیشت و هەمیش ئەو شەرمەی لەناخیدا بوو هەر دەهات و پتر دەبوو. ڕوخسارە ئەسمەرەکە و سمێڵەکانی ملازم شوکری بۆ ساتێکیش لە بەر چاوی لا نەدەچوون. کە دەگەیشتە ئەوێ، دەبوو چ بە مولازم بڵێ؟ ئاخۆ دەیگوت ئەمن سەراسوێی نەخۆشانم نەکردووە و چارەم نەکردوون؟ نەمهێشتووە دەست و داوێنم ماچ بکەن؟ دووعام نەکردووە و فووم پێدا نەکردوون؟ نەیدەتوانی. تەنیا دەیتوانی بڵێ، سەرقەڵەمانەی هەموو ئەو شتانە، تەنیا سەرەپەنجەیەکم خوێ لێ وەردەگرتن، بەڵام چما مولازم گوێی دەدایێ؟ هێندەی لێ دەدا دەیکوشت. ئەو شارە لەوەتیی هەبوو کوتەك وەشێنی وەك ئەو شوکری بەگەی بەخۆیەوە نەدیبوو. مەحاڵ بوو یەکێك بێتە ئەو بنکەی پۆلیسە و لە چوونەدەرەوەدا خوێن نەمیزێ. تاشباش ئۆغلو پێی قەبووڵ نەدەکرا لێی بدرێ. چۆن دەکرا کەسێکی گەیشتبێتە ئەو پلە و پایەیە و لە هەنتەشی خودا و لە لای گوندییەکان بە پلە و پایەیەکی ئاوەها گەیشتبێ، تێهەڵدانێکی وا بخوا خوێن بمیزێ و لاق و بەلەکی شین و مۆر ببنەوە و وای لێ بێ نەتوانێ بە ڕێیەدا بڕوات؟

خۆ ڕووناکاییەکەشی دیتبوو: لەسەر ماڵەکەی خۆی. ئێستا ئیتر دڵنیا ببوو کە دیتوویەتی. ئەو شەوە و ڕۆژەکانی دواتریشی کە لە جێدا کەوتبوو، هەر دوودڵ بوو، بەڵام ئیتر ئێستا گومانی نەمابوو.

زیان گەیاندن بە وەها بنیادەمێك، لەوانەبوو مولازمیشی تووشی بەڵایەك کردبایە. چووزانێ. دەکرا بە مولازم بڵێ بە چاوەکانی خۆی ڕووناکاییەکەی دیتووە، بەڵام کوا ئەو گوێی لەو قسانە بوو؟

لە گوندەکەوە، سەگێکی زەرد لەوانەی مێگەل، کەوتبووە شوێنیان و بە ئامان و زامان لێیان نەدەبۆوە. تاشباش بە دیتنی ئەو چوارپێیە، خۆشییەکی لە دڵی گەڕابوو. چوارپێی "کۆر دورموش"ی دراوسێی بوو و تاشباش ئەو سەگەی زۆر خۆش دەویست.

جۆماڵی و ژەندەرمەکان، بە درێژایی ئەو ڕێیە، نە تاشباشیان دواندبوو و نە قسەیەکیشیان لەگەڵ یەکتری کردبوو. دیار بوو جۆماڵییش لێی بە پارێزە. تاشباش ئاگای لێ بوو کە بەجۆرێك لێی دەڕوانێ و کەیفی دەهات. گەیشتنە دارستانەکەی قارامۆغون. لك و پۆپی دارەکان لە بن

بارستایی بەفرەکەدا داهاتبوونەوە. دارستانەکە سپیاییەکی ڕووناکی هەبوو. ئەو دارستانەی لە بەهار و هاویندا تاریك بوو، ئێستا نوقمی تاو بوو. خەرمانەیەك بوو لە نوور. سێبەری هەورێکی ڕەش بە سەر سەریاندا تێپەڕی. با گەرمەکە دیسان هەڵیکردەوە. لووتکەی چیای تەکەچ خەریك بوو تاریکدا دەها.

جۆماڵی نیگەران بوو. دڵنیا بوو لە ناکاو دەیکاتە کرێوە و بارن. ئەو باش شارەزای ئەو داوێنەی تۆرووس بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی:"ئای، تاشباش ئۆغڵون ئەگەر ئەتۆ بە ڕاستی وەلی و پیاوچاکی، پێشی ئەو بەفرە بگرە." ئەوجار خۆمانە سەیرێکی کرد و بزەیەکی هاتێ.

هیچ بوونەوەرێك دیار نەبوو. نە باڵندەیەك و نە دەعبایەکی کێو و نە حەیوانێکی دیکە، تەنانەت گیایەکیش چیە نەدەبینرا... هەموو شتێك یەکپارچە سپی بوو. ئەو لێڕەی بە نێوەڕاستەکەیدا تێدەپەڕین، لە بن پێیانیاندا خشەخشی دەهات و جارجار وەك چۆن گەڵای دار دەوەرێ، ئاوا بەفری سەر لك و پۆپەکانیان بەسەردا بەردەبۆوە.

هێشتا زۆری مابوو لێڕەکە ببڕن . لە ترسان هەنگاویان خۆشتر کرد. لە ناکاو هەورەکانی سەر چیای تەکەچ، وەك خێوەتێك ژوور سەریان داپۆشین. هەموو وڵات تاریك داهات. تەنیا بەفرە بەستووەکانی قەدی دارەکانیان دەدی...

ئاسمان گرمەیەکی لێوە هات، دەتگوت دەیەوێ شەق بەرێ. ڕێك وەك ئاسمانی پاییز لە ڕاست و چەپ و تەنیشتەوە، لە هەزار لاوە بای گەرم و سارد و کزە زریان، هەڵیانکرد. بەفری سەر لقەکانی هەڵدەستاند. کرێوە دەستی پێ کرد. ئۆنباشی یەکەم کەسێك بوو وەقسە هات:

ـ فەوتاین.... بێت و ئەو بۆرانەی هەڵیکردووە ئاوا بڕوات...ئیتر...

ئەگەکە دەتگوت خۆی بە تاشباشەوە نووساندووە و چرکەیەکیش لێ جوێ نەدبۆوە:

ئۆنباشی ڕووی لە تاشباش کرد و گوتی:

ـ کاکە مەمەد، ئەتۆ خەڵکی ئەو دەوروبەرەی، شارەزاتری. ئەو دەوروبەرانە ئەشکەوتێك شتێکی لێ نییە؟

تاشباش لە دڵی خۆیدا دەیگوت:"ئەو کاکەییانە، لە خۆیان خوێنگەرمتر نییە. ئایینەکەیان ئایینی هەق و دین خوشەویستی و ئەشقە... ئەوانە هەموو شتێك لە سەر بنەمای خۆشەویستی و ئەشق دادەمەزرێنن. دەڵێن بنیادەم و ڕووناکی دەپەرستن، بەڵام واش نییە. ئەوانە ئەشقی مرۆڤدۆستی و ئەشقی دنیا دەپەرستن. چما خۆشەویستیی دنیان هەر ڕووناکییەکە نییە؟"

تا ترسەکەی پتر دەبوو، پتر متمانەی بە ئۆنباشی جۆماڵی دەکرد. حەزی دەکرد هەر چۆنێك بێ، چاوی بە مولازم نەکەوێ. پێی وابوو بێت و لەبەری بپارێتەوە و بڵێ هەر لێرە لێم گەڕێ و مەمبە لای مولازم، ئەو دەڵێ باشە بە سەر چاوان.

کە بەفرەکە دایکردبوو، لە دڵی خۆیدا گوتبووی:"ئیشەڵڵا ئەو بۆرانە ناهێڵێ بگەمە شار. وەبن بەفرێ دەکەوم و ڕەق هەڵدێم."

لە ناخی دڵییەوە ئەو ئاواتەی خواستبوو.

گوتی:

ـ مەترسە ئۆنباشی گیان. بڕێکی دی بڕۆین، لەو دیو ڕەوەزەکانی گۆك بوورون، ئەشکەوتێکی لێیە کە کۆرماغارای پێ دەڵێن. بەر لەوەی بەفرەکە کەسیرەمان بکا، دەگەینە ئەوێ.

بەفرەکە هەر دەهات و توندتری دەکرد، ئاسمان جار بە جار تاریکتر دەبوو و بایەکانیش بەتەوژمتر. با لە ڕاست و چەپ و لە هەزار لاوە دەهات. لەرەوەزەکان وەسەر کەوتن و بە هانکە هانك خۆیان گەیاندە کورماغارا. دەمودەست ئاگرێکیان کردەوە و گەرم بوونەوە. سەگەکەش لە تەنیشت ئاگرەکەوە و لە سەر خۆڵەکە وەرکەوتبوو. نێو ئەشکەوتەکە پڕ ببوو لە دووکەڵ و چاوەکانیان پڕ ببوو لە ئاو.

جۆماڵی گوتی:

ـ باشە خواردنەکەمان بەش دەکا.

ـ پرێسکەکەی من بەشی سێ ڕۆژی تێدایە.

ئۆنباشی گوتی:

ـ لێرە سێ ڕۆژ سەهلە، دەتوانین پێنج ڕۆژیش بێنینەوە.

نانیان خوارد. بەفرەکە کردییە بۆران و بارِن. بارِنەکە هەرچی بەفری دەشتەکان و سەر دارەکان و ئاسمان هەبوو، هەر هەمووی هەڵدەگرت و لە کێوێکەوە بەکێوێکی دیکەیدا دەکرد. پەیتا پەیتا قرچەی شکانەوەی دارەکان لە لێرەکەوە دەهات. دەتگوت لێرەکە یەکسەر لە ڕەگەوە هەڵدەکەنرێ.

جۆماڵی گوتی:

ـ ئەی هاوار لەو تۆفانەی، کورە ئاوا بڕوا، حەفتەیەکی دیکەش لێرە دەرباز نابین. خۆ کاکە مەمەد ئەو ئەشکەوتەی پێشان نەدابایەین، هەر ئەمڕۆ تێدا دەچووین.

تاشباش بێ ئۆقرە بوو. بڕیاری خۆی دابوو. چاوەڕێی ئەوە بوو شەودابێ. بۆیەش سەری هەڵنەدێنا کە تەنانەت سەیرێکی دەموچاوی ئۆنباشی بکا. هەر پرسیارێکی ژەندەرمەکان لێیان دەکرد، ئەو بە دوو وشەی کورت وەڵامی دەدانەوە. ئیتر بێدەنگ دەبووەوە و نوقمی دنیای خۆی دەبوو.

دەسبەجێ نێو ئەشکەوتەکەیان پڕ کردبوو لە پووشکە و ئاوردوو. ئاگرێکی گەورە لە نێوەڕاستی ئەشکەوتەکە بڵێسەی دەکێشا. خۆ ئاگر کە جوان گڕی گرت، ئیتر دووکەڵ ناکا. نێو ئەشکەوتەکە گەرم بوو. بە گاشەبەردی گەورە دەرگای ئەشکەوتەکەیان گرت و هەر کەلێنێکی بچووکیان لێ هێشتەوە.

ئیتر نانی شەوێشیان خوارد و لێی نووستن. تاشباش بەخەبەر بوو. کە دیتی هەمووان نووستوون، هەستا. پرێسکەکەی لە پشتی بەست و لە ئەشکەوتەکە خزییە دەرەوە. لە پشتەوە گوێی لە دەنگێکی کز بوو. کە ئاوڕی دایەوە دیتی سەگەکەیە. بێت و بەسەر خۆیدا زاڵ نەبوایە بۆرانەکە دەیڕفاند و بە عەرزی دادەدا. خشە و خرم و هۆڕی دارەکان بەرز بوو و ویزە ویز و گڤەی بایەکە دارستانەکەی پڕ کردبوو. تاشباش ئەمجارە نە کلاشی لبادیی لە پێدا بوو و نە کەپەنەکی پێ بوو. بۆران و سەرماکەشی زۆر لە سەرما و بۆرانی نێو گوندی جیاواز بوو. داوێنی چیای تەکەچ بوو و بۆران و باڕنی شەوانە. جگە لەوەش، ئەو تازە لە نەخۆشییەکەی هەستابۆوە و زۆر کز و لاواز بوو. بە خێرایی لە ڕەوەزەکانی ئەشکەوتەکە هاتە خوارێ و خۆی گەیاندە تەختایی لێڕەکە. لە خوارەوە تاوێك وێستا. ڕاست و چەپی خۆی نەدەدی. ماوەیەك بە دەوری خۆیدا خولایەوە. بۆرانەکە ئەوەندە توند بوو، خەریك بوو پشووی لێ ببڕێ.

تاشباش بەخۆی گوت:

"ئەوەی کردم کەرێتی بوو. ئەوە خۆکوشتنە." ئەوجار دانی بەو کارە شێتانەیەدا دێنا کە کردبووی:

"ئەگەر مولازم هەر لێم دەدا و لە پیاوەتی دەکەوم، وا باشترە ئاوا بمرم..."

وا باشتر بوو، بەڵام نەشیدەتوانی هەر وا سووك و ئاسان مل بۆ مەرگ ڕاکێشێ. چۆکی دادا و دەستی کردە پاڕانەوە. ئەگەر لەو تۆفان و بۆرانە بە ساغی دەرچووبایە، ئەوجار دڵنیا دەبوو کە وەلییە. ئیتر تەواو ئیمانی بە وەلییایەتی و پیاوچاکبوونی خۆی دێنا و ئیتر خێر و خۆشی و چاکە و سلامەتیی بەسەر خەڵکدا دەبەشییەوە.

دەیگوت:

ـ خوایە گیان، چما ئەمن بەندە و وەلییەکەی خۆت نیم؟ بۆ خۆت باش دەزانی، حەز دەکەی هەر لێرە بمکوژە. کەیفی خۆتە چۆنی پێت باشە من ڕازیم."

هەستا. تین و تاقەتی لە ئەژنۆیدا نەمابوو. بە مێشکیدا هات بگەڕێتەوە ئەشکەوتەکە بۆ لای ژەندەرمەکان. بۆرانەکەی ئەوەندە توند بوو، ئیتر نەیدەتوانی لە ڕەوەزەکان وەسەر بکەوێتەوە. لەو هەوا سارد و وەیشوومەیەدا، پیاوێکی نەخۆش، بەو ئەژنۆ لەرزۆکانەوە سەهلە، کوڕە پیاوی زۆر بەهێز و تۆکمەش نەیدەتوانی لەو ڕەوەزانە وەسەر بکەوێ. خۆ تین و تواناشی لەبەردا بوایە، ئیتر ڕێگەی ئەشکەوتەکەی نەدەدۆزییەوە.

شەقەی ددانی هات... ماوەیەك بەبێ ئەوەی بەرەو شوێنێکی دیاریکراو بچێ، ملی ڕێیەی گرت و ڕۆیشت. لەو دەوروبەرانە، نەك لەسەر ڕەوەزەکانەوە، بەڵکو لە خوارووی گابەردەکانەوە و لەو سەری ڕاستاییەکە، ئەشکەوتێکی بچووکی دیکەشی لێ بوو کە "ئەشکەوتی سەرمابردووان"ـیان پێ دەگوت. هەر وەك لە ناوەکەیڕا دیار بوو، بۆ خۆ حەشاردانی بنیادەم، حەشارگەیەکی زۆر قایم و پەنا نەبوو. ئەو ئەشکەوتە دەبوو هەر لەو نزیکانەوە بێ، بەڵام دەبوو لە کامە لاوە بۆی بچی؟ تاشباش هەموو لایەکی لێ تێك چووبوو. خۆ توانیبای بیدۆزێتەوە لە کام لایە و بزانێ دەبێ بەرەو کام لا دەڕوا، بشمردبا خەمی نەبوو.

ئەو شوێنەی لێی ڕاوەستابوو، کوێرە ڕێیەك بوو. بە شانی ڕاستیدا کوێرەڕێیەکی بەردەڵان و بە شانی چەپیدا زەوییە تەختانییەکە بوو. ڕووی کردە لایەك و ڕۆیشت و ڕۆیشت. دیسان هەر ڕۆیشت. نە بەردەڵان دیار بوو نە هیچ... گەڕایەوە. کە لاقی لە بەردێك هەڵەنگوت دڵی خۆش بوو. ئەوجار دەبوو لای باکوور بدۆزێتەوە. لە باکوورەوە هاتبوو و بەرەو باشوور دەچوو. ئەشکەوتی سەرمابردەکان نیوسەعاتێك لە پێشترەوە بوو. لە لێڕەکەدا دارەکان بەرەو باشوور نووشتاونەتەوە. پێنج شەش دارێکی بە دەست تاقی کردەوە و ڕێی خۆی دۆزییەوە. ئێستا بەرەو باشوور غاری دەدا. دیسان دەکەوت و هەڵدەستایەوە و غاری دەدا. سەگە زەردیش بە شوێنییەوە بوو.

خوێنی ڕاوەستابوو و خەریك بوو ڕەق دەبۆوە، بەڵام لەو کاتەدا بەسەر خۆیدا زاڵ دەبووەوە و غاری دەدایەوە. جارێك کە کەوتە عەرزی، سەیری کرد تینی لەبەردا نەماوە هەستێتەوە.... دەیزانی گەیوەتە نیزك ئەشکەوتی سەرمابردووان، بەڵام نەیدەتوانی هەستێ و لە ئەشکەوتەکە بگەڕێ. ددانی بە جەرگیدا گرتبوو و بە هەموو هێزی خۆی، بە گاگۆڵێکی بەرەو پێشەوە چوو. لە سەر ملی، هەستی بە هەناسە گەرمەکانی چوارپێیەکە کرد. ئەوەش هێزێکی تازەی وەبەر دەنا.

هێمای ڕەقەبوونەوەی لە گیانیدا هەست پێ کرد. لاقەکانی سڕ دەبوون و نەیاندەتوانی جەستەی هەڵگرن.

لێرەوار دەیلووراند و دارەکان وەك لە ڕەگەوە هەڵکێشرابێن، سەریان دەبردە بن یەکتری. لە ناکاو هەورەتریشقەیەك هەموو وڵاتی ڕووناك کردەوە. تاشباش ئۆغلو لە خۆشیان خەریك بوو شێت بێ. ڕەوەزە نووك تیژەکەی ئەشکەوتی سەرمابردووانی دیت. تۆزێك لە پێش خۆیەوە، لە پێشەوەی بوو.

هەموو جلەکانی تەڕ ببوون و خووسابوون. لاقەکانی لەکار کەوتبوون و لە نێوقەد بۆ خوارەوەی سڕ ببوو. لە لاقییەوە سڕبوونەکەی خەریك بوو بەرەو سەر، بەرەو زگی دەکشا. خەویش خەریك بوو بەربینگی پێ دەگرت. تاشباش ئۆغلو کە دیتی خەو خەریکە دایدەگرێ، ترسا. مەرگ چاوەڕێی دەکرد. کە سەیری کرد بەفری لەسەر کەوتووە، خۆی ڕاپسکاند. هەرچی هێزی هەیبوو دایە دەستەکانی و بەرەو ئەشکەوتەکە خزی.

سەگەکە لە تەنیشتییەوە بوو و ئەویش وەك خۆی دەخزی.

تاشباش لەو جەنگەیەدا دەستی بۆ گیرفانی برد و سەیری کرد شقارتەکەی پێ ماوە. گوتی: "ئەو شقارتەیە، شەقارتەکەی حەسەنی خۆمە. دیارییەکەی ئەوە."

گەرمای خۆشەویشتیی گیانی تەنییەوە.

# ٤٦

بەفر وردە وردە دەتوایەوە. زەرداوی پەین و پاڵ و کا و کۆت بە خوڕ، بە جۆگەلەی نێوان ماڵەکاندا دەهاتە خوارێ و منداڵی ڕووت و قووت تێیدا گەمە و یارییان دەکرد.

بەفراوە ڕوونەکە، لە نێو ئاوەدانیدا پیس و لیخن و لە داوێنی چیا و شیو و دۆڵەکانیشدا زوڵاڵ و ڕوون وەك چاوی قرژاڵ، بۆ ماوەیەکی زۆر هەر نەدەبڕایەوە. بەهار دەپشکووت.

هەموو ساڵێ، ئەو دەمەی بەفرا، ڕووبار و جۆگەلە و شیو و دۆڵەکانی پڕ دەکرد، خەڵك ئاردیان لێ دەبڕا و برسێتی دەستی پێ دەکرد. گوندی، ئەوەندەی لە عادیل دەترسان، سەد ئەوەندە لە هاتنی بەهار تۆقیبوون. ئەوان هەر جارێك لە عادیل دەترسان، بەڵام هەموو ساڵێ ترسی بەهارێیان ڕێدەنیشت. هیچ هێزێك باشاری ئەو ترسەی نەدەکرد، تەنانەت هێزی وەلییایەتییەکەی تاشباش نۆغڵوش.

پاشکەوتی ئاردی هەموو ساڵێیان زووتر لە ساڵی پێشوویان تەواو دەبوو. ئەو پاشکەوتەی سێ ساڵ لەمەوبەر لە پانزەی نیسانێدا تەواو ببوو، ئەمساڵ لە یەکەم ڕۆژی نیساندا تەواو دەبوو. بەو شێوەیە وای لێ دەهات لە نێوەڕاستی زستانێدا تەواو بێ. ساڵ بە ساڵ خراپتر دەبوو. لە لایەکەوە ساڵ بە ساڵ خەڵکەکە منداڵیان پتر دەبوو و حەشیمەتی گوندەکەش زیادی دەکرد و لە لایەکی دیکەشەوە زەوییەکان پیت و بەرەکەتیان نەدەما. مام خەلیل گوتبووی:

"ئەو زەوییە، بە سەردەمی بابی من، هەر دەنکێکی سیی دەنکی بەر دەگرت، ئێستا لە پێنج دەنك زیاتر بەر ناگرێ. هەتا نەوەکەم گەورە دەبێ، هەر دەنکە و دەنکێك دەگرێ. دنیا خرابوونە. خەڵك زۆڵ و بیژوو دەبن."

مام خەلیل تۆزێکی پێوە دەنا. ئەو خاکە لەوەتەی هەیە دەنکێکی سیی دەنکی نەگرتووە، بەڵام بەو جۆرەی دەڕۆیی، لەوانەبوو وای لێ بێ، هەر دانەوێڵەیەکی بیچێنی، لە دەنکێك پتری

پێوە نەبێ و دواتریش وای لێ بێ هیچ بەر نەگرێ و وەك شۆرەكات ئیتر هیچ شینكەیەكی لێ نەڕوێ و ئەوەش ڕاستییەكی تاڵ و ناخۆش بوو.

گوندەكانی دەور و پشتیش هەر وا بوون. بە تایبەتی گوندەكانی دەشتێ هەر زۆریش خراپتر بوون. خاكەكەی ئەوان هەر لە ئێستاوە ئەو تۆوەی لێیان دەچاند، شینی نەدەكرد.

گوندی هیچ لەوە نەدەترسان. تەنانەت هەر باسیشیان نەدەكرد. چونكە خاكەكە وردە وردە لە پیت و بەرەكەت دەكەوت. ئاخری ڕۆژێك دەهات، سەیر دەكەن زەوییەكە تەواو لێ كەوتووە و ئیتر دەستەوستان دەمانەوە.

پێش هەمووان ئاردی گۆملیكسیز ئۆغلو تەواو بوو. هێشتا ئاوی بەفراوان هەر بە جۆگەلەی گوندیدا دەڕۆیشت و نەبڕابۆوە. هەموو ساڵێ ئاردی گوملكسیز ئۆغلو لە پێش هەمواندا تەواو دەبوو، بەڵام ئەمساڵ هەر زۆر زووتر تەواو ببوو. لەگەڵ تەواوبوونی ئاردەكە، ئەو ترسەی بە درێژایی زستان دڵی گۆملیكسیز ئۆغلوی تەنیبۆوە، لە ناكاو ڕەوییەوە.

گۆملیكسیز ئۆغلو پیاوێكی ژیر بوو. هەر ئاردەكەی تەەواو دەبوو، وەكەیف دەهات و دڵی خۆش دەبوو. ئیتر خاتر جەم ببوو. هەموو ساڵێ وا دەبوو. گوتی:

ـ ئێمە هەموو ساڵێ، بە ترسە ترس چاوەڕێی هاتنی عادیل"ین، بەڵام لە ڕاستیدا لەمرۆوە لە تەواوبوونی ئارد دەترسین. عادیل بیانووە."

دیارە عادیل زۆریش بیانوو نەبوو. ترسی بەهار، ساڵ بە ساڵ لە دڵیاندا گەورەتر دەبۆوە. ترسێكی قووڵ و ڕەگدار بوو.

گۆملیكسیز ئۆغلو، هەموو ساڵێ بەهارێ، كە ئاردەكەی دەبڕا، دەچوو لە كۆستۆئۆغلوی برادەری قەرزی دەكرد. كە كۆستوئۆغلو لێی دەبڕا، دەچوو لە "چل درۆ"ی وەردەگرت. كە چل درۆش لێی دەبڕا...

بەو جۆرە ئاردی هەموو ئاوایی لە ماوەی چەند ڕۆژاندا تەواو دەبوو. دیارە لەو نێوەدا كەسی واش هەبوون ئاردی خۆیان دەشاردەوە و بە كەسیان نەدەدا، بەڵام ئەوانە زۆر نەبوون، هەر وا چەند كەسێك بوون. ئەوانەش جاری وابوو بێ ئارد دەكەوتنەوە، بەڵام كە بێ ئارد دەمانەوە، قریشیان هاتبایە، كەس لوێچێ ئاردی نەدەدانێ.

وەرزی دروێنە دەهات. ئەوی ئاردی بە قەرز وەرگرتبوو، چەندی قەرزی كردبوو، نە لوێچێ كەمتر و نە زیاتر، قەرزی خۆی دەدایەوە.

لەگەڵ نزیکبوونەوەی بەهاردا، خەمێکی قورس لە سەر دڵی مریەمۆك دەنیشت. ئەمساڵ خەمەکەی دوو هێندەی جاران بوو. هەم بەهار دەهات و هەمیش عادیل. دەبوو لە کامیان هەڵێ؟

ئەمساڵ لە ساڵانی قاتی و قڕی دەبوو، بەڵام لە ساڵی قاتی و قڕیدا نە هیچیان بۆ خواردنێ هەبوو، نە دەغڵ و دانێك بۆ دروێنە. لە برسانا دەمردن. لە خوای بەزیاد بێ، ئەمساڵ کەس لە برسان قڕی نەدەهات. گەیشتنە بەهارێ. ئیتر زەوی شین دەبووەوە و هەر هێندەی توانیبایان تا شینکە سەر دەردێنێ، دەست بە ئاردەکەوە بگرن و نەبڕێ، ئیتر ترسیان نەبوو. لە دەرکەوتنی شیناوەردەوە هەتا پێگەیشتنی دەغڵ و دان، دەکرا گەڵای باویلکەگیا و فەریکە بێنی و بیکولێنی و خوێی پێوە بکەی، لە گۆشتی بەرخ خۆشترە. ترشۆکە، کاردۆ، کەنگر... دەکرێ توێکڵی دار کاژ بقەڵشێنی و یالابووکی لێ دەربێنی. هەر بۆن و بەرامەکەی پیاو تێر دەکا و پێی دەژیێ.

بەڵام هەمووی ئەوانە دڵخۆشکردن و هیوا بوون. کزە ڕووناکییەك کە بەهار بە سەر ترسەکەی ئەوانیدا دەپژێنێ. دەزانن هیچ شتێك جێی نان و ساوارەکەیان بۆ پڕ ناکاتەوە. لە ساڵەکانی قاتی و قڕیدا چرۆی هێندێ داری تایبەت کۆ دەکەنەوە و دەیکەنە نان...، بەڵام چما ئەوانە جێی نان پڕ دەکەنەوە؟

ئەگەر ڕاستیت دەوێ، هێندەی لە بەهار دەترسن، ئەوەندە لە عادل ناترسن.

لەگەڵ ترسی برسێتیدا، بەفراوەکانیش وشك بوون. لەگەڵ وشکبوونی بەفراوان، شینکەی شلك و چووزەرەی ناسك و تورت سەریان لە خاك هێنایە دەر. ئەو شنەبایەی لە دەشتێوە هەڵیکردبوو، تاوی وێکەوتبوو و نیوەگەرم ببوو. دەشتەکەش لە بری با و بۆران، بۆنی عەتری گوڵانی بە بایەکەدا دەنارد.

ئەوانەی لە ئۆزوون دەڕە، لە تەرمی مام خەلیل دەگەڕان، هیچ شوێنەوارێکیان لێی نەدۆزییەوە. ئیتر دڵنیابوون کە گورگ خواردوویانە و خەڵکیش بڕوایان کرد، بەڵام لەو نێوەدا لە گوندی "ئینجەجیك"ـەوە خەبەریان هێنا. مام خەلیل زستانێ، چووبووە ئەوێ. لە ماڵی کۆنەدۆستێکی خۆی، جێ قوونی کردبۆوە و بڕیاری دابوو نەگەڕێتەوە ئاوەدانی. دەیانگوت هەرچی جنێوی دەیزانێ، بە گوندی یالاك و دار و بەردەکەی و بە ژن و منداڵ و کوێخا و تاشباشی ئەو گوندەی دەدا. دەیگوت:"بە حاڵی سەگ گیانە شیرینەکەمم نەجات دا، دەنا کەوڵیان دەکردم و لەتوپەت دەکرام و هەر لەتێکمیان بە لقی دارێکەوە دەکرد. هەقیشیان بوو.

هەر کەس لە جێی ئەوان بوایە و خەڵکی هەر گوندێکی دیکەش بوایەن هەر وایان دەکرد. چونکە عەرزی ئاغای خۆم بکەم، ئەوانم دەرەنگ بردە لۆکە ڕنینەوە و بوومە هۆی ئەوەی عادیل ببێتە بەڵای گیانیان..، بەڵام لە چنگیان ڕام کرد و خۆم قوتار کرد. ئەوجار، هەر خۆیشم عادیلم لە کۆڵ کردنەوە.. ئێستا چۆنم لە کۆڵیان کردەوە؟ هەر خۆم دەزانم و خودا. ئەوەندەی دوو قسەم لەگەڵ کرد، دەمودەست قەبووڵی کرد و ئەمن بەو کارەی خۆم ئەو گوناحەم لەسەر خۆم پاك کردووە کە دەرهەق بە گوندییەکان کردوومە، بەڵام ناتوانم بچمەوە ئەو گوندە. چونکە ئەگەر دیسان بڕۆمەوە، هەر بە زیندوویی دەمسووتێنن و دەمخەنە پێش سەگان...."

ئەوە بوو ئەو هەواڵەی لە گوندی ئینجەجیکەوە هات. بە دوای ئەوەدا خەبەرێکی وەك ئەوە لە گوندی سورمەلییەوە کە لە داوێنی چیای تۆرووس بوو، هات. لەوێش مام خەلیل چیی لە زاری دێتە دەرێ بە خەڵکی گوندی یالاکی دەڵێ. گوتبووی: هەموو ژنی ئەو گوندە قەحپە و گاندەرن. هەر ژنەی چوار منداڵی دەبێ، بۆیە بابم، نە نان بۆ پیرەکان دەمێنێتەوە و بە ناویان بەش دەکا."

دیسان لە گوندەکانی قۆشلار و قارگۆن و ئۆرەنجیکەوە خەبەری دیکەی لەو جۆرە دەهاتن و زۆر حەقایەت و بەیت و باویان لە مام خەلیل دەگێڕایەوە. شتێك لێرەدا مسۆگەر بوو: بەپێی هەموو ئەو قسانە، مام خەلیل وەبن بەفرێ نەکەوتووە و نەمردووە. ، بەڵام هەر وەکی کەس تەرمی ئەوی بە مردوویی نەدۆزیوەتەوە، بە زیندووییش کەس نەیدیبوو.

بەڵام حوسنی و ڕەجەب... لەو ڕۆژانەدا کە تازە بەفرەکان دەستیان بە توانەوە کردبوو، منداڵێکی گوندی بۆزدەرە، سەد و پەنجا مەترێك لەو لای داوێنی "قیمیقلی"یەوە دیتبوونی. حوسنی، قژ درێژ و ڕەجەب چوار شانە، لە سەر زەوییەکە چۆکیان دادابوو و دانیشتبوون و توند یەکتریان لە ئامێز گرتبوو. کوڕەکە لە پێشدا بۆ ئەوەی سەیری ئەشقبازییەکەیان بکا، دەچێ لە پشت پنچکێکەوە مات دەبێ و سەیریان دەکا، بەڵام دەبینێ هیچ جووڵەیان نییە. بە ترس و لەرزەوە هەر لەوێوە یەك دوو بەردیان تێ دەگرێ. لەگەڵ ئەوەدا کە بەردەکان لە نزیکیانەوە وەعەرزی دەکەون، بەڵام ئەوان هیچ ناجووڵێن. کوڕە تووڕە دەبێ و بەردەوام بەردیان تێدەگرێ. کوڕە لە پشت پنچکەکانەوە دێتە دەرێ و لێیان دەچێتە پێشێ. کە سەیر دەکا، باوەشی ئەو دوو گراوییە کە پێکەوە نووساون، پڕە لەو بەفرانەی هێشتا نەتواونەتەوە. بە غاردان خەبەر دەباتەوە ئاوەدانییەکەیان.

سێ ڕۆژ لەوە پێش تەرمی دوو ئاشقەکەیان هێنایەوە. گەنجێك نەبوو لەو گوندەدا لانیکەم کۆپلە شیعرێکی بۆ ئەو ئاشقە و ماشقەیە دانەنابێ. کیژ و بووك و ژن، هەر کەسە و وایلۆك و چەمەرییەکیان بۆ چڕین. تەنانەت مرێمۆکیش لە بن لێوانەوە شینێکی بۆ گێڕان و گریا...

کەس هەواڵێکی تاشباشی نەبیستەوە. نە وەك ئاشقەکان جەستەی لە بن بەفرەکاندا کەوتە دەرێ و نە وەك مام خەلیلیش سۆراغێکی هەبوو. ببووە بە دڵۆپەیەك ئاو و عەرز قووتی دابوو.

تەنیا ئۆنباشی جۆماڵی بەو جۆرە بەسەرهاتەکەی بۆ مولازم و بۆ ئەوانیتر گێڕایەوە:

"بۆرانەکە هەڵیکرد. هەموو وڵات تاریك داهات. لەو نێوەدا گوێم لە دەنگێك بوو کە دەیگوت"یا عەلی، یا نووری دنیا..." تاشباش ئۆغڵو لە پێشمانەوە و ئێمەش بە دوایدا دەڕۆیشتین. لە ناکاو لەگەڵ ئەو دەنگەدا نوورێك لە پێشمانەوە دەرکەوت و وەك قورقوشمی تواوە، بەرەو چیاکان شۆلاوگەی بەست. ئەمن هاوارم کرد!"تاشباش، تاشباش... مەمەد..." دەنگیچك نەهات. هەتا بەیانی هەرام کرد. هەتا ڕۆژ بۆوە هەر لەوێ چاوەڕێ بووم. تاشباش سۆراغی نەبوو. خوایە ئەگەر هێندەی نوکە دەرزییەك درۆی تێدایە عەولادم لێ بستێنی. حەزرەتی عەلی لەسەر خوانەکەی دەرم بکا..."

ئەوە بەهار دەهات. هەوایەکی ساو و ساماڵ و فێنك. چنەکان لە بەربەرۆچکە و بن دیوارەکان دانیشتبوون و تەشییان دەڕست. گوێلکە خەنەییەکان، بەو لاق و لەتەرە باریکانەیانەوە، شاد و یەکەیف لەبەر تاوەکە هەڵدەبەزین. شیر و ماست زۆر بوو. ئاخ خۆزگە ئەو عادیل ئەفەنییە نەبوایە... ئاخ... ئەگەر دەردی بێ ئاردی و بێ نانی نەدەبوو، ئاخ ئەگەر بنیادەم دیلی ورگی خۆی نەدەبوو...

ژنەکان ماڵ بە ماڵ بە سەرە تەنەکەی کونکونەوە سکڵ و پشکۆیان دەبرد. ئەوە نیشانەی بەهار بوو. چونکە ئەو کوانووانەی بە درێژایی زستانێ نێڵەیان هاتبوو، ئێستا کوژابوونەوە. شقارتە لە ئاواییدا لە هەموو شتێ بەقیمەتتر و بەنرختر بوو. جا چونکە شقارتە نەبوو، ژنان لە ماڵەکانی دیکەوە سکڵ و پشکۆیان دێنا و ئاگریان پێ دەکردەوە. لە بوومەلێڵی ئێوارەدا ئەوەیان دەکرد.

سەری شەوێ، هەر هەموو ئاوەدانییەکە، بەو ئاگرانە، دەبووە یەکپارچە ئەستێرەی پڕشنگدار.

## ٤٧

رۆژێکیان، کە بەیانی لە خەو هەستان، سەیر دەکەن بەهار هاتووە. بەهاری دەشتێ ئاوایە. لە ناکاو دێ.

لە دەشتێ، بەهار شێت ببوو. لە هەموو ساڵێك شێتتر. بەرد و ئاو، کێو و شیو و دۆڵ و زەوی و ئاسمان هەر هەمووی شین دەچۆوە. لێرەوارەکەش نوقمی بۆن و بەرامەی گوڵان بوو و لایە لایەی خۆی دەچڕی و بە هەزاران مەل و باڵندەی سپی لە سەر لك و پۆی دارەکان نیشتبوون.

بەهاری دەشتێ بە درەنگەوە دێ. گوڵەکانیشی درەنگ دەپشکوێن. چڵی گوڵەکان لە پەنجەیەك بەرزتر نین. کورت و ئەستوور. ڕەنگی گوڵی دەشتێ، زۆر سەیر بریقەدارە. ئەگەر سوور بن، سوورییەکەیان لە گوێن هیچ سوورییەکی ئەم دنیایە نییە... زەرد و شین و نارنجییەکەشیان هەر وایە، تەنانەت لە تاریکە شەویشدا لە چاو دەدەن. بۆنەکەیان توندە. بۆیە هەر ئەوەندە بەسە دابێیتەوە و بۆن بە خۆڵی دەشتەکەوە بکەی، جا گوڵی پێوە بێ یان نا، بۆنی گوڵانی لێوە دێ. لوێچێ لەو وخۆڵە هەلگرە و لە باغەڵتی بکە، بۆ ماوەی چەند ڕۆژان بۆنی گوڵەکانی ئەو دەشتەت لێ دێ. بۆن و بەرامەی گوڵەکان وا تێکەڵی خۆڵ و خاکەکە بووە، لێك جوێ نابنەوە.

حەسەن لە خۆشیان باڵی گرتبوو. بانگی ئۆمەخانی دەکرد:

- هۆی کچێ... هۆی کچێ... بۆچی خۆ دەخافڵێنی... خێرابە...

ئۆمەخان لە ژوورێوە هەرای کرد:

- ئەوە چ باسە، کوڕەتیو؟... ئەو هات و هاوارەت لە چییە؟

- با بێیە دەرێ، بزانە ئەو سەرە ئەسپێونەت...

- ئەمن هەر نایەم...

حەسەن نەرم بۆوە:

- نا نا وەرە... ئەتۆ خوشکە جوانەکەمی.... وەرە.

ئۆمەخان:

- دێم، بەڵام...

حەسەن:

- باشە، ئەتۆ جارێ وەرە. چیت بوێ دەتدەمێ.

تاوێکی گەرم بوو. زەوی وردە وردە هاڵاوی لێ هەڵدەستا. ئێستا عەرز دەکوڵی و کەفوکوڵێکی سەیری هەبوو. جرِ و جانەوەر و باڵندە و گورگ و ڕێوی و ئەو ورچانەی لە خەوی زستانی هەستابوون، مار و کیسەڵەکان، گەرمەی جووتبوونیان بوو. جاڵجاڵۆکە بە شوێن مێش و مەگەزانەوە و باڵندەی بە دوای جاڵجاڵۆکەوە و باڵندە گەورەکان بە شوێن باڵندە بچووکەکانەوە بوون بیانگرن. مێروولە کە شارۆچکەی خۆیانیان ساز کردبوو، بە بەر خۆرەکەدا بڵاو ببوونەوە و خۆیان هەڵخستبوو. دار و گیا و با و لك و پۆ و گەڵا و جرِ وجانەوەر و باڵندە تێك ئاڵابوون. خاکی لێڕەوار و دەشت نوقمی ژیان، لە کەفوکوڵ و شەهوەتی پڕ بەرەکت و زاو و زێدا بوون. خاك لە خۆشیی ئەو بووژانەوە و زاو و زێیە و ئەو چێژ و ژیانە نوێیە، ئەو جۆش و کەفوکوڵ و هەوڵ و شێتییەدا باوێشکی دەدا.

خاکی دەشت و بەرد و داز و دارستانەکە وەها نوقمی چێژی خۆ بەدەستەوەدان و خاوبوونەوە بوون، کە بێت و دەستت بۆ بردبایەن، وەت دەزانی دەست لە لۆکەیەکی نەرم دەدەی. ئەگەر لە بەرزاییەوە بەردێکت هەڵدابایەتە سەر ڕەوەزێك، تێی دەچەقی.

زەردەواڵە زل زلەکان و زەردەواڵە زەردەکان و مێشەنگوینەکان بە باڵە تەنك و ناسکەکانیانەوە لەو بەر تاوە، بە هەزاران هەزار دانە دەسووڕانەوە. خونچەی تازە پشکووتوو، بە هەزاران و سەد هەزاران مێشەنگوینیان لە دەور بوو. تیشکەکە لەگەڵ لەرینەوەی باڵەکانیاندا، دەبریسکایەوە.

منداڵەکان بەرەو دارستانێ ڕایان دەکرد.

حەسەن گوتی:

- دەمەوێ وشترێك دروست بکەم. وشترێك دروست بکەم کە هیچ کاتێك تێك نەچێ. لە شووڵ سازی دەکەم.

ئۆمەخان:

- بۆ منیش دروست بکە.

حەسەن تووڕە بوو:

- کچەتیوە دۆمە، ئەتۆ باسی هەر شتێك بکەن دەتەوێ.

ئۆمەخان چووە پێشێ و پاڵێکی بە سینگی حەسەنەوە نا و گوتی:

- هەی کەر، ئەتۆ کەری. ئەگەر کەر نەبوایەی، شقارەتەکەت دەدامەوە. ئەگەر کەر نەبوایەی ئەو شقارتەیەی بە شەوخوونیی لەو شەوە بە بەفر و کرێوە و بۆرانانەدا وەدەستم هێنابوو، دەتدامەوە. ئەگەر ئەمن نەدەبووم، شقارتەکانتیان دەدزی.

حەسەن ملی بەلارەوە نا و ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

- جا سوودی چییە؟ عادیل دێ و هەمووم لێ دەستێنێ. ئەو هەمووە ئێشکگرتنەمان بە زایە چوو.

ئۆمەخان لە پێش حەسەن لاچوو و گوتی:

- ئەتۆ چووزانی؟

حەسەن:

- نەتدیوە بابم ماوەیەکە هەر قسە ناکا. هەر لە پێش خۆی ورد دەبێتەوە و دالغەی لێ داوە. ئەوەندە تووڕەیە بۆوەی نابێ لێی نزیك بیتەوە.

ئۆمەخان گوتی:

- نا، عادیل قەت نایە، ئەو لە بەهارێدا نایە.

حەسەن گوڕاندی:

- بێدەنگ بە، بێدەنگ بە کچەتیوە پیسە. ئەگەر نەهاتبایە بابم ئاوای لێ دەهات؟ ئەتۆ قەتت دیتووە ئەو ئاوا ڕەنگی مردووانی لێ بنیشێ؟ عادیل دێ و هەموو شقارتەکانم لێ دەستێنێ.

دوو شقارتەی لە باخەڵی دەرێنا و گوتی:

- ها، ئەو دووانەیان بۆ تۆ. بۆ تۆ بێ باشترە نەك عادیل بیانبا.

ئۆمەخان بە ترس و گومانەوە تاوێك ڕاوەستا. ئاخۆ ئەگەر دەستی بردبایە وەریانگرێ، حەسەن دەستی نەدەکێشایەوە؟

حەسەن:

- کچێ دەی ها.

ئۆمەخان بڕوای نەدەکرد و دەستی نەدەبرد وەریانگرێ. بە درێژایی ئەو زستانە لەسەر ئەو شقارتانە شەڕیان کردبوو و حەسەن ڕازی نەبوو شقارەتەیەك نا، تەنانەت چڵێکیشی بداتێ.
حەسەن گرماندی:
- دەی وەریگرە کچەتیوە، بۆ تۆ بێ باشترە لەوەی عادیل بیبا.
ئۆمەخان سەیری نێو چاوەکانی حەسەنی کرد. هیچ شوێنەوارێکی گاڵتەپێکردنیان پێوە دیار نەبوو. بەسپایی دەستی برد. شقارتەکان لە لەپی دەستیدا بوون. چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو. نەیدەزانی چ بکا. حەپەسا بوو. چاوێکی بە شقارتەکانەوە بوو و چاوێکی لە حەسەن. گوتی:
- ئەوانە بۆ خودی خۆم؟...
حەسەن بە خەفەتبارییەوە گوتی:
- بۆ خودی خۆت. باشترە لەوەی عادیل بیانبا.
ئۆمەخان دەستی کرد بە پێکەنین و تریقانەوە. پێکەنینەکەی نەدەبڕایەوە. حەسەن بەرانبەری ڕاوەستابوو و سەیری پێکەنینەکەی دەکرد. زۆری پێ سەیر بوو. تاوێك نیگایان تێك ئاڵقان. حەسەن دەستی کرد بە پێکەنین. ئێستا خوشك و برا پێکەوە پێدەکەنین. هەر دووکیان سەیری یەکتریان دەکرد و دەتریقانەوە. نوقمی شادی و خۆشی بوون.
ئۆمەخان گوتی:
- هەر بەراتی بۆ خۆم؟ هەر دووکیان؟
حەسەن گوتی:
- هەر دووکیان.
بە غاردان گەیشتنە لێڕەوارەکە. حەسەن پووشکەی کۆ کردەوە و بردییە شوێنی ئاورگەکەی جاران و لەسەر یەك هەڵی چنی. دەستەچیلەی وەبن پووشکەکان دا. جا ئێستا کە ئاگرەکەی دەکردەوە، ئای لەو بۆنە خۆشەی لێی هەڵدەستا. پووشکە و داری بەهاری شتێکی دیکەیە. بۆنی گوڵاوی لێوە دێ. لە تەنیشت ڕەوەزەکە دانیشت. چەند ڕۆژێك بوو حەجمینی نەبوو و پەیتاپەیتا دەیگوت با چینە لێڕەوارەکە، بەڵام کە ئۆمەخان دەیگوت:"با بڕۆین." ئەو نێوچاوانی تێك دەنا و پاشگەز دەبۆوە.
ئەمڕۆش هەر وا بێ ئۆقرە بوو.
بە سپایی قوتووە شقارتەکەی لە گیرفانی دەرێنا. کردییەوە و هەمووی لە سەر کۆشی ڕۆ کرد. دە دوازدە چڵە شقارتەی هەڵدەگرت و وێکڕا ئاگری دەدان. کە ئاگریان دەگرت، بڵێسەیەکی گەورەیان لێ

بەرز دەبۆوە. حەسەن چاوی لە بلێسەکە دەبڕی و بەبێ ئەوەی چاو بترووکێنێ، هەتا دەکوژایەوە، سەیری دەکرد. ڕەزامەندییەکی خەمبارانەی بە دەموچاوییەوە دیار بوو. جار بە جار قەڵافەتی دەگۆڕا، جارێک خەفەتبار و جارێك ڕازی و بە کەیف و جاری واش بوو ئاسایی.

شقارتەی یەکەمی یەکسەر سووتاند و تەواوی کرد. قوتووی دووەمیشی دەرهێنا. ئۆمەخان هێندەی پێ سەیر بوو چاوی لە ژێللا هاتبوون و سەیری دەکرد. لە جێی خۆی وشك ببوو. سەیری دەکرد و هیچی نەدەگوت.

ئاخرییەکەی بە دەست خۆی نەبوو، لە بەری پاڕایەوە:

- بەسە، حەسەن گیان، بەسە براکەم.

و دەسبەجێ بێدەنگ بۆوە.

حەسەن دوای ئەوەی هەموو شقارتەکانی سووتاند و تەواوی کردن، بە ئۆمەخانی گوت:

- بێنە شقارتەکانی خۆیشت.

ئۆمەخان دەرپەڕی و قیژاندی:

- ناتدەمێ. ئەتۆ شێتی، شێتی، شێت.

حەسەنیش وەك بزووت دەرپەڕی و پەلاماری دا. بوو بە شەڕێك کەوچکی تێنەگەڕێ.

حەسەن ئەوەندە شێتانە شقارتەکانی دەویشت و لە سەریان بەشەڕ دەهات، کە زۆری نەبرد هەمووی لە چنگی ئۆمەخان دەرێنان. ئۆمەخان هەموو سەر و دەموچاوی بە نینۆك تێك کردبۆوە.

دەموچاوی حەسەن هەمووی خوێناوی بوو. هەر خوێنی لێ دەچۆڕایەوە، بەڵام ئەو گوێی لەو شتانە نەبوو. دیسان چۆکی دادا و چڵە شقارتەکانی هەر دوو قوتووەکەی کردە لەپی دەستییەوە و بە هانکە هانك خستنییە سەر ئاگرەکە. شەمچەکان وێکڕا دەتقینەوە. دەستەکانیشی لە چەند جێوە سووتابوون.

حەسەن بە دوایین چڵە شەمچەکەی ئاگرێکی کردەوە. دەستی نایە بن چەناگەی و نوقمی سەیرکردنی بلێسەکان بوو. ماوەیەك چاوی لە بلێسەکان نەترووکاند.

لە ناکاو هاواری کرد.ئۆمەخان کە دالغەی لێدا بوو، ڕاچڵەکی و مچوڕکێك بە گیانیدا هات.

- سەیر کە، سەیر کە. داری چاکی. هەر ئەو دارەی هاتبووە سەربانەکەی مامە تاشباش... سەیر کە.... وەر سەیر... ئەوە هەستا. خەریکە دەڕوا. نەتدی؟ نایبینی؟

ئۆمەخان بە تووڕەییەوە گوتی:

- نابینم. هیچ نابینم.

حەسەن دیسان ورد بۆوە. ئاگرەکە سووتا و دامرکایەوە. حەسەن هێشتا چاوی لێ نەدەترووکاند.

تاوێك دواتر وەخۆ هاتەوە. هەموو گیانی دێشا. هەستا. باسکی لێك کردەوە و باوێشکێکی دا و گوتی:

- هەستە، ئۆمەخان. پشتم تێ کە. ئاور بدەیەوە دەتکوژم.

بە نێو ڕەوەزەکاندا بە سپایی ڕۆیشت و چۆوە تەنیشت ڕەوەزە نووك تیژەکە. لە کن بەردەکەی خۆیەوە ساتێك ڕاوەستا. وەك شتێکی پیرۆز بە ئەشق و هیواوە سەیری بەردەکەی کرد. داهاتەوە و چەند جارێك دەستی پێدا هێنا. ئەوجار بە دوو دەستان گرتی و بەرزی کردەوە. هەر هەڵیهێنا، وەك کارەبا لێی دابێ، هەڵبەزییەوە و وشك بوو. نەیدەزانی چ بکا. بەردەکەی لادا. نەیدەتوانی چاو لە جێیەکەی بترووکێنێ. سات بە سات ڕوخساری گەشتر دەبۆوە و شادی و خۆشی دایدەگرت. چیاکان و بەردەکان و دارەکان و زەوییەکەش هەر هەمووی دەبریسکانەوە. خۆشی و شادی لە هەموو گیانییەوە بڵێسەی دەدا. هەرای کرد:

- ئۆمەخان، ئۆمەخان وەرە.

شادییەکی وا لە دەنگەکەی دابوو، ئۆمەخانیشی داگرت. بە غاردان چوو. ئەویش چاوی بڕییە ئەو شوێنەی حەسەن لێی ورد ببۆوە. خوشك و برا ئێستا چاویان لە جێی بەردەکە بڕیبوو و سەیریان دەکرد. وێناچێ تا ئێستا، هیچ کەس بە دیتنی خۆشترین ڕووداویش، ڕوخساری ئاوا گەش بووبێتەوە.

سێ گوڵ لە جێی بەردەکە پشکووتبوون و لە سەر خۆڵە ڕەشەکە پان ببوونەوە. یەکیان سوور و بریسکەی بلوورینی وەك بڵێسەی لێ دەبۆوە و چڵەکەشی درێژ بوو... دووەمیان زەرد بوو، زەردێکی وەك تاو، ئەویش بریقەدار بوو و چڵەکەشی بەرز. سێیەمیان شین بوو. شینێکی بلوورین و بەرز.

حەسەن سەیری چاوەکانی ئۆمەخانی کرد و پرسیی:

- دیتت؟

- دیتم.

- هەر سێکیان؟

- ئەی، دیتم.

**کۆتایی بەشی دووەم**



ڕۆمانی ئەودیوی کوێستان، یەکێکە لە بەرهەمە بە نرخەکانی یەشار کەمال. نووسەر لەو ڕۆمانەدا بە وردی پەردەی لەسەر لایەنە دەروونی و نهێنییەکانی ناخی مرۆڤ هەڵداوەتەوە. بە خوێندنەوەی ئەو ڕۆمانە جوان و زەریف ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێ کە وەچەی ئادەمیزاد چۆن دەست دەکات بە دروستکردنی پیرۆزایەتییەکان و چۆناوچۆن پیرۆزایەتی بە شتەکان و کەسەکان دەبەخشێت و دواتریش هەر کەسە و لەبەر خۆیەوە چیرۆکێکی خەیاڵیی لەبارەیانەوە هەڵدەبەستێت و پەرجۆ و موعجیزەیەکیان بۆ ساز دەکات. ئەو ڕۆمانە جیا لە زۆربەی ڕۆمانەکانی دیکەی یەشار کەمال ، ڕۆمانێکی تەواو فەلسەفییە و ئاوڕی لە مەسەلەی "پەرستن" داوەتەوە. یاشار کەمال لە ئاوێنەی ژیانی خەڵکە ساویلکەکەی گوندی "یالاك"دا دەچێتەوە بنج و بناوانی مێژووی . ژیانی ئادەمیزاد و خەون و خەیاڵ و ئارەزووەکانیانەوە...





وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتی
ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی
MUKIRYANI ESTABLISHMENT
FOR RESEARCH & PUBLICATION
www.mukiryani.com

چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری